رۆز رۆزتری

# هێزی خوێندنەوەی ڕوو

وەرگێڕانی:

**لەیلا حەمید محەمەد**

ناوی کتێب: هێزی خوێندنەوەی ڕوو
نووسینی: ڕۆز ڕۆزتری
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: لەیلا حەمید محەمەد
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٨٤٨
هەڵەگری: بۆکان نووری + فەرهاد ئەکبەری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٩
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٠ی ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ




نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو لە چاوپێخشانێکدا

# وەسفی خوێندنەوەی ڕوو

وا پێ دەچێ دەمێکە ئێوە یەکتر دەناسن... بەڵام ئەمە ماقووڵ نییە، لەبەرئەوەی ئێستە یەکترتان بینیوە. لەگەڵ ئەوەش ئەو نەک تەنیا وەسفی هێماکانی رووی تۆی کردووە، بگرە بەباشترین شێوە وەسفی تۆی کردووە. "واشنتۆن پۆست"

ئەو بۆ ئەوەی هەڵە نەکا، دەسبەجێ پرسیار ناکا. چاوەڕێ دەکا و دڵنیایە لەوەی لانی کەم تا ڕادەیەک لە ئامانجەکە نزیکە. ئەو کاتەش کە داوای ڕوونکردنەوە دەکا، داواکردنەکە بەهەستێکی زانینخوازیی تەواوەوە دەبێ هەروەک چۆن کەسێک سەری خۆی لە پەنجەرەیەکی باران لێداودا دەردێنێ تا بەڕادەی بەهێزیی زریانێک بزانێ. "واشنتۆن تایمز"

"جۆن ئینگلر"ی پارێزگار و "تێری مەکێین"ی سەرۆکی شارەوانی "ئێجگار بەگومان بوون..."، بەڵام "هەردووکیان ڕایان گەیاند خوێندنەوەکانی رۆزترییان لە ڕادەبەدەر پێ ڕاستەقینە بووە. "کۆواری لەنسینگ ستێیت"

بڕیارم دا وێنەیەکی خۆمی بۆ بنێرم لەگەڵ ئاگەدارییەک کەوا هاوسەرەکەم بۆ بێ هەڵەبوونی لێکدانەوەکەی ئەو، چاو بەڕاپۆرتەکەیدا دەخشێنێتەوە. تاکە وەڵامی هاوسەرم ئەوە بوو: "ئەو بەرەکەتی تەکاندووە". "کاسۆلیک ستاندارد"

لە سەرانسەری ئەمەریکادا، بۆ خەڵکی سەڵت، خوێندنەوەی ڕوو زۆر لە هاوژوانیی ئینتەرنێتی پشت پێبەستراوترە. رۆز رۆزتری شارەزایە بەناوبانگەکەیە و لەسەر سیستەمی ڕووخوێندنەوەی چینیی دێرین، سیستەمی خۆی پەرە پێ داوە. "دێیلی مێیل – شانشینی یەکگرتوو"

هەروەک رۆز رۆزتری دەڵێ: "ڕاست و دروستیی ئەو شتەی ئێمە لە ڕوومساندا و هەر ڕووێکدا بەشێوە جیاکەرەوەکەی خۆی دەری دەخات، یەجگار دڵگیرە". ستایل – هۆنگ کۆنگ

چۆنیەتیی پێوەندیکردنمان هاوشێوەی ناوەڕۆکەکەی گرینگە. ئێمە دەبێ ئەو شتەی

دەیڵـێین بەپێی چۆنیـەتیی وەرگـرتنی لەلایـەن گـوێگرەوە، بگـونجـێنین. نهـێنیـیـەکـانی خـوێندنەوەی ڕوو بەسـوودن لەبەرئەوەی یارمـەتیت دەدەن بۆ ناسـینەوەی شـێوازی کـەسـی. "کۆواری تۆپیکا کاپیتاڵ"

خـوێندنەوەی ڕوو لـە ڕووی خـۆ پەسندکـردنـەوە خـزمـەتێکی بـەڕاسـتی زۆر پێـشکێش بەخـەڵک دەکا. ئەو کـاتەی تۆ فـێر دەبی چۆن سـەیری ڕوویـەک بکەی دەگەیـە تێگەیشـتنێکی ڕاستەقینە لە ڕووی خۆت. "ئیندییەن ستار"

ئامـانجـی ڕۆزتری ئەوەیە ئـەو پێـوەرە کـۆمـەڵایەتیـیـانە لـە ناو ببـا کـە بەکـار دێن بۆ جیـاکردنەوەی ئەو شـتـەی بەشـێوەیەکی باش ناسـراوە لەوەیان کـە بەخـراپ ناسـراوە. ئەو دەڵێ هـەمـوو ئاکارەکانی ڕوو بێ ڕەچاوکردنـی دڵڕفێنی یان بەئاشکرا ناشـیرینبـوونیـان، واتاهـەڵگر و پڕ بەهـان. "کۆواری ئالۆها"

ڕۆژنامـە لەو چەند مانگەی ڕابردوودا لە زۆر ڕووەوە لە پاڵێوراوە سـەرەکییـەکانی پۆسـتی سـەرۆکایەتیی شـارەوانیی سـان فرانسـیسکۆی کۆڵیـوەتەوە. ئەمڕۆ... ڕۆزتری شـارەزاییی خـۆی لەسـەر پـاڵێوراوانی ڕکابەریەتیی سـەرۆکایەتیی شـارەوانیی سـان فرانسـیسکۆ تاقی کردەوە، لە کاتێکدا جەختی لەوە کردەوە پێشـتر هیچ زانیارییەکی لەسـەریان نەبووە. "سان فرانسیسکۆ کرۆنیکڵ"

«ئەم سـەروتـارە بووە هۆی ئەوەی خـەڵکی سـان فراسـیـسکۆ ١٠٠ داواکاری بۆ کـتێب و بابەتی خوێندنەوە پێشکێش بکەن.»

"مـۆر"ی "قایمقـامی قەزا" وتی: "خـەمـڵاندنەکانی ڕۆزتری بەتایبـەتیش بەشـەکەی پێوەست بەپاشـەکەوتکردنی پـارە ڕاست و دروست بوو. من لە "Frugal Fannies" شت دەکڕم. ئاخـۆ ئەمە هیچ شتێکت بۆ بەدەردەخا؟" "کۆواری فێیر فەکس"

# دەسپێک

زۆر لە مێژە مرۆڤەکان بۆ زیندوومانەوەی خۆی، ناچار بوون ڕوو بخوێننەوە. مێشکی ئێمە لە ڕێی خوێندنەوەی ڕووەوە پەرەی سەندووە. لە ئەنجامدا ئێمە هەموومان بەزگماکی ڕووخوێنەوە دەرچووین.

لێکۆڵینەوەی سیستەماتیکی ڕوو لەسەر دەستی شامانەکاندا سەری هەڵدا. بەشێوەیەکی گشتی ئەمەش وەک زانیارییەکی نهێنی لەلای پسپۆڕی دەگمەنەوە بەجێ ماوە. بۆ نموونە سیستەمی چینی پرۆسەیەکی ڕاهێنانی بەروەستاییی هەیە کە هەندێک جار ٤٠ ساڵ دەخایەنێ. لەبەرئەوە شێوازە سیستەماتیکییەکانی خوێندنەوەی ڕوو بەئاسانی دەست ناکەون.

لە ڕۆژئاوا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەمە دەستی بەگۆڕان کرد. پیاوێک بەناوی "لاڤاتیر" بەگەرموگوڕییەوە دەستی کرد بەلێکۆڵینەوە و کێشانی شێوەکانی ڕوو و بەمەش ڕێچکەیەکی نائاسایی هەوڵدان بۆ بەگشتیکردنی خوێندنەوەی ڕووی دەست پێ کرد. بەڵام بەپێی مێژوو ئێمەی مرۆڤ بەڕاستی بەگومانین "واتە یەجگار ڕەخنەگرین". هەر لەبەر ئەم هۆیەش دەقە نووسراوەکانی خوێندنەوەی ڕوو لە ڕادەبەدەر ناپەسندن. جارێک ئەم ڕستەیەم خوێندەوە: "خاوەن لووتێکی قوپاو یەک هەنگاو لە سروشتی گیانەوەری و دڕندایەتی بەدوورە." باشە کێ خاوەنی لووتی قووپاوە؟ بەلای دەسپێکەرانەوە، زۆربەی منداڵان.

جێی سەرسڕمان نییە کە تەنیا دڵسۆزترین قوتابییانی خوێندنەوەی ڕوو، هەوڵی چاو پێدا گێڕانی تەواوی دەقە نووسراوەکانی تایبەت بەم بوارە دەدەن کە ٦٠ ناوونیشان لەپاش "لاڤاتیر"ەوە لە خۆ دەگرێ کە من خۆم دۆزیمنەوە. کاتێک بۆ یەکەم کتێبم لەبارەی واتای ئەندامەکانی ڕوو سەرقاڵی چاوپێدا گێڕانی ئەم دەقانە بووم چاوم کەوت بەگەوهەرێکی بچکۆلانە، کتێبێک بەناوی "I Can Read Your Face – دەتوانم ڕووت بخوێنمەوە". ئەوە یەکەم کتێبی ڕۆژ ڕۆژتری بوو لەم بوارەدا کە لە هیچ کام لەو شتانەی پێشتر بینیومن نەدەچوو. یەکەم کتێبی خوێندنەوەی ڕوو بوو کە لە ناخ و لە ڕاستییە تەواوەکەی بابەتەکەوە

هەڵقوولا بوو. ئێستە، پاش نۆ ساڵ، ڕۆز ئەو کتێبەی نووسیوە کە من بەکتێبێکی تری ڕێچکەشکێنی دادەنێم کە خوێندنەوەی ڕوو لەسەر حاڵەتی ژیانی ڕۆژانە پیادە دەکا و زۆر نموونەی لەسەر ڕووداو و خەڵکی تێدایە بۆ بەرجەستەکردنی ئەو شتەی باسیان دەکا. ڕۆز بووەتە هۆی ئەوەی خوێندنەوەی ڕوو دەرک بکرێ، فێربوونی ئاسان بێ و لەبەر بکرێ.

شێوازی دوانی ڕۆز خۆش و بەتین و پەرۆش و لە ناخەوە هەڵقولاوە "هەروەک شێوەی ژیانی خۆی، ئەمەش بەهەڵسەنگاندنی بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆی و شارەزاییی منە لەو". ئێوە، لە ژێر ڕووکەشەکەدا، دەگەنە قووڵاییەکی تێگەیشتن لە خەڵک و واتای ئەو ڕووانەی لە دەقە نووسراوەکاندا ئاماژەیان پێ نەدراوە.

بەتێگەیشتن لەوەی کە هەر لایەنێکی کەسایەتیی مرۆڤ کۆمەڵێک بەهرە و کۆمەڵێک کاردانەوە هەڵدەگرێ، ڕۆز دەس بەکار دەبێ. پاشان بەردەوام دەبێ تا پێشانمان بدا چۆن زۆر قووڵتر لە هەر کەسێکی دیتە ڕێمان، تێ بگەین. ڕێبازە گشتییەکەی ڕۆز وا دادەنێ ئێمە لەم کارەدا هەمووومان بەیەکەوەین و پێویستە خۆمان و ئەوانی ترمان خۆش بوێ تا کارەکە ئەنجامی لێ بکەوێتەوە. لە ڕاستیدا ڕۆز گۆڕانێکی ڕۆحیی گەورە کەوا ئێستە لە ئارادایە، هەڵدەبژێرێ و دەیگوازێتەوە. هەموو بەرەنجامەکەی ئەوەیە ئەگەر بەپێی ئەو هەستەی لە دڵمانەوە سەرچاوە دەگرێ، نەجووڵێینەوە ئەوا ئێمەی مرۆڤ ناتوانین چێژ لە مرۆڤبوونی خۆیان وەربگرین. لەو بڕوایەدام گۆڕانێکی گەورە لەسەر لێواری ڕوودانە و ڕۆزیش بەشێکە لەو گۆڕانە، بەوی فێرمان دەکا گۆڕانەکە بۆ پێوەندی لەگەڵ خۆمان و لەگەڵ کۆمەڵگە و لەگەڵ ڕەگەزی مرۆڤدا کارا بکەین. زانیاری بەخشینە دڵڕفێنەکەی ڕۆز دەبێتە هاوڕێی ڕۆحتان. ئەم کتێبە بۆ خوێندنەوە بابەتێکی سوودبەخشە و پەردەلادانێکە گۆڕانی لێ دەکەوێتەوە. لە دڵەوە هانتان دەدەم لەگەڵ ڕۆز ڕۆزتری هاوڕێ بن لەم ڕووداوە شۆڕشگێڕانە مەزنەدا.

دکتۆر نارایان سینگ کالسا

بۆڵدر، کۆلۆرادۆ – تشرینی دووەمی ١٩٩٧

١

# هێز، کەس خوازیاریەتی؟

ڕەنگە وەک تۆ گرینگیدانم بەخوێندنەوەی ڕوو هەروەک ئارەزووییەک بۆ وەدەستهێنانی هێز دەستی پێ نەکردبێ. ئەوە دواتر هات.

ئۆه، گاڵتە دەکەم. بەڵام ڕاستە کە خوێندنەوەی ڕوو مرۆڤ بەهێزتر دەکا، زانیاری هێزە و، لەبەرئەوەی زۆربەی خەڵک هیچ زانیارییەکیان لەبارەی ئەو زانستە وردەوە نییە کە لە ڕووەوە سەرچاوەی گرتووە، ڕەنگە لەوان بەپێش بکەوی بەمەرجێک بتوانی سەیر بکەی و فێر ببی لەجیاتی ئەوەی شتەکان پشتگوێ بخەی.

ئەوە ئاماژەیەکە بۆ ئەو بابەتەی دواتر دەکەوێتە بەرچاوت: خوێندنەوەی ڕوو بەواتای سەیرکردنی ڕوو نییە هەروەک چۆن بەپێ بۆچوونی زۆربەی خەڵک، ڕوو بنچینەییترین وێنەی ناخ و دەروونە. لێرەدا با تەنیا ئەوەندە بڵێین جیاوازییەک لە نێوان خوێندنەوەی دەربڕین و خوێندنەوەی ڕوودا هەیە، لە بەشی داهاتوو ئێمە تەواوتر لە بابەتەکە دەکۆڵینەوە.

ئاخۆ ڕووخوێندنەوەت پێ سەیرە؟ خوێندنەوەی ڕوو، هەزاران ساڵە بەکار هاتووە. ناوە ڕەسمییەکەی فیزیۆگنۆمی "Physignomy"یە، واتە لێکدانەوەی واتای ڕوو بۆ ناسینەوەی دەروونی مرۆڤ.

کاتێک تۆ ڕوو دەخوێنییەوە، سوودێکی لاوەکی وەردەگرێ لەبەرئەوەی شتی نوێی ئەوتۆ لەبارەی ڕووی خۆت دەدۆزییەوە کە لەمەوبەر هەرگیز تێبینیت نەکردووە هەروەک جێکەوتی گوێ و پلەی سەر لێو.

لە وەتەی ساڵی ١٩٨٦ەوە من ڕووی هەزاران کەسی وەک تۆم خوێندووەتەوە و زۆربەیان زانیاریی سەرسوڕهێنیان لەبارەی ڕووی خۆیان بۆ دەرکەوتووە. چۆن وا دەبێ؟ پێشتر

ئەوان گـرینگیـیـەکـی زۆریان بەڕوو نەدابوو. بـۆچی دەبوو گـرینگیـی پـێ بدەن؟ خـۆ زۆربەی بەشـەکانی ڕوو بێ واتا بـوون. بەڵام ئێسـتـا ئەو بەشـانە هەڵگری واتـان. بۆیە ئامـۆژگـاریت دەکەم، کـاتێـک ئەم کـتـێبـە دەخـوێنییـەوە نەینۆکـێک لە تەنیـشت خـۆت دابنێی. دۆزینەوەی زانیـاری سـەبارەت بەڕووت بەشـێکە لە چێژ و خۆشی خـوێندنەوەی ڕوو. لەگەڵ ئەوەشـدا تۆ زێتـر لەو ڕادەیەش فـێـر دەبێ. ئەم ڕابـەرە چۆنیـەتی و هـۆ و هـەمـوو شـتـێکی خـوێندنەوەی ڕووت فێر دەکا جگە لە کاتی پراکتیزەکردنی "ئەم بەشەی دەبێ بۆ خۆت بیزانی".

زانسـتی خوێندنـەوەی ڕوو هێزە. لە لاپەڕەکانی دواتردا ئێمە جەخت لەسـەر سـێ ڕێگەی کارەکی دەکەینەوە کە بەهـۆیانەوە خوێندنەوەی ڕوو بەرەو بە هێزی کەسیی تۆ دەدا.

### ١- فرۆشیاری

پەرەدان بەشـارەزاییی کـاراتر لە فـرۆشـیـاری نەک تـەنیـا پسـپـۆڕانی فـرۆشـیـاری کـە دەیانەوێ پـارەی زیاتر کـۆ بکەنەوە دێنێـتـە جـۆش و خـرۆش، بگرە زۆرێک لە قـوتابیـانم لە بواری خـوێندنـەوەی ڕوودا، دڵـخـۆش دەکـا. هەر هەمـوومـان خـۆمـان لە بارودۆخـی ئەوتۆدا دەدۆزینەوە کـە تێیـدا ناچارین خـۆمـان بەدەر بـخـەین و لەگـەڵ ئەوانی تردا وتووێژ بکەین. زۆربەمـان خـوازیارین ئەم کارە باشـتـر ئەنجـام بدەین. بۆ نموونە "میـکی کـانتـۆر"، نوێنەری پێشووی بازرگـانیی ئەمریکا، لە ناو بەشی بڕواپێهێناندا کـەسێکی تەمەڵ و تەوەزەل نەبوو، کـەچی گـوایە ئەو لە هەڵسـوکەوتکردن لەگـەڵ کچـە دە سـاڵانەکەیدا چۆکی داوە و گلەییی کردووە: "ناچارم ڕۆژانە لەگەڵی بکەومە گفتوگۆ و زۆربەی جار دەدۆڕێم".

لەوانەیە پـێویست نـەکا تۆ بڕوا بەخـۆبوونی منداڵێکی زۆرزان یان حکوومـەتێکی بێگانە سـسـت بکەی، لەگـەڵ ئەوەشـدا شـارەزاییی باشـتـر بۆ پێـوەندیکردن ڕەنگە هێـشـتـاش لە داهـاتوویەکی نادیاردا بـەکەڵکت بـێ. لە چاوپێکەوتنێکی دامـەزراندندا – جـا بۆ هـەر کـارێک بێ – ئاخـۆ دەسـتـەبەرکردنی زانیـاریی نهێنی لەبارەی سەرکاری داهـاتووت سـوودی نابێ؟ کـاتێک دامـەزرای ئاخـۆ باشـتـر خـزمـەت بەکارهێنەکـانت ناکـەی، ئەگـەر زانیـاریی زیاترت لەســەریان هـەبێ؟ وە ئەگـەر ئەو کـۆمـپـانیـایەی تـۆ کـاری تێـدا دەکـەی بەنیـازی قـەبارە بچووککردنەوە بێ، ئاخۆ دەشێ توانای تۆ بـۆ خوێندنەوەی خـەڵک، یارمەتیت بدا بۆ لەسەر کار مانەوەت هەروەک یەکێک لە گونجاوترین کەسەکان؟

وتەی مــەبەست لە زنجـیـرە کـارتۆنێکی وێنەییی دوورودرێژی کـەم نرخ ئەمــە بوو: "من مـرۆڤایەتیم خـۆش دەوێ، بەڵام تەنیـا مرۆڤـەکانن کـە بەرگـەیان ناگرم". خـوێندنەوەی ڕوو بۆ

هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵک یارمەتیت دەدا، تۆ بەجیا شارەزای کەسێک دەبی، بەجیا زانیاری لەسەر کوڵمێک کۆ دەکەیەوە و بەجیا فێری جۆرە فرۆشیارییەک دەبی.

دان پێدانانی کەسی لێرەدا: کۆمەڵێک خەڵک لەگەڵ بیستنی بیرۆکەی چۆنیەتی کارتێکردنی زیرەکاتی لەسەر ڕەونەقی فرۆشتن، چاویان زەق دەبێتەوە. ئەوانی تر "بە لەخۆگرتنی منیش" ڕەنگە زیاتر ڕوویان گرژ بکەنەوە:"چی، بیرتیژییەکانی خۆم بۆ فێڵکردن لە خەڵک بەکار بێنم؟ خوا نەکات". لەگەڵ ئەوەشدا سەرکەوتووترین فرۆشیارەکانیش پێت دەڵێن ئەوان زۆر لە کڕیارەکان ناکەن. ئەوان گفتوگۆ دەکەن. لە یەکتر دەگەن، تەنیا پاش ئەمە داوای خەملاندن دەکەن.

تەنانەت ئەگەر نەتەوێ فلسێکیش بەهۆی خوێندنەوەی ڕووەوە وەدەست بهێنی، لە مێشک و دەروونتدا سوودمەند دەبی کاتێک لەم زانستە مرۆڤییە قووڵە ورد دەبییەوە. ئێستا کامیان لە لات لە پێشترە: لایەنە مادییەکەی ژیان یان لایەنە ڕۆحییەکەی؟ لە هەردوو باردا خوێندنەوەی ڕوو دەوڵەمەندت دەکا.

## ٢- پێوەندییەکان

هێزی خوێندنەوەی ڕوو، خۆی لە پێوەندییەکاندا دەردەخا، بەڕادەیەکی زۆریش لەو بارانەدا کە خەڵک بەئاسایی تێیاندا هەست بەلاوازی دەکا وەک لە پێشبڕکێیە دوو کەسییەکاندا، لە کاتی دیتنی خەسووی داهاتووتدا، لە بەگومانبوونت بەرامبەر بەدراوسێیە نوێیە لچ هەڵقووڕتاوەکەی خانووی تەنیشتت کە سەگی جۆری ڕۆتوایلەری هەیە.

هەموو ئەم حاڵەتانە چ خاڵێکی هاوبەشیان هەیە؟ لەبەرئەوەی تۆ خاوەن گۆچانێکی سیحراوی نی، ئەوا بەخەڵکەوە بەستراوییەوە و خەڵکیش لە تۆ دانەبڕاون. چۆن هەردوو لایەنتان باشترین سوود لەوە وەردەگرن؟ ئەگەر تۆ بێ هێز بی ناچاری خۆزگە بخوازی ئەم بێگانانە لەگەڵت نەرمونیان بن، ئاواتەخواز دەبی ئەوان ناخی تۆ ببینن "کە هەڵبەتە شکۆمەندە". تۆ خۆزگە دەخوازی. بزە دەکەی و لە مێشکتدا بۆ بەختەوەری دەستت بۆ پاڕانەوە بەرز دەکەیەوە.

بەڵام خۆ مێشکت دەستی نییە. ئەمە کتوپڕ ئاشکراترین هۆیە بۆچی ئەم جۆرە هەڵوێستە هەرگیز وا لە مرۆڤ ناکا هەست بەوە بکا، بەهێزە یان ناتوانێ توانابەخش بێ بۆی. زانیاری هێزە. ئەگەر بەڕادەی پێویست ژیر بی، ئەوا خۆزگە دەخوازی بتوانی باشترین ئاکاری هەموو ئەو بێگانانە ببینی کە دێنە ناو ژیانت و، مەبەستیشم ئەوە نییە

دروشمێکی بەخرۆشی وەک ئەمەیان بێنمەوە یادت: "ئەو کەسە کەسێکی خواییە، کەواتە تا ئەو ئاستەی بتوانم ئەوانی تر پشتگوێ بخەم ئێمە دەتوانین بەخۆشی بەیەکەوە هەڵبکەین".

هەروەها دیتنی باشترین ئاکار لە کەسێکدا، واتای ئەوە نییە ناوونیشانێکی خێرای پێوە بلکێنرێ. کۆمەڵە خەڵکێک پێی وایە خوێندنەوەی ڕوو ئەوەیە کە تۆ لە٣٠ چرکەدا بڕیار بدەی ئاخۆ کەسێک "باش"ە یان "خراپ"ە. حە، دە واز بێنن. ئێمە ئاڵۆزین. ئەگەر حەز دەکەی سەبارەت بەکێشەکان و بابەتی نایاب زانیاریت هەبێ، نیگەران مەبە، کاتێک ڕوو دەخوێنییەوە تووشی ئەم شتانە دەبێ.

خوێندنەوەی ڕوو، شتی کارەکیت پێشان دەدا وەک ئەوەی چۆن کەسێک بڕیار دەدا، پارە خەرج دەکا، بەکاریگەرترین شێوە کار دەکا و وردەکارییەکان جێبەجێ دەکا، کێ خاوەن هەستێکی گاڵتەجاڕیی منداڵانەیە؟ کێ پێ ناکەنێ مەگەر گاڵتەکە بێ تام بێ؟ کێ شوێنکەوتوویەکی تۆخی بیروباوەڕەکانی خۆیەتی؟ کێ زمانی جەستە بەکار دێنێ بۆ ئەوەی پێچەوانە کتومتەکەی ئەو شتە بنوێنێ کە لە ڕاستیدا هەستی پێ دەکا؟

ڕەنگە ڕێک ئێستا دەبێ بڵێم کە توانای تۆ بۆ بەکارهێنانی سیستەمی خوێندنەوەی ڕوو پێوەستی بەوردبوونەوە لە ڕووی خەڵک نییە. پێویست ناکا ڕووی خەڵکت بەبیر بمێنێتەوە یان بەپێچەوانەوە لە سەرنجدان ورد بی «من وا نیم». بۆ خوێندنەوەی نهێنییەکان تاکە شتی پێویست زانینخوازییە، لەگەڵ خۆویستییەک بۆ سەیرکردنی بەشەکانی ڕووی خەڵک کاتێک ڕێک لە بەردەمت ڕاوەستاون. کارەکە ئاسانە. خۆ زانیاریت هەیە لەسەر چۆنیەتیی ئەنجامدانی شتەکان لەسەر بنەمایەکی لە بارێکەوە بۆ بارێکی دی؟ کەواتە تۆ ئاستە نوێیەکەی زانیاریی خۆت لەسەر بنەمایەکی لە ڕوویەکەوە بۆ ڕوویەکی تر وەردەگری.

ئەو بەشانەی ڕوو کە تۆ لێیان دەکۆڵییەوە، یەکجار جیاوازن و، ئەو نهێنییانەش کە ئەم بەشانە بۆتی دەدرکێنن زۆر جیاوازن لەو نموونانەی کە ڕەنگە پێشبینییان بکەی. لە ڕاستیدا خوێندنەوەی ڕوو گەرەنتی کراوە بۆ وردوخاشکردنی هەموو ئەو شێوازانەی ڕێگر بن لەوەی تۆ خەڵک وەک تاک ببینی. ئەمە بەشێکە لەو شتەی کە هێزی زیاترت لە پێوەندییەکانت پێ دەبەخشێ.

بەشێکی تری بەهێزکردنی پێوەندی لەوەوە دێتە دی کە خوێندنەوەی ڕوو ڕێگەت پێ دەدا بەسەر ڕووتینەکان باز بدەی. ئاخۆ لەو کەسە بێزاری کە ڕۆژانە چاوت پێی دەکەوێ؟ با خوێندنەوەی ڕوو یارمەتیت بدا بۆ پەسندکردنی ئەو کەسە لە بارودۆخێکی تەواو جیاوازدا.

ئەی بۆچی بۆ زاڵبوون بەسەر هیلاکی لە ڕێگەی خوێندنەوەی ڕوو، سوود لە دەسەڵاتی خۆت وەرناگری؟ ئاخۆ چاوت بەخەڵکێکی زۆر کەوتووە کە خەریکە ڕوویان لەگەڵ یەک تێکەڵوپێکەڵ دەبێ؟ بەدڵنیاییەوە پشوویەک بەسوودە. بەڵام هەرزانترین و باشترین پشوو، ڕەنگە بەسەربردنی چەند سەعاتێک بێ لەگەڵ ئەم کتێبە. بەهۆی ڕێگە دیاریکراوەکانی تێڕامان لە خەڵک، بۆ خۆت پشوویەکی نایاب بدە.

## ٣- ڕێز لەخۆنان

ئەوە نهێنییە بچووکە ناپەسندەکەی وانەکانی منە لەسەر خوێندنەوەی ڕوو. ئێمە باش ڕێز لە ڕووی خۆمان ناگرین و پێشبینیی بێ ڕێزیش دەکەین. هیچ کام لە بەهەزاران پێوندیکارەکانم نەهاتووە بۆ لام بپاڕێتەوە: "یارمەتیم بدە، لە ڕووی خۆم بێزار بوومە، کاتێک ڕووی خۆم لە ناو نەینۆکدا دەبینم جوانییەکەی چی تر نامهەژێنێتەوە، چی ڕووی داوە". خۆ ئێوە دەزانن کارهێنەکانی من هەراشن. بەپێچەوانەوە کوڕە سێ ساڵانەکەم ئەوەندە حەز لە ڕووی خۆی دەکا کە پەڵە ماچی کەم دەخاتە سەر نەینۆکەکە. دواجار کە من یان تۆ ئاوامان کردبێ کەی بووە؟

دڵگەرمبوونت بەڕووی خۆت نابێ لەگەڵ لەخۆباییبووندا تێکەڵ بکرێ کە برێتییە لە زۆر فیزلێدانی کەسێک بەهۆی ڕووی. نەخێر، ئێمە باسی ڕێز لەخۆنان دەکەین. مافی خۆمانە بەتەواوی حەز لەو شتە بکەین کە دەیبینین، بەڵام ئێستا کە تۆ ئیتر سێ ساڵان نی، زۆرێک لەو شتانەی لە ژیاندا دەیانبینی یان لە نەینۆکدا یان لە هەر شوێنێکی تردا توێ پاش توێ بەلێکدانەوە داپۆشراون. هێماکان، بیرەوەرییەکان، ترسەکان و خووەکانی ڕەخنەگری هەموویان ئەو وێنەیەی ناو نەینۆک دەشێوێنن. ئەوەی شتێکی لەم لێکدانەوانە کەمتر نەبێ ئەوەیە تۆ چۆن بۆچوونی خۆت لەبارەی ڕووت دەلکێنی بەبۆچوونت لەبارەی پاشماوەکەی تری خۆت. ڕووی خراپ یەکسانە بەکەسێکی خراپ و، بەداخەوە بەنزیکەیی کەس ئەوەندە حەز لە ڕووی خۆی ناکا. کۆمەڵگەی ئەمەریکی لە میلینیۆمی یەکەمدا شایەتمانی ئەوە بووە.

ڕۆژانە وێنە بێ شومارەکانی ئەو ناودار و مۆدیلانەمان بەسەردا دەبارێنن کە بەمیکیاژەوە جوان کراون، ڕەنگە نەشتەرگەریی جوانکارییان بۆ کرابێ، بێگومان پرچیان بەمۆدیلی شاز ڕازاوەتەوە. پاشان وێنەگران ڕووناکییە هەڵخەڵەتێنەرەکانیان لە دەوریان داناوە و پاش ئەمە "دوا ڕیسوایی بۆ خەڵکی بەدەر لە ئێمە" ئەم خەڵکە بەدەسکرد جوانانە

ڕەنگشۆر کراون. ئەوان تەنانەت هاوشێوەی وێنەکانیشیان جوان نین.

ئەوە هەموو ورەبەزاندنێکی پڕ هێزە. وە ئێمەش ئەو ورەبەردانە ئەوەندە بەقوولییەوە وەردەگرین هەروەک ئەوەی شتەکە ڕەوا و براوە بێ.

تەنانەت ئەگەر تۆ یەکسەر نەیەی و دان بەوە نەنێی کە چی تر حەز لە ڕووی خۆت ناکەی خوێندنەوەی ڕوو هەر یارمەتیت دەدا بۆ ڕێز لەخۆنان. چۆن وا دەبێ؟ تۆ لەوە تێ دەگەی کە هەر وردە زانیارییەکی ڕووت وەک گۆشەی لێوت و خڕی کولمت، واتایەکی سەرسوڕهێنی لە ناو خۆیدا حەشار داوە. نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو پابەندی ئەم گریمانەیەن: "خوا شتی بێ واتا ناخوڵقێنێ". بزانە چۆن ئەمە لەسەر ڕووی خۆت و هی خۆشەویستەکانت و هی ئەو کەسانەی کە بەبڕوای خۆت ڕەنگە بکەونە بەردڵت جێبەجێ دەبێ. لەهەر بەشێکی ئەم کتێبەدا پێشانت دەدەم بەدوای چیدا بگەڕێی و واتایەکەی ڕوون دەکەمەوە.

هێز، کەس خوازیاریەتێ؟ ئاخۆ بەهێز نابی ئەگەر ڕووخوێنەوە بێ؟ ئاخۆ توانای ئەوەت نابێ بۆ مەبەستی چاکە بەکاری بێنێ؟ کەواتە وەرە ناو پۆلە کاریگەرەکەی من کە تێیدا کۆمەڵە خەڵکێکی وەک تۆ "بەڵام ژمارەیەکی کەمیان ڕەنگە تۆزیک سەیرتر بن" کۆبوونەتەوە. ئەوەش وەک هەوڵی منە بۆ وەرگێڕانی ئەم پەڕتووکە ڕێنوێنیکەرە بۆ وانەیەکی نموونەیی ڕووخوێندنەوە. قوتابیانی هاوڕێت ئەو پرسیارانە دەکەن کە ڕەنگە ئێستا لە ناو مێشکی تۆدا هەڵبەز و دابەزیان بێ.

پرسیار: خوێندنەوەی ڕوو تا چ ڕادەیەک وردە؟

وەڵام: لە وەتەی من دەستم داوەتە وتنەوەی نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو، بەهەزاران ڕووم خوێندووەتەوە. لە کۆتاییی هەر خوێندنەوەیەکدا داوای ڕوونکردنەوە دەکەم سەبارەت بەوردبوونم. ٩٩٪ سەدی وەڵامەکان ئەرێنی بوون و، ئەم سیستەمەش فێربوونی ئەوەندە ئاسانە کە قوتابییەکانیشم ئاستێکی بەرزی وردبینییان هەیە.

پرسیار: ئاخۆ سووسەکردن لە ژیانی خەڵک لە ڕێی خوێندنەوەی ڕوو، ڕەوشتێکی پەسندە؟

وەڵام: وەڵامە کورتەکە بەڵێیە. بۆ وەڵامە درێژەکەش با نموونەیەک بهێنینەوە. با بڵێین تۆ بەدوای کارێکدا دەگەڕێی. ئاخۆ هەوڵ نادەی هەموو زانیارییەک لەسەر سەرکارە نوێیەکەت بدۆزییەوە؟ "بەهەمان شێوە ئەگەر تۆ کەسی دامەزرێنەر بی ئاخۆ پێویست ناکا زیاتر لە زانینخوازییەکی گوزەرا زانیاریت لەسەر داواکاری کارەکە هەبێ؟" خۆ چاوپێکەوتنەکانی

دامەزراندنیش هەموو ئەو زانیارییەی پێویستە، بۆت بەدەر ناخەن.

لە ڕاستیدا کە شانۆگەرییە. ئەوانەی لە شانۆگەرییەکەدا ڕۆڵ دەگێڕن بەڕواڵەت بابەتە ڕەسمییەکانی پێوەست بەکاروبار، بەنەزاکەتێکی دەسکردەوە تاوتوێ دەکەن. کەچی لە ژێر رووکەشدا گەڕانێکی شپرزە لە ئارادایە، هەرکەسە لە کەسایەتی دەکۆڵێتەوە، گوێ هەڵدەخا بۆناسینەوەی هێماکانی خووڕەوشت، بەسەختی تێ دەکۆشێ بۆ ئەوەی ڕاستییەکە بدۆزێتەوە. ئەوەش لەبەرئەوەیە کە لەوانەیە تۆ ڕۆژانە کاتێکی زیاتر لەوەی لەگەڵ هاوسەرتدا بی لەگەڵ ئەم هاوکارەدا ببەیە سەر. ئاخۆ بارودۆخەکە چی بەسەر دێ ئەگەر ئێوە بەیەکەوە بەند بکرێن؟

بەڕەچاوکردنی ئەوەی کە پێویستییەکی ڕەوایە تۆ ئەو زانیارییەت هەبێ چ جۆرە کاردانەوەیەکت دەبێ، ئەگەر "جۆرج"ی هاوڕێت زانیاریی نوێت لەبارەی ئەم کەسە نەناسراوە پێ بدا؟ ئاخۆ بۆ گوێگرتن لێی دوودڵ دەبی؟ کەواتە بۆچی دوودڵ دەبی لەوەی لە ڕێی ڕووخوێندنەوەی تۆ خۆت زانیاریی نوێ دەستەبەر بکەی؟

ئەم زانیارییە نهێنییە لەبارەی کەسایەتی کە پێشوەختە بۆت دابین کراوە، ڕەنگە ئەو جیاوازییەت بۆ بەدەر بخا کە لە نێوان هەڵبژاردنێکدایە کە لە ڕاستیدا هەروەک بەدەردەکەوێ مەزنە لەگەڵ هەڵبژاردنێک کە کارەساتێکی ڕێ تێچوویە. دەتوانین ئەمە بەهۆی گرافۆئەنالیسیز، واتە لێکۆڵینەوەی خووڕەوشت بەپشتبەستن بەنموونەی دەستنووس ڕوون بکەینەوە. ئاخۆ ئەوەت دەزانی کە لە٨٠٪ی ئیشوکارەکان ئەمڕۆ لە فەڕەنسا پشت دەبەستێ بەگرافۆئەنالیسیز؟ بەبۆچوونی "کارۆل مۆر"، پشکێنەرێکی شارەزای دەستنووس لە ڤێرجینیادا کە بەڵگەکەی لە دادگەدا بەکار دێ، گرافۆئەنالیسیز لە ئیسرائیل تەنانەت زیاتریش بەهەند وەرگیراوە بەڕادەیەک کە مرۆڤ بەبێ پێدانی نموونەی دەستنووس، ناتوانێ کارێک دەستەبەر بکا، یاخۆ تەنانەت باڵەخانەیەک بەکرێ بگرێ. لە هەر شوێنێک ژیان ببەیە سەر، گرینگی دەدرێ بەناسینی دەروونت. نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو دەتوانن زانیاریی هاوشێوە دابین بکەن و فێربوونیشیان ئاسانترە.

وەک یارمەتییەک بۆ باشتر بڕیاردان لەسەر دامەزراندن و بۆ خستنەڕووی کاراترین بارودۆخ لەو کارمەندانەی کە دایان مەزراندوون، من وانەم بەبەڕێوەبەرەکان وتووە. ستافی سامانی مرۆڤایەتی ئەمەیان بۆ ڕوون بووە کە بەرەنجامەکان وەک یەک وان لەگەڵ تاقیکردنەوە ئاڵۆزترەکانی کەسایەتی، بەڵام ئەوان ڕووخوێندنەوەیان زۆر لە لا ئاسانتر بوو لەبەرئەوەی تەنیا شتێک کە دەبێ بکرێ ئەوەیە سەیری داواکاری کارەکە بکرێ.

بەڕێوەبەرێک بەجوانترین شێوە ئەمەی دەربڕیوە: "ڕوو پوختە زانیارییەکی گەڕۆکە".

ڕەنگە ئەو چیرۆکەی سەرۆک "لینکۆڵن"ت بەرگوێ کەوتبێ کە باس لەو کاتە دەکا کە داوای لێ دەکرێ کەسێکی دیاریکراو لە کابینەی خۆیدا دابمەزرێنێ. ئەو کاتەی لینکۆڵن ئەمەی ڕەت کردەوە، ئەمە هۆیەکەی بوو: "حەز لە ڕووی پیاوەکە ناکەم".

ڕاوێژکارە متمانەپێکراوەکەی بەگژی داچووە: "بەڵام گوناهی پیاوە داماوەکە چییە کە ڕووی ئاوایە؟"

لینکۆڵن ئەم قسەیەی بەدڵ نەبوو، وتی: "هەر پیاوێکی تەمەن سەروو چل ساڵ بەرپرسە لە چۆنیەتیی ڕووی خۆی".

پرسیار: بیرت لەوە کردووەتەوە خوێندنەوەی ڕووی کەسێک هەر لە بنەڕەتدا هەڵە بێ؟

وەڵام: بەڵێ. ڕووی کەسێکی خوار تەمەن هەژدە ساڵ مەخوێنەوە. منداڵ کاتی تەواوی لە بەردەست نییە بۆ ئەوی شێوە بدا بەڕووی خۆی. دایک و باوک دەزانن ڕووی منداڵ چەند خێرا دەگۆڕێ، منداڵ ڕۆژێک زیاتر لە دایکی دەکا و ڕۆژێکی تر زیاتر بەباوکی دەچێ، ساڵێک لووتی هەڕەشەی داگیرکردنی ڕووی دەکا و ساڵی دواتر بەشەکانی تر وایان بەسەر دێ. کەواتە چاکترە بهێڵرێ ئەو ڕووە پێشبینینەکراوانە پڕ بەپێستی خۆیان پەرە بسەنن، بەر لەوەی ناوونیشانیان بدرێتە پاڵ. تۆ ڕەنگە بەهەرحاڵ ڕووی منداڵ بخوێنییەوە «من و هاوسەرم لە ڕۆژی لەدایکبوونی کوڕەکەمانەوە دەستمان کرد بەخوێندنەوە» بەڵام ئاگەدار بە نەوەک، بەهۆی درکاندنی خوێندنەوەی ڕوویان، سەر لە خەڵکی گەنجی هەستیار بشێوێنێ.

پرسیار: ئەی ئەگەر کەسەکە بۆ خۆی لە خوار تەمەن ١٨ ساڵ بێ؟ نابێ ڕوو بخوێنێتەوە؟

وەڵام: گاڵتە دەکەی؟ تۆ هەرگیز ناتوانی خوێندنەوەی ڕوو زۆر زوو دەست پێ بکەی. ئەو کاتەی گەیشتبییە تەمەنی دەنگدان دەتوانی ببی بەپسپۆڕێکی خوێندنەوەی ڕوو کە ئەم پسپۆڕییە لە ناو شتەکانی تردا بۆ پاڵپشتی لە دەنگدان دەبێ. تۆ تەنیا تۆزقاڵ تۆزقاڵ هەر شتێکی لە ڕووتدا دەبینی تا دەگەیە تەمەنی ١٨ ساڵی تێبینی بکە. ڕووی هاوڕێیەکانیشت مەخوێنەوە. لەجیاتی ئەوە چاو ببڕە سەر هەراشەکان بەڕادەیەکی زۆریش مامۆستا و کەسانی بەدەسەڵاتی دی. بەڕەچاوکردنی ئەوەی ئەوان تا چ ڕادەیەک بەسەر تۆدا زاڵن مافی خۆتە ئەم ڕێگەیەی بەهێزکردنی خۆت، واتە زانینی نهێنییەکانی ئەوان، بگرییە بەر.

پرسـیـار: ئاخـۆ دەتـوانم بەهـەمـان شـێـوەی بەکـارهـێنانی کـارتەکـانی تارۆ، سـوود لە خوێندنەوەی ڕوو وەربگرم؟

وەڵام: لەوباوەڕەدا نیم هەرگیز بەم زووانە دەستەکارتێک بۆ بەشەکانی ڕوو بخەمە بازاڕ. تەنانەت ئەگەر ئەو پشکەی لە ژیاندا بەرئێمە کەوتووە، بەتێپەڕینی کات بگۆڕێ گۆڕانەکە ئەوەندە خێرا نابێ کە دەرفەتی جێگۆرکێکردن بەدەستەکارتێکت پێ بدا.

ئەوەی ڕاستـی بێ ئەو شتـەی تۆ باسـی دەکەی فـاڵگرتنەوەیە. خوێندنەوەی ڕوو یارمـەتیت دەدا داهاتوویەکی پرشنگدارتر بۆ خۆت بخوڵقێنی، بەڵام نەک لە ڕێی مـەزنـدەکردنییـەوە. لەجـیـاتی ئەوە خـوێندنـەوەی ڕوو دەتوانێ یارمـەتیت بدا، مـەزنتـرین بەهرەکـانی خـۆت بناسـیـیـەوە و گـوڕوتینت پێ دەبەخـشێ تـا بەهۆی بەهرەکـانتـەوە پێش بکەوی. ئەمـەش ڕێگەیەکی بەهێزە بۆ هەنگاونان بەرەو چارەنووسی خۆت.

ئەو کـەسـانەش کە بـەقسـەی فـاڵچی دڵیـان لەخـۆ نابێتـەوە، خـوێندنـەوەی ڕوویان لە لا پەسندە. بیـر لە "ئێدی دین" دەکـەمـەوە، هەواڵنێرێکی ڕۆژنامـەی"سـیـتی پێیپـر"ی تایبـەت بەمۆدەی نوێ لە شاری واشنتۆن دی سی. تەنیا بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکم سەبارەت بە لە باس بەدەریی ناوبراو پێت دابێ ئەوە دەڵێم کـە ئەو ئەم ناونیـشـانەی بۆ چاوپێکەوتنەکـەمـان دانابوو: "A Visit to the Releam of Dorian Gray and Mr.Potatohead – سـەردانێک بۆ جیهانی دۆرین گرێی و بەڕێز پتێیتۆهێد". لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خوێندنەوەکانمی بۆ خەڵکی نـاسـراوی لۆکـاڵی بەدڵ بوو و کـاتێک نۆرەی خـوێندنـەوەی ڕووی ئەوم هات، ئەو خـوێندنەوەکـەی بە "شـیکردنەوەیەکی پڕ بەپێـستی خـۆی" وەسف کـرد و گـەیشـتـە ئەم ئەنجامـە:" ئا لێرەدا من نەک تەنیا هەست بەوە دەکەم شوێنداگیرکردنم لەسەر ڕووی زەوی شتێکی بەجێیە بەڵکو ئەمە بەمافی خۆمیش دەزانم. خوێندنەوەی ڕوو تێگەیشتنێکی سەیرە بۆ خـۆناسینت، ڕێگەیەکی باشـترە لە گروگاڵکردن بۆ دەروونناسێکی دەسگران". بێگومان ئێدییش خوێندنەوەی ڕووی پێ باشتربووە لە تارۆخوێندنەوە.

پرسـیار: ئەی ئەگەر هاتو دوای ئەوەی فێری خـوێندنەوەی ڕوو بووم خـۆم بۆ ڕانەگیرا؟ ئاخـۆ خـوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ بمگۆڕێ، بۆ کـەسێکی نامـۆ واتە بارێک کە سـەر لە خـۆم و خەڵکی تریش بشێوێنم؟

وەڵام: بڕوانە، کە دەتەوێ فـێـری خـوێندنەوەی ڕوو بی، خـۆ مـەبەسـتت چوونە سـەر مـانگ نییـە. نابێ هەرجارە و کـە جـووتە گـوێیـەکت دی، بەفراوانخـوازیـیـەوە برۆیە ناو قـووڵاییی

بابەتەکەوە. خوێندنەوەی ڕوو شارەزاییەکە و بەئارەزووی خۆت دەتوانی کاری پێ بکەی یان لە کاری بخەی.

پرسیار: بەڵام چۆن بزانم کەی دەبێ بەکاری بێنم؟

وەڵام: وا دابنێ خوێندنەوەی ڕوو وەک تەلەڤزیۆنێک وایە. ئەو کاتەی بتەوێ زیاتر لە خەڵک تێ بگەی، چرق، دەتوانی دای گیرسێنی. کاتێک شتێکی تر، با بڵێین سێکس، زیاتر سەرنجت ڕادەکێشێ، مێشکی تۆ بەئاراستەی پێچەوانە سەرقاڵ دەبێ. بۆیە ئەو بەشەی تۆ کە بەرپرسە لە خوێندنەوەی ڕوو لەخۆوە دەکوژێتەوە.

پرسیار: ئەگەر خوێندنەوەی ڕوو خەڵک شێت نەکا، ئەو پرسیارەم بۆ دروست بووە ئەی خوێندنەوەی ڕوو چ کاریگەرییەکی هەیە؟ ئاخۆ کەس پێتی نەوتووە ئەو کارەی تۆ بەترسە؟

وەڵام: ژمارەیەک لەو کەسانەی ڕوویانم خوێندووەتەوە سەرەتا خوێندنەوەی ڕوویان بەترسناک دەزانی. ئەوان چاوەڕێیان نەدەکرد ڕوو خوێندنەوەی ئەوەندە ورد بێ. بەڵام لەبەرئەوەی من لە دڵەوە ئەم کارە دەکەم، خەڵکەکە هەست بەجۆش و خرۆش دەکەن. جارێکیان داوام لێ کرا لە میوانداریيەک ڕوو بخوێنمەوە، بەڵام خەڵکەکە ئەوەندە بەپەرۆش بوو کە ماوەی کارکردنمیان بۆ ١١ سەعات درێژ کردەوە. بەگشتی، ڕوو خوێندنەوەی هانی خەڵک دەدا تا تۆیان زیاتر خۆش بوێ. مسۆگەریش نییە، بەڵام ڕەنگە وا بێ. ئەگەر تۆ تەنانەت وشەیەکیش لەو شتەی کە بەهۆی ڕووخوێندنەوەوە هەستی پێ دەکەی نەدرکێنی، بەڵام نیازت وا بێ بەقووڵییەکی زیاتر لەگەڵ خەڵک بگونجێی، ئەوە ئاستی پێوەندییەکەت دەگۆڕێ.

نیازی تۆ بۆ گەیشتن بەشارەزاییەکی قووڵتر، لەخۆوە کەسی بەرامبەرت هان دەدا تا هەمان هەڵوێستی بەرامبەر بەتۆ هەبێ. ئاخۆ هەست بەجیاوازی ناکەی لە نێوان ئەو کاتەی کە خەڵک بەپیرتەوە دێن لەگەڵ ئەو کاتەی کە بەناو زنجیرە گفتوگۆیەکدا ڕادەبوورن و خەیاڵشکاو و بێ مەیل دەبن یاخۆ بەبێ دەنگی هەڵت دەسەنگێنن؟ ئاخۆ بەشێوەیەکی جیاواز کاردانەوەت نابێ ئەگەر بێو کەسێک خۆشەویستییەکی ڕاستەقینەی هەروەک ئەوەیان کە بۆ مرۆڤێکی هەبێ، بەرامبەر بەتۆ بنوێنێ؟

پرسیار: ئاخۆ بەڕاستی مەبەستت ئەوەیە تۆ دەتوانی برۆیە لای نەناسێک و ڕوونکردنەوە لەسەر لووتی ئەو بدەی و ئەویش هەتاهەتایە تۆی خۆش بوێ؟

وەڵام: خووڕەوشت و هەروەها هەڵسوکەوتی جوان پابەندت دەکەن تەنیا ئەو کاتەی

خـەڵک داوات لێ بکا، ئەنجـامی خـوێندنەوەی ڕوو بـدرکـێنێ. وە هـەروەها ئـەوان تەنیـا ئەو کاتە ئەم داوایە دەکەن کە خۆیان حەز بەبیستنی قسـەکانت بکەن. هەڵبەتە، ئەوە واتای ئەو نییە مەرجە ئەوان باوەڕمەندی ڕاستەقینە بن. هەندێک جار خەڵک تاقیت دەکەنەوە.

بەم دوایانە لەلایەن کـۆمـپـانیـایەکی فـەرمـانبـەرانەوە داوام لێ کـرا ڕووی ئەندامـانی ئەنجـوومـەنی بەڕێوەبەرانی دەزگـاکان کە ئەرکی بـەڕێوەبردنی کۆمـپانیایەکـانی دادیان لە ئەستۆ بوو، بخوێنمەوە. هاوڕێیەک کە لە سەنتەری ئەنجوومەنی واشنتۆن دی سی سەردانی دووکانۆچکەکەمـانی کردبوو دەنگێکی زل و بێزارکەر و هەڵسوکەوتێکی بێزارکەریش هەبوو. بەڵام بەهەرحاڵ من کـارەکەم کرد. باسی ئەو بەهرە و بەرپەرچدانەوانەم بۆ کرد کە لە ڕووی ئەودا نیـشـان دەدران. ئەو پاش پێـنج سەعـات گەڕایەوە. بەهـێواشـی وتـی: "هـەر دەبێ ئەمـەت پێ بڵێم. تا ئەمڕۆ هـەر ڕقم لە لووتم دەبووەوە. ئەوەی تۆ وتـت جیـاوازییـەکی گـەورەتر لەوەی بەخەیاڵتدا دێ، لەلای من خوڵقاند".

پرسیار: ڕووشکێنترین شت کە لە پیشەی خۆتدا وەک ڕووخوێنەوە هـاتبێتە ڕێت چییە؟

وەڵام: "لە هـەڵبـژاردنەکانی سـاڵی داهـاتوودا بۆ سـەرۆکایەتیی شـارەوانی ئێـوە دەتوانن لە ڕابردووی نوێنەرەکـان بکۆڵنەوە یان دەتوانن ڕوویـیـان بخـوێننەوە"، بەم شـێـوەیە وتارێک لە کـۆواری واشـنتـۆن منـی بەخـوێنـەران ناسـاندبوو، بەڵام من هـەرگـیـز وام نەوتبـوو. ڕووخـوێندنەوەکـانم بۆ سـیـاسـەتوانان دەقـاودەق خـواسـترابوونەوە، بەڵام لەبەرئەوەی کۆوارەکە وای پێشان دابوو گوایە من تەنیا لەسەر بنەمای ڕوو، دەتوانم بۆ خەڵک سەبارەت بەدەنگدان پێشنیاز بدەم خۆشیم لێ هەڵگیرابوو.

هەمـان شـت دووبارە دەبێـتـەوە لـە دامـەزراندنی کـەسـێکدا یان زەمـاوەندکـردن لەگـەڵ کـەسـێک. ئـەی هـاوار، خـۆ من تەنیـا و تەنیـا لەسـەر بنـەمـای ڕوو تەنـانەت پێـشنیـازی ماچکردنی کەسێکیش ناکەم.

ئەوەی من پێـشنیـازی دەکـەم ئەوەیە، خـوێندنەوەی ڕوو بۆ وەدەسـتـهـێنانی زانیـاریی تر بەکار بهێنرێ. خـوێندنەوەی ڕوو گەلێک زانیـاریت پێ دەبەخشێ، بەڵام واتـای ئەوە نییـە کە وەک جێگرێک بێ بۆ شارەزاییی گشتی بگرە وەک پاشکۆیەکی ئەمە.

٢

# چۆن دەستم بەڕوو خوێندنەوە کرد؟

"تێمێسی مێیر"، دیارترین ڕووخوێنەوەی جیهان، لە بەرامبەرم ڕاوەستا. زۆر ترسام. داوای لێ کرابوو ڕووم بخوێنێتەوە، بەڵام نەک لەلای منەوە بگرە لەلای "بارسۆلۆمیۆ راچمانینۆف"ی سێیەم، پیاوێک کە دەیویست سەرنجم بۆ خۆی ڕابکێشێ.

ئەمەش ئەو ڕووداوەیە کە بەرەو ئەم خاڵە سەرەکییەی ژیانم، پاڵی پێوە نام. ساڵی ١٩٧٥ بوو. یەکەم جار بوو سەردانی یانەی"مێنسا"م کردبوو، یانەیەک کە بەهیوای دۆزینەوەی کۆمەڵە هاوڕێیەک ڕووم تێی کردبوو و لەگەڵ ڕێزمدا بۆ بەڕێز "مێیر"ی کۆچکردوو من بانگهێشتنی شتێک کرابووم کە بێزارکەرترین وانەی ژیانم بوو.

بەڕێز "مێیر" لە ژوورێکدا بوو کە ئاخێندرابوو بەخەڵکی وەک خۆم، بەزیرەک لە قەڵمدراو و تەواو بێ ئاگا لە ڕوو خوێندنەوە. دیپلۆماتکاری پێشوو کە ڕووخوێنەوەیەکی بەناوبانگی بەشێوازی چینی بوو، دوا کتێبی خۆی لەسەر خوێندنەوەی ڕوو بەرز کردەوە و وتی:"دەمەوێ هەمووتان ئەم کتێبە بکرن بۆیە هیچ شتێکتان لەبارەی ناوەڕۆکەکەیەوە پێ ناڵێم".

فرۆشیارەکان تێبینییان نووسی: "ئەمە ڕێگەیەکی زۆر کاریگەر نییە بۆ فرۆشتنی کتێب".

"مێیر" دەبووایە بۆ سەعاتی دواتر باسی شتێکی کردبایە، لەبەرئەوەی ئەو میوانی تایبەتیی ئێمە بوو. ئاپۆرەکە نەدەسرەوتەوە و ئەگەر کەسێک خۆشەویستێکی دڵڕفێنی لەوکاتەدا هەبووایە، ئەوا لەگەڵی، خۆی دەخافڵاند. بێ ئەوەی هەست بکەم لە شوێنی لەدایکبوونی پیشەی داهاتووم دام، باوێشکێکم دا.

"بارسۆلۆمیۆ ڕاچمانینۆف"ی سێیەم کە لە تەک منەوە دانیشتبوو و هەروەک خۆم

ئاواتەخوازبوو لەوشەوەدا کۆمەڵە هاوڕێیەک بدۆزێتەوە، پێ دەچوو باوێشکی منی بەدڵ بوو بێ. بۆیە تا بەشی پێشەوەی ژوورەکە لەگەڵ نزیکەی ٤٠٪ی گوێگرانی ناوهۆڵی گوێگرتن، بەدوام کەوت. ئێمەی زانینخواز و بەجێماو، چاک پرسیارمان سەبارەت بەڕوو خوێندنەوە لە بەڕێز "مێیر" گرت.

لە کۆتاییدا ئەو ڕوونکردنەوەی تایبەتی لەسەر لووت و نێوچاوان و کوڵم پێ داین. دواتر بارسۆلێومیۆ ویستی سەرنجم ڕابکێشێ. داوای لە تیمێسی مێیر کرد: "تکایە ڕووی ئەو کچە بخوێنەوە".

سەرەتا سڵم کردەوە. بەدڵنیاییەوە دەبوومە جێگەی پێکەنین «کەواتە بەڕێکەوت بووە، ئەگەر ویستبم کتێبێک لەبارەی خوێندنەوەی ڕوو بەمەبەستی ڕێز لەخۆنان بنووسم؟ ڕەنگە ئاواش نەبێ».

دوای تێڕامانێکی پسپۆڕانەی کورتخایەن "مێیر" وتی: "جوانە"

سەرم بەدەوروبەردا خولاندەوە تا بزانم مەبەستی ئەو کێیە.

پاشان وتی: "مامۆستایە".

حەپەسام. لە ماوەی چوار ساڵی ڕابردوودا زیاتر لەوانەوتنەوە لەبارەی پێشکەوتنی کەسی شتێکی ترم نەکردبوو. وانەوتنەوە ژیانم بوو. بەشەرمەوە بووبێ یان بەچاوقەیمی لە کۆتاییدا وێرام چاو ببڕمە ناو چاوی. بەداخەوە دیاربوو نیگەرانە، زۆر نیگەران.

پاش بێ دەنگییەکی پڕ نەزاکەت بەدەربڕینێکی هەڵقوڵاو لە ترسێکی زۆرەوە، لێم ڕاما: "بەڵام نابێ بڕۆت بکەی".

بەدەربڕینێکی بەهەمان ڕادە بەتین گەڕامەوە و سەیرم کرد. لە ترسا نا، بەڵام لە شەرما، وتم:" بەڵام خۆ من بڕۆم هەڵناگرم".

چاوەڕێی زانیاریی زێترم دەکرد، بەڵام بەڕێز "مێیر" متەقی لێوە نەهات.

## چۆن سیستەمی نهێنییەکانی ڕوو خوێندنەوەم پەرە پێ دا

لە ساڵ و مانگەکانی دواتردا هەموو کتێبەکانی ڕوو خوێندنەوەم بەزمانی ئینگلیزی، خوێندەوە. تا ماوەیەک لە ڕاستیدا من لە کتێبخانەی کۆنگرێسدا دەژیام. بەڵێ. باش تێ کەوتبووم. بیرکردنەوە لەوەی کە ڕوو لەوانەیە واتای هەبێ، هەستێکی ڕێبەدیکەری گەورەی لەلام خوڵقاند. ئەگەر وتەکانی مرۆڤ گرینگ بن، ئەگەر زمانی جەستەی مرۆڤ بتوانێ

توێیەکی تری واقیعی خاوەنەکەی ئاشکرا بکا، کەواتە ڕووە بەتەمەنەکەی دەبێ چی بێ؟ شتێکە وەک زەلاتەی پەتاتە تێکەڵ بەیەک کرابێ؟

بەلام لێکۆڵینەوەی من جەربەزەیەکی زۆری دەویست کە ڕەنگە جیاوازبێ لەو شەڕەهەناوەی بۆ خوێندنەوەی هەموو پەیرەوەکانی نووسراو بەزمانی ئینگلیزی بۆ دروستکردنی زەلاتەی پەتاتە، پێویستە. بۆ نموونە زانیمەوە چ شتێک برۆیەکانمی ئەوەندە ترسناک کردبوو.

سیستەمی " Siang Mien سیانگ میێن"ی دێرینی چینی کە هاوتای پزیشکیی چینی بەتەمەنە، ئەمڕۆ وەک سیستەمێکی سەرنجڕاکیش بەلام توزێک ڕەخنەهەڵگر لە بەردەستمانە. سیستەمەکە لەسەر بنەمای ئەو چەمکەی کە شتێکی وەک "باشترین دەم" و "باشترین برۆ" هەبێ، دارێژراوە. ئەگەر تۆ ئەم ئاکارە تایبەتانەت نەبێ سیانگ میێن بەئاسانی و هەندێک جار بەوردەکاریی زۆرەوە پێت دەڵێ بۆچی تۆ مرۆڤێکی دۆڕاوی.

بۆ نموونە هێمای برۆیە ناوێزەکانم بەهۆی دابەشبوونی مووەکانیەتی. بەزمانێکی تەکنیکی برۆیەکانم تاجیان زۆر گەورەیە «زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم هێمایە لە بەشی برۆ دایە کە دوای کەمێکی تر دەی خوێنییەوە». بەگوێرەی سیانگ میێن لێکدانەوەکە زۆر سانایە: "کەسێکی خاوەن ئەم جۆرە برۆیانە لە ژیاندا هەرگیز دەسکەوتێکی ئەوتۆی نابێ". کاتێک خەریکی لێکۆلینەوە لەسەر گوێ بووم هەندێک زانیاریی ترم دەست کەوت کە بەهەمان ڕادە کاریگەربوو، بۆ تاڵکردنی ڕۆژەکە لێم. سیانگ مێین فێری جێکەوتی گوێی کردم. دۆزینەوەیەکی سەرنجڕاکیش بوو. هەروەها هەواڵێکی دڵخۆشکەریشم زانی. شتێکی بەبەراورد ناسائاییم هەبوو، گوێی جێکەوتوو لە شوێنێکی بەرز. پاشان هەواڵە ناخۆشەکە بەدوایدا هات : "گەورەترین سەرکەوتنی ئەو کەسە لە سەرەتای ژیانیدا دەبێ". چ شتێک بەدەر لە کێشەی زەقی ڕەگەز ئەوەندە ئەمەی سامناک کردبوو؟ کاتێک ئەو بۆچوونەم خوێندەوە دەمێک بوو پێم نابووە ناو سییەکانی تەمەنم. گوایە «بێ ئەوەی هەستی پێ بکەم» گەیشتبوومە ئەوپەڕی سەرکەوتن.

لە سیستەمەکانی تری ڕوو خوێندنەوەش ڕامام. باسی کتێبێکم لە ژێر ناوونیشانی " You Are All Sampaku – هێمای مەرگت لێ دەبارێ" بوو، کە بۆ مەزندەکردنی جوانەمەرگی سوودی لە هێمایەکی چاو وەردەگرت. حەزم لەوە نەدەکرد. گەڕان بەدوای مەرگ لە هیوایەتەکانی من نییە. گوێبیستی پەسنە بەتینەکانی ڕوو خوێندنەوەی

مایکرۆبایۆتیک بووم. کەچی ئەو گوروتینە نەما لەبەرئەوەی بەردەوام واتای هێمایەکانی ڕووی بەشێوەیەکی وەک ئەم جۆرەیان، لێک دەداوە: "لە دەمەتەوە دیارە دایکت زۆر داودەرمانی تایبەت بەرجیمی خواردووە". ئەگەر ئەوە ڕاستیش بێ، باشە کەسەکە دەسەلاتی چییە؟

بەرەبەرە حەز و ئارەزوو، ئەوەیان لە ناخمدا چاند تا بەهۆی ئەو شتەی لە خوێندنەوەی ڕوو فێر بوومە برەو بەسیستەمێکی جیاواز بدەم، سیستەمێکی دابڕاو لە مەزندەی پەرێشانکەر، سیستەمێکی ڕێک کە بۆ خەڵک بەسوود بێ. سیستەمەکە پابەندی ئەم گریمانەیەیە: "خوا شتی بێ واتا ناخوڵقێنێ".

بەبەکارهێنانی هەستی زگماکیم کە بەهۆی چەندین ساڵ بیرکرنەوەی قووڵ دەوڵەمەند کرابوو، لە ناخمدا وێڵی واتای هێمایەکانی ڕوو بووم. ئەگەر برۆی تاجدار واتای شکستهێنان لە ژیانی نەدابایەوە ئاخۆ هەڵگری چ واتایەک بوو؟ ئەی جێکەوتی گوێ؟ کاتێک وەلامەکانم دەست کەوت ئەوانم لەسەر خۆم و دواتر لەسەر هاوڕێیەکانم و لە کۆتاییدا لەسەر پێوەندیکەرە پاداشتدەرەوەکانم تاقی کردنەوە.

ئەوان دەیانوت: "بەڵێ، زۆر ڕاستە". ئەمە بەتەنیا وەلامی بەشە دڵخۆشکەرەکان نەبوو.

## شێوازی کەسی نەک تەنیا شێوەی ژیان

پێوەندیکەرەکان زۆر جار پرسیارم لێ دەکەن، چۆن سیستەمەکەی خۆم پەرە پێ داوە. جگە لە هەستی زگماکی، وەرگرتنی پلەی بەکالۆریۆسم لە زانکۆی براندیس و هەروەها کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەکم بۆ پلەی ماستەر لە بواری کاروباری کۆمەلایەتی کەڵکیان هەبووە. لە نێوان شتەکانی تردا خوێندنی ئەکادێمی شێوەی ژیانی فێر کردم.

واتای زاراوەی "شێوەی ژیان" دەزانی، وا نییە؟ بەواتای شێوەیەکی ژیانە هەروەک هەڵبژاردنی شێوە ژیانێکی تەندروست بۆ دوورکەوتنەوە لە نەخۆشیی دڵ یان خۆڕازاندنەوە بۆ ژوانەکان بەمەبەستی بەدەرخستنی ئەو شێوە ژیانەی کە تۆ حەز دەکەی خووی پێوە بگری. لە شەستەکاندا کاتێک بۆ یەکەم جار ئەم چەمکەم ناسی شێوەی ژیان بابەتێکی چارەنووسساز"یان لانی کەم کۆمەڵناسی" بوو: پرۆفیسۆرەکانی کۆلێج لە بۆستن جۆرێک لە شێوەی ژیانیان هەبو بەبەراورد لەگەڵ شێوەی ژیانی گومرایە کۆمەلایەتییەکان. کەچی ئەمڕۆ لە باسکردنی شێوەی ژیاندا جەختەکە لەسەر هەڵبژاردنە. ئەگەر شێوەی ژیانت بەرەنجامی ئەوتۆی هەیە کە حەزی پێ ناکەی وەک سەکتەیەکی دڵ، دەتوانی شێوەی ژیانت

بگۆڕی و ڕەنگە هەر ناچار بی وا بکەی، مەگەر بۆ خۆت حەزت لە سەکتەیەکی تر بێ.

چەمکێکی هەروەک شێوەی ژیان گرینگ، بەڵام یەکجار کەمتر بەرچاو چەمکی شێوازی کەسییە. ئەوە واتای باری ئاسوودەیی کەسێکە لە هەڵسوکەوتکردن بەشێوەیەکی دیاریکراو یاخۆ هەستیاربوونیەتی بەرامبەر بەلایەنێکی دیاریکراو لە ژیاندا. بۆ نموونە کۆمەڵە خەڵکێک زۆر گرینگی دەدەن بەخۆبەستنەوە بەکەسانی تر، هەڵسوکەوتیان ڕێکوپێکە و کاتێک یاسا پێشێل دەکەن هەستی پێ دەکەن. بەپێچەوانەوە خەڵکی تر زیاتر بەلای سەربەخۆیی دەشکێنەوە، سەرەتا کارەکان بە "شێوازی خۆم" ئەنجام دەدەن، پاشان ئەگەر پێویست بوو پەنا بۆ یارمەتی دەبەن.

ئەم نموونانە شێوازە کەسییە جیاوازەکان بۆ گونجانی کۆمەڵایەتی ئاشکرا دەکەن. هەست کردن بەوەی خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ زانیاری لەبارەی شێوازی کەسی بداتە دەستەوە. وەک ڕەچەشکێنییەک وابوو سەبارەت بەگونجانی کۆمەڵایەتییش لە ڕێی لێکدانەوەی گۆشەی گوێ زانیاریی پێویست دەدۆزییەوە. ئەمە ڕاستە، پلەی دەرپەڕینی گوێی کەسێک لە سەرییەوە، بەندە بەپێویستیی ئەو کەسە بەگونجانی لەگەڵ خەڵکدا. بۆچی گونجانی کۆمەڵایەتی؟ بۆچی گۆشەی گوێ؟ ئەمە هێماناسیی ڕووە، ئەلفوبێیەکی ڕۆحییە. هەر بەم شێوەیەشە. کاتێک زاناکانی توێکاری دڵی مرۆڤ شی دەکەنەوە لە شێوەی کارکردنی دەکۆڵنەوە، ئەگینا خۆ دای ناهێنن، بەهەمان شێوە، ڕووخوێنەوەکان لێکۆڵینەوە دەکەن. ئێمە داهێنەر نین. کاری ئێمە ئەوەیە ڕاستگۆییی خۆمان بەباشترین شێوە لە ڕێگەی دۆزینەوەی ئەو شتەی هەبوونی هەیە، پێشان بدەین. لەبەرئەوەی ئەوەش ئاستێکی ڕۆحیی واقیعە، لێکۆڵینەوەکە لە ناو هەستدا دەکرێ نەک لە ناو تاقیگەیەکی فیزیاییدا.

بۆم دەرکەوتووە هەندێک خەڵک بڕوا بەمە دەکا، هاوکات خەڵکی تر گاڵتەیان پێی دێ. هێنری فۆرد دەڵێ: "ئەگەر لەو باوەڕە دای دەتوانی شتێک بکەی یاخۆ ناتوانی بیکەی، لە هەردوو باردا هەر ڕاست دەکەی." من خۆم وای بۆ دەچم گاڵتەچییەکان هیچیان پێ نابڕێ.

لەبەرئەوەی تۆ حەز دەکەی ئەو ڕێ تێچوونە بەهەند وەربگری، کەوا لێکۆڵینەوەی هێماکانی ڕوو، هەروەک گوێی گۆشەتیژ، ڕەنگە بتگەیەنێتە ئاستێکی بەسوودی واقیعی ژیان، کەواتە با دوو شتی تەواو جیاواز لە گوێی ڕاستەقینەت، لە مێشکدا بێ:

– خوێندنەوەی شێوازی کەسی جیاوازە لە دیاریکردنی چارەنووسێکی چەسپاو. شێوازی کەسیی خۆت لەوانەیە بگۆڕێ هەروەک چۆن شێوەی ژیانت دەتوانێ گۆڕانی

بەسەردا بێ. شێوازی کەسی پابەندی ئارەزووی خۆتە.

– شێوازی کەسی نە باشە و نە خراپ. چ گوێ وەک پەپوولەی فرۆک گۆشەی کراوەی وەرگرتبێ، چ بەنزیک کەللەوە نووسا بێ و زیاتر بەدەسکی ئەو پەنجەرانە بچێ کە بەهۆی ڤێلکرۆی زۆر توندوتۆڵ تەبق کراون، هەریەک لەم هێمایانە لانی کەم لە ژیاندا، سوودێک دەگەیەنێ بەخاوەنەکەی.

## بەهرە نەک تەنیا شێوازی کەسی

ڕێگەیەکی بەسوود بۆ شرۆڤەی شێوازی کەسی کە دەرکم پێی کردبێ، بریتییە لە بەستنەوەی شێوازی کەسی بەبەهرەوە. بەهرە ئەو کاتە بەدەردەکەوێ کە تۆ هەست بەشتێک دەکەی کە بەشێوەیەکی سروشتی لێی باشی و ئەو شتە بۆ مەبەستی تایبەت بەکار دەهێنی.

بۆ نموونە "ئاندری"ی خاوەن گوێی گۆشەتیژ خۆگونجێنەرێکی کۆمەڵایەتییە، کە بەپشتبەستن بەوەی ئاخۆ لەگەڵ چ گرووپێکدایە شێوازی هەڵسوکەوتی دەگۆڕێ. ئەو چەندەها ساڵ بوو خۆی بەمە بێزار کردبوو: "کەسایەتیی من لە کوێیە؟ بۆچی من ئەوەندە ڕاڕام؟"

کاتێک ڕووخوێنەوەیەکی وەک من دەڵێ شێوازی کەسیی ئەو، بۆ هەڵسوکەوتکردن دەبێ نائاساییانە لەگەڵ چاوەڕوانییەکانی خەڵکدا یەک بگرێتەوە، ئەوا کاردانەوەکە لەوانەیە بەسوود بێ. ڕەنگە ئاندری بۆی ئاسانتر بێ خۆی پەسند بکا.

بەڵام بۆچی لە بابەتی خۆپەسندکردنەوە، لە کورتی بیبڕینەوە؟ کاتێک ئاندری بەهۆشیارییەوە لە شێوازی کەسیی خۆی تێ دەگات، ئا ڕێک لەم ساتەدا، دەتوانێ شێوازی کەسیی خۆی بۆ بەهرەیەک بگۆڕێ. با بڵێین ئاندری لە فرۆشیاریی هاوبەشیدا کار دەکا و سەردانی شوێنی جێبەجێکردنی کارەکان دەکا. بیر لەوە دەکاتەوە: "ئا، با شارەزاییی بریکارەکان لە کاری هاوبەشیدا هەرچۆنێک بێ، بەڵام مەرج نییە هەموویان بتوانن لەگەڵ هەموو شوێنێک خۆیان بگونجێنن. من بەڕاستی زۆر بەئاسانی دەتوانم ئەم کارە بکەم، بەڵام پێشتر ئەوەم بەشتێکی ئاسایی لە قەڵەم دابوو". ئەو کاتێک بزانێ بەهرەمەندە، دەتوانێ برەو بەبڕوا بەخۆبوونی و تەنانەت ڕاپەڕاندنی ئیشوکاریشی بدا.

ئاندری کە ئێستا لە کارامەییی خۆی لە گونجاندنی ئەو شتانەی کە هەریەکە لە

بریکارەکان چاوەڕێیان دەکەن، ئاگەدار بووەتەوە، ئەوا بۆ پێشنیازەکانی فرۆشتنیش لە جاران کاریگەرتر دەبێ. ئەو هەروەها دەتوانێ بەهرەکەی خۆی لەلای سەرکارەکەی باس بکا. با بڵێین ئاندری داوای بەرزکردنەوە دەکا، بۆ پلەی بەڕێوەبەریی فرۆشیاری ناوەخۆیی. بەجەختکردنەوە لەسەر لێهاتوویی خۆی وەک ڕاوێژکاری شارەزایی لە کاری هاوبەشیدا، دەتوانێ خۆی لە ناو داواکارەکانی تر لە بەرچاوتر بکا. ئاخۆ تێگەیشتنی لە جیاوازی نێوان هەستکردن بەڕەوابوون «شێوازی کەسی» و بەهێزبوون «بەکارهێنانی ئەو شتەی کە لێی کارامەی- بەهرەکەت- بۆ مەبەستی تایبەت؟»

ئەمانە چەند نموونەیەکی ترن سەبارەت بەچۆنیەتیی بەهێزبوونت لە ڕێگەی ڕوو خوێندنەوە:

- هەر شتێکی تایبەت بەهێمایەک بخوێنییەوە، فێری لایەنێکی شێوازی کەسیی خۆت دەبی کە دەتوانی وەک بەهرەیەک لە فرۆشیاری یان هەر کارێکی تردا بەکاری بهێنێ.

- بەهرە، هۆیەکە بۆ ڕێز لەخۆنانێکی ڕەوا.

- ئەو کاتەی لەبارەی هێماکانی خەڵکی تر زانیاریت دەست دەکەوێ، فێری شێوازی جیاواز لەوەی خۆت دەبێ، لێیان ورد بەوە، لێیان فێر بە، ئەمەش گوڕوتینت پێ دەبەخشێ لە پێوەندییەکانت.

- ئەگەر تۆ بەڕێوەبەرێک یاخۆ دایک یان باوکێک بی، بەشێوەیەکی کارا دەتوانی یارمەتیی کەسێکی تر بدەی تا بەهرەکەی بناسێتەوە و پەرەی پێ بدا. لەگەڵ ئەوەشدا بەڕێگەیەکی تر خوێندنەوەی ڕوو، یارمەتیت دەدا تا لە پێوەندییەکانتدا بدرەوشێیەوە.

## لە چوارچێوەنانەوە

تایبەتمەندییەکی تری نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو کە لە سیستەمەکانی تری ڕوو خوێندنەوەدا باس نەکراوە، لە چوارچێوە نانەوەیە. ئەمە بەو واتایە شتێک کە لە ڕابردوودا هەراسانی کردبی، هەڵگری و بیخەیە ناو بارودۆخێکی تەواو جیاواز. کارەکە هەروەک دەرهێنانی وێنەیەکی خێزانییە لە چوارچێوەیەکی ناشیرینی کۆن کە هەرچی لایەنی کرێتیی ناو ڕووی خەڵک هەبێ پێشان دەدا و پاشان گواستنەوەیەتی بۆ ناو چوارچێوەیەکی درەوشاوە و نوێ. لە ناکاو لەجیاتی دیتنی کرێتییەکان لە ناو چاوی هەموو خەڵکەکەدا پرشنگێک دەبینی.

نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو دەتوانن بەمەبەستی لە چوارچێوەنانەوەی ئەو شتانەی بەرگەیان ناگری یارمەتیت بدا. بەدەردەکەوێ کە کێشەکان بەزۆری پێوستن بەو شتانەی کە لە ڕاستیدا تۆ حەزیان لێ دەکەی. شتەکە وەک ڕووە دیوەکەی تری سکە وایە. کاتێک باس لەخووڕەوشت دەکرێ زۆربەمان پێوەندییەک لە نێوان ڕووە شێر و ڕووە خەتەکەی، سکەیەک یاخۆ ڕووی ژێرەوەی و ڕووی سەرەوەیدا نادۆزینەوە. لەگەڵ ئەوشدا زۆرێک لە کەموکووڕی و خاڵە لاوازەکان بەتوندی بەستراونەوە بەجیاکراوەترین خاڵە بەهێزەکان.

با بگەڕێینەوە سەر نموونەی ئاندریی خاوەن گوێی گۆشەتیژ. هەرچەندە ئەو زۆر هەستیارە لەمەڕ خووڕەوشتی جوان بەڵام ڕەنگە بەئاسانی لەلایەن ئەو خەڵکانەی کە خووڕەوشتەکانیان لە ڕوو و قلێن، هەراسان بکرێ. ماوەی چەندین ساڵ بوو ئەوە ئاندریی بێزار کردووە. هەرچەند هەوڵ دەدا کەسێکی نەرمونیان بێ هەندێک جار وەک لووتبەرزێک هەڵسوکەوت دەکا. لە ئێوارە میوانییە شکۆمەندەکاندا لە ناکاو خۆی دەدۆزێیەوە کە خەرێکی بۆڵەبۆڵێنە: "ئەو کەسە لە کوێ گەورە بووە؟ لە تەوێڵە؟".

باشترە ئاندری بزانێ لووتبەرزییەکەی سەبارەت بەخووڕەوشت ڕەنگدانەوەی پێوەرە بەرزەکانیەتی. لووتبەرزییەکەی ڕووە هەڵگەڕاوەکەی ڕەوشتبەرزییە یەکجار خواگیرانەکەیەتی. تەناتەت ئەگەر لە داهاتوودا بەردەوام تێبینیی خووڕەوشتی قلێپ بکا، ئێستا دەتوانێ شتێکی نوێ دابڕێژێ: "بۆچی دەبێ چاوەڕوان بم هەموو کەس خاوەنی خووڕەوشتی جوانی وەک هی خۆم بێ؟ تێ گەیشتم، من لە خوو و ڕەوشت بەهرەمەندم. ڕەنگە بتوانم زیاتر بەرگەی ئەو خەڵکانە بگرم کە لەم بەهرەیە بێ بەشن". ئاندری بەهۆی لە چوارچێوەنانەوەیەکی تێروتەسەل سەرەتا واز لە لووتبەرزییەکەی دێنی و دواتر لە یەکێک لە وانەکانی ژیانی تەواو شارەزا دەبێ.

## وانەکانی ژیان

ئاخۆ بیرت لەوە کردووەتەوە ئەو شوێنەی تێیدا دەژی "هەسارەی فێربوون"ە؟ قوتابخانەیەکی یەک هۆڵییە کە لە ناویدا منداڵانی باخچەی منداڵان لە تەک دەرچووانی زانکۆ دادەنیشن. بتەوێ و نەتەوێ، هەر هەمووان پەروەردەیەکی ڕۆحی وەردەگرین و پێت خۆش بێ یان ناخۆش، ئەوە قوتابخانەیەکی تەواو گشتییە.

سەیر لەوەدایە کە مەرج نییە چەمکە ڕواڵەتییەکانی وەک باری کۆمەڵایەتی، سامان و ناوبانگ دەرخەری ئاستی سەرکەوتنی هاوپۆلەکانت بن لەوانە ڕۆحییەکانیاندا. دەکرێ

خەڵکی خاوەن پلەی بەرز یان خەڵکی دەبەنگ یاخۆ هەرکەسێکی نێوان ئەم دوو توێژە زۆر چاک پەروەردە بکرێ. ئەو مرۆڤە بەسەرزمانەی جەستەی پێ بەخشراوە بەشێوەیەکی سەرووئاسایی ڕەنگە هەر جۆرە پلەیەکی کاریی چەسپاوی هەبێ یان ڕەنگە لەمە هەر بێ بەش بێ.

ڕۆڵی خوێندنەوەی ڕوو ئەوەیە باسی ئەو وانەیەی ژیانت بۆ دەکا کە کەسێک وەری دەگرێ. نیوەی وانەکان باس لەوە دەکەن تۆ چۆن بەهرەکانت بناسییەوە و بەکاریان بێنێ. نیوەکەی تریان وا دەخوازن تۆ فێری چۆنیەتیی بەرەنگاربوونەوەی رووە هەڵگەڕاوەکەی بەهرەکەت بێ. بەم شێوەیە، هەر بەهرەیەک کاردانەوەیەکی ڕێ تێچووی هاوڕێی خۆی هەیە– هەروەک چۆن دواتر لە باسێکی دووروودرێژی سەرنجڕاکیشدا دەیخوێنییەوە.

ئاخۆ ڕوو دەتوانێ پێت بڵێ کەسێک وانەیەکی دیاریکراوی وەرگرتووە یان نا؟ ناتوانێ «هەرچەندە خەرمانەکانی کەسێک هاوشێوەی هاوسۆزی کە لە کتێبەکانی ترمدا باس کراون، دەتوانن ئەم خاڵەت بۆ ڕوون بکەنەوە».

تا فێری وانەیەکی ژیان دەبی بەهۆی ئاڵاریشەی هاوڕێ تووشی گێروگرفت دەبی. خوێندنەوەی ڕوو یاریدەت دەدا چوارچێوەیەکی نوێ بۆ وانەکە دابڕێژی. پاش ئەوەی بەردەوام دەبی لە فێربوونی وانەیەکی ژیان کاردانەوە ڕێ تێچووەکەی ئیتر کاریگەری لەسەرت نامێنێ. کەواتە کاتێک لەبارەی کاردانەوەیەک دەخوێنییەوە کە چی تر کارت تێ ناکا، ئافەرینێکی زۆر شایستە لە خۆت بکە.

## ناکۆکی

بەکورتی و پوختەیی، نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو، زانیاریت سەبارەت بەوانەکانی ژیان، هەم بەهرەکان و هەم ئەم بەرپەرچدانانەوەی کە ڕەنگە هاوڕێی بەهرەکان بن، بۆ دابین دەکەن. ئەم جۆرە تێگەیشتنەش توانات پێ دەبەخشێ بۆ لە چوارچێوەنانەوەی کەموکوڕییەکانی خۆت و خەڵکی تر. نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو سیستەمێکی ڕێکوپێکە کە پابەندی ئەم گریمانەیەیە: "خوا شتی بێ واتا ناخوڵقێنێ". لەجیاتی ئەوەی هێمایەکانی ڕووی مرۆڤێک بەکۆمەڵە بۆهێلێکی بێ واتا دابنرێن، هەر ئەندامێکی ڕوو بەشتێکی ڕۆشنکەرەوە دادەنرێ. تەنیا بەخوێندنەوەی ڕووی خەڵک دەتوانی زیاتر لێیان تێ بگەی. لەگەڵ ئەوەشدا خوێندنەوەی ڕوو مشتومڕی لەسەر دەکرێ. خوێندنەوەی ڕوو کۆمەڵە بۆچوونێکی گشتیی خەڵک لەبارەی واقیع بەدرۆ دەخاتەوە. بزانە ئاخۆ دەتوانی لەو کۆڕەدا

کە لە خوارەوە لەسەر شێوازی پرسیار و وەڵامدا هاتووە، پەنجە بخەیە سەر ئەم بۆچوونانە:

پرسیار: هەرچەندە حەز دەکەم بزانم خوێندنەوەی ڕوو لە ڕاستیدا هیچی بۆ هەیە یان نا، بەڕاشکاوی پێت دەڵێم لەوە شک و گومانم هەیە. بەڕەچاوکردنی ئەوەی ڕوومان لەسەر بنەمای بۆماوە داڕێژراوە، ئاخۆ شتێکی ڕەوایە ڕوو بخوێنینەوە؟

وەڵام: بۆماوەزانی بەشێکە لە واقیعی ژیان، تەواوی واقیعەکە نییە و ڕەنگە هەر جۆرێکی زۆر بەسوودی ئەو واقیعە نەبێ کە پێوەندیی بەبەشەکانی ڕووەوە هەیە.

بۆ خۆت دەزانی واقیع زۆر ئاستی هەیە. هیچ نەبێ خانەیەکی دەستت ئەو کاتەی دەخرێتە بەر مایکرۆسکۆپ تەواو جیاواز دەنوێنێ لەو دەستەی بۆ تەوقەکردن لەگەڵ هاوڕێیەک درێژی دەکەی. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم تێڕوانینانەت بۆ دەستت، هەردووکیان، ڕاستن. ئەمەش بەهۆی ئاستە لێک بەستراوەکانی ژیانە کە زۆرن. یەکێک لەسەرپشکییەکانی ئێمە وەک مرۆڤ سەربەستیمانە لەوەی بەئارەزووی خۆمان سەرنج بخەینە سەر هەر ئاستێکی ژیان کە خۆمان دەستنیشانی بکەین. دەتوانین مێشێک بکەین بەگامێش یان بەپێچەوانەوە گامێشێک بکەین بەمێش. من پێشنیاز دەکەم بەم شێوەیە سەیری بۆماوەزانی بکرێ: ئەگەر تۆ زانایەک بی، بێ دوودڵی، هێمایەکانی ڕوو وەک بەرەنجامێکی بێگەردی بۆماوە لە قەڵەم بدە. بەڵام تەنانەت مەزنترین زاناش ناچار دەبێ، هەندێک جار لە تاقیگە دەربچێ و تەنیا ببێتە کەسێکی ئاسایی. وەک کەسێک، ژیانی تۆ بەهۆی ئاستە ڕۆحانیترەکەی خوێندنەوەی ڕوو دەوڵەمەند دەبێ. خوێندنەوەی ڕوو، شتێکی جەستەیی لەگەڵ شتێکی سەرووجەستەیی «یان لانی کەم دەروونی، بەڕەچاوکردنی ئەوەی تا چ ئاستێک دەتوانی بەرگەی دڵرفێنیی فەلسەفەی سەردەمی نوێ بگری دەتوانی لەم کتێبە هەروەک کتێبێک لەبارەی دەروونناسی یان میتافیزیک سوود وەربگری. ئاستە تێکئالاوەکانی ژیانە کە ڕێگە بەم هەڵبژاردنە دەدا» تایبەت بەدەروونی مرۆڤ لە یەکتر دەبەستێتەوە.

پرسیار: کەواتە تۆ دەڵێی بۆهێلەکان هیچ جۆرە کارتێکەرییان لەسەر ڕوومان نییە؟ ئاخۆ تەنیا بەڕێکەوت یان بەبەخت نییە کە ڕوومان وا دەرچووە؟

وەڵام: نەخێر. لەو بڕوایەدام کە ڕۆحی تۆ لەو شتەی لە گۆماوی بۆهێڵ دایە، هەڵدێنجێ و، هەندێک جار بۆ دۆزینەوەی هێماکانی پێویست مەوادیەکی تا ڕادەیەک دوور لەو

گۆماوەدا دەبرێ. بۆ نموونە ڕووخوێنەوەیەک ئەوەی دۆزییەوە لە خێزانەکەیدا کە چوار برا هەن، هەر هەموویان لێک دەکەن جگە لە"یاخییەکە" کە ڕووی تەواو لە هەموو ئەوانی تر جیاوازە. ئەمە ڕێکەوتە؟ بۆ ڕووخوێنەوەیەک، نەخێر.

ئەمەش نموونەیەکی تر. بیر لە هەر ژن و مێردێکی ناسیاو بکەوە کە لانی کەم ماوەی دە ساڵە بەبەختەوەری بەیەکەوە دەژین. هەست ناکەی ڕوویان خەریکە دەچێتە سەر شێوەی یەکتر؟ باشە ئەمەیان لە کوێ بۆ هاتووە؟ لە منداڵەکانیانەوە؟

ڕوونکردنەوەیەکی ڕێ تێچووی تر ئەوەیە کە هەروەک ڕووخوێنەوەکان هەزاران ساڵە وای بۆ دەچین: «زۆر پێش سەرهەڵدانی بۆماوەزانیی هاوچەرخ»، پێوەندییەکی قووڵ لە نێوان دەروون و ڕووی مرۆڤدا هەیە.

بیر و بۆچوونەکان بێ بەرەنجام نین. ئەگەر لەو باوەڕە دای ژیانت بەهۆی بۆماوەوە سنووری بۆ دیارکراوە کەواتە تۆ ئازادیی ویستی خۆت تەسک دەکەیەوە. نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو ئەو هەڵەت بۆ دەرەخسێنن تا لە ڕووت هەروەک لایەنەکانی تری ژیانت بەرپرسیار بی. ئەگەر بەقووڵی سەیری ڕووەکان بکەی سەرت سڕ دەمێنێ لە ئاست ڕادەی گۆڕانیان لەگەڵ تێپەڕینی کات و هەروەهاش لەوەی بە چ شێوازێک پەرەسەندنی ڕۆحیی ژیانی هەرکەسێک پشتڕاست دەکەنەوە.

پرسیار: لە ماوەی ژیانمدا بەدەست ڕەگەزپەرستی دژی ئاکارەکانی ئەمریکی – ئەفریقییەوە دەناڵێنم. ئاخۆ من تاکە کەسێکم کە پێی وایە ئەو شتەی تۆ کە بە"فیزیۆگنۆمی" ناسراوە، تەنیا وشەیەکی ڕازاوەیە بۆ ڕەگەزپەرستی؟

وەڵام: بەداخەوە، نەخێر. بەڵام با بەپێچەوانەی نیگەرانییەکانت سەبارەت بەڕوو خوێندنەوە بزانین لە ڕاستیدا خوێندنەوەی ڕوو چییە. خوێندنەوەی ڕوو، پێوەرێک نییە تا بەهۆیەوە خەڵک بەباش یان بەخراپ هەڵبسەنگێنی. خوێندنەوەی ڕوو، دەرفەتێکە بۆ فێربوون نەک هەڵسەنگاندن. خوێندنەوەی ڕوو یەکلاکەرەوە نییە بۆ سەرانسەری ژیان لەبەرئەوەی ژیانی تۆ لە ماوەی تەمەنتدا گۆڕانی بەسەردا دێ و ڕووت ڕەنگدانەوەیەکە بۆ ئەم گۆڕانانە. هەروەها مەبەست لە خوێندنەوەی ڕوو پۆلێنکردنی خەڵک لە ناو تاقمە نەژادییەکان نییە. بگرە مەبەست لێی باسکردنی شێوە و گۆشە و ئەندازەکانی ڕووە. خوێندنەوەی ڕوو ڕەچاوی ڕەنگ و پێکهاتەی موو و ڕەنگی چاو و هی پێست ناکا.

پرسیار: بێگومان ناتوانی نکۆڵی لەوە بکەی کە کۆمەڵە ئاکارێکی دیاریکراو تایبەتن

بەگرووپێکی ئەتنیکی دیاریکراو، وایە؟

وەڵام: پێویست ناکا بەهۆی کلێشەکردنەوە چاوەڕوان بین کۆمەڵە ئاکارێک تایبەت بن بەگرووپێکی دیاریکراو. بەڵام کاتێک تۆ بڕوانی، بەڕاستی بڕوانی، تاکەکان دەبینی. ئەمە بەشە سەرنجڕاکێشەکەیە. جارێک لە تەلەڤزیۆنی نیشتیمانیدا دیمانەیەکم لەگەڵ کرا. پێشکێشکارەکە ئەم پرسیارەی کرد: "تۆ چۆن دەتوانی ڕووی خەڵکی ڕەش پێست بخوێنییەوە لە کاتێکدا کە هەموویان بەیەک دەچن؟".

شەپۆڵەکان تاسان بەناو ئاپۆرەی ستۆدیۆدا بڵاو بوونەوە.

ئەوەی سەرنجڕاکیش بوو ئەوە بوو کە ئەم پێشکێشکارەی پرۆگرامە گفتگۆئامێزە پێستێکی ڕەنگ قاوەیی و جووتە چاوێکی شینی هەبوو. ڕەنگە بۆ خۆشی دوورەگەیەکی ڕەش و سپی بووبێ. کەواتە ئەو بۆ خۆی بەڕاستی چاکتر لە من دەیزانی نەدەبوایە پرسیارێکی ئەوەندە ڕووشکێن بکا. بەڵام مەبەستی ئاژاوەنانەوە بوو.

ئەمڕۆ خەڵکێکی کەم دەتوانن بێنە دەرەوە و بەئاشکرا بڵێن: "هەموو خەڵکی ڕەش پێست بەیەک دەچن" یان "هەموو خەڵکی ئاسیای ڕۆژهەڵات بەیەک دەچن". ئێمە وا ناڵێین، بەڵام زۆربەی کات وا بیر دەکەینەوە. لەگەڵ ئەوشدا ئەمە تەنیا لە ڕووکەشترین هەڵوێستدا بەدەر دەکەوێ.

لۆرا کە یەکێکە لە هاوڕێیەکانم لە دایکبووی تایوانە، بەڵام لە ئەمریکا گەورە بووە. پێش ئەوەی سەردانێکی چین بکا، پێی وتم: "گەلێک خۆشە بەشەقامدا بڕۆم و هەموو خەڵکەکە شێوەی لە خۆم بکات". هەرچەندە بەپێچەوانەوە، ئەگەر ئاپۆرەکە چەند گەورەش بووبێ لۆرا هەگیز لە ناسینەوەی هاوسەر یان کۆڕەکەی تووشی گرفت نەبووبوو. لایەنە لێکچووەکە بەشێوەیەکی سەرەکی ڕەنگەکە بوو. زۆربەی کاتیش شتەکە هەر ئاوایە.

وای بۆدەچم ئەوەی لۆرا مەبەستی بووبێ ڕەگوڕیشە کولتوورییەکانی بووبن. لێکچوونە ڕەگەزییەکان هەروەک هۆیەک بۆ ڕێزگرتن لە کولتووری مرۆڤ شتی سەرسوڕهێنن- و ئاستێکی سەرسوڕمێنی شانازی بەڕەگەز هەیە کە پەسنی مێژوو و پێشینان و کولتوور دەدا. لەگەڵ ئەوشدا ئاستێکی تری شانازی بەڕەگەز هەیە کە شوێنی وەک بۆسنیای کردووە بەمەڵبەندی ڕق و کینی "پاکتاوی ڕەگەزی". خوێندنەوەی ڕوو بابەتێکی تەواو جیاوازە.

پرسیار: بەڵام ئەی ئەگەر بێ و تۆ وا ڕاهاتبی، کاتێک چاوت بە خەڵک بکەوێ سەرەتا و

لە سەرووی هەموو شتێکەوە سەرنجی لایەنی ڕەگەزی بدەی؟

وەڵام: ئەو کاتە تێبینیی لایەنی ڕەگەزی بکە و بەسەریدا باز بدە. وەک ڕووخوێنەوەیەک تۆ سەربەستی لەوەی خەڵک بگەڕێنییەوە بۆ سەر هەر کێشەیەکی ڕەگەزی یاخۆ لەوەی هەروەک تاک سەیریان بکەی. ئاخۆ ئەمەش دەبێتە کاتی بەمێشکردن یان بەگامێشکردنی مەسەلەکە؟ ئەو کاتەی چاومان بەکەسێکی نەناس دەکەوێ سەربەستین لەوەی بەدڵی خۆمان لەگەڵ هەر کۆمەڵێک پۆلێنی بکەین. بۆ نموونە تۆ دەتوانی بەرووی کەسێکدا چاو بگێڕی بۆ دۆزینەوەی کەموکورییەکان هەروەک چۆن پزیشکێکی پێست نەخۆشەکان دەپشکنێ. لە ڕێی ڕاهێنانەوە هێندەی تۆزقاڵێکیش بێ، دەتوانی بەچاو بەباشترین شێوە لەشولاری ئافرەتێک لە رووی چەورییەوە «هەروەها ئاکاریشی» بخەملێنی و ئەمەش هەر سوودی دەبێ هەرچەندە نازانم بۆ چ شتێک.

کاتێک ئامادە بووی بۆ ئەوەی زیاتر لە خەڵک تێ بگەی و خەڵک هەروەک تاک هەڵبسەنگێنی، ڕوو بخوێنەوە.

پرسیار: ئەگەر بمانەوێ لەجیاتی کلێشەیەک، کەسە ڕاستەقینەکە ببینین ئاخۆ چۆن خوێندنەوەی ڕوو یاریدەمان دەدا؟

وەڵام: تۆ بەجیا سەیری بەشێکی ڕوو دەکەی و لەگەڵ ئەم بەشەدا بەردەوام دەبی لە سەیرکردن. هەر بەشێکی ڕوو، زۆر هێمای هەیە کە دەبێ لێیان هەڵبژێری. کەواتە ئەگەر بەهۆی پەروەردەکردنتەوە پێت وابێ کۆمەڵە ئەندامێکی دیاریکراوی ڕوو وەک لووت بەردەوام تایبەتن بەگرووپێکی ڕەگەزییە، ئەوا تووشی حەپەسانێکی گەورە دەبی. ئەو هێمایەی لووت کە بەزیادەی لووت ناوی دەبەم، وەک نموونە وەربگرە. هەندێک خەڵک کوتە گۆشتێکی زیادەیان بەلووتەوەیە کە لە سەری لووتەوە شۆڕ دەبێتەوە، واتە لە نێوان هەردوو کونە لووتیان دایە. سەیری لاپەڕەی دواتر بکە کە تێیدا ئەوە ڕوون کراوەتەوە. هەروەها لە ناو نموونەکانم لە کۆتاییی ئەم کتێبەدا سەیری نموونەیەکی ڕاستەقینە بکە لە ڕووی نەژادەوە بنەچەی من ئەو جوولەکانەن کە لە ئەڵمانیا و ڕووسیا وەدەرنراون. دایکم و باوکم و خوشکم و ئامۆزا و خاڵۆزاکانم ئەو هێمایەیان نییە وە منیش تا تەواو پێم نەنایە ناو سییەکانی تەمەنم ئەم هێمایەم نەبوو «دێتەوە بیرت پێشتر وتم چۆن بەبۆهێڵەکانەوە ڕوومان دادەڕێژرێ و چۆن ڕوومان لە ژیاندا گۆڕانی بەسەردا دێ؟». ئەو کاتەی سەیری لاپەڕەکەی تر بکەی دەتوانی نموونەی زیاتر لە خەڵکی خاوەن زیادەی لووت بدۆزییەوە.



خاوەن زیادەی لووت



بێ زیادەی لووت

پرسیار: بەهەرحاڵ ئەو هێمایەی لووت واتای چییە؟

وەڵام: ئەگەر خاوەن زیادەی لووت بی، دەبێ مەبەستت لە کارکردن، خزمەتکردن بێ. ئەگەر لە قووڵاییی ناخەوە هەست نەکەی بەهۆی کارەکەتەوە یارمەتیی خەڵک دەدەی، با کارەکەت هەر شتێکی ترت لە ڕووی مادی و پلە پێ ببەخشێ، ناتوانی لە کارەکە بەردەوام بی.

بەڵام ئەم واتایە چ پێوەندییەکی بەڕەگەزەوە هەیە؟ هیچ.

پرسیار: ئاخۆ دەتوانرێ خوێندنەوەی ڕوو بۆ بەڕاستی زاڵبوون بەسەر کلێشەکانی ڕەگەزی بەکار بهێنرێ؟

وەڵام: ئەو کاتەی ئەوەندە سەیری کەسێکت کردبێ کە توانیبێت سێ هێمای ڕوو یان زیاتری بۆ دەستنیشان بکەی، تۆ لە بری ئەوەی سەیری کلێشەیەکت کردبێ چاوت بڕیوەتە مرۆڤێکی ڕاستەقینە. تەنانەت بیرۆکەی سەیرکردنی بەشە ڕاستەقینەکانی ڕوو دەتوانێ ڕزگارت بکا.

لە لاپەڕە ١٤١دا تەنیا بڕوانە وێنە کێشراوەکەی "تایگێر ودز"، بەهرەمەندترین یاریزانی ئەمەریکی لەگۆڵفدا. لەبەرئەوەی وێنەی کێشراوە لێرەدا ئیتر هان نادرێی کە بەشێوازی هەمیشەییت لە سەیرکردنی خەڵک، واتە بەهۆی ڕەنگی پێستیانەوە، سەیری ئەم کەسە بکەی. تۆزقاڵ تۆزقاڵ لە ڕووی ورد بەوە. ئەو خۆی بە "کێبلینیزیەن" دادەنێ لەبەرئەوەی کەلەپووری خۆی پێک هاتووە لە:

١/٤ چینی
١/٤ ڕەشپیست
١/٤ تایوانی
١/٨ خەڵکی خۆماڵیی ئەمریکی
١/٨ سپیپێست

تایگێر ودز بەنزیکینە سەر بەکام ڕەچەڵەکە؟ کەسێکی فرەڕەگەز، تێکەڵەیە، بەڵام ئەو تێکەڵەیە هەر خۆیەتی. ئەوە حاڵی جیهانی ئێمەیە لەم ڕۆژگارەدا. ئافرەتێکی بەتەمەن بەهاوڕێیەکەمی وت: "سوپاس بۆ خوا هەرگیز ئەوەندە ناژیم ئەو ڕۆژە بەچاوی خۆم ببینم کوڕەکەت ژنێکی غەیرە ئیتاڵی بێنێ". کە دڵتوندکەرە! سەردەمی هاوسەرگیری لە نێوان نەتەوە جیاجیاکانە کەچی بەگوێرەی کولتووری خێزانیی خۆت ڕەنگە گوێت لەوە بووبێ

کەسێک ڕستەیەکی وەکو ئەمە بدرکێنێ «تەنیا دوا وشە بەپێی کولتووری خۆت بەنەتەوەیەک بگۆڕەوە، هەر نەتەوەیەک بێ لە ئەمریکییەوە بگرە تا زوولوو». زۆر خەڵک هاوسەرگیری لە دەرەوەی نەتەوەی خۆیان بەدڵ نییە. بەڵام هاوسەرگیرییەکە بەم هۆیە پێشگیری لێ ناکرێ و، من دڵخۆشم بەیەکێک لەم هاوسەرایەتییانە. ڕەنگە دایک و باوک و باپیرەکانی تایگێر ودز، کۆمەڵە خزم و کەسێکیان تاساندبووبێ، بەڵام تایگێر ودز بێ کەموکووڕی دەرچوو.

"بێتی کرۆکر" نموونەیەکی ترە لەسەر فرەڕەگەزیەتیی مرۆڤ کە «ئەگەر ئەو کەسە بەڕاستی هەبوونیشی نەبێ» لە ڕووی بازرگانییەوە یەکێکە لە سەرکەوتووترین شیرنیکارانی ناوخۆیی لە ئەمەریکادا. ١٥ ساڵ پاش ئەوەی کۆمپانیایەکە دەستی بەفرۆشتنی کەرەسەی دروستکردنی کێک کردبوو بۆ یەکەم جار وێنەی بێتی کرۆکر بڵاو کراوە. بەوتەی "پام بێیکر"، وتەبێژی ئاشەکانی گشتی، ڕووی بێتی بەدرێژاییی تەمەنی کۆمپانیا زۆرجار دەسکاری کراوە تا ڕەنگدانەوەیەک بێ بۆ "ئافرەتی ئەمریکیی هاوچەرخ".

مودیلەکانی پرچ هەروەک میکیاژ پەرەیان سەندووە. لە ئەنجامدا بەرگی باوەکەی ناوماڵی بێتی دەبوایە دابکەندرابا تا نیشان بدا کە "ئافرەتی هاوچەرخ" کە خۆی لە ناو بێتیدا بەرجەستە دەکا ڕەنگە چی تر تەنیا وەک ژنێکی ماڵەوە نەڕوانێتە خۆی.

ئەو شتەی لە ماوەی چەندین ساڵدا نەگۆڕابوو ئەوە بوو بێتی هەروەک قەوقازییەکی پرچ ڕەشیلەی چاوشین مابووە. لە کۆتاییدا ئەوەش چاوی پێدا خشێنرایەوە. وێنەی بێتی بۆ نۆیەم جار دەسکاری کرا. بەوێنە ڕەسمییە تەمەن ٧٥ساڵەکەی بێتی ئەم ڕووەی وەرگرت. بۆ گەڕان بەدوای وێنەیەک کە کڕیارەکان بەهۆیەوە خۆیان پێناسە بکەن، کۆمپانیایەکە کێبرکێیەکی وتارنووسینی ساز دا. براوەکانی ڕوونیان کردبووە کە حەزیان لە چێشتلێنان و هەویرکارییە، کەوا خۆیان بۆ خێزان و هاوڕێ و کۆمەڵگەکەیان تەرخان کردووە. وتارنووسە براوەکان هەروەها کارامەییی خۆیان لەوە وەدەرخست کە ڕێگەی داهێنەرانەیان بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ناوماڵ دەدۆزییەوە. بەڕێز بێیکر وتی:" هەرچەندە بنەچەی خێزانی ڕەچاو نەکرابوو، بەڵام هەر ٧٥ براوەکانی پێشبرکێیەکە لە ڕاستیدا سەربەڕەچەڵەکی ڕەگەزیی جۆراوجۆر بوون".

شێوەسازیی کۆمپیوتەری، ڕووەکانی هەر ٧٥ براوەکەی ئاوێتەی یەکتری کرد تا بێتی کرۆکرێکی نوێ بخوڵقێنێ کە وێنەکەی دواتر لەسەر شێوازە باوەکەی کۆمپانیایەکە ڕەنگ کرا. وێنە نوێیەکە کە پێک هاتبوو لە وێنەی هەر ٧٥ ئافرەتەکە لەسەر بەرگی کتێبی "Betty

Crocker's New Cookbook – بەرهەمی نوێی بێتی کرۆکر لەبارەی چێشتلێنان" کە لە ساڵی ١٩٩٦دا چاپ کراوە، دەدرەوشێتەوە.

ئێستا چاوەکانی بێتی قاوەیین، ڕەنگی تۆزێک ئەسمەرترە. کلێشەگەرانی ڕەگەزی ئێستا زۆر بەدژواری دەتوانن بۆ سەرکلێشـەیەکی بگەڕێننەوە. بەبۆچوونی پام بێیکر ئەنجامە پێچەوانەکان زۆرترین ڕەزامەندییان لێ کەوتووتەوە. هەندێک خەڵک دەڵێ: "بێتی بەخەڵکی ئەمریکای لاتین دەچێ". ئەوانی تر دەڵێن: "ئەو تۆزێک ڕەنگی مۆسولمانەکان دەداتەوە" کاتێک گوێمان لەوە دەبێ: "ئەو کتوپڕ وەک دراوسێم یان ئامۆزام یان هاوڕێیەکەمە" ئێمە هەست دەکەین سەرکەوتوو بووین. بێتی کرۆکر هەروەک لایەنە مرۆڤانەکەی ئەم کۆمپانیایە سەیر دەکرێ. پرسیارم لە یەکێک لەو ئافرەتانەی کە بۆ وێنەکەی بێتی کەڵکیان لە بەشێکی جەستەی ئەو وەرگرتبوو، کرد کە ئاخۆ چ هەستێکی هەیە بەرامبەر بەوەی وێنەکەی خۆی کراوە بەڕووێکی فرەڕەگەز. "جولی لیڤینر"ی خەڵکی ویلمینگتۆن لە کارۆلاینای باکوور هاوولاتییەکی نموونەیی ولاتە فرەنەتەوەکەمانە. بنەچەی وێلش و ئەڵمانی و فەرەنسی و خەڵکی خۆماڵیی ئەمریکییە. جولی کە بۆ یەکەم جار بێتییە پەرەسەندووە نوێیەکەی دیتبوو کاردانەوەی بەم شێوەیە بوو:

"بەبەراورد لەگەڵ وێنەکانی پێشتری، بێتی کرۆکر زیاتر لە جاران ڕوویەکی ڕەگەزیی پێوە دیاربوو. بەلام کاتێک وردتر سەیرم کرد هەستم کرد لە بزەکەیدا ددانێکی خێچوخوار دیارە، ددانێک کە من خاوەنی بووم. ئەوندە دڵنیا بووم کە پرسیارم لە پیاوەکەی بەرپرس لە وێنەکە کرد. ئەو پێی وتم یەکەم جار کە وێنەکەی بێتی نەخشێنرا وێنەکە یەکجار بێ کەموکووڕی دەرچووبوو. پێی وتم: "بۆیە من دەمی تۆم خستە ناو وێنەکە".

" کاتێک من توانیم ئەندامێکی خۆم لە ڕووی بێتیدا ببینمەوە وێنەکە چی تر ئەوەندە ڕەگەزی نەدەهاتە بەرچاو".

جولی ڕوونی کردەوە: "مرۆڤ بەردەوام خۆی بەکەسێکی کەمێک ئاسایی دادەنێ". وە مەسەلەکەی ئا لێرەدایە. ئاخۆ تۆ خۆت بەکەسێکی "کەمێک ئاسایی" دادەنێی؟ با ڕەنگی پێستت هەر چییەک بێ تۆ وەچەیەکی نموونەیی مرۆڤی. ئەگەر بەدوای وردەکاریی تایبەتەوە بگەڕێی وەک ددان یان شێوەی کونە لووتەکانت، ئەمە مەودای تاکبوونتە. ئەمە بۆ هەموو کەس هەر بەم شێوەیە و، خوێندنەوەی ڕوو یارمەتیت دەدا تا مەودای تاکبوونی خۆت بەقووڵی و بەتێروتەسەلی بدۆزییەوە.

ئەو کەسانەی خاوەن زیادەی لووتن:

مارتن لووتر کینگی کوڕ، سەرکردەی ئەمریکی – ئەفریقی، خەباتکاری مافە شارستانییەکان.

ئالبێرت شوایتزر، نێردەی ئەڵمانی لە بواری پزیشکیدا

ئەنوەر سادات، سەرکردەی سیاسیی میسری

لیۆ ئێزاکای، فیزیازانی ژاپۆنی

هێنری بێرگسن، فەیلەسووفی فەرەنسی

جاسینتۆ بێناڤێنت مارتنز، شانۆنامەنووسی ئیسپانی

ئۆدیسێس ئێلیتس، شاعیری یۆنانی

یووان تی لی، کیمیاگەری ئەمریکی–چینی

ئوانگ سان سوو کیی، خەڵکی بورما، خەباتکاری مافەکانی مرۆڤ

میرێد کۆریگان، ئاشتیخوازی ئیرلەندی

هار گۆبیند کۆرانا، زانای ئەمەریکی – هیندی لە بواری کیمیای زیندەوەرزانی

کامیلۆ گاڵگای، نەخۆشیناسی ئیتاڵی

داگ هامارسکیۆلد، سەرکردەی سویدی، ئەمینداری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان

ئیڤان پاڤلۆڤ، دەروونناسی ڕووسی

تایگر ودز، یاریزانی ئەمەریکیی گۆڵف

٣

## چۆن بەچاوی ڕووخوێنەوەیەک سەیر بکەین؟

ئەو ڕۆژانەی کە تۆ، یان کەس نا خۆم، وەک منداڵ نانمان دەخوارد و دایکمان ئاواتەخوازی ئەمە بوو، بەسەرچوون. بەڵام بۆ چەند چرکە ساتێک، خووە کۆنەکانی خۆت بەبیر بهێنەوە، لەبەرئەوەی شتێکی بەکەڵکت لەبارەی چۆنیەتیی ڕوانین لەسەر شێوازی ڕووخوێنەوەیەک فێر دەکەن.

منداڵ لە شێوەی خواردنی ئامانجێکی هەیە. بەجۆش و خرۆشی شارەزایەکی زەین «ئەگەر واش نەبێ بە کارامەیی شارەزایەکی زەین» شتەکان لێک جیا دەکاتەوە. لە قۆناخێکی منداڵیدا ئەو کاتەی تاکە شتێک کە تۆ ویستبات بیخۆی، مریشک بوو، بێ هەڵە مریشکت لە هەر خواردنێکی ناو مەنجەڵەکە جیا دەکردەوە. سۆسەکەت بەلای ڕاست و لەتکە گێزرەکانت بەلای چەپدا پاڵ دەنا و ئەودەمە دەتتوانی یەکسەر دابکەوییە سەر ئەو پاروەی حەزت لێی بوو. بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر لەسەرەخۆتر بای ئەوا زیاتر لە خواردن ورد دەبوویەوە دەتتوانی هەر پارچە مەعدەنووسێک، جا با چەند بچووکیش بووایە، لابەری. مریشک، تەنیا مریشک ئەو شتە بوو کە تۆ دەتویست سکتی پێ بئاخنی.

منداڵ لە سەرنجدان سەردەستەیە. لە ڕاستیدا، هاوڕێیەکم کە جادووگەرە پێی وتووم کاری جادووگەری بۆ ئاپۆرەیەکی پێکهاتوو لە منداڵی پێنج ساڵان زۆر زەحمەتە.

کێن، ئاوا گلەیی کرد: "تۆ ناتوانی هەڵیان بخەڵەتێنی، فێڵەکە بەو مەرجە سەردەگرێ کە لە کاتی جێبەجێکردنیدا بینەران بخافڵێنرێن، بەڵام منداڵ هەڵناخەڵەتێندرێ. ئەو هەرکارێکی تۆ دەیکەی دەبینێ، وێڕای ئەو شتەش کە دەتەوێ بیشێرییەوە. وەک هەموو جارێک لە کۆتاییدا ئەو کاتەی دەڵێم :"ها، ئەها!" کاردانەوەیان بەمجۆرەیە: "ئێ، ئینجا چی؟" ئەو زیتەڵانە هێشتاش چاوەڕێی بەشە سیحراوییەکە دەکەن".

سیحر لە تەمەنی منداڵیدا لە ناو فرۆفێڵی کەسێکی تردا نییە. بەهەمان شێوە، سیحری ناو ڕوو لە شوێنێکی بەدەر لەو جێیەیە کە لە سەیرکردن ڕاهێنراوین. ئەگەر بەبیرمان بێ بەدیدە وردبینەکەی ڕووخوێنەوەیەک بڕوانین، ئەوا دەتوانین بەسەر ئەم خووەدا باز بدەین و بەپێچەوانەشەوە ئەم خووە سەربەخۆ خۆی دەسەپێنێت.

## خووە کۆنەکان

هەرچەندە نووسینگەی ئەمەریکی بۆ سەرژمێری مووچەیەکی مانگانەی بۆ تۆ نەبڕیوەتەوە، بەڵام لەوەتەی تەمەنت پێنجساڵان بووە خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بووی.

لە چرکە ساتەکانی دیتنی ڕووێکدا تێبینیی ئەم لایەنانە دەکەی:

– ڕەگەز «نێر یان مێ»

– پیری یان گەنجی

– ڕەنگی پێست «کە دواتر بۆ گەڕاندنەوەی کەسێک بۆ سەر جۆرێکی ڕەگەزی سوودی لێ وەردەگیرێ»

– زیندوو یان مردوو «ڕەنگە تۆ زۆرێک لە دووەم جۆریان کە بەناو شەقامدا هاتوچۆ دەکەن، نەبینی، بەڵام بڕوام پێ بکە ئەگەر بیانبینی هەستیان پێ دەکەی».

ئەم زانیارییانە چەند زوو بەمێشکدا گوزەر دەکەن. کۆمەڵە زانیارییەکی جیاواز پێوەندییان بەسەرنجڕاکێشبوونەوە هەیە. با بڵێین تۆ سەڵتی و بەناو ئینتەرنێتدا دەگەڕێی بەو هیوایەی کە وێنەی هاوڕۆحەکەت بدۆزییەوە. سەرنجڕاکێشی ڕەنگە زۆر بەهەند وەرگیرابێ و لە هەندێک باردا ئامانجی هەموو ئەو بەکارهێنەرە "مراجع" بەئاگایانەی ئینتەرنێت بێ کە وێڵی هاوژوانێکن «هەرچەندە هەر کەسێک کە بەنیازی خۆشەویستییەکی ئینتەرنێتی بێ، سەرەتا دەبێ بەناو لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا نەک گوزەر بەڵکو دەبێ ڕا بکا پاشان سێ تاقیکردنەوەکەی درۆ–دۆزەرەوە لە "Aura Reading through All Your Sences خەرمانەخوێندنەوە لە ڕێی هەموو هەستەکانتەوە" وەک پاشکۆیەکی ئەمە بخوێنێتەوە».

ئەنجامی لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆجی ئەوە دەسەلمێنێ زۆربەی خەڵک ئەو کەسە بەهاوسەر هەڵدەبژێرن کە لە جوانیدا ئاستێکی لێکچوویان لەگەڵیدا هەبێ– ئەگەر تۆ لە جوانیدا دەیەم پلەت هەبێ زۆر ڕێی تێ دەچێ کە هاوژوانێکی پلە ٣ت نەبێ.

زۆربەی ئەو شتەی کە لە ڕوو خوێندنەوە، کە لێکۆڵینەوەیەکی سایکۆلۆجیی قووڵە، پەسند

دەکرێ یاخۆ لە ناسینەوەی هاوڕۆحێکدا لە ڕێی پێکهاتەی هۆرمۆنییەوە، لە ڕاستیدا بەهەڵسەنگاندنێکی ڕۆحسووکی کورت دەکرێتەوە.

زۆر جار نیگایەک نەک ڕوویەکی ڕاستەقینە هۆشمان دەفرێنێ. ئەندامە جەستەییەکان بەدڵمان دەبن، بەمەرجێک لەگەڵ مۆدیلە ویستراوەکەی پرچ و ئارایش و خەرمانەدا «بەڵێ، خەرمانەش، تەنانەت ئەگەر ئێمە ئەنقەست ئەوەمان بەمەرجێک دانەنابێ» بگونجێن. ئێمە بە بەڵێ یان بە نەخێر خۆمان یەکلا دەکەینەوە و کارەکەمان لە مەودای ئەو ڕووەدا بەکۆتا دێ. ئەنجامدانی ئەم کارە دەشێ دڵکەرەوە بێ بەڵام ئەگەر تۆ بۆ خۆت لە ژێر تاقیکردنەوەدا بی، شتەکە ڕەنگە ئەوەندە دڵخۆشکەر نەبێ. لە هەردوو باردا نابێ چاوپێداگێرانێکی سەرپێیی لەگەڵ ڕوو خوێندنەوەدا تێکەڵ بکرێ.

هەندێک جار ئێمە دەتوانین خۆمان بخەینە ناو زانینخوازییەکی کۆمەڵایەتیی بێگەردەوە. ئاخۆ زەنگینی لە ناو ڕوودا بەدەر دەکەوێ؟ زۆربەی جار بەڵێ، لە ددان، لە چۆنیەتیی خۆڕازاندنەوە، لە گۆشەی سەر، لە گوارە بەدەر دەکەوێ «بەهەرحاڵ ئاماژەکان زۆرن».

ئەی ئینتیمای کۆمەڵایەتی؟ ئەو شتەی کە تیشێرت ناتوانێ بۆتی ئاشکرا بکا لە ڕازاندنەوەی ڕوودا بەدەر دەکەوێ، ئاخۆ هێمایەکی خاچ دەبینییەوە کە بەشوێنەکەوە هەڵواسرابێ، یان خاڵێکی سووری نێوچاوان یان خەزێمێک دەبینی؟

ڕێگەیەکی تر برێتییە لە سوودوەرگرتن لە پسپۆڕیی زۆر پەرەسەندووتر. بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر شێوەی ژیان ڕەنگە تۆ خۆت لە خوێندنەوەی زمانی جەستە یان خەرمانە یان بچووکترین دەربڕینەکان ڕاهێنابێ. ئەمانە یاریدەت دەدەن بۆ دەستنیشانکردنی هێما وردەکانی تایبەت بەکۆمەڵێکی دیاریکراو. بۆ نموونە من دۆزیومەوە کە ڕێگەیەک بۆ جیاکردنەوەی کولتوورێک لە ئاینێکی سست، برێتییە لە لێکچوونێکی بەڕواڵەت لە نێوان دەربڕینەکانی سەر ڕووی ئەندامە جیاوازەکان.

بۆ لایەنی سیکیولارش، ئاخۆ هەرگیزلە ریستورانتێک لە شوێنێکی دانشتووی؟ کە نزیک لە ئەندامانی کۆمپانیایەک کە بۆ خوانی نیوەڕۆ کۆ بوونەتەوە . ئاخۆ سەرت سڕ نەماوە لەوەی ڕووی تەواوی کەسەکان لە یەکتری دەکا؟ چون توانراوە خەڵکێکی ئەوەندە لێکچوو بدۆزرێتەوە؟ یان چۆن ئەم کارمەندانە ڕوویەکی ئەوەندە لێکچوویان وەرگرتووە؟

هەمووومان شارەزاییمان لە تاکە ئینتیمایەکی کۆمەڵایەتی هەیە کە لە ڕوودا بەدەر دەکەوێ یان دەتوانین شارەزای ببین. کۆوارێکی وەک ڤۆژ بکەوە و سەیری ڕووە سڕ و بێ

هەسـتـەکـانـی مـۆدیلە بەرچاوەکـانی نـاو وێنەکـان بکە. هـەمـوو کـەس ناتوانـێ ئەم ڕووە بەخۆیەوە بگرێ. لانی کەم ئەوە پێویستی بەڕاهێنانە.

هەندێک جـار ئێـمـە لە ڕوودا بـەدوای تەندروسـتـیـدا دەگـەڕێین. برینە جـەسـتـەیی و دەروونییـەکان دەشێ لە ڕوودا نەخش ببەستن. بەپێی شارەزاییی خۆت ڕەنگە تۆ ئاشناییت هەبێ لەگـەڵ ئەو هێـمـا وردانەی کـە دەرخـەری جـۆرە ڕاهاتنێکن لـە ئەلکحـول یـان ئەو هێمـایانەی ئاماژە دەدەن بـەوەی کەسێک تووشـی نەخۆشـیـی سـەوەفـانی درێژخـایەن یان جۆرەکانی تری ئازاری جەستەیی هاتووە.

خـەمـۆکـی، لاوازیی سـێکسـی، دڵڕەقی، شـەرم و بەپێی ئەو ئـەزمـوونانـەی لە ژیـاندا وەدەسـتـمـان هێنـاون، هەر یەک لە ئێـمـە لە ناسـینەوەی کـۆمـەڵە جـیـاوازییـەکی تایبـەتدا شارەزاییمان پەیدا کردووە. ئەو شتـەی کە خەڵکی تر هـەر بیریان بۆی ناچێ، بۆ ئێمە وەک ڕۆژی ڕوون دیارە.

ئەم زانیـارییە دەسکەوتێکی سـەرسوڕهێنە کە بەدژواری دەست کەوتووە و بەنرخـە. بەڵام با لەگـەڵ ڕوو خـوێندنەوەدا تێکەڵ نەکرێ. سـوپاس بۆ خـوا کـە خـوێندنەوەی ڕوو یارمـەتیی خەڵک دەدا بۆ ئەوەی دڵیان خۆش بکەن. تەنانەت ئەگەر شێوەی ژیانیشت وا بخوازێ کە تۆ بەشـێوەیـەکی ڕۆتینی هـیـلاکـیی ناو ڕووی خـەڵک بخـوێنـیـیـەوە، هۆیەکـەی خـودی خـۆتە کـە ناچـارت دەکـا لـەو ڕێگەیـانەوە سـەیری ڕوو بکەی کـە شـتـێکی زیاترت پـێـشـان بدەن. تارماییەکانی تراژیدیا دەتوانن قاڵمان بکەن، بەڵام تیشکی بەهەرەش هەمان توانای هەیە.

## دەربڕین

دەستت داگرە و چاوت بکەوە، ئێمەی ئەمەریکی بەهۆی حەزکردنمان لە دەربڕین خوومان بەوە گرتووە زۆر سـەیری ڕوو بکـەین. کولتووری گشـتیی ئەمریکی ئـێمـەی لە تێڕامـان لە ڕووی یەکتری ڕاهێناوە و ئەمـەش بەهیچ شێوەیەک نەریتێکی جیـهانی نییە. تەلەڤزیۆنیش لەوە ڕامـان دەهـێنێ تـا ببـینە بینـەری دەربڕین. ئـەو کـاتەی تـۆ فـێـردەبی چـۆن سـەیری تەلەڤـزیۆن بکـەی، لەوە تێ دەگـەی کە نواندن کلیلی هـەمـوو دیمەنە گـرینگەکانە. تـانوپۆی چیرۆک چڕ دەبێـتـەوە و دێتە جـۆش. ڕێک لەو کاتەدا کـامێرا بۆ گرتنی دیمەنێکی بەهێزی شڵـەژانێکی عاتیفی بۆ پێشەوە دەچێ. مۆسیقـای پشتەوەی دیمەنیش پرتەپرتی لێوە دێ. تۆ لەوە تێ دەگەی کـەرەسە بنچینەییـەکانی چیرۆک، جـا هـەر چیرۆکێک بێ، ئەو شتـەیە کە دەتوانی بیبینی و بیبیستی.

بەڵام ئاخۆ ئەوە بەڕاستی هەر بەم شێوەیەیە؟

دووبارە، باشترە دان بەوەدا بنرێ کە ڕاستی زۆر توێی هەیە. دەربڕین وەک ڕێگەیەکی ناسینی خەڵک بەسوودە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کەموکووڕیی هەیە.

کاتێک تۆ پشت بەدەربڕین دەبەستی دەرگەی هەڵخەڵەتان ئاوەڵە دەکەی. لە تەمەنی منداڵیدا هەموومان فێری ئەوە بووین چۆن ڕووخسارێکی ویستراو بنوێنین. مەرج نییە ئەمە تەنانەت درۆش بێ و زیاتر لەوە دەچێ کە خۆت بخزێنییە ناو مەودایەکی عاتیفی و بەئاسانی بڕیار بدەی کە درۆیەکە ئەو بەشە واقیعەیە کە دەبێ بوترێ.

وا دابنێ تۆ چاوت لە "بۆبی"ی کوڕت مۆڕ کردووەتەوە:

"ئەوە خەریکی خواردنی ئەو پسکیتە بووی؟"

بۆبی بەوردی مایکرۆساتی نێوان ئاودیوکردنی پسکیتەکە و هاتنە ژوورەوەی تۆی بەبیر دێ و دەڵێ: "نا باوکە، خەریکی بازدان لەسەر کاناپەکەدا بووم".

ڕوویەک کە بێ تاوانیی لێ دەبارێ زەق چاوت تێ دەبڕێ.

ئای لەوە!

ئەگەر بۆ شارەزابوون لە کەسێک پشت ببەستێ بەڕووی ئەو کەسە و جەختەکە لەسەر دەربڕینی سەر ڕووی بێ، ئەوا دەربڕینەکە جگە لە هەڵخەڵەتاندن کەموکووڕیی تریشی هەیە. دەربڕین میزاج پێشان دەدا و میزاجیش شتێکی کورتخایەنە و دواتر واقیع جێی دەگرێتەوە. چەندجار گوێبیستی چیرۆکی خەمباریی هاوڕێیەک بووی کە بەم وشانە دەستی پێ کردبێ: "متمانەم پێی کرد لەبەرئەوەی ئەو یەکجار نەرمونیان بوو".

"نەرمونیان"ی لە ژوانێک یان چاوپێکەوتنێکی دۆزینەوەی کاردا بەوردی هیچ شتێکت لەبارەی هەڵسوکەوتی بەردەوام کەسێک بۆ ئاشکرا ناکات، جا چ جای شێوازی کەسیی ئەو کەسە لە دەسەڵات یان دۆستایەتی یاخۆ کاردا. بۆ دەستەبەرکردنی زانیاریی لەو جۆرە تۆ پێویستیت بەڕوو خوێندنەوەیە. بەپێچەوانەی ڕوونواندن، هێماکانی ڕوو ساختە نین، ئەمەش بەرەو جۆرە زانیارییەکی وردترمان دەبا.

لە هەموویان خراپتر، دەربڕینی نیوەچڵە.

خەڵک کاتێک زەقزەق سەیری ڕوو دەکەن، دەڵێن: "چاو نەینۆکی ڕۆحە". زۆر جار ئەوان خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن. بەدڵنیاییەوە کرۆکی ڕۆح لەوێدایە بەڵام سۆزیش لەوێ هەیە. زۆربەی کات خەڵک کاردانەوەی بۆ سۆز دەبێ، نەک بۆ ئەو ڕۆحەی لە قووڵاییدایە.

بەڵام با ئەمەت لە مێشک بێ: بۆ ڕووخوێنەوان تەواوی ڕوو نەینۆکی ڕۆحە.

تۆ ئێستا چۆن ڕوو دەخوێنییەوە؟

ئەمە تاقیکردنەوەیەکی بچووکە یارمەتیت دەدا چۆنیەتیی خوێندنەوەی ڕوو بەشێوازی ڕووخوێنەوان، بەرجەستە بکەی.

ڕاستە یان چەوتە؟ "وەڵامەکان لە کۆتاییی ئەم بەشەدان".

١- تێبینیکردنی دەربڕینی سەر ڕووی کڕیارەکەت یارمەتیت دەدا، بەسەر دۆخەکەدا زاڵ ببی.

٢- هەرگیز متمانە بەکەسێکی چاو زەنگیانەیی مەکە.

٣- هەرگیز متمانە بەکەسێک مەکە کە بەردەوام ئاراستەی نیگای دەگۆڕێت.

٤- زۆربەی خەڵک لەچاو ئەندامەکانی تریان زۆر حەز لە چەناگە ناکەن.

٥- ئەو پیاوانەی ڕدێن بەردەدەنەوە ڕەنگە چەناگەیەکی ناتەواوی پێ بشارنەوە.

٦- خەڵکی لێو پڕتر، سێکسیترن.

٧- بیرتیژی لە شێوەی کاسەی سەردا بەدەر دەکەوێ.

٨- پێ دەچێ خەڵکی سەر بەهەمان ڕەگەز شێوەیان لە یەکتری بکا.

٩- پاش تێرامان لە ڕووی کەسێک دەتوانم لە هەڵسەنگاندنە سەرپێییەکانی خۆم سەبارەت بەکەسایەتییەکەی دڵنیا بم.

١٠-من هەموو شتێکی گرینگ لەبارەی شێوەی ڕووی خۆم دەزانم.

## ئامانجێکی نوێ بۆ لە ڕوو ڕوانین

ئامانج یەکەم تەکنیکی سەیرکردن لەسەر شێوازی ڕووخوێنەرەوانە. ئامانجی تۆ لە بەکارهێنانی چاوت و مێشکت و دڵت چییە؟ بۆ ڕووخوێندنەوە تۆ سەیری ڕووی کەسێک دەکەی. مێشک و دڵیشت یارمەتیت دەدەن تا خێرا بتەوێ شارەزای ئەو کەسە بی.

تکایە، من مەبەستم ئەوە نییە بەزۆری هەڵوێست بگری، هەروەک چۆن لە مووچڕک پێداهاتنی پاڵەپەستۆ خستنە سەرخۆدا بڵێی: "وا بزانم دەتوانم بیکەم... وا بزانم دەتوانم بیکەم... وا بزانم دەتوانم بیکەم..." تەنیا ویستێک بەسە بۆ ئەوەی شتەکە سەربگرێ. پاش ئەوەی ویستەکەت یەکلا کردەوە، دەتوانی لە ڕوودانی شتەکە دڵنیا بی. شتەکە هەروەک ئەم پەندە سەرسڕمێنەیە کە دەڵێ: "لە تۆ حەرەکەت و لە خواش بەرەکەت".

یەکێک لەو هۆیانەی ڕوونی دەکاتەوە بۆچی چۆنیەتیی ڕاهاتنمان لە سەیرکردنی ڕوو دەتوانێ بەربەستێکی زۆر گەورە بێ، ئەوەیە کە زۆربەمان بەدرێژاییی خوێندنی تەمەنی منداڵیمان لە وانەبێژانی وانەی وەک ژمێرە و وانەی هاوشێوە فێری ئەم بنەما بنچینەییە بووین: " هەر ئەوەندە سەیر بکە کە زیرەکی خۆت پێشان بدەی".

باشترین ئەو ڕووخوێنەرەوانەی من چاوم پێیان کەوتبێ، بێ فیزن. ئەوەش لەبەرئەوە نییە کە ئامانجم ئەوە بێ: «دەمەی بێ فیزیی خۆم پێشان بدەم»، بگرە لەبەرئەوەیە کە ئامانجی وەک ئەمەیان هەیە: «حەز دەکەم شارەزای ئەو کەسە بم»، «حەز دەکەم لەو کەسە فێر بم»، «حەز دەکەم خزمەتێک بەو کەسە بکەم».

ئەگەر شارەزای ڕێگە زۆرەکانی سەیرکردنی ڕوو بووی، ئەوا بێ ئەوەی هەستی پێ بکەی خووەکانی خۆبەدەرخەریش لە ناو دەبەی. تەنانەت و بەتایبەتیش ئەگەر ئەم خوویانە هەست پێ نەکراو بن، پێویستە وازیان لێ بهێندرێ.

کەواتە ڕەنگە ناوە ناوە پێویست بێ لە ناخەوە خۆت ڕابتەکێنی. هەناسەیەکی قووڵ هەڵبکێشە. هێمن بەوە. ئەو شتەی ئێستا دەبێ ئەنجامی بدەی ڕوو خوێندنەوەیە. ڕێگەکانی تری تێڕامان لە خەڵک دەتوانن تا ماوەیەکی تر چاوەڕوان بن.

## لە یەک ئاستدابوون لەگەڵ ڕوو

کاتێک خەریکی خۆئامادەکردنی بۆ خوێندنەوەی ڕووی کەسێک، لە گۆشەیەکی ڕاستەوە بڕوانە. هەمان شت بۆ باشترین خوێندنەوەی ڕووی خۆت لە ناو نەینۆکدا بەکار دێ.

– لە خوارەوە بۆ سەرەوە و بەپێچەوانەشەوە سەیری خەڵک مەکە. بۆ دیتنی واقیع لەگەڵ ڕوویان لە یەک ئاستدا بە.

تێڕامان هەروەها لە کاتیشت دەبا بەڕادەیەکی زۆریش لەو ماوەیەدا کە تۆ سەرقاڵی ڕاهاتنی لە چۆنیەتیی سەیرکردنی شتێکی نوێ. بۆ نموونە کاتێک بتەوێ لە لووت ورد ببییەوە، ئەگەر تەنیا چاوپێداگێڕانێکی سەرپێیت کرد و گەیشتییە ئەو ئەنجامەی کە خاڵی گرینگ برێتییە لەوەی ڕووەکە لووتێکی زلی لەسەر قووت بووەتەوە، ئەوە بەس نییە. بگرە دەبێ ئەوەندە سەیر بکەی تا بتوانی لووتەکە بەلەباری ببینی. بزانە: "لووتەکە چەند گەورەیە؟" و جارێکی تریش بڕوانە. بزانە کام هێما ئەم یەکەم هەستەی ورووژاندووە؟ هەریەک لەم هێمایانە بۆی هەیە ئەم هەستە بخوڵقێنێ:

- درێژیی لووتێکی درێژ
- دەرپەڕینی لووتێکی درێژ لە لاڕووەوە
- چەماوەیەکی زەق کە لە لاڕووەوە بەدەر بکەوێ
- پاناتیی لووت لە ناوچەی ئێسقانی لووتدا
- پاناتیی لووت لە سەری لووتدا
- پاناتیی تەواوی لووت
- لووتێک کە بەشێوەیەکی زەق بەرەو خوارەوە پان بووەتەوە
- سەرە لووتێکی گۆشتن
- دووەمین ڕووبەری یەکەمایەتیی گەورە

پێت سەختە؟ نیگەران مەبە. ئەم کتێبە ڕێبازێکی گونجاو پێشکێش دەکا کە سەیرکردنی بەشەکانی ڕووت بۆ ئاسان دەکا. ئەندامە سروشتییە جۆراوجۆرەکانی وەک گوێ بەشی تایبەت بەخۆیان بۆ تەرخان کراوە. هەر ئەندامێک "Feature" چەند جۆرێکی "Category" هەیە کە هەریەکەیان کۆمەڵێک هێما "Trait" یاخۆ بەندی زانیاری لەبارەی ڕووی لەخۆ گرتووە. لووتی درێژ یەکێکە لە هێماکان و لووتی کورت ئەوەی تریانە. ناو ئەم کتێبە هێمایە جیاوازەکانی سەر بەهەر جۆرێکی ڕێک خستووە. وەک یارمەتییەک بۆ ڕاهاتنی چاوت لە بەجیا ناسینەوەی هێمایەک هەر وێنەیەکی ناو سێتەکە جگە لە جیاوازیی ئەو هێمایەی کە تۆ فێری دەبی، جیاوازی لەگەڵ وێنەکانی تردا نییە. لە بنەڕەتدا تۆ هەرگیز چاوت تەنیا لە دیتنی هێماکان ڕاناهێنی.

هەروەها هێمایەکیش واتایەکی هەیە. هەر کاتێک تۆ هێمایەکت لە ڕووی کەسێکدا دیت ئەوا وەسفی ئەو هێمایە لەسەرهەر کەسێک کە تووشت دەبێ و خاوەنی هێماکەیە جێبەجێ دەبێ. کەواتە لێرە بەدواوە تۆ دەتوانی نهێنییەکانی هەر ڕوویەک بخوێنییەوە.

پێشتر گاڵتەم دەکرد کە وتم منداڵ ئەوەندە بەزوڵاڵییەوە واقیع دەبینێ کە فروفێڵی جادووگەری کاری تێ ناکات. کاتێک تۆ بەڕوونییەکی زیاتر ڕوویەک دەبینی ئەوا وەهمەکانیش دەبینی. ئەوە جۆرە سیحرێکە کە تا بەتەمەندا بچی کاراتر دەبی.

پرسیار: مەگەر خوا یارمەتیم بدا دەنا بەنزیکەیی وەک کیسەڵ تەپم. بەدڵنیاییەوە دەمەوێ ڕوو بخوێنمەوە، بەڵام ئاخۆ دەتوانم؟

وەڵام: ئەگەر ئەوەندە خێرا بی کە بتوانی وشەکانی سەر لاپەڕەیەک بخوێنییەوە واتە

بەڕادەی پێـویست خـێـرای بۆ ئەوەی ببی بەڕوو خـوێنەوە. وە بیـر لەوە بکەوە ئەو کـاتەی هێـمـاکـانی ڕوو بێ واتا بوون چ پێـویسـتی دەکرد تۆ هـەسـتـیان پێ بکەی؟ شـتـەکـە وەک خـوێندنـەوەیەکی بەردەوامـە. بەر لەوەی تـۆ فـێری نووسین بی، پیتی وەک ب و د و پ و ک و وەک مژمـژۆکە وابوون. هێمـاکانی ڕوویش لە خـودی خۆیاندا جۆرە ئەلفوبێیـەکن. کاتێک تۆ فـێریان بووی، دەتوانی بیـانخـوێنییـەوە. وە کـاتێـک تۆ شـارەزای ئەم جـۆرە خـوێندنە بووی، سـەرت لە ئاست ساناییـی ڕوو خوێندنەوەدا سرِ دەمـێنێ. هەندێک جار لە مێـوانداریيەکـان بۆ سـەرگـەرمی کـار دەکـەم. هەرچەندە بەرامـبـەر بەتیـپـێکی مـۆسـیـقـا یان سـەمـایەکی چوارگـۆشـەییـە، هێشـتـاش لە خـوێندنەوەی ڕوو بەردەوام دەبم و، کـاتێک هەوڵ دەدەم بۆ ئەوەی لە ناو ژاوەژاوەدا کـرد قسـەم ببیسـترێ، دەنگم دەنووسێ. بەڵام لە دیتنی هێمـاکانی ڕوو و تێگەیاندنی واتاکانیان تووشی گرفت نابم. خوێندنەوەی ڕوو وەک هەر شارەزاییيەکی تری ژیانە. ئێمە لەو شتانەی کە بەلامانەوە گرینگە لەسەرخۆین.

پرسـیـار: من بەناوی هەمـوو قـوتـابییـانی تۆ کـە هونەرمـەندن، دەمـەوێ سـکاڵایەک بکەم. ڕەنگ لە ڕوودا شـتـێکی یەکجـار دڵڕفێنە، ڕوو هەمـووی هـەر ڕەنگە. ئەمـە دەسـتـڕەنگینیی خوایە، وا نییە؟ کەواتە بۆچی لە ناو سیستەمەکەتدا شوێنێک بۆ ڕەنگیش ناکەیەوە؟

وەڵام: بەلای منەوە شـتێکی دڵخـۆشکەرە کە هـونەرمـەندێکی وەک تۆ پێم سـەرسـام بووە. بەڵام بەرامـبـەر بەهەر دڵێکی پاک کـە شـەیدای جوانییە بـێ خـەوشـەکـەت نەرماتیی پێسـتت یان ڕەنگی پرچت بووە، ئاخۆ کۆمەڵە خـەڵکێکیش شک نابەی کە ڕەنگی پێستی تۆ هەروەک هۆیەک بۆ پۆلێنکردنت بەکار دێن و بەم شێوەیە لە ڕاستیدا هـەر بەهیچ هەژمارت ناکەن.

پرسـیـار: ئەی ئەگـەر سـەیری ڕەنگیش بکەین و تەنانەت وشـەیەکیش نەدرکـێنین؟ بۆچی نابێ چی تر شەیدای ئەم ڕەنگانە بین؟

وەڵام: کـە داوات لێ دەکـەم لە ڕوو خـوێندنەوەدا ڕەچاوی ڕەنـگ نەکـەی خـۆ هەرگـیـز مـەبەسـتم ئەوە نیـیـە لە کـاتەکـانی تردا چێـژی لێ وەرنەگـرێ. تۆ دەتوانی وێنەی خـەڵک بەڕووتیـشـەوە بکێـشێ بەڵام بێگومـان کـە تووشی هـەرکـەسـێک دەبی تەنیـا بۆ پەرەدان بەسەلیقەی هونەریی خۆت، خۆ داوای لێ ناکەی جلەکانی داکەنێ. فیزیۆگنۆمی بەڕەنگێکی نەگۆڕی کورتخایەن دابنێ. کاتێک تۆ بەسـەر شـێوازە بەردەوامەکانی خۆت بۆ ڕامان لە ڕوو کـە تێـیدا بەزۆری ڕەچاوی ڕەنگ دەکـرێ، باز دەدەی، ئەوا ڕێگە بە توانـای خـۆت دەدەی تا تێبینیی شتی تری بەهەمان ڕادە جوانیی ناو ڕوو بکا.

## ئێستا چۆن ڕوو دەخوێنییەوە؟

وەڵامەکان

١- چەوت: ئەگەر ڕەچاوی دەربڕینی سەر ڕووی کڕیارەکەت بکەی، بەدڵنیاییەوە ئەم کارەت وەک ئاو لە هێڵەککردنە. بەڵام ڕەنگە زیاتر لەوەی بتەوێ بەچالاکی بۆ گۆڕینی هەستەکانی بەرامبەرەکەت چالاکانە هەوڵ بدەی، کاردانەوەت بەرامبەر بەهەستەکانی هەبێ. بۆ ئەوەی کەسێکی میزاج ناخۆش، دڵخۆش بکەی ڕەوتی گفتۆگۆیەکە بخە ژێر ڕکێفی خۆت کە ئەمەش لە ڕێی خوێندنەوەی هەست و بیری کڕیارەکەوە دەبێ. بۆ نموونە بۆ خوێندنەوەی ڕوو سەیری شێوەی برۆ و گۆشەی گوێ بکە.

٢- چەوت: چاوی زەنگیانەیی هەر چۆنە؟ گشت ئەو هەستەی وات لێ دەکا کەسێک بەچاو زەنگیانەیی دابنێی دەشێ بەهۆی هەریەکە لەم فاکتەرانە بێ: بچووکیی قەبارەی چاو، چاوی لێک نزیک، چاوی قووڵ، وە یان پفی سەرچاو. کاتێک زانیت چۆن ئەم هێمایانە دانە بەدانە شی بکەیەوە لە واتایان تێ دەگەی و ڕەنگە واتاکەیان بەپێچەوانەی پێشبینیی خۆت بێ.

٣- چەوت: ئەگەر کەسێک حەز نەکات چاو ببڕدرێتە ناوچاوی، واتای ئەوە نییە کە کەسەکە بەمسۆگەری تەڵەکەبازە. شەرم و نائارامیی سێکسی و خەمۆکی هۆیەکانی چاوی ئاراستە بگۆڕن. لە ڕاستیدا ئەمەریکییەکانی سەر بەکولتووری جیاواز هەندێک جار وا پەروەردە کراون کە وەک هێمایەک بۆ ڕێزلێنان چاو نەبڕنە ناو چاوی کەسانی تر.

٤- چەوت: بەپێی لێکۆڵینەوەیەک کە لە"سایکۆلۆجی تودێی"دا هاتووە، ٣٠ ملیۆن ئەمەریکی حەز لە چەناگەیان ناکەن بەڵام ٦٠ ملیۆنیان ڕقیان لە لوتیانە. بەڵام خەمڵاندنێکی سەرەکیتریش هەیە: من کە بەردەوام چاودێریی کاردانەوەی پێوەندیکەرەکانم کردووە بۆم دەرکەوتووە کە ٩٩٪ی کارهێنەکانم پاش ئەوەی لە واتای شاراوەی ئەو هێمایانەی ڕوو کە ڕقیان لێ دەبووەوە، تێ دەگەیشتن، بەبۆچوونی تۆ ئاخۆ چ کاردانەوەیەکیان هەبوو؟ ڕێزێکی تایبەتیان لە ڕووی خۆیان دەنا.

٥- چەوت: بە ڕدێن بەردانەوە پیاو دەرفەتی گۆڕینی شێوەی چەناگەی خۆی بۆ دەرەخسێ. لە کاتی ڕوو خوێندنەوەدا ئەو شتەی کە دەیبینی گرینگە و، بەهۆی ویستی ئازادە کە ڕوومان بەجۆرەها ڕێگە گۆڕانی بەسەردا دێ. ڕدێنیش یەکێکە لەو ڕێگەیانە. کاتێک پیاو چەناگەی خۆی بەڕدێن دادەپۆشێ، ئەو چەناگەیە دەگۆڕێ، کەسایەتییە

دەروونییەکەش بەم شێوەیە گۆڕانی بەسەردا دێ.

٦- چەوت: هەر کەس بۆی هەیە سێکسی بێ... وەیان ئاوا نەبێ «بۆ خۆشت وا ڕێک کەوتووە کە ڕۆژێک لە چاو ڕۆژەکانی تر زیاتر سێکسی بوویی، وا نییە؟» ئەمەیان ڕێگەیەکی مسۆگەرترە بۆ خوێندنەوەی لێوی کەسێک: پڕیەتیی لێو پێوەندیی بەخۆئاشکراکردنەوە هەیە، چەندی لێو گۆشتنتر بێ ئەوەندە کەسەکە بەئاسانتری زانیاریی کەسیی خۆی دەدرکێنێ.

٧- چەوت: فرێنۆلۆجی کە لە ڕێی خوێندنەوەی قۆرتەکانی سەر کەللەوە پێوانی بیرتیژیی کەسێک دەکا زۆربەی کات وەک ڕێگەیەک بۆ پۆلینکردنی خەڵک بەباش یان بەخراپ بەکار دەهات و گومان لە وردییەکەی کراوە. نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو، وەک ڕێگەیەک بۆ قووڵترکردنی شارەزاییمان لە خەڵک سوودی لێوە وەردەگیرێ، نەک بۆ دوورکەوتنەوە لەم شارەزاییە. ڕوو هیچ پێوەندییەکی بەفرێنۆلۆجی و ئەفسانە و باوەڕ بەچارەنووسەوە نییە "بەگوێرەی زانیاریی گشتی ڕووی مرۆڤ هەرچۆنێک بێ، لە چاو بەشی پشتەوەی سەری مرۆڤ، شتێکی ڕۆشنکەرەوەترە".

٨- تەنیا ئەو کاتەی زۆر لە نزیکەوە سەیر نەکەی: هەرچەندە ژمارەیەکی کەم لە هێماکان وەک ڕەنگی پێست و پێکهاتەی موو بەسن بۆ مەبەستی کلێشەسازی، بەڵام لێکچوونە ڕەگەزییەکان بەشێکی گرینگی نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو نین. ئەو کاتەی تۆ فێر دەبی بەشیاوی ڕوو بخوێنییەوە خەڵک کەمتر وەک کلێشە و زیاتر وەک تاک دێنە بەرچاوت.

٩- چەوت: ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنانە زۆربەی جار ناتەواو و هەڵخەڵەتێنەرن و پێشبینییەکانی کەسی هەڵسەنگێنەر بەدی دەهێنن. لە ڕێی ڕوو خوێندنەوەوە پەرە بەتێکڕای گورجوگۆڵی و هەروەها ڕەوشی پێوەندییەکانت بدە.

١٠- لەوانەیە: کۆمەڵگە فێرمان بکا بەڕێگەگەلی ئەوتۆ سەیری ڕوو بکەین کە لە هەمان کاتدا هەم سنوردار و هەم سنوردانەرن. ئێمە خولیای ڕەنگ و هەمەڕەنگی و شێواز و بیروباوەڕی نوێ و ڕووین. ئەو کاتەی تۆ فێری خوێندنەوەی ڕوو دەبی ڕەنگە شتی ئەوتۆ لەبارەی ڕووی خۆت بدۆزییەوە کە پێشتر هەرگیز تێبینیت نەکردوون و، لەوە تێ دەگەی کە هەر هەموویان زۆر واتاهەڵگرن.

٤

## برۆ

هەر هەمووومان لە چۆنیەتیی سازدانی دەمەتەقێیەک شارەزایـن. ئێمە خەڵکی نەناس لە ڕێگەی باسکردنی بابەتی گشتی وەک کەشوهەوا دێنینە قسە. هەندێک جار تەنیا بۆ دڵخۆشکردنی خەڵک ئەم ڕێگەیە دەگرینەبەر. بەڵام یەکێکی وەک تۆ پلانێکی تری لە مێشکدا دەخولێتەوە: تۆ پڕ بەدڵ دەتەوێ کەسەکە بناسی. ئەگەر پزیشکەکانی دەروونی دەتوانن لە تێستی ڕۆشادا پەڵە مەرەکەب بەکار بێنن، ئەی بۆچی تۆش بۆ ناسینی خەڵک کەڵک لە پەڵە هەورێک وەرناگری؟ ئەو کاتەی تۆ باسی بابەتێکی ئاشکرای وەک کەشوهەوا دێنییە پێش، ڕێگەی لێکۆڵینەوە لە نهێنییە کەمتر دیارەکانی سروشتی مرۆڤ هەموار دەکەی.

یەکجار زۆر لەبەرئەوەی کە تۆ سەبارەت بەخەڵک زانینخوازی، حەز دەکەم برۆت پێ بناسێنم کە لەمەودوا لە ڕووی هەر کەسێکی نەناسدا چاوت پێی دەکەوێ. وە تۆش حەزت لێیە شارەزای برۆ بی. بۆ ڕووخوێنەوەیەک یەک خولەک خوێندنەوەی برۆ دەتوانێ هێندەی یەک سەعات سەرقاڵبوون بەتەنیا دەمەتەقێیەک، زانیاری لەبارەی شێوازەکانی بیرکردنەوەی کەسێک دابین بکا.

### موو؛ لە کوێ ڕواوە؟

شێوەی ڕوانی مووی برۆ ئامارێکی سەرەکییە. بۆ خوێندنەوەی ئەم ئامارە لە نزیک لووتەوە دەست پێ بکە و بەرەو لای گوێ برۆ. بەجیا تەماشای هەر یەکە لە برۆیەکان بکە.

– برۆی تاجدار باوترین هێمایە. سەرەتاکەی چڕوپڕە و دوایی تەنک دەبێتەوە تا لە کۆتاییدا وردە موو یان هیچموویەک نادۆزیتەوە.

– برۆی سەراوبن بەپێچەوانەی برۆی تاجدارە. چەندی موو «بەڕێژەیەکی زۆریش» لە

نزیک لووتەوە ڕوابێ ئەم ڕێژەیە بەرەو لای گوێ زیاد دەکا.

– برۆی ڕێک لە سەرەتاوە بۆ کۆتاییەکەی هەمان ڕێژەی مووی هەیە.

پرسیار: ئەی ئەگەر برۆ پڕ یان تەنک بوو؟

وەڵام: ئەوە جۆرێکی جیاوازە: پێی دەوترێ ڕێژەی موو.

پرسیار: ئەی ئەگەر برۆیەک وەک چەماوە هاتە بەرچاو؟

وەڵام: ئەوەشیان جۆرێکی ترە: پێی دەوترێ شێوەی برۆ.

پرسیار: باشە ئەی ڕەنگی برۆ؟ ئاخۆ ئەگەر ڕەنگی برۆ تۆختر بێ ئەوا پرتر ناهێتە بەرچاو؟

وەڵام: ئاخر ئەگەر تۆ ڕووخوێنەوەیەکی ورد بی لە یەک کاتدا تەنیا بۆ یەک هێما چاو دەگێڕی کە ئەویش ڕێژەی موویە. ڕەنگەکەی گرینگ نییە.

پرسیار: ئەی ئەگەر میکیاژی پێوەبوو؟

وەڵام: نیگەران مەبە و بەتایبەتیش ورە بەرمەدە. ئەو کاتەی تێرامانێکی ڕووخوێنەرەوانەی باشت هەبێ دەتوانی ژێر میکیاژیش ببینێ، بڕوام پێ بکە وایە.

دەی، هەرکەسە با ئەینۆکی خۆی هەڵبگرێ. چی دەبینی؟

شێوەی ڕوانی موو ئاماژە دەدا بەوەی کە چۆن کەسێک وردەکارییەکان جێبەجێ دەکا. شێوەی سروشتیی برۆ هاوتای ئەو شێوازەیە کە لە پرۆژەیەکی ناو ژیانی واقیعدا پێڕەو دەکرێ.

خاوەن برۆی تاجدار لە دەستپێکردنی پرۆژەی نوێ بەهرەمەندە. دەستپێکردنی شتێکی نوێ جۆرە گوروتینێکی تایبەتی دەوێ. کاردانەوەی ڕێ تێچوو برێتییە لەوەی کەسەکە پاش ئەوەی پرۆژەکە دەکەوێتە گەڕ، لێی سارد دەبێتەوە. ئەگەری ڕوودانی ئەم بارە لە ئارادایە ئەگەر کەسەکە ئەو وانەیەی ژیانی وەرنەگرتبێ کە چۆنیەتیی هاوسەنگکردنی پاڵنەری داهێنانی لەگەڵ ئەو یەکدڵییەی کە بۆ بەرەواجوولانەوە لەگەڵ بیرۆکەکانی پێویستە، ڕوون دەکاتەوە.

– ئەگەر برۆی تۆ لە ناوەڕاستدا تەنک بووبێتەوە، بەشێوەیەکی نموونەیی تۆ لە ناوەڕاستی پرۆژەیەکدا لێی سارد دەبییەوە.

– ئەگەر برۆت پاش سێیەم چارەک تەنک بووبێتەوە، ئەوا سێ چارەک لە پرۆژەکە



برۆی ڕێک



برۆی تاجدار



برۆی سەراوبن

دابەشبوونی موو لەناو برۆدا

جێبەجێ دەکرێ تا تۆ هەست بەوە دەکەی بەناو زۆنگاوی بێزاریدا گوزەر دەکەی.

– ئەگەر پاش تەنیا یەک چارەک برۆت تەنک بووە «هەروەک برۆی من کە هەروەک پێشتر باسم کرد تێمێسی مێیری تاساند»، کەواتە بۆ بەردەوامبوونت ڕووبەڕووی ئاریشەیەکی سەرەکی دەبیتەوە.

بۆچی ئەم گوڕوتین برانە سەرهەڵدەدا؟ لایەنە ئەرێنییەکە برێتییە لەوەی کەسی خاوەن برۆی تاجدار، بەبەراورد لەگەڵ کەسانی خاوەن جۆرەکانی تری برۆ، بیرۆکەی زیاتری بۆ پرۆژەی نوێ لەلایە. هەر کە بتوانێ ئەوەندە ئەنجام بدا تا پرۆژەیەک بخاتە سەر پێ، داهێنەرایەتییەکەی هانی دەدا تا پرۆژەی دواتر بخاتە ناو لیستەکەی.

ڕەنگە خەڵکی خاوەن ئەم جۆرە برۆیە، خەیاڵخاوانە بۆ جێبەجێکردنی وردەکارییەکان پشتپێبەستراو نەبن. بەڵام کاتێک تۆ پێویستیت بەسروشێکی نایاب هەبێ سوود لەم خەڵکە وەربگرە. سێ نوێکاری خاوەن برۆی تاجدار برێتین لە "تۆماس ئیدیسۆن" و "فلۆرێس نایتینگڵ" و "لوویس پاستۆر". وە هەرچەندە خەڵکی خاوەن برۆی تاجدار لەلایەن سیانگ مێینەوە لەبەرئەوەی لە ژیاندا زۆریان پێ ناکرێ کەسانێکی ناوشکاون، بەڵام "هێربێرت وێخنێر" نموونەیەکی خراپ نییە. ئەو خاوەن ئەو بەهرە چیرۆکنووسییەیە کە بەهۆیەوە "The Limited" لە دایک بوو. دوا بەدوای ئەمەش ژمارەیەکی کەم بەرهەمی تری نووسی بەلەخۆگرتنی "Victoria’s Secret" و "Lane Bryant" و "Henri Bendel".

برۆیە تاجدارەکانی "ماتیۆ هێنسن"ی دۆزەرەوە ڕەنگە دەرفەتی ئەو دەستپێشخەرییەیان بۆی ڕەخساندبێ تا تەواوی ناوچە ساردەکانی بپێوێ و ڕێگەی خۆی بۆ گەشت بەرەو جەمسەر بگرێتە بەر یارمەتی و مادام باسی سەهۆڵ هاتە پێش با "بۆنی بلێیر"ی خاوەن برۆی تاجدار لە یاد نەکەین کە هێشتاش خێراترین ئافرەتی ئەمەریکییە لە خلیسکێنێدا.

خەڵکی خاوەن برۆی تاجداری پڕ، بەدڵنیاییەوە دەتوانن براوە بن. بەڵام تەنیا پێویستە بۆ بەردەوامبوونیان زیاتر تێ بکۆشن. ئەوان ڕەنگە بیر لە کارکردن لەگەڵ خەڵکی خاوەن برۆی سەراوبنیش بکەنەوە.

هەرچی کەسی خاوەن برۆی سەراوبنیشە لە بەدواداچوونی وردەکارییەکاندا بەهرەمەندە. چەندی زیاتر بچێتە ناو پرۆژەیەک وردەکاریی زیاتر دەدۆزێتەوە کە پێویستی بەدواداچوون هەیە.

کەواتە ئاخۆ ڕێی تێ دەچێ ئەو کەسە لە پێناو گەیشتن بەتەواوەتییەکی بێ کۆتا سەر لە

خۆی بشێوێنێ؟ بەڵێ. بەڵام کەمتەرخەمیش ڕەنگە گرفتێک بێ. ئێستا من مەبەستم هەموو جۆرەکانی کەمتەرخەمی نییە لەبەرئەوەی زۆر جۆرە کەمتەرخەمی هەیە. کەسی خاوەن برۆی سەراوبن لە جۆرێکی دیاریکراوی تەمەڵی ڕاهاتووە. ئەو دژی دەستپێکردنی پرۆژەیەکی نوێ بەرهەڵستی دەکا. وا دیارە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەسانی خاوەن برۆی سەراوبن، دەزانن چ چارەنووسێک چاوەڕوانیان دەکا. ئەم کەسانە دەزانن لە کارێکی شڕوپڕدا شتێک بەناوی "خێرا" بوونی نییە. پیاوێکی برۆ سەراوبنی ناسیاوم سێ ساڵی پێ چوو تا بڕیاری دا شوێنی جل هەڵواسینی ناو ژووری نووستنی ڕێک بخاتەوە. پاشان ڕێکخستنەوەکە شەش سەعاتی خایاند. کارەکەش هەڵبەتە بێ کەموکوڕی بوو.

برۆ سەراوبنەکان کە دەگەنە پلەی ئاسایی کارایی و چالاکیی خۆیان، وەک تەقەمەنییان لێ دێ. بەنزیکەیی دەقاودەق ئاوان. سیانگ میێن دەڵێ ئەوان سەربازی لێهاتوویان لێ دەردەچێ – ئەوان ئەو تەقەمەنییەن بۆ شەڕێکی درێژخایەن پێویستە. ئەم وەسفە بەڕادەیەکی زۆر بۆ ئەو برۆیانە دەست دەدا کە لە ڕوویەکی لەبزینەییی خاوەن کوڵمی دەرپەڕیودا جێگیر بن. تۆ ئەم ڕووەت لە تەلەڤزیۆن بینیوە. مەبەستم ڕووی "ویلیام سکاتنر"ە کە بەشێوەیەکی درەوشاوە ئەم جۆرە هێمایانەی ڕووی بۆ دارێژراوە، بۆ ئەوەی تا ئەو کاتەی وەشانە بەردەوامەکانی "Starship Enterprise" بخوازن ئەو ڕۆڵی پاریزگارەکەی ناو ئەم بەرهەمە بگێڕێ.

خۆشبەختانە برۆ سەراوبنەکان بەکەڵکی پۆستی ئاشتیخوازانەش دێن. بیر لە کارامەییی "یۆیۆما"ی چێلۆژەن و "کێنزۆ تانگ"ی کۆڵەکەی بیناسازیی ژاپۆنیی هاوچەرخ بکەوە. ئەی هاوار، با "کێڤن ترودۆ"ی بیرمەند لە یاد نەکەین.

"گابریل گارسیا مارکز" خاوەن برۆی سەراوبنی بەئاشکرا ئەستوورە. ئەمە سەرنجی ڕاکێشام کاتێک لەواشنتۆن پۆستدا چاوم بەوێنەیەکی ڕووی کەوت. هەروەک چاوەڕێم دەکرد لە ڕوونکردنەوەی ژێر وێنەکەیدا نووسرابوو: "ڕۆماننووسەکە تەمەنێکی بەوەسفکردنی ئەم وێنە بەشکۆیە بەسەرکردووە. وە هەموو ڕۆژەکانی ژیانی بەلێکدانەوەی وردەکارییەکان ئاوا بوونە".

هەربەم بۆنەیەوە، تەنانەت ئەگەر شێوەی ڕوانی موو تاکە جۆر بێ کە بیزانی بیخوێنییەوە دەتوانم دڵنیات بکەمەوە کە لەمەودوا لە ڕۆژنامەخوێندنەوەدا تاموچێژێکی زۆر زیاتر لەوەی جاران وەردەگری.

برۆی ڕێک کە دوابابەتی ئەم لیستە تایبەتەیە نابێ هەرگیز لەلایەن کەسێکی خاوەن ئەم هێمایە پشتگوێ بخرێ. ئەگەر تۆ ئەم جۆرە برۆیەت هەبێ، دەزانی چەند بەباشی دەتوانی وردەکارییەکان جێبەجێ بکەی، لە "ئاگۆستۆ فێیلد" بپرسە کە نەک تەنیا سوود لە برۆیە ڕێکەکانی وەردەگرێ، بەلکو مووەقیتبووەکانیش کە هێمایەکی دەگمەنن و دواتر لەبارەیان دەخوێنییەوە، سوودی پێ دەگەیەنن. سەرکەوتوویەکی تری خاوەن برۆی ڕێک "نۆم میلێر"ە کــە پلـە دوای پلـە ڕێگەی ســـەرکـــەوتنی بڕی و بووە بەڕێوەبەری ئیـــداریی بڕیاردەر لـە "Interstate Battery's System"ی ئەمەریکا.

ئەگــەر برۆیەکــانت ڕێک بن پرۆســەی بیــرکــردنەوەت بەهێــواشــی بەرەو پێش دەچێ. بیرۆکەیەکت دەست دەکەوێ. پەرەی پێ دەدەی و هەموو وردەکارییە پێوەستەکانی جێبەجێ دەکەی. بەخۆت دەڵێی: "هیچ کێشەیەک نییە، کارەکە زۆر گران نییە". بەڵام، هەڵبەتە لەسەر هەســارەی فێربوون کـەموکـووڕی هەر هەیە. کـەموکـووڕییــەکەش بەپەرچدانەوەیەکی ڕێ تێچووی بچووکە کە هەندێک جار لە ڕوویەکی بەهرە لێبارێودا سەر هەڵدەدا. ئاریشـەکەش برێتییە لە: بێنکورتبوون لەگەڵ هەموو خەڵکی تر. ئێمە تێ ناگەین، بۆچی خەڵکی تر لە ئەنجامدانی ئەو کارەی کە بۆ ئێمە وەک ئاوخواردنەوە وایە ئەوەندە دەستـوپێ سپین، لە خۆمان دەپرسین دەبێ چ کێشـەیەکیان هەبێ؟ بۆ نموونە ئەگەر تۆ برۆ ڕێک بی، دەتوانی بەئاسانی لەگەڵ وردەکارییەکاندا مامەڵە بکەی. لەبەرئەوە ڕەنگە وا بزانی شتەکە بۆ هەر هەموو خەڵکی تریش دەبێ بەم شێوەیە بێ، بۆیەش ئەگەری زۆرە خۆت لە کاتی بۆڵەبۆڵیندا بدۆزییەوە: "ئەو گێلە تەمەڵە چییەتی؟ قاتی سەرەوەی بەکرێ داوە، دەنا بۆچی ئاوایە؟" یان "بۆچی ئەو کـچـە بەردەوام لە ناو وردەکــارییــەکـاندا دەچەقێ؟ بۆچی هەروەک خـۆم زوو جێبەجێیان ناکا و بەرەو پێش ناچێ؟". هەر بۆڵەبۆڵ و بۆڵەبۆڵ. ئەمە بەرگە نەگرتنی هەموو خـەڵکی ترە. بڕوام پێ بکە ئەگـەر خـەڵکی تریش هەمـان بەهـرەی تۆیان هەبووایە ئەوا بێ یەک و دوو بەکاریان دەهێنا.

پرسیـار: ئەی بۆ هەڵبژاردنی هاوژوان چ ئامـۆژگارییەکت هەیە؟ ئاخـۆ نەتدەتوانی بۆ هەر لایەنێکی برۆ سێتێکی جیاواز دابنێی؟

وەڵام: ئۆهـ، برۆ تاجدارە داهێنەرەکانت خەریکە خۆیان وەدەر دەخەن، بۆ بناخەڕێژکردنی هاوڕێیەتی، بەڵێ، لە شێوەی ڕوانی موو سەرەداوێکت دەست دەکەوێ. بەگوێرەی بنەماکان بەجیا لە وردەکارییەکان بکۆڵەوە.

با بڵێین بۆ نموونە تۆ و هاوژوانە خەیاڵییەکەت بەلای پرۆژەیەکی بیناسازیی ناو شاردا پیاسە دەکەن. ئەمە ئەو ئامۆژگارییەیە پێشنیازی دەکەم بۆ ورووژاندنی هەستی دۆستانەی جێگیر لە ناو بڕۆیەکانی هاوژوانەکەت:

– بەبرۆ تاجدارێک بڵێ: "ئای لەم هەموو کارە؟ قەت باوەڕ دەکەی ڕۆژێک کۆتایی بێ؟".

– بەبرۆسەراوبنێک بڵێ: "ئەو کەسانەی هەموو کونوکەلەبەرەکانی کارێکی لەو جۆرە پڕ دەکەنەوە، شایەنی ڕێزن. تۆش وا بیر ناکەیەوە؟".

– بەبرۆ ڕێکێک بڵێ:" هیوادارم هەر کەسێک بەرپرسە لەم بێ سەروبەرییە، خەڵکێکی لێهاتوو بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی دواتر ڕێکی بخەنەوە. هەستت بەوە کردووە دۆزینەوەی خەڵکی کۆڵنەدەر چەند زەحمەتە؟".

پرسیار: خۆ مەبەستت ئەوە نییە من هەموو هاوژوانەکانی داهاتووم ببمە لای پرۆژەیەکی بیناسازی، وایە؟ مەبەستێکی گرینگترت هەیە، وا نییە؟

وەڵام: بنەمای نزیکبوونەوە لە کەسێک بەستنی پێوەندییەکە لەگەڵ مێشکی ئەو کەسە. ئەگەر تۆش ئاریشەی تایبەت بەهێمایەکی ڕووت لە لا ئاسان بێ کەواتە ڕەنگە ئەمە هەندێک سوودی بۆت هەبێ.

پیرۆزە. تۆ یەکەم جۆری برۆت وەرگرت. ئەمەش ئەو زەمینەیە کە لە هەریەکە لە هێمایەکانی دواتردا لەسەری دەڕۆین: جیاوازییەکانی هەر جۆرێکی سروشتی فێر بە، بزانە هی خۆت چۆنە، پاشان بزانە واتای هەر هێمایەک چییە و کارەکە بەنموونە هێنانەوە بەکۆتا بهێنە. بەر لەوەی بڕۆینە سەر ئەندامی داهاتوو، با ڕەچاوی شتێک بکەین کە هەموو ڕووخوێنەوەیەک زوو یان درەنگ تێبینی دەکا.

## شتێکی زۆر گرینگ

لەگەڵ پەرەسەندنی شارەزاییت، هەست بەشتێکی سەیر دەکەی. جۆری هێمایەکی سەر ڕوویەک دەشێ زۆر بێ یان کەم. باشترە بزانرێ کەی هێمایەک زۆرە لەبەرئەوەی چەندی هێمایە جەستەییەکە زیاتر بێ ئەوا واتا دەروونییەکەی ئەوەندە زیاترە. ڕووخوێنەرەوان هەزاران ساڵە ئەم یاسایەیان پێڕەو کردووە:

– بەشێوەیەکی جەستەیی یەکجار زۆر = لە ناخدا یەکجار زۆر

بەکورتی:

– زۆر= زۆر

بەپێچەوانەوە:

– بەشێوەیەکی جەستەیی نەختێک دیار = لە ناخدا نەختێک گرینگ

هەروەها بۆ هەموو مەبەستە کارەکییەکانیش:

– بەشێوەکی جەستەیی تەنیا بەئاستەم بینراو = ئەوندە ناهێنێ بخوێنرێتەوە «خەریکی بەشێکی تری ڕووی کەسەکە بە دەنا کارەکەت وەک کوتانی ئاسنی ساردی لێ دێ».

پرسیار: ئاخر کەسێک چۆن دەتوانێ زۆرەکان دەستنیشان بکا؟

وەڵام: تۆ لە ڕێی ڕوونکردنەوە و وەسفەکانی ناو ئەم کتێبە بیرۆکەیەکت لەبارەی هێما جۆراجۆرەکان دەست دەکەوێ. بۆ ئەوەی زانیارییەکە بگوازییەوە بۆ سەر ڕوویەکی ڕاستەقینە، سەیری ئاوینە بکە و هێمایەکە لەسەر ڕووی خۆت تاقی بکەوە. دواتر ڕوو بکە خەڵکی تر و باشترە چەند کەسێک لە یەک کاتدا سەیر بکەی تا بتوانی هێمایەکان بەراورد بکەی. بەباشی ئەوەت بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەم هێمایانە تا چ ڕادەیەک دەشێ جیاواز بن.

بۆ نموونە تۆ بۆ شێوەی برۆ چاو دەگێڕی. تەنیا سەیری برۆیەکان و تەنیا سەیری شێوەیان دەکەی و لە ڕوویەکەوە ڕوو دەکەیە ڕوویەکی تر و لە کۆتاییدا قسەیەکی لەم جۆرە دەکەی: "برۆی "جۆن" کەوانەییە بەڵام هی "جێین" ڕاستە."

کاتێک فێری ناسینەوەی هێمایەکان بووی، هەنگاوی دواتر ئەوەیە شارەزای زۆرەکان بی.

شێوە جۆرێکە لە زۆرەکان. بۆ ناسینەوەی ئەم جۆرە زۆرە دوو کەسی خاوەن هەمان هێما بەراورد بکە.

لە ئەنجامدا ڕۆژێک دادێ کە تۆ لە ژوورێکی قەرەباڵغدا ڕوویەک دەبینی و ئەو ڕووە دەتهەژێنێ– نەک لەبەرئەوەی ئێوارەیەکی ئەفسووناوییە و کەوتوویە داوی خۆشەویستییەوە بگرە لەبەرئەوەی تۆ لە ژوورەکەدا کەسێکت دۆزیوتەوە کە برۆی کەوانەییە. ئەوەش بەو واتایەیە کە تۆ دەتوانی ئاستی چەماوەی برۆی ئەو کەسە لەگەڵ هی کەسەکەی یەکەم بەراورد بکەی. چەماوەی برۆی کامیان زۆر زیاترە؟

ڕەنگە هی جاک لە هی جیم زیاتر بێ. هەندێک لەو برۆیە کەوانەییانەی کە دەیانناسییەوە یەکجار کەوانەیین لە کاتێکدا ئەوانی تر لەگەڵ جۆری کەوانەییدا پۆلێن دەکرێن، بەڵام بەئەستەم دەچەمێنەوە. ناسینەوەکە پێت دەڵێ کەوا چۆن شێوەیەک

دەتوانرێ بەیەکێک لە زۆرەکان هەژمار بکرێ.

قەبارە جۆرێکی ترە لە زۆرەکان. بەدواداچوونی ئەم لایەنە، ڕەنگە سەرەتا گێژت بکا و وەک ئەوەیە کە پشتاوپشت لە ڕێگەیەکی لاوەکی لێ بخورێ. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە تۆ تەنیا بەدوای گەورە بەپێچەوانەی بچووکدا ناگەڕێی، بگرە تیشک دەخەیە سەر زۆر گەورە بەپێچەوانەی هەندێک گەورە – یاخۆ زۆر بچووک بەپێچەوانەی هەندێک بچووک.

بۆ ئەوەی بەئاسانترین شێوە ئەمە ببینرێ، بەشەکانی ناو یەک ڕوو بەراورد بکە. کەواتە واز لە بەراوردکردنی جاک و جیم بێنە و بەجیا لە یەک ڕوو بکۆڵەوە. با بڵێین گەیشتوویە نەرمە گوێ. نەکەی بەبەراوردکردنی نەرمە گوێی جیم لەگەڵ هی جاک بڵێی نەرمە گوێی جیم گەورەیە. ڕەنگە هەموو ئەندامەکانی جیم گەورەتر بن.

لەبری ئەوە قەبارەی نەرمە گوێی جیم لەگەڵ بەشەکانی تری گوێی بەراورد بکە.

تێ گەیشتی؟ هەندێک ڕوو تاکە زۆرێک پێشان نادەن، نە لە قەبارە و نە لە شێوە. ڕوویەکی وەک ڕووی "ڕۆس پێرۆت" تەواو پێچەوانەیە لەبەرئەوەی دەتوانی کۆمەڵێک زۆری تێدا بدۆزییەوە. هەندێک ڕوو، زۆرەکانیان پێوە دیارە و هەندێک وا نین، شتەکە هەر وا ئاسانە.

## برۆ لە ڕووی تەنکی و پڕی

– برۆی پڕ، فرە مووداره.

– برۆی تەنک، شتێکی پێچەوانەی فرەیی هەیە، جا با هەر ناوێکی لەسەر بێ، با ناوی تەقولۆقیش بێ؟

پرسیار: لەبەرئەوەی برۆ دەشێ تاجدار یان سەراوبن بێ، چ بەشێک بۆ زانینی ڕێژەی موو هەژمار دەکرێ؟

وەڵام: سەرنجی تووکنیی گشتی بدە. بزانە دەتوانی ئەو کەسەی ڕووی دەخوێنییەوە بەبرۆی تووکنتر بهێنییە بەرچاوت؟ ئەگەر وابوو برۆی ئەو کەسە تەنکە. ئەگەر ئاسانتر بوو کە کەسەکە بەبرۆی تەنکتر وێنا بکەی، کەواتە برۆی پڕە.

پرسیار: ئەی ئەگەر هەر توانای وێناکردنمان نەبووایە؟

وەڵام: چۆن قسەی وا دەکەی، خەیاڵ مافی زگماکیی تۆیە. لە کۆتاییدا هەر دەگەیە ئەم قەناعەتە. لە هەمان کاتدا دەتوانی زانیاری کۆ بکەیەوە. سەیری برۆی ١٥ کەس بکە و



برۆی تەنک



برۆی پڕ



برۆی مامناوەندی

برۆ لە ڕووی تەنکی و پڕییەوە

تیشک بخە سەر جۆری "ڕێژەی موو". دەتوانی زانیارییەکانی خۆت بەخێراییەکی زۆر دابڕێژی.

پرسیار: ئەی ئەگەر تۆ سەرنجی تووکنیی بڕۆی خۆت دا و زانیت بەهەردوو ئاراستەوە زۆر نییە؟ ئەی ئەگەر تەنیا تۆزێک پڕ بوو؟

وەڵام: مەرج نییە ئەم هێمایە لەسەر ڕووی خۆت بخوێنییەوە. وازی لێ بهێنە. تا نەبی بەڕووخوێنەوەیەکی شارەزا هەوڵ بدە هەر هێمایەک کە بەهیچ بابەتێک نەچێ لێکی نەدەیەوە.

ڕێژەی موو لە جووتە برۆیەکدا، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەوا تا چ ڕادەیەک کەسێک لە ئەنجامدانی وردەکارییەکان لە یەک کاتی دیاریکراودا هەست بەئاسوودەیی دەکا.

برۆی پڕ، یەکێکە لە هێمایەکانی بیرتیژی. ئەی خوا بیبڕێ. دەزانم ئەگەر ئەم وەسفە لەگەڵ تۆ بگونجێت ڕەنگە ئێستا چاوت بڕیبێتە خوارەوە و لە ناو بێ ئۆقرەییە ڕێزلێگیراوەکەی خاکەڕاتییدا پەل بکوتی. ئەگەر بۆ دڵدانەوەش بێ، بزانە کە خەڵکی برۆ تەنکیش هەروەها دەتوانن بەهەمان ڕادە زیرەک بن. جیاوازییەکە تەنیا لەوەدایە کە شێوازە کەسییەکانی خەڵک جۆراوجۆرن.

بەشێوەیەکی ورد پێ دەچێ برۆ پڕەکان بتوانن لە یەک کاتدا ئازوگوێز بەزۆر پرۆژە بکەن. وە ئەگەر برۆیەکانت ڕێک وە یان سەراوبن بن ئەوا تۆ بەشێویەکی یەکجار باش دەسەڵاتت دەبێ بەسەر وردەکارییەکانی هەریەکە لە پرۆژەکان. لەوەش زیاتر، ئەگەر تۆ لە مشومڕکردندا باڵادەست بی «کە ئەمەش لە ڕێی هێمای لێوی قایلکەر کە دواتر باسی لێوە دەکرێ، بەدەر دەکەوێ» دەتوانی وا لە خەڵک بکەی لە ئاست ژیریی تۆدا واقوڕماو بن.

تاکە کاردانەوەت بڕێتییە لە خەڵکی کاسکەر. نەکەی لەلای هاوڕێیەکانت باسی هەموو چالاکییەکانت بکەی. ئاوەڵ و هاوکار و کارمەندەکانت ڕەنگە لە ناو ئاگری ئیرەییدا بەتۆدا باڵیان بسووتێ یان لە ئاست تیشکی بەشکۆی مێشکی تۆدا لەسەر خۆیان بچن.

ئەگەر سەیری "دێیڤید کۆپرفیلد"ی خەیاڵپلاو بکەین، تێ دەگەین تەنانەت ئەگەر یەکێک لە برۆیەکانی مرۆڤیش پڕ بێ ئەم مرۆڤە بەڕاشکاوی دەشێ کەسێکی سیحراوی بێ. ڕەنگە ناوبراو سودی لە برۆیەکانی وەرگرتبێ بۆ کۆتاییهێنان بەشەڕ، بەدڵنیاییەوە، توانای مرۆڤ بۆ فڕوفێڵی نایاب و یەکجار زۆر نکۆڵی لێوە ناکرێ. جارێک پێوەندیکەرێک کە پیشەیەکی هێندە باشی نەبوو بۆ برۆچاندنەوە پرسی پێم کرد. "جۆ" لە پێوەندییە

دووقۆڵییەکەی نێوان ڕوو و دەروون تێ گەیشت. لە ویست و خەیاڵی خۆیدا ئەگەر برۆی ڕاستی زۆر پڕی وەک هی "ئەنیشتاین"ی هەبووایە- کە لە ڕاستیدا بەکەڵکی پیشەی بەشکۆی فیزیازانی دەهات، زۆر دەگۆڕا. «ئەی بۆچی برۆی چەپی ئەنیشتاینی نەویستبوو؟ بۆ ئەمەیان برۆیەکی وەک "ئۆپرا"ی دەویست، پیاوێکی کۆڵنەدەر بوو!». پێم وت، نەشتەرگەریی برۆم پێ باش نییە «ئاگات لە ڕیکلامەکانی تەلەڤزیۆنی هەیە؟ "ئێمە، لە سەنتەری برۆ بۆ پیاوان، لە خزمەت ئێوە داین!"».

برۆی تەنک، بۆ نموونە، ئاماژە بەبەجۆشبوونی مێشک دەکا. چەندی زۆری لە خۆت بکەی بۆ ئەوەی ئازوگوێزی بەکۆمەڵە پڕۆژەیەک بکەی، بەڵام کاریگەریت زیاتر دەبێت ئەگەر لە یەک کاتدا خۆت بەیەکێکیان سەرقاڵ بکەی. "ستیڤن کۆڤی"ی بەڕێوەبەر، دەزانێ چۆن باشترین سوود لەم بەهرەیە وەربگرێ. هەروەک نووسەری "The Seven Habits of Highly Effective People –حەوت خووی خەڵکی یەکجار کاریگەر"، ئەو چۆنیەتیی ڕێکخستن و جێبەجێکردنی یەکەمایەتییەکان ڕوون دەکاتەوە و ئەم ڕێکخستن و جێبەجێکردنەی یەکەمایەتییەکان هونەری خەڵکی خاوەن برۆی تەنکە.

پرسیار: چۆن بۆ کاری فرۆشیاری سوود لە تووکنیی برۆ وەربگرین؟

وەڵام: خەڵکی خاوەن برۆی پڕ ڕقیان لە کورتبڕییە. ئەوان ڕێزت لێ دەگرن ئەگەر تۆ هەموو سوودەکانی کالاَیەکەت بەهەموو وردەکارییەکانیانەوە پێشکێشیان بکەی. بەپێچەوانەوە، خەڵکی خاوەن برۆی تەنک وەسفی ئاساییان بەلاوە پەسندترە. ئەوان ڕێزت لێ دەگرن ئەگەر تۆ پوختەی خاڵە هەرە گرینگەکانیان پێ بڵێی.

پرسیار: دان بەوە بنێ کە تۆ بەڕاستی مەبەستت ئەوەیە خەڵکی خاوەن برۆی پڕی وەک من، بەکورتی، زیرەکترن؟

وەڵام: نەخێر، هەر چۆنێک بێ مەبەست چۆنیەتیی هەڵسەنگاندن و ڕەسەنایەتیی بیر و هۆش و لایەنەکانی تری بیرتیژی نییە. برۆی پڕ بەواتای حەزکردن لە ئاڵۆزییە. برۆی تەنک ئاماژەیە بۆ حەزکردن لە سادەیی. بەئارەزووی خۆت جیاوازییەکە بەسادەبوون یان بەئاڵۆزبوون لێک بدەوە.

## شێوەی برۆ

شێوەی برۆ بریتییە لەو قاڵبە ئەندازەیییەی کە هەر برۆیەک پێکی دێنێ:

– برۆی کەوانەیی، هەندێک جار پێی دەوترێ "چەماوە" کە بەشەکانی بازنەیەک پێک دێنێ.

– برۆی ڕاست، بەنزیکەیی لە هێڵێکی ڕاست دەچێ.

– برۆی هەشتی "گۆشەدار" تەوەرێکی هەیە کە تێیدا ئاراستەی موو دەگۆڕێ. زۆربەی «بەڵام نەک هەموو» برۆ هەشتەکان، تەوەرەکەیان لە کۆتاییی برۆ دایە.

ئەو دەمەی بۆ ناسینەوەی برۆی خۆت سەیری خۆت دەکەی لە بیرت نەچێ لەجیاتی ئەوەی بڕوانییە سەرتر یان خوارتر، ڕێک سەیری بەرامبەرت بکە.

شێوەی برۆ ئاماژەیە بۆ چوارچێوەی بیرکردنەوە. ئاخۆ تۆ بەشێوەیەکی نموونەیی تێبینیی چ جۆرە وردەکارییەک دەکەی ئەو کاتەی لەگەڵ خەڵک دای؟

برۆی کەوانەیی ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە تۆ لە تێبینیکردنی وردەکارییەکانی تایبەت بەهەستەکانی خەڵک شارەزای. ئەم شێوەیە یەکێکە لەو چەند نیشانانەی ڕوو کە هێمای هەستیاریی عاتیفییە «ئەوانی تر برێتین لە چەناگەی چەماوە و ژێرپێڵووی چەماوە و گوێی خاوەن بازنەی ناوەکیی گەورە.»

هەستیاری چ لە فرۆشیاری و چ لە پێوەندییەکان بەتایبەتیش ئەگەر ئەو کەسەی دەتەوێ بەسەریدا زاڵ بی هەمان هێمای هەبێ، یارمەتیت دەدا. پلەی چەمانەوەکە ئاراستە دەگۆڕێ لەگەڵ تیشکۆی هەست. ئەوانەی خاوەن برۆی زۆر کەوانەیین بۆ هەست و سۆز وەک موگناتیس وان. لەلای ئەوان نابێ تەنیا بڵێی "من باشم، تۆ چۆنی ؟". ڕەنگە تۆ یەکسەر هەستەکانت بدرکێنی لەبەرئەوەی کەسانی برۆکەوانەیی هەرچۆنێک بێ، بۆ خۆیان ئەم هەستانە دەخوێننەوە.

پرسیار: ئاخۆ ئەو شتەی کە بەئاریشەی هاوتای ئەم برۆیانە ناوی دەبەی ئەوەیە کە ئێمە ئاگامان لە هەستونەستی خەڵک دەبێ؟

وەڵام: نەخێر، ئاریشە پێوەندیی بەوەوە هەیە کە کاتێک هەستی خۆت بریندار دەکرێ چ کارانەوەیەکت دەبێ. تۆ کاتێک دەتەوێ هەست بەئارامی بکەی بەشێوەیەکی ئاسایی ڕوو لە چی دەکەیت؟ ڕوو لە سۆز دەکەی– بۆیە هەر برینەکەت دەکولێنییەوە. لە چاو کەسانی



برۆی کەوانەیی



برۆی ڕاست



برۆی هەشتی

شێوەی برۆ

خاوەن دوو جۆرە برۆیەکانی تر، لە کاتی هەڵچوونی عاتیفیدا هێوربوونەوەت زۆر دژوارترە.

کەسانی خاوەن برۆی زۆر کەوانەیی، وەک برۆی تۆ زۆر بەئاسانی هەستیان بریندار دەکرێ. ئەوەش لەبری ئەوەندە هەست تیژبوونی خۆتە. بەڵام ڕەنگە زانینی ئەمە دڵت بداتەوە کەوا سیانگ میێن تێبینییە ئەوەی کردووە کە ئەم جۆرە برۆیە کاتێک تەنکیش بێ دەربڕی سۆزە. ڕاستە، لەبەرئەوەی برۆی یەکجار تەنک جا هەر شێوەیەکی هەبێ ئاماژەیەکە بۆ مێشکێک کە تەنیا خولیای یەک شتە. کەواتە، برۆی زۆر تەنک و کەوانەیی ئاماژەیەکە بۆ کەسێک کە لە یەک کاتدا لە ئەنجامدانی تاکە پرۆژەیەکدا زۆر سەرکەوتووە. وە هەروەها بابەتی سەرنجیشی ڕەنگە سۆزداری بێ. کەواتە، بەڵێ هەڵبەتە، تۆ خاوەن توانای سۆزداریی.

پرسیار: ئاخۆ لێکدانەوەکەی تۆ لایەنگریی ئافرەت ناکا؟ هەر هیچ نەبێ هەموو خەڵک دەزانێ ئافرەت برۆی کەوانەییە و پیاویش برۆی ڕاستە.

وەڵام: تۆ خۆت ڕێک بەکلێشەیەکەوە بەستووەتەوە. خۆشبەختانە ڕزگاربوون لەمەیان ئاسانە. ئەرکی تۆ، ئەگەر بۆ خۆت حەز بکەی، ئەوەیە سەیری خەڵکی ڕاستەقینە بکەی. ڕێک سەیری برۆیان بکە.

"گریگۆری هێنس"ی سەماکار و ئەکتەر، برۆی هەم کەوانەیی و هەم چڕە. تەقەسەمایە سەرووئاساییەکەی هەم ئەو هەستیاری و هەم ئەو ئاڵۆزییەی کە تۆ لەو برۆیانەدا چاوەڕێیان دەکەی پێشان دەدا.

"پۆل مەکیارتنی" برۆی زۆر کەوانەییە. ئەو زیاتر لە "بیتڵ"ەکانی تر لە هۆنینەوەی هۆنراوەی خۆشەویستی شارەزایە.

برۆی ڕاست ئاماژە دەکا بەچەمانەوەیەک بەرەو تێبینیکردنی بیرۆکەکان. ئەمەش کاردانەوەیە بۆ هۆیەکی وەک زانینخوازیی زەینی یان هەبوونی مەیلێک بۆ لۆجیک. لە زنجیرەی "ترێکیس/ کۆڕەوان"دا بەڕێز "سپۆک"ت بەبیر دێتەوە؟ لە ڕاستیدا، برۆی "لیۆنارد نیمۆنی"ی ئەکتەر کەوانەییە. بەڵام دەستپێداهێنانێکی بلیمەتێکی میکیاژ، برۆیەکی ڕاستەئاسای بۆ ئەو کەسایەتییەی کە نیمۆنی ڕۆڵەکەی دەگێڕا، داڕشت.

پرسیار: برۆی نیمۆنی جوان بوو، بەڵام ئاخۆ وشەی "بلیمەت" کەمێک بۆی زۆر نییە؟

وەڵام: لەوانەیە وا بێ. بەڵام بیر لە کێشە سەرەکییەکەی کەسایەتییەکە بکەوە. سپۆک دەبوایە نیمچە گرکانی و نیمچە مرۆڤانە بووایە تا مشتومڕێک لەسەر یەکجار

لۆژیکاڵبوونی لێ بکەویتەوە. ئەمە، لە ڕاستیدا، کتوپڕ گرفتی برۆ ڕاستەکانە. کەسێک ڕەنگە ئەوەندە سەرقاڵی کۆکردنەوەی زانیاری و بیرۆکە و دۆزینەوە بێ کە ئەوانی تر بەکەسێکی دڵمردووی لە قەڵەم بدەن.

یەکجار دڵزیندووبوونیش ڕەنگە کێشەیەک نەخوڵقێنێ. بەم دوایانە لەگەڵ "بلێیک" قسەم کرد کە هاوڕێیەکی تەمەن شەش ساڵانی کوڕەکەمە و بەخۆڕاگرییەکی سەرسوڕهێن بەرەنگاری خەیاڵشکێنی دەبێتەوە. بلێیکیش برۆی زۆر ڕاستن. خۆم بۆڕانەگیرا. لێم پرسی: " کاتێک دڵتەنگ دەبی چی دەکەی؟".

وتی:"زۆر ئاسانە، تا پێنج دەژمێرم. دوایی دەڵێم پێویست ناکات دڵم توند بکەم، وایە؟".

تۆش ئەگەر برۆت زۆر کەوانەییە نەک زۆر ڕاست، هەر ئاوا بکە.

برۆی هەشتی ئاماژە دەکا بەمێشکێکی بەڕێوەبەرانە. بەشێکی کەسەکە بەردەوام دوورەپەرێزە و پرسیاری لەم جۆرە دەکا: "ئاخۆ ئەم گفتوگۆیە لە بەرژەوەندی منە؟ ئاخۆ ئەو کەسە کاتم دەکوژێ؟ من بەڕاستی چ شتێکم لەم بارودۆخە دەوێ و چۆن دەتوانم دەستەبەری بکەم؟".

کەسێکی خاوەن برۆی هەشتیی گۆشەگیر بۆ خۆهەڵقورتاندنە ناو گفتگۆیەک و گۆڕینی ڕەوتەکەی دڵ لە دڵ نادا. بەرەنگاربوونەوەش لەگەڵی ڕەنگە تەنانەت دڵکەرەوەش بێ.

بەڵام ئەو خاڵە بۆ ئەوانی ترمان ترسناکە، وا نییە؟ تەنانەت ئەگەر هێمایەکە زۆریش نەبێ و بەرەنگاربوونەوەکان تا ئەوپەڕی توانا کەم کرابنەوە، کاردانەوەی ڕێ تێچووی برۆی هەشتی برێتییە لە هەڕەشەکردن. کاتێک تۆی برۆ هەشتی سەیری خەڵکی تر دەکەی ئەوان هەستت پێ دەکەن، دوورەپەرێزیی ڕێخۆشکەرە بۆ شک و گومان. بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەمە نرخێکی کەمە بەرامبەر بەهێزێکی ستراتیجیی گەورە. بەڕێوەبەرەکان بەهۆی گۆشەگیرییەوە سەرکەوتوو دەبن و بەوتەی "ئار ئێڤیل جانسن"ی ڕووخوێنەوەی ئاوەڵم، وا دیارە ئەو پێشەیەی کە ئەمەریکییەکان تێیدا ڕێز لە خەڵکی خاوەن برۆی هەشتی دەگرن بەزۆری بێژەریی دەنگوباسە. ئیڤیل ئەوەی ئاشکرا کرد کەوا لە تیمەکانی تایبەت بەبڵاوکردنەوەی دەنگوباسیاندا، بەهێزترین بێژەر بەزۆری پیاوێکی لانی کەم خاوەن تاکە برۆیەکی زۆر هەشتییە. وا بزانم ئێمە چێژ لە بەرنامە "پیتێر جێنینگز" و "سام دۆنالدسن" وەردەگرین لەبەرئەوەی ئەوان لە بەزمورەزمەیە. بزانە ئەوان چۆن لە ڕێی خۆسەپاندن و لێکدانەوە و دەسەڵاتگێڕیدا، جا چ بەشێوەیەکی ئەفسوناوی، چ

بەپێچەوانەوە، گوڕوتین دەبەخشنە بەرنامەیەک.

پرسیار: هەرچەندە من ئەو مێشکە بەڕێوەبەرانەیەم نییە «لەبەرئەوەی هەروەک دەبینی برۆم ڕاستە» بیرۆکەیەکی بچووک خەریکە لە مێشکمدا سەر هەڵدەدا کە دەڵێ ئێمە بەسوود وەرگرتن لە شێوەی برۆ دەتوانین لە فرۆشیاریدا سەرکەوتوو بین، ئەوە ڕاستە؟

وەڵام: وایە، پێوەندیشی بەبیر و بۆچوونی خودی کەسەکەوە هەیە.

– بۆ کریارەکی برۆکەوانەیی جەخت لەسەر ئەو لایەنەی سوودی کاڵایەکەت بکەوە کە پێوەست بێ بەهەست. "پێت ناخۆش نییە کە میوانەکانت لەبەر بچووکیی قەبارەی شاشەی تەلەڤزیۆنەکەت ناتوانن وێنەیەکی جوان ببینن؟ بیر لەوە بکەوە کە چەند ئاسوودە دەبی ئەگەر لەم جۆرە تەلەڤزیۆنانە بکڕی؟"

– بۆ برۆ ڕاستەکان سوودەکانی کاڵایەکە ڕیزی بکە و بڵێ کەوا تۆ بەنیازی ڕوونکردنەوەی: "یەکەم شت تۆ تێبینیی ئەوە دەکەی کە لەسەر ئەم شاشەیە دەتوانی سپییەتیی چاوی خەڵکەکە لە کاتی گوللە هاوێژتندا ببینی. ئەوەش لەبەرئەوەیە سیستەمەکە خاوەنی "وپ دی دۆ"یە. دووەم شت تێبینیی سافیەتیی قیژەکانی ناو ئەم فیلمە بکە. دەنگەکە هی فلان مارکەی بازرگانییە." و قسەی لەم جۆرە.

– بۆ برۆ هەشتەکان جەخت لەوە بکەوە کەوا چۆن بەرهەمەکە یارمەتیی کڕیار دەدا تا خاوەن دەسەڵات بێ. " ئەگەر شاشەی لەم قەبارەیەت هەبێ، دەزانی چەند کاریگەریی لەسەر شێوازی میوانداریکردنت دەبێ؟ چ کاریگەرییەکی لەسەر میوانەکانت دەبێ؟

تێ گەیشتی، هەریەکە لەم برۆیانە دەتوانن ختووکە بەخەیاڵتدا بهێنن. لە ڕێی تێبینیکردنی ژیانی کڕیارەکانت ئاستی فرۆشیاریی خۆت بەرز ڕابگرە.

## بەرزاییی برۆ

ئەو کاتەی تێبینیی هەموو هێمایەکانی جێگیر لە ناو برۆ دەکەی، نەکەی بەرزاییی برۆ فەرامۆش بکەی کە برێتییە لە مەودای بەراوردیی نێوان چاو و برۆ.

– زۆربەی خەڵک برۆ ناوەنجین واتە مەودای نێوان چاو و برۆیان بەشێوەیەکی ئەوتۆیە کە دواتر وەک مامناوەندی دەیناسییەوە.

– بەپێچەوانەوە خەڵکی برۆ نزم برۆیان کەوتووەتە ئەو شوێنەی چاویان لێ دەترووکێن. ئەگەر برۆ نزمییەکە یەکجار زۆر بێ، وەها دێتە بەرچاو کە برۆیەکە خەریکە بەربێتەوە سەر چاو.



برۆی ناوەنجی



برۆی نزم



برۆی بەرز

بەرزاتیی برۆ

– برۆ بەرزەکان مەودایەکی زۆریان لە نێوان چاو و برۆدایە. لە یەکەم نیگادا، خەڵکی خاوەن برۆی بەرز، ڕەنگە وا بێنە بەرچاو کە برۆیان هەڵاویشتبێ کەچی وا نییە.

پرسیار: چۆن ئەوە بزانین؟

وەڵام: کات ئەوە بەدەر دەخات. برۆی بەرز لە سەرانسەری ماوەی گفتوگۆیەکەتاندا هەر لە شوێنێکی بەرز بەجێگیری دەمێنیتەوە. برۆی ناوەنجی و برۆی نزم لە کۆتاییدا هەر دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان. برۆی ناوەنجی و برۆی نزم بۆ ئەوەی شێوەی برۆی بەرز وەربگرن دووبارە پێویستە بەزەحمەت بەرز بکرێنەوە.

پرسیار: برۆی بەرز، برۆی نزم... ئاخۆ زاراوەکانی تۆ نەختێک خۆبەزلزانینیان پێوە دیار نییە؟

وەڵام: هەڵبەتە هیچ کام لەم زاراوانە ئاماژە بەکولتوور نادەن. دوو نموونە لە جیهانی مۆسیقا وەربگرە: "دۆلی پارتن" خاوەن برۆی بەرزە. لە کاتێکدا "ڤیکتۆر بۆرگ" برۆی نزم بوو. هیچ هێمایەکی ڕوو، بەلەخۆگرتنی بەرزایی برۆش، خەڵک پابەند ناکا گوێ لە هەرجۆرە مۆسیقایەک بگرن. پێ دەچێ بەرزایی برۆ، پێوەندیی هەبێ بەماوەی دەربڕینی بیرۆکەیەکەوە وە ئەمەش بە"هەڵقولاویەتیی بێژەکی" ناسراوە.

ئەوەتان کە برۆی بەرز بێ، خاوەن چەکێکی شاراوەیە. تۆ پێت خۆشترە بیرۆکەکانت لەلای کەس نەدرکێنێ. هەرچەندە تۆ بەواتای وشەوە بیرۆکەکانت لە مەودای سەرەوەی چاوەکانت ناشێرییەوە، بەڵام دەبێ خاوەن جۆرە خانەیەکی زەینیی ناوەکی بی، واتە شتێک کە بۆ پلانەکانت وەک داغیلەیەک وا بێ تاکو ڕێگەت پێ نەدا لەسەر ئەو پرۆژەکانت بدوێی کە هێشتا جێگیر نەبوونە.

کاتێک کە گفتوگۆیەکی گرینگ چاوەڕێت بکا لە مێشکتدا تا ئەوپەڕی باشی خۆتی بۆ ئامادە دەکەی. لەم ڕوانگەیەوە هیچ کام لە خاوەن جۆرە برۆیەکانی تر ناتوانن شان لە شانت بدەن. هەروەها ڕازدارییەکەت لە هەموو تەوەرەکانی ژیاندا سوودت پێ دەگەیەنێ. تاکە کاردانەوەی ڕێ تێچووت دوورەپەرێزییە. بەڵام ئەمە نرخێکی کەمە لە بەرامبەر هێزە ستراتیجییەکەی تۆ.

بۆ نموونە "دکتۆر مارتین لۆتێر کینگ" لایەنگرانی خۆی تاساند و، لەسەر شێوازی ڕاستەقینەی برۆ بەرزەکان، بەر لەوەی خێرا بەهەموو جیهان بڵێ: "من پلانێکم هەیە"، تەوژمێکی سیاسیی گەورەی خوڵقاند.

کەسی خاوەن برۆی نزم لە یەکەم ڕۆژەوە باسی پلانەکانی دەکا. ئەو بەهرەمەندە لە بەرنامەڕێژکردنێکی دەستبەجێ. ئەو گوێ نادا بەم پەندە کە دەڵێ: " پارووەکەت جوان بجوو ئەوجا قووتی بدە". بەلایەوە خۆئامادەکردنی پێشوەختی بۆ گفتوگۆیەک دەبێتە هۆی ئەوەی وشەکان بێگەڤوگوڕ بێنە بەرچاو. ئەگەر تۆ برۆ نزم بی چاک دەزانی هەروەک ئەو نانەی کە لە نانبرێژی کارەباییەوە دەردەچێ و تەنیا ئەو کاتە بەتامە کە گەرم و تازەیە، بیرۆکەکانیشت بەهەڵقوولا بوونیانەوە کاریگەرن.

تۆ کە قسەکەرێکی دەستبەجێی لە پیشەی ئەوتۆ کە ڕێز لە پاڕاویەتی دەمودەست بگیرێت، وەک پێشکێشکاریی پرۆگرامی گفتوگۆئامێز لە چاو هەر پیشەیەکی تر سەرکەوتووتر دەبێ. "مێرڤ گریڤین" بەنموونە وەربگرە کە لە بەرژەوەندیی بەهات و ژیانی کەڵکی لە شێوازە دەمودەستەکەی خۆی وەرگرتووە. گریڤین بەر لەوەی ببێتە پێشکێشکاری بەملیۆنەها پرۆگرامی پێشبڕکێ و پرۆگرامی وتووێژ، ئەکتەر بوو. لە ژیاننامەکەیدا باس لەوە دەکا کەوا چۆن هاوڕێیە ئەکتەرەکانی خۆی تووشی گرفت کردووە. لەبەرئەوەی ئەو هەرگیز نەیتوانیوە ڕێگە لە سەربەخۆ قسەکردنەکەی بگرێ، هەر جارەی وتەکانی بەجۆرێک دەرچوونە. بۆیە ئەکتەرەکانی تریش وتەکانی خۆیان لێ تێک چووە. بەلای ڕووخوێنەوەیەک شتێکی سەیر نەبوو ئەگەر گریڤین نەیتوانیبا بەرنامەیەک بەهەمان شێوە بۆ دووەم جار پێشکێش بکا لەبەرئەوەی برۆی ئەو پیاوە ئەوەندە نزمە کە لە ڕاستیدا وەک برژانگ وایە.

"محەمەد عەلی کێلێی"ی قارەمانی بۆکس بەدەرخستنی توانای خۆی لە یاری بۆکسێندا، ناوبانگی دەرکرد. مەودای نێوان چاو و برۆی کێلێی ئاماژەی بەوە دەدا کە پێش ئەوەی بڵێ: "من بەهێزترین کەسم"، تووشی دوودڵی نەدەبوو.

کەسێکی خاوەن برۆی بێ تام نزم "جێراڵدۆ ریڤێرا"ی پێشکێشکاری پرۆگرامی گفتوگۆئامێز. ئەو بەم شێوەیە وەسفی شێوازی قسەکردنی خۆی دەکا: "هەوڵ دەدەم هەڵوێست وەربگرم و ئەم هەوڵوێستە بەخەڵک ڕابگەیەنم".

ڕیڤێرا، بەسوودوەرگرتن لە شێوازە کەسییەکەی خۆی وەک هزرڤانێک، بیرۆکەکەی ڕاستە «ئەوەی گومانی لێ دەکرێ ڕەنگە سەلیقەکەی بێ». برۆنزمەکانی خاوەن هەر جۆرە سەلیقەیەک بەباشترین شێوە سەر دەکەون، بەمەرجێک لە هەستی کتوپڕ و خۆتێوەگلاندن و دەربڕیندا شارەزا بن. بەڵام ئەوەت لە یاد بێ کە قسەپەڕاندن دەسەڵاتت پێ دەبەخشێ.

هەرچی کەسی برۆ ناوەنجییە، بەرنامەڕێژیکردن بۆی کێشە نییە. تۆ توانای گۆڕانت

هەیە. لە بارودۆخێکدا پێشوەختی خۆت ئامادە دەکەی. لە بارودۆخی تردا بێ نازونووز و شڵەژان چی هاتە سەردەمت نای گێڕییەوە. تاکە پرسیارت ڕەنگە ئەمە بێ: "ئەو خەڵکە گێلانە چییانە؟" لەگەڵ ئەوەشدا، خۆ تۆ گرفتی برۆ نزمەکانت نییە تا هەرچی هەتە و نیتە بدرکێنی. هەروەها لەو مەترسییە بەدووری کە وەک برۆ بەرزێک بەنهێنیکار لە قەڵەم بدرێی. تاکە گرفتی تۆ، هەمان گرفتە هەمیشەییەکەی چارەنووسەکەتە، واتە بەرگەنەگرتنی هەموو خەڵکی تر.

پرسیار: تاقەتی چەنەبازیم نییە. برۆ نزم بم یان برۆ بەرز، هەر هاوڕێیەکانم لە دەست دەدەم. ئاخۆ کەس پێتی نەوتووە باسکردنی ئەو هزرانەی لە مێشکتدا دەخولێتەوە ڕەنگە مەترسیدار بێ؟

وەڵام: لەبەرئەوەی تۆ شتێکی ترت لە ناو ڕوودا دیارە، دوودڵبوونەکەت شتێکی ئاساییە. هەندێک جار بەهرەی هەڵقولاویەتیی کەسێک تەواو پێچەوانەی ئەو ئاریشەیە کە لە بەشەکانی تری ڕوودا بەدەر دەکەون و لێوە زۆر تەنکەکەی تۆش نموونەیەکە بۆ ئەم ئاریشەیە. ئەوانی تر دەمی بچووک و چرچ و لۆچی ئەستوونی نێوچاوان و پف و چاوی گۆشە داکەوتوون. هەر هەموویان دواتر باسیان لێوە دەکرێ. کەواتە پێویستە تۆ لە چۆنیەتیی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئاریشەی هاوتای بەکارهێنانی بەهرەی خۆت لە ئاخافتنی دەستبەجێدا تووشی گرفت نەبییەوە.

پرسیار: کەواتە ئاخۆ تێگەیشتن لە چۆنیەتیی سوود وەرگرتن لە بەرزاییی برۆ بۆ فرۆشیاری سەرکەوتووتر شتێکی ئاڵۆزە؟

وەڵام: لە ڕاستیدا شتەکە ئاسانە. گرینگی بەشێوازی کەسیی خۆت بدە و لەگەڵی برۆ. بەشێوەیەکی وردتر، ئەگەر تۆ برۆ نزم بی ئەو مافە بدە بەخۆت تا ئەو شتەی بەمێشکتدا گوزەر دەکا، بیڵێی تەنانەت ئەگەر سەرکارەکەشت داوای لێت نەکردبێ ئەم کارە بکەی لەبەرئەوەی ڕەنگە ئەو برۆ نزم نەبێ.

هەروەها ئەگەر برۆ بەرز بی ئەو ماوەیە وەربگرە کە لەگەڵ خۆت دەگونجێ. وە ئەو کاتەی زەوقی دەمەتەقێت نییە، بۆ قسەکردن زۆری لە خۆت مەکە.

## بەهرە تایبەتەکانی برۆ

بۆ چێژوەرگرتنێکی تایبەت سەیری بەهرە تایبەتەکانی برۆ بکە کە لەم ئەندامەدا بەدەر دەکەون.

– مووە ئاڵۆز بڵۆزەکان سەیر و سەمەرەی ناو جیهانی برۆن. لێرە و لەوێ دەڕوێن و هەندێک جار درێژ دەبن و لوول دەخۆن و جاری وا هەیە بەپڕی و بەڕەنگی جیاواز لە ڕەنگی مووی دەوروبەر وەدەر دەکەون. واتاکەیان هەروەک شێوەیان سەرنجڕاکێشە.

– مووە پێچەوانەکان بەئاراستەی یەکتری گەشە دەکەن و هەندێک جار لێک دەئاڵێن.

– مووە پەرشووبڵاوەکان لێک دوورن وەک خەڵکی مۆنتانا کە ئەگەر دووریی نێوانیان لەگەڵ دراوسێیەکان کەمتر لە ٥٠ میل بێ هەست دەکەن دراوسێیەکانیان سنووریان بەزاندووە.

– مووە قیتبووەکان یەکسەر بۆ لای سەرەوە گەشە دەکەن، واتە بەپێچەوانەی مووەکانی تری برۆن کە بەلاری گەشە دەکەن. ئەم جۆرە مووە تایبەتییانە لە دەستپێکی برۆدا دەدۆزییەوە، بۆیە ئەو ناوەیان لێ نراوە. بەڵام بەشێوەیەکی تەکنیکی زۆربەی برۆیەکان بەم شێوەیە دەست پێ دەکەن و بەدەگمەن ڕێک دەکەوێ مووە قیتبووەکان لە بنچکێکی دیاریکراودا چڕببنەوە.

– برۆیە پێوەستەکانیش نازناوێکی ڕازاوەیە بۆ ئەو جووتە برۆیەی کە بەهۆی کۆمەڵە موویەکی ڕوواو لەسەرەوەی لووت یەک دەگرنەوە.

بەهرە تایبەتەکانی برۆ ئاماژە بەشێوازە نائاساییەکانی بیرکردنەوە دەکەن.

پرسیار: چۆن وا دەبێ؟ ئەی بیرکردنەوەی هەرکەسێک لانی کەم بەبۆچوونی خودی کەسەکە نائاسایی نییە؟

وەڵام: بەهۆی ئەم هێما تایبەتانەی برۆ، ئێمە تیشک دەخەینە سەر ئەو شێوازانەی کە بەبەراورد دەگمەنن تەنانەت دەگمەنتر لەهەستی بێ هاواتایی کە بەشێوەیەکی کەسی وەحیمان بۆ دێنێ. من هەرگیز ئەو قوتابییەم لە بیر ناچێتەوە کە پاش ئەوەی لە زانکۆی میامی وانەیەکم لەسەر تێڕامان پێشکێش کرد، سەردانی کردم. ئەمە ٢٦ساڵ لەمەوپێش ڕووی دا، بەڵام هێشتاش دەنگی ئەو کچەم کاتێک کە بەقووڵترین نهێنیکارییەوە وتی: "من وەک خەڵکی تر نیم. هزری ئەوتۆم هەیە کە هەرگیز نایان درکێنم. ئەم هزرانەم لە ناو مێشکمدا حەشار داون"، لە گوێدا دەزرنگێتەوە.



مووه ئاڵۆزبڵۆزەکان



مووه پێچەوانەکان



مووه پەرشوبڵاوەکان



مووه قیتبووەکان



برۆیە پێوەستەکان

بەهرە تایبەتییەکانی برۆ

مــووە ئاڵۆزبڵــۆزەکـان ســەمــبـووڵی بیـرۆکــەی ئاڵۆزوبلۆزە. ڕەنگە داهێنەرایەتییـەکی سـەرسوڕهێنیـان لێ بکەوێتـەوە، وەک لەباری ئەم کەسانەدا "ئـاڵبێرت ئەنیشـتاین" و "وارێن بافێت"، ئەو کەسەی کە لەلایەن "فۆربیس"ەوە بەزەنگینترین ئەمریکی ناسراوە.

مـووە پێـچـەوانەکـان بەهرەیەکی ڕێ تێـچـووتر بـەدەر دەخـەن. تۆ زیاتر بەرگـەی بیـر و بۆچوونە دژیەکــەکــان "یان تـەنانەت ورووژان بـەهۆی ئەم بیــر و بۆچوونانە" دەگــرێ. ئەم موویانە بڕیاریان لەسەر پیشەی "دۆناڵد ترەمپ" داوە.

مــووە پەرشــوبـڵاوەکـان دەربـڕی هزری پەرشــوبڵاون، ئارایشــەیەک بـۆ بەدواداچوونێکی یەکانگیر. بەڵام بوونی پاشبیری ناپێوەستی تریش ڕەنگە بەکەڵک بێ. دووبارە ئەنیشـتاین بەنموونە وەربگرە. پێویست دەکا زیاتر ڕوونکردنەوە بدەم؟

کـەس دەناسی کـە مـووە قیـتـبـووەکـانی دیار بن؟ ئەم مـۆدیلـە بەهۆی "برووک شـیلدز"ی مـۆدیلکار و ئەکتـەر دەناسـرێتـەوە و سـەمـبـولی بیـرتیـژییـە «هیچ نەبێ شـیلـدز لە پرینکتـۆن خـوێندنی تـەواو کـردووە». بـەشـێـوەیەکی وردتر ئەگـەر مـووە قیـتـبـووەکـانی برۆی مـرۆڤ بەئاشکرا دیار بن ئاماژە بەوە دەدەن کە کەسـەکە بەتێگەیشـتنەوە لە تەمەنێکی بچووکەوە دەچێـتـە ناو جـیـهـانـی هەست و هزرەوە. بەرلەوەی کـەسی خـاوەن ئەم هـێـمـایـە دەست بکا بەپڕۆژەیەک، ئەو جـۆرە گرفتـە ڕێ تێـچـووانە مەزندە دەکا کە ڕەنگە بەخـەیاڵی ئەوانی تردا نەهێن. گرفتە ڕێ تێچووەکەی کەسی خاوەن مووە قیتبووەکانی برۆ ئەوەیە کە لەبەرئەوەی بەردەوام دەڵێ: "ڕاوەستن، ڕەنگە گرفتێک هەبێ"، بەکەسێکی دڵساردکەرەوە دادەنرێ.

هـەروەها ئـەو ڕاسـتـیـیـەش کـە زۆربەی جـار ئەو شـتـەی کـە تۆ وتووتـە ڕاست دەرچووە، لەلایەن خـەڵکەوە خۆشـەویستـت ناکا. لەگەڵ ئەوەشدا خـەڵک ئیـرەیی بەم هێـمـایە دەبەن. بۆ نموونە بزانە چۆن "ئاگۆسـتۆ فێیلد" ئەم سـەلیقە جیـاکەرەوەی لە بەرژەوەنـدی خـۆی بەکـار هێناوە و یەک لە دوای یەک کـەناڵی تەلەڤزیۆنیی سـەرکەوتووی، بـەلەخۆگـرتنی "Latino Entertainment Television"ی دامەزراندووە.

هـەرچی برۆ پێوەسـتـەکانیشن، ئەوان بێ پچڕانەوە بیر دەکـەنەوە. بەشێوەیەکی نموونـەیی، مێشک هـەر لە کارکردن دایە. وشـەکان ڕەنگە گرفـتێک بن. بۆیە برۆی پێوەست یەکێکە لەو هێـمـایە سروشـتـیـیـانەی ڕوو کـە پێم باشـە بـگـۆڕێ. مـووکیش بەکـار بهێنە یان سـوود لە ئێلێکترۆلایسـز وەربگرە. یانیش بەمـەکینـەیەکی بچـووکی پـرچتـاشـین مـووەکـان بتـراشـە. لەبەرئەوەی هێـمـایەکانی ڕوو و شـێوازی کـەسـی پێوەندییـەکی دەروونیـان بـەیەکەوە هـەیە،

هێورکردنەوەی برۆی کۆڵنەدەر ڕەنگە یارمەتیی حەسانەوەی مێشکت بدا.

پرسیار: ئاخۆ مەبەستت ئەوەیە لەبەرئەوەی برۆم پێوەسە ڕەنگە نەخۆشیی خەوزڕانم هەبێ؟

وەڵام: هێمایەکی سروشتیی دەرەکی، لایەنێکی دەروونی لە شێوازی کەسیدا بەرهەم ناهێنێ. مەبەست پێوەندییەکەیە. بەشێوەیەکی زۆر وردتر پێوەندییەکی دووقۆڵییە، بەواتای ئەوەی ئەگەر تۆ دەروونت، بگۆڕی ئەوا ڕووت دەگۆڕی «ئەم گۆڕانە درێژخایەنە بەشێوەیەکی گشتی بەربڵاوترین جۆری گۆڕانە»، بەڵام کاتێک ڕووت بەهۆی نەشتەرگەریی جوانکاری یان ئەو شتانەی کە بەڕێکەوت ناو دەبردرێن، بگۆڕێ ئەوا دەروونیشت یەکسەر دەگۆڕێ.

پرسیار: چ نموونەیەک هەیە بۆ گۆڕانێک کە لە دەروونەوە بێ و لە ڕوودا ڕەنگی دابێتەوە؟

وەڵام: بەتێپەڕبوونی کات بەپشتبەستن بەهەڵبژاردن و بەهاکانی خۆت، ڕووت بەشێوەیەکی سروشتی بەو ڕێگەیانەی کە لەگەڵ شێوازی کەسیت دەگونجێن، دەست بە گۆڕان دەکەن. پرۆسەکە ئێجگار وردە. بۆ نموونە، کاتێک بۆ خۆم منداڵم بوو پێڵووەکانم بەڕێگەیەکی ئەتۆ گۆڕان تا ڕەنگدانەوەیەک بن بۆ شێوەیەکی تر لە سۆزداری. وەک ڕووخوێنەوەیەک من زۆر گۆڕانی وەها دەبینم کە تۆ هەرگیز پێشتر هەستت پێیان نەکردووە.

پرسیار: برۆهەڵگرتن بەواتای هەڵخەڵەتاندن نییە؟

وەڵام: هەڵخەڵەتاندنی کێ؟

پرسیار: دەزانی، مەبەستم ئەوەیە خەڵک وا ڕاهاتوون ئێمە بەشێوەیەکی نەگۆڕاو ببینن.

وەڵام: تا ئەو کاتەی کەللەت بەلەشتەوە نووسابێ و گوێشت بەکەللەتەوە و... هتد، باوەڕ ناکەم ڕووی تۆ وەک خۆی بمێنێتەوە. ئەو شتەی کە لە ڕووی تۆ دایە یان بۆ خۆت دەیخوڵقێنێ، واتایەکی دەروونیی هەیە. ئەو واتایەش ئەو شتەی کە تۆ فێری خوێندنەوەی دەبی. شێوەی ڕوو، پێڕەوی لە بڕیارێکی نەگۆڕ ناکا بگرە لە گۆڕاندایە.

پرسیار: ئەی نەشتەرگەریی جوانکاری؟ ئەوەیان بەهەڵخەڵەتاندن دانانێی؟

وەڵام: نەشتەرگەریی جوانکاری نموونەیەکی باشە لەسەر گۆڕانی خەڵک لە ڕوودا واتە گۆڕانێک کە دواتر لە ناخیش ڕەنگ دەداتەوە.

پرسیار: بەبڕوای من گۆڕینی لووت یان ئەندامی لەو جۆرە، بۆ ئەوەیە خەڵک

بەشێوەیەکی جیاواز هەڵسوکەوتت لەگەڵدا بکا. دەزانێ، ئەگەر لووتێکی گۆڕاوی جوانت هەبێ، ڕووت جوانتر دەبێ و خەڵکیش باشتر لەگەڵت دەجوولێنەوە و تۆش ئاسوودەتر دەبی.

وەڵام: بابەتەکە زیاتر لەوە هەڵدەگرێ. ئەو کاتەی تۆ ڕووت دەگۆڕی، دەروونیشت بەو ڕێگەیانەی کە بەهۆی خوێندنەوەی ئەم کتێبە دەتوانی مەزندەیان بکەی، دەگۆڕێ. نەشتەرگەریی لووت لەلای ئەو خەڵکانەی کە حەزیان لە شێوەیەکی دیاریکراوی لووتە بەسەنگت دەکا، بەڵام هەلی ئەنجامدانی کارێکت لەکیس دەدا کە یەکجار ڕەسەن و گرینگە. کوڵمدانان ڕەنگە زۆر بەشکۆتر پێشانت بدا، بەڵام تا خوو بەشێوازە نوێیەکەی هێزی خۆت دەگری ڕەنگە زیاتر لەوەی بۆی دەچی تووشی بەرپەرچدانەوەی دەروونی ببییەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو نەشتەرگەرییەی پارەت لێی خەرج کردووە لە سەتاسەت سەرکەوتوو بێ، کاریگەرییە دەروونییە لاوەکییەکانی پێشگیرییان لێ ناکرێ. بەهۆی پێوەندییە دووقۆڵییەکەی نێوان ڕوو و دەروون ئەم کاریگەرییانە مسۆگەرن. نەشتەرگەرانی جوانکاری داوای وانەوتنەوەیان لێم کرد تا بۆیان ڕوون بکەمەوە چۆن نەشتەرگەرییەکانی ئەوان خەڵک لە ناخەوە دەگۆڕێ. ترسی نەشتەرگەرەکان لە سکاڵای دژی هەڵەی پزیشکییە. بەبۆچوونی من، پێویستە نەخۆشەکان زیاتر لە خودی نەشتەرگەرەکان لە بەرەنجامە دەروونییەکانی دەسکاریکردنی ڕوویان کە وەک هەویری سیرامیک یاریی پێ دەکرێ، بترسێن.

هەر نەشتەرگەرییەکی جوانکاری بەرەنجامی نەویستراوی لێ دەکەوێتەوە. نەشتەرگەری بەلای زۆر خەڵک هەڵبژاردنێکی باشە، بەبۆچوونی خەڵکی تر هێشتنەوەی بەهرەیەکی جێگیر لە ناو ناخ، ڕەنگە زۆر گرینگتر بێ لەلایەنە کۆمەڵایەتییەکەی ڕوو. ئەو شتەی کە مسۆگەریش بێ ئەوەیە نەشتەرگەریی جوانکاری هەڵبژاردنێکی زۆر ئاڵۆزترە لەوەی بەخەیاڵی زۆربەی خەڵکدا دێ. وەک ڕووخوێنەوەیەک تۆ دەگەیە ئاستێکی ئەوتۆ کە باشتر لەم خاڵە تێ بگەی.

پرسیار: بەهۆی جۆری کاری فرۆشیارییەکەم، زۆر پاڵەپەستۆم لەسەرە بۆ ئەوەی گەنجتر بێمە بەرچاو. وەک زۆرێک لە گەنجان من لەخۆبایی نیم، بگرە واقیعبینم. بۆیە بەنیازم نەشتەرگەرییەکی جوانکاری بۆ لووت بکەم تا کارەکەم بپارێزم، ڕات چییە؟

وەڵام: "هێنری دێیڤید سۆرۆ" بەگاڵتە وتی: " دوورکەوە لە هەموو ئەو پرۆژانەی کە

پێویستە بۆیان جلی نوێ بکەیە بەرخۆت". من هەمان شت بۆ هەر پرۆژەیەک کە داوای لووتێکی نوێت لێ بکا، دووبارە دەکەمەوە. وەک ڕووخوێنەوەیەک ڕقم لەو ژمارە ڕوو لە زیادبوونەی پرۆپاگەندە و وتاری ناو کۆوارەکان دەبێتەوە کە بەشانوبالّی نەشتەرگەریی جوانکاریدا هەڵدەدەن. خۆ کەس پارە لەوە خەرج ناکا تا پروپاگەندە بۆ بۆچوونێکی پێچەوانە بکا. کەواتە ڕاستییەکە لە کوێیە؟

ڕوو خوێندنەوە بۆچوونێکی پێچەوانەت پێشکێش دەکا کە لە ڕووی ڕۆحییەوە سوودبەخشە. تۆ دەتوانی سوود لە فیزیۆگنۆمی وەربگری تا بەرهەڵستی ئەو ڕوانگەیە ببێتەوە نەشتەرگەریی جوانکاری بەپێوەر دابنرێ. بیر لەوە بکەوە کە سەردەمێک ئافرەتانی ئەمەریکی کۆرسێتیان دەبەست، دواتر کەمەربەندیان بەست، ئێستا ئێمە سەربەستین لەوە هیچ کامیان نەبەستین، بەڵام لەجیاتی ئەم دوو جۆرە جلانەمان لە لا ئاسایی بووە.

ئەو بەدخۆراکییەی ئێمە ئەمڕۆ ڕووبەڕووی بووینەوە دیاردەیەکی تا بڵێی خراپە، ئاخۆ ئێمە لە ڕاستیدا دەمانەوێ وامان لێ بێت، کە تێیدا ئافرەتان «و پاشان پیاوان» پێڕەویی ئەو مۆدیلانە بکەن کە لەجیاتی مکیاژ بەهۆی نەشتەرگەرییەوە دەڕازێنرێنەوە.

ملڕاکێشان بۆ نەشتەرگەریی جوانکاری، تینبەخشی ئەم جۆرە پاڵەپەستۆیە کۆمەڵایەتییەیە. بۆیە لەبەرئەوەی بۆ خۆت داوات لێ کردم، پێم باشە نەشتەرگەری نەکەی. سڕینەوەی بەشێک لە ڕووت چۆن دەکرێ بتپارێزێ؟

نەشتەرگەریی جوانکاری یاریدەدەرە بۆ لایەنە کۆمەڵایەتییەکان، بەڵام ڕەنگە یەکجار زۆر ڕۆح بشێوێنێ. ئەگەر تۆ دەبێ شتێک بگۆڕی بۆچی لەسەر برۆیەکانت شتەکە تاقی ناکەیەوە؟ هۆیەکی بەهێز هەیە بۆ ئەوەی برۆ بەئاسانترین بەشی شیاو بۆ گۆڕان لە ڕوو دابنێین. هەروەک لەم بەشەدا فێر بووی برۆ دەربڕی شێوازەکانی بیرکردنەوەیە و بیرکردنەوەیەک کە توانای گونجانی هەبێ، یارمەتیت دەدا لەو شوێنەی کە گرینگە، واتە لە ناخدا گەش و جوان بێ.

٥

## گوێ

ئەو کاتەی ئامادەییت هەبوو بۆ وەرگرتنی نهێنیی بەکەڵک و قووڵ ئاورێک لە گوێ بدەوە. هیچ بەشێکی تری ڕوو هێندەی لە گوێ ناتوانێ زانیاریی وامان بداتێ کە چۆن کەسێک چوارچێوە بۆ واقیع دادەڕێژێ. ئەم شێوازە قووڵانە بەزۆری نا ئیرادین. لەگەڵ ئەوەشدا، لەو باوەڕە دام تۆ بتوانی خۆت لە چوارچێوەی ئەم جۆرانەی خوارەوەدا پێناسە بکەی.

ڕەنگە تەنانەت ڕووبەڕووی ئاستێکی ئەوەندە قووڵی واقیع ببییەوە کە ترست بنیشێ.

## درێژیی گوێ

یەکەم نهێنی کە گوێ دەتوانێ بۆتی بدرکێنێ پێوەندیی بەجۆری درێژیی گوێوە هەیە کە شتێکی ڕێژەییە. بەڵێ، من بوێرانە ئەم بەشەی کتێب بەدژوارترین بابەتەکەیەوە دەست پێ دەکەم. ئاخۆ تۆ چۆن دەتوانی پێوانی شتێکی ڕێژەیی وەک درێژیی گوێ بکەی؟ لە خۆت و تەنیا لە خۆتەوە لە ناو نەینۆک دەست پێ بکە «لەسەر هەمان ئاست سەیری ڕوو بکە و لە بیرت نەچێ دەبێ ئەو نەینۆکەکە لە ئاستی ڕووت نە بەرزتر بێ نە نزمتر.»

سەیری درێژیی گوێت بکە. بەراوردی درێژییەکەی بکە لەگەڵ درێژیی ڕووت، لە نێوچاوانەوە بۆ چەناگە. بزانە دەتوانی چەند گوێی لەسەریەکتری بهێنییە بەرچاوت پێش ئەوەی لە مەودای ڕوو دەربچی؟

– ئەگەر وەڵامەکەت سێ یان چوار گوێ بوو، کەواتە تۆ گوێیەکی بەئاشکرا درێژت هەیە.

– ئەگەر توانیت حەوت تا هەشت یان تەنانەت نۆ دانە لەو ئەندامە وردانە ڕیز بکەی سەریەک، کەواتە تۆ بەکەسێکی خاوەن گوێی کورت دەناسرێیەوە.

– ئەگەر توانیت جێی پێنج تا شەش گوێ بکەیەوە، گوێیەکی لە درێژیدا تەواو ناوەنجیت هەیە.

پرسیار: ئاخر من دەزانم لە پێواندا سەرکەوتوو نابم. لەوانەی زیندەوەرزانیی قۆناخی ئامادەیی نەمدەتوانی یەک شتیش لە ژێر مایکرۆسکۆپ ببینم. ئەگەر بۆ پێوانی هەرشتێک تەنانەت درێژیی گوێش لەخۆم ڕانەدیت، دەبێ چی بکەم؟

وەڵام: ئەو کاتە واز لە مێتۆدە ڕەسمییەکە بێنە. دەتوانی پشت بەمەزندە ببەستی. بزانە گوێی تۆ، بەبەراورد لەگەڵ هەموو ڕوو، گەورە دیارە یان ناوەنجی یانیش بچووک. ڕات چییە، ها؟

ئێستا کاتێکی گونجاوە بۆ ئەوەی ئەوە بخەمەوە یادت کە خوێندنەوەی ڕوو تەنانەت بەلەخۆگرتنی بەشی خەملاندنی قەبارە بەراوردییەکەی هێما جەستەییەکانیش شتێکی لەخۆزانراوەیە Intuitive. ئەو کاتەی تۆ لە دووکانی پێڵاوفرۆشی دای و پێت دەخەیە ناو ئامێرە سەیرە گیلۆتین ئاسایەکەی پێوانی قەبارەی پێ ڕەنگە هەستەکانت بیانەوێ شتێکت پێ بڵێن: خەفەت مەخۆ، قەبارە نزیککراوەکەی پێت پڕ بەپێڵاوەکە دەردەچێ. بەهەرحاڵ، چەندی زیاتر گوێ بخوێنییەوە، ئەوەندەش ئاسانتر لەم جۆرە شارەزا دەبێ.

پرسیار: مەبەستت گوێی گەورەیە؟ بەدڵنیاییەوە دەڵێی ئەو گوێیانە گەورەن. بەهۆی ئەوانەوە ژیانم لێ تاڵ بووە. سەیرکە چەند دەرپەڕیون.

وەڵام: دان بەخۆتدا بگرە. هەر دەڵێی ئەو خەڵکە هەموویان تاوانێکی عاتیفیی گەورەیان داوەتە پاڵ ئەم بەشە یان ئەو بەشەی ڕوویان.

بیر لەوە بکەوە: ئەندامێکی ڕوو بەجۆرەها شێوە دەتوانێ گەورە بێ. لەباری تۆدا، بەڵێ، گوێی تۆ یەکجار دەرپەڕیوە ئەمەش وا لە هێمای گۆشەی گوێی تۆ دەکا بەیەکێک لە زۆرەکان هەژمار بکرێ. بەڵام ئێمە هێشتا نەگەیشتووینە ئەو هێمایە. ئێمە ئێستا لە جۆرێکی جیاواز دەکۆڵینەوە کە برێتییە لە درێژیی گوێ. گوێی تۆ لە درێژیدا ناوەنجییە.

– وایە، تۆ ڕاست دەکەی. گۆشەکە هۆی گەورەبوونی گوێمە نەک لە بنەڕەتدا هەرشتێکی تری ئەو ئەندامە. بەڵام کێ بیری بۆ ئەوە دەچوو؟

درێژیی گوێ پێشاندەری حەزی نا ئیرادیی کەسێکە بۆ ڕادەی وەرگرتنی زانیاری. ئەم ڕادەیەش هەروەک درێژیی گوێ بەراوردییە.

کەسی خاوەن گوێی درێژ توانای بیستنیی نائاسایی هەیە. نموونەش ئەوانەن: "لیندن



گوێی کورت



گوێی درێژ



گوێی ناوەنجی

درێژیی گوێ

جـانسـن"ی سـەرکـردە لە قـومـاربازی و "ئەلبـێـرت شـوایـتـزر"ی مـرۆڤـدۆسـت و هـەروەها پێشەنگانی دەستەبەرکردنی بازاڕی فرەئاست واتە "ریچارد دی ڤۆس" و "جێی ڤەن ئەندڵ" کە لەسەردابەکانیاندا "Amway"یان دامەزراند «ئێستا کۆمپانیا بچووکەکەیان پتر لە ٣,٥ بلیۆن دۆلار دێنێ».

ئاخـۆ ئاریشـەی ڕێ تێـچـوو بۆ ئەو کـەسـەی کـە هـەروەک چـۆن ئـسـفنجـێکی وشک ئاو هەڵدەمژێت ئەویش وا بەئاسـانی زانیاری ڕادەکێشێ، دەبێ چی بێ؟ نقومبوون ئاریشە ڕێ تێچووەکەیە. ڕەنگە تۆ بزانی ئەم ئاریشە چۆنە. تەنانەت پاش ئەوەی تۆ ئەو شـتەی دەتەوێ دەبیـسـتی بەبێ ویسـتی خـۆت ناتوانـی واز لە وەرگـرتـنی زانیـاری بهـێنی. لە ئاکـامـدا تۆ لەوانەیە سـەرت لێ بشێوێ سەبارەت بەو شـتەی کە بەپێی تێگەیشتنی خـۆت بەپێچەوانەی هەموو ئەو زانیـارییانە بێ کە لە سەرچاوەکانی ترەوە هەڵچۆڕاون. بەڵام سوودەکانی گوێی درێژ زۆرن، لەوانەش کارامـەیی لە خشـتـەی وشـەی یەکـتـربڕ، یان هـەر چالاکییـەکی تر کـە پێویستی بەزانیاریی گشتی هەبێ.

بەپێچـەوانـەوە، خـەڵکی گوێ کورت نەک تەنیـا زانیـاری کۆ دەکەنەوە بگرە زانیـارییـەکە بەجیدی وەردەگرن و تەنانەت وای دادەنێن کە قسەکان بەخۆیان وترابێ. ئەگەر تۆ سـەر بـەم گرووپە بی کەسـێکی زۆر لەسـەر هەسـتی. ئاریشەی ڕێ تێچوو ئەوەیە کە خێراتر لەوانی تر لە وەرگرتنی زانیاری تێر دەبی. پاشـان لە کارکردن دەوەستێ، جـا با ئەو شتەی خـەڵکانی تر هـەوڵ دەدەن پێـتـی بڵێن هـەر شـتێک بێ، تۆ ئامـادە نی گوێ بگـری «ڕەنگە دژوار بێ بۆ خـۆت دان بەوە بنێی کە تۆ ئاوای، ئەگەر پێویست بکا، پرس بەکەسـێکی وا بکە، کە چاک بتناسێ تا بۆچوونی خۆی، پێت بڵێ».

بەڵام سـەیروسـەمـەرەیی گوێیە بچووکەکەت لەوەدایە کە بەر لەوەی لە کـارکردن بوەسـتی زۆر بەباشی زانیـاری وەردەگری. "چارلی چاپلین" هەرگیـز تاکە فیلێکیشی، کە ئەگەر بۆ فیلمەکانی بەکەڵکی هاتبا، لە بیر نەدەچوو. گوێیە پێکەوەنیناوییەکەی "پیتێر سێلر"یش دەبێ بەهاوتای گوێی چارلی چاپلین دابنرێ. "مایکڵ جۆردن"یش لە هەر شتێک کە تووشی هاتبێ، جا هەرجۆرە وەرزشێک بووبێ، باشترین سوودی وەرگرتووە.

ئەگەر تۆ خـاوەن گـوێی مـامناوەنجی بی ئەوا بۆ گـوێگرتن توانای خـۆگونجـاندنت هەیە. هـەندێک جـار وەک بەتـامـەزرۆییـەوە زانیـاری وەردەگـرێ. کـاتەکـانـی تر حـەز دەکـەی گـوێ ڕانەگری. زۆر پەرێشان نابی، وایە؟ «لانی کەم لە کاتی بیستنی خۆنەویستەکەیدا.»

هاوڕێ! تۆ بەجوانی خۆت دەگونجێنێ. تاکە کاردانەوەت هەمان گرفتە بچووکەکەیە، واتە بەرگەنەگرتنی هەموو خەڵکی تر. بۆچی هەندێک خەڵک ناتوانن بەئاسانی واز لە گوێگرتن بێنن؟ بۆچی ئەوانی تر ئەوەندە خۆیان ماندوو و مردوو دەکەن و ئامادەن گوێ لە هەر کەسێک بگرن کە بەلایاندا تێ دەپەڕێ؟

پرسیار: کەواتە دەکرێ لەبەر ئەو هۆیە بێ کە خێزانم ناهێڵێ منداڵەکانمان ببەینە سێرک؟ ئەو دەڵێ سێرک بێزاری دەکا. گوێی خێزانم وەک وردەلەپکەی دەریاییە.

وەڵام: بەڵێ. ڕەنگە پێوەندیی بەهێمای درێژیی گوێوە هەبێ. بەبۆچوونی من هەر کاتێک ئەو پێی وتی لە خەڵک بێزارە و دەیەوێ بەتەنیا بێ پێویستە باوەڕ بەقسەکەی بکەی. ئەوەشت با لە مێشک دابێ کە تۆ هۆی بیزاربوونی نیت. شتەکە پێوەندیی بەهاوسەرەکەت و گوێی خۆییەوە هەیە.

## جێکەوتی گوێ

ئێستا گوێ لەمە بگرە. تا ئەو کاتەی زانیاریت نەبێ لەسەر گوێی جێنکینز «گوایە پاش ئەوەی گوێی بڕاوتەوە شەرێک هەڵایساوە. پیلانێکی ورد بوو، بۆ زانیاریی زیاتر سەیری کتێبەکانی مێژووی بەریتانیا بکە» یان گوێی "ڤینسینت ڤان گۆخ" کە بەدەستی خۆی گوێی خۆی بڕیوەتەوە «خوا ئەو ڕۆژەت بەنسیب نەکات» ڕەنگە وا بیر بکەیتەوە کە گوێ تەنیا یەک جێکەوتی ڕێ تێچووی هەیە کە ئەمیش لە تەنیشت سەرە.

بەڵام ئێستا ئێمە بەنیازین ئەو ڕێ تێچوونە ڕەچاو بکەین کە دەڵێ جێکەوتی گوێ هەر ئەوە نییە کە لە تەنیشت ڕوومەت یان شوێنێکی تری ڕووتەوە بێ. بەبەراورد لەگەڵ هەموو ڕووی خۆت ئاخۆ گوێی تۆ لە کوێ هەڵواسراوە؟

بۆ ئەوەی ئەم جۆرە ببینی پێویستە دوو نەینۆک بەدەست بگری تاکو بتوانی لە لاڕووەوە خۆت ببینی. هەروەها ڕەنگە بەشێوەیەکی کاتەکی پێویست بکا تۆ مۆدیلی ڕێکخستنی پرچت بگۆڕی «لە ڕاستیدا تاکۆتاییی ئەم بەشەی کتێب دەبێ هەروا بکەی لەبەرئەوەی ئەگەر گوێی تۆ بەپرچێکی چڕوپڕ و سەیر داپۆشرابێ خوێندنەوەی دژوار دەبێ».

– جاروبار چاوت بەگوێی بەرز دەکەوێ کە لووتکەکەی لە ئاست شوێنێکی سەرووی برۆدایە و نەرمەگوێیەکەشی ناگاتە ئاست سەری لووت.

– گوێی نزم هێمایەکی بەربڵاوترە کە تێیدا نەرمەگوێیەکە لە خوار ئاستی سەری لووتدایە و لووتکەکەشی ناگاتە بەرزاییی ئاستی برۆ.



گوێی نزم



گوێی بەرز



گوێی ناوەنجی

جێکەوتی گوێ

– گوێی لە جێکەوت ناوەنجی لە هەر هەموو هێمایەکان باوترە کە تێیدا گوێ جێی خۆی بەرێکی لە نێوان بەرزترین بەشی برۆ و سەری لووتدا کردووەتەوە.

پرسیار: من بۆ دیتنی ئەم هێمایە لە ڕووبەڕوودا هیچ گرفتێکم نییە، بەڵام خاڵە تایبەتییەکە ئەوەیە کە پێ دەچێت من بتوانم جێگۆڕکێ بەجێکەوتی گویم بکەم. هەندێک جار گوێم بەرز دیارە و کاتەکانی تر نزمە. ئاخۆ ئەمە ئاماژە بەبەهرەیەکی تایبەت دەکا؟

وەڵام: نەخێر. بەڵام تۆ پەنجەت خستووەتە سەر ئەو گرفتەی کە کاتێک هەوڵ بدەی لە ڕووبەڕووەوە ئەم هێمایە بخوێنییەوە، سەر هەڵدەدا. بەدڵنیاییەوە لە ڕووبەڕووەوە دەتوانی گوێ ببینی، بەڵام ئەوە دەوەستێتە سەرئەوەی تۆ چۆن سەرت ڕاگرتووە. ئەو کاتەی تۆ سەیری سەرەوە یان خوارەوە دەکەی، جێگۆڕکێ بەجێکەوتە ئاشکرایەکەی گوێت دەکەی. بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم کە لەجیاتی ئەوەی لە ڕووبەڕووە ئەم هێمایە سەیر بکەی، لە لاڕووەوە سەیری بکە. بەم شێوەیە دەتوانی سوود لە دوو خاڵی نیشاندەری جێگیر وەربگری کە برێتین لە لووتکەی برۆ و سەری لووت . لەم ڕوانگەیەوە جێکەوتی گوێ گۆڕانی بەسەر نایەت.

پرسیار: ئەی هاوار، مەبەستت ئەوەیە ئەم هێمایە هەرگیز ناگۆڕێ؟

وەڵام: پێشبینیی گۆڕانی بۆ بکە. بەدڵنیاییەوە دەگۆڕێ، بەڵام نەک لە ماوەی چەند ساتێکدا بگرە لە ماوەی چەندین ساڵ. ئەگەر جێکەوتی گوێ جێگۆڕکی بکا یان تۆ سەیری وێنەی میقاتکراوی خۆت دەکەی یانیش سەیری فیلمی کارتۆن دەکەی. ئەگەر واش نەبێ هۆیەکەی ئەوەیە کە تۆ هەمان تەکنیکی دژواری سەیرکردنی گوێ لە ڕووبەڕووەت بەکار هێناوە.

جێکەوتی گوێ یەکێکە لەو هێما بەسوودانەی کە باشترە بیانخوێنییەوە بەتایبەتیت ئەگەر تۆ لە بواری فروشیاریدا کار بکەی. ئەم هێمایە خێرایی بڕیاردانی کەسێک بەدەر دەخات.

گوێی بەرز ئاماژە دەکا بەخێراییەکی زیاتر لە تێکڕای خێرایی بۆ هەرسکردنی زانیاری. خاوەنی ئەم جۆرە گوێیە "ستیف جۆبس"ە، بازرگانی بوێر لە بواری کۆمپیوتەر کە وەک قارەمانێکی ئەفسانەیی وایە. هەروەها زۆرێک لەو کەسانەی خاوەن ئەم جۆرە گوێیەن زیاتر لە هەموو کارێکی تر لەو کارانەدا هەست بەئاسوودەیی دەکەن کە بۆ داڕشتنی بەرنامەی کۆمپیوتەری مەرجە کارکەرەکان خێراییەکی زۆریان هەبێ.

"سێر چارلز دروو" پێشەنگێک لە بواری پاراستن و پاشەکەوتکردنی خوێن، خاوەن گوێی بەرز و کەڵپی گەورە بوو «بۆ کەڵپەکەی گاڵتەم کرد». کەسانی نوێکاری تری خاوەن گوێی بەرز بریتین لە: "جێی گرێیج ڤێنتر" کە دەستپێشخەر بوو لە بەکارهێنانی سیستەمی دۆزینەوەی زنجیربەندی میکانیکی automated gene sequencers و "جێیمز واتسۆن"ی بۆماوەناسی وەچەکانی پێشوو و "سێر پاتریک گیدیس"ی چاودێری پەرەپێدانی شار و "ئێدگار ڤاریس"ی ئاوازدانەر. "جۆن ستێینبێیک" بیرتیژیی خێرای خۆی بۆ دارشتی زۆر رۆمان بەکار هێنا، "ویلت چەمبرلێن" ئەم بەهرەیەی خۆی لە تۆپی باسکە بەکار هێنا و بلیمەتیی "میدۆری"ش لە کەمانچەژەنیدا، لە سوودی ئەم بەهرەیە بێ بەش نەبووە.

جارێک لە میوانداررییەک پیاوێک سەرنجی راکێشام. ئەو پیاوە خاوەنی بەرزترین جێکەوتی گوێیە کە تا ئێستا دیتبێتم. پێم وت: "سڵاو، تۆ خاوەنی بەرزترین گوێی کە تا ئەمرۆ دیتبم. ئاخۆ تۆ بەخێراییەکەی سەرووئاسایی شت فێر نابی؟" «هیچ لێی دوودڵ مەبە، خوێندنەوەی ڕوو ڕێگەیەکی سەرەکییە کە بەهۆیەوە دەتوانی لە میوانداررییەکاندا خۆت بەخەڵک بناسێنی. لەجیاتی ئەوەی بڵێی: "ئاخۆ پێشتر لە هیچ شوێنێکی تر یەکترمان نەبینیوە؟" و بەو قسەیە بتەوێ خۆت هەڵبقورتێنی دەتوانی هاوژوانەکانی داهاتووت بەوتەیەکی لەم جۆرە ئەفسوونی بکەی: "من پێشتر هەرگیز تۆ یان کەسێکم کە بەئاستەم، لانی کەم لە رووی جێکەوتی گوێیەوە لە تۆ بکا نەدیبوو "هەر هێمایەکی تر بڵێی کە ئەو کاتە سەیری دەکەی" من ڕوو خوێنەرم. حەز دەکەی پێت بڵێم واتای ئەم هێمایە چییە؟"».

یەک ساتیشی نەبرد تا پیاوە گەڕاوە و وتی: "من هەژدە زمان دەزانم".

ئەی لایەنە خراپەکەی گوێی لە بەرزاییدا شەکاوە بێ، چی بێ؟ دان بەخۆدانەگرتن ڕەنگە لایەنێکی خراپ بێ. زوو تێ گەیشتی. بۆچی ئەو کەسەی قسەت لەگەڵ دەکا ئەوەندە هێواشە؟ "وەڵام: لەبەرئەوەی ئەو گوێ بەرز نییە بۆیە مێشکی زۆر خێرا کار ناکا."

ئاریشەی ڕێ تێچووی تر ئەوەیە کە زوو بەکۆتاهێنانی کارێک پێویستییەکی سەرەکیی تۆیە. بەڵێ، بەزۆرترین خێرایی تۆ بڕیاری باش دەدەی و وەستان شێتت دەکا. ڕەنگە هەندێک جار تۆ بەپەلە بڕیار لەسەر زانیارییەکی ناتەواو بدەی تەنیا لەبەرئەوەی ناتوانی بۆ چرکەیەکی تر دان بەخۆتدا بگری.

کەسێکی خاوەن گوێی نزم، ڕەنگە تووشی گرفتێکی ئاوا نەبی. ئەم کەسە ڕەنگە لە

بیرتیژیدا هێواشتر بێ. تکایە سەرنجی ئەوە بدە کە ئاستی بیرتیژیی کەسێکی گوێ نزم، ڕەنگە هەروەک خەڵکی تری خاوەن گوێی بەرز، یان ناوەنجی بێ، ئەوەی جیاواز بێ، تەنیا خێرایی و شێوازەکەیە.

بڕیاردانیش بەشێوەیەکی جیاواز، ئەنجام دەدرێ. زیاتر لە هەر شتێکی تر گوێی نزم بەو واتایەیە کە پێویستیی تۆ بەزانیاری زیاترە لە پێویستیت بەبڕیاردان و کۆتاییهێنان بەکارەکە. بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕێک، ئەمە ئەنجام بدەی ڕەنگە کارەکە دوابخەی. بەبۆچوونی من باشترین شێوەی کارکردنی تۆ بەمجۆرەیە:

– تۆ سەرەتا زانیاری گڵ دەدەیەوە و ئەگەر ماوەت پێ بدرێ، قۆناخی لێکۆڵینەوە ڕەنگە چەندین ساڵ بخایەنێ.

– دووەم شت زانیارییەکان هەڵدەسەنگێنی Evaluate– ئەم وشەیە دەبووایە ئاوا بنووسرێ Evalu-Wait واتە هەڵسەنگاندن– چاوەڕوانکردن لەبەرئەوەی ئەو ماوەیەی کە تۆ سەرقاڵی بیرکردنەوە لە بڕیاردان دەبی، خەڵکی تر کتوپڕ لە چاوەڕوانیدا دەبن.

– لە کۆتاییدا تۆ بڕیاری خۆت دەدەی. باشترە بڕیارەکەت ژیرانە بێ لەبەرئەوەی ڕەنگە هەرگیز نەتەوێ لێی پاشگەز ببیتەوە.

وایە، ڕەنگە هەندێک خەڵک بڕیاردان و مکووربوون لەسەر ئەم بڕیارە بە ئاریشەیەک دابنێن. بەڵام تۆ دەتوانی بەم وتەیە وەڵامی بۆڵەبۆڵکەران بدەیەوە:

من لە بڕیاردانمدا لاسایی ئەو کەسانە دەکەمەوە کە نموونەن بۆ ژیرییە دووربینانەکەی کەسی خاوەن گوێی نزم.

«لەبەرئەوەی زۆربەی خەڵک کاتێک کارێکی ژیرانە دەکەن وشەی "لاساییکردنەوە" بەکار ناهێنن تا ژیرییەکە بەناوی خۆیانەوە تۆمار بکەن. ئەگەر بابەتەکە سەرنجی تۆی ڕاکێشابێ، دەتوانی لیستەیەک لە هەموو کەسایەتییە مێژووییەکانی خاوەن پلەی سیاسیی گەورە ئامادە بکەی. بەگوێرەی تیۆرەکەم گوێی نزم کاریگەرییەکی بەرگریکارانەی هەیە، بۆ دڵنیابوون لەم ڕاستییەش بیر لە ڕێیگان بکەوە کە تا ئێستا بەبەراورد لەگەڵ هەموو سەرۆکەکانی ئەمریکا، خاوەنی نزمترین جێکەوتی گوێ بووە. تەنیا میلێرد فیلمۆر و فرانکلین پیرس لە ڕووی سەرنجڕاکێشیی گوێیانە شان لە شانی گیپر دەدەن.»

تۆی گوێ بەرز ئێستا بیرت بۆ ئەوە چووە کە ڕەنگە کەسێکی بڕیاردەری گوێ نزم سەرپشکییەکی تریشی هەبێ. با بڵێین تۆ هەر ئێستا بەسەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان

هەڵبـژێردراوی. کە خـۆشـە، بەڵام بـۆ خـۆت زوو هـەست بـەوە دەکـەی کە مـانگی هەنگوینی سـەرۆکێک بەهۆی هەڵبـژاردنەوە تەنیا چـوار ساڵ دەخـایەنێ. لەگـەڵ چاپەمـەنیدا ڕەنگە تۆ تەنیا دوو سـەعات ڕێزت لێ بگیرێ و دواتر هـەموو بـڕیارەکانت بەشـێتانە لە قـەڵەم دەدرێن. هـەر بـۆیە بیــر لەو بکـەوە کــە چەند بەهرەمــەند دەبـی، ئەگــەر بـۆ نموونە بتــوانی نیــوەی بڕیارەکانی کەسێکی گوێ بەرز بدەی.

سـەرۆک "جـۆرج ئێچ ڕێیگان" و "جـۆرج دەبلیـو بوش" ڕەنگە سـوودیان لە خـێراییـیـە بەبەراورد کەمەکەیان وەرگرتبێ. بەپێچەوانەوە بیر لە کێشەی سـەرۆک "کلینتۆن" بکەوە کە پێوەندیی بەگوێیە بەرزەکەیەوە هەبوو. بەدڵنیاییـیەوە کلینتۆن بەهۆی خـێرایی لە بیـرتیژیدا تـوانیـی زەمـــالەیەکی زانکۆی ڕۆدز وەربگرێ کـــە ئـەمـــەش ڕێخـــۆشـکـەر بوو بـۆ پلـەی سەرۆکایەتی. پاش ئەوەی پێی نایە کۆشکی سپی، گوێیە بەرزەکانی ئاماژەیان دا بەحەز و ئارەزووی بـۆ بەپەلـە بڕیاردان لـەســەر بـابەتی کــەسی و ســیـاسـی و ئەمــەش کلینتــۆنی نەپارێزراوانە خستە ژێر لێشاوی ڕەخنە.

بەڵام تۆی ڕووخوێنەوەی خـاوەن گوێی لە جێکەوتدا ناوەنجی ئەم جۆرە گرفتانەت ناهێتە ڕێ. بەڵام گرفتـی تۆ هـەمان گرفتـی جـارانە: بەرگەنەگرتنی هـەمـوو خـەڵکی تر بەتایبـەتیش خەڵکی بـەپەلە و خەڵکی کـاتکوژ. بەڵام تۆ کە لە تواناتدایە خێرایی بیرتیژییـەکەت بگۆڕی، سـەرمایەیەکی تەواو ئەرێنیت هـەیە. بەشێوەیەکی سـەرنجڕاکێش ئەم هێمایە لە ناو یاریزانە شـارەزایەکانی بێیسبـۆڵدا بەربڵاوە. یاریزانە بەرچاوەکـانیان کە بەخـەیاڵمدا بێن ئەمـانەن: "مارک مەگگوایر" و "ویلی مێیس" و "ریکی هێندرسن" و "ئۆرل هێرشیسر".

ئەو بـەهرەیەی لە گــوێی لە جـێکەوتدا ناوەنجـی دەردەکـەوێ هـەروەها یاریدەی "مــارڤن هـارۆڵد دێفس"ی بلیۆنێری داوە تا بەهۆی خێراییـیە سـەرووئاساییەکەی لە بڕیارداندا، چا چ بۆ نەوت بـووبێ، چ بۆ مـۆڵکی لۆسـانجلێس، و چ بۆ بـەرهـەمـە سـەرنجـڕاکـێشـەکـانی "Twentieth Century Fox"، ناوبانگ دەربکا.

پرسـیـار: تکایە بەیارمـەتیت. لەسـەر لێواری بابەتێکی گرینگ خەریکە هەڵدەلەرزم. چۆن سوود لە زانیاریی جێکەوتی گوێ وەربگرم بۆ پەرەدان بەپێوەندییەکانم لەگەڵ خەڵکی تردا؟

وەڵام: تۆ لێرە هـەسـتت بە گرفتێک کـردووە، زۆر چاکە. بۆ ئەوەی سـوود لە خـوێندنەوەی ئەم هێـمـایە وەربگری، سـەرەتا بـزانە هێمـای خـۆت سـەر بـەچ بـابەتێکە. پاشـان خـۆت لەگـەڵ شێوازی بیرکردنەوەی هـاوڕێیەکانت بگونجێنە.

– ئاخۆ گوێی تۆ لە شوێنێکی نزم هەڵکەوتووە؟ کەواتە دووبارە کەسی بەرامبەرت لەوە دڵنیا بکەوە کە لە ڕاستیدا تۆ ئاگات لێیەتی و گوێت بۆی ڕاگرتووە. دەتوانی بڵێی: "دەبێ بیر لە زۆر شت بکەینەوە". کاتێک بۆ بڕیاردان بیر دەکەیەوە دەستخۆشی لە هاوڕێیەکەت بکە لەبەر دان بەخۆداگرتنی. ئەگەر پێویست بوو بەبیری بێنەوە کە ڕەنگە بۆ بڕیاردان کاتێکی زۆرت بوێ لەبەرئەوەی لەلای تۆ هەڵسەنگاندنی چەند و چونیەتی خودی بڕیارەکە زیاتر لە خێراییی بڕیاردانەکە گرینگترە و هەروەها پێ دەچێ کە هەر ئەمە ڕاست بێ و، ئەمەش شتێکی کەم نییە.

– ئاخۆ گوێت لە شوێنێکی بەرز هەڵکەوتووە؟ کەواتە نەرمونیان بە و لە گوڕی ئەو خێراییە زەینیەت کەم بکە کە بەهۆیەوە لە سووچێکی هزرتەوە بۆ سووچێکی تری باز دەدەی. ڕەنگە کاتێک دێیەوە سەر هۆشی خۆت لەوە تێ دەگەی کە بەهۆی پەلەکردنتەوە لە هەموو کارێکدا تەنیا کەلاوەیەکت بۆ بەجێ ماوە.

## گۆشەی گوێ

ئاخۆ گوێی تۆ چەند لە سەرت دەرپەڕیوە؟ ئەمە ئاماژەیەکە بۆ نهێنییەکانی تر.

بەکارهێنانی قەڵەمدار ڕێگەیەکی پێوانی گۆشەی گوێیە. ئەمەش تا ڕادەیەک پێویستی بەهەماهەنگی هەیە، بەڵام دڵنیام تۆ دەتوانی ئەم تاقیکردنەوەیە ئەنجام بدەی. سەرەتا پاڵ بەپرچی سەر گوێی ڕاستتەوە بنێ. نەینۆکەکە لە دەستی چەپتدا بگرە.

بۆ ئەوەی لە ڕووبەڕووەوە وێنەیەکی تەواو ببینی قەڵەمدارێک بێنە و سەراوژێر لە دەستی ڕاستتدا بیگرە و لە پشت گوێی خۆتی ڕابگرە.

– گوێی گۆشەتیژ هەڵدەدرێتەوە تا ڕێگە بەتێپەڕبوونی قەڵەمدارەکە بدا.

– بەڵام مەرج نییە گوێی گۆشەکراوە لە جێوە بجووڵێ. لە ڕاستیدا، هەندێک گوێ ئەوەندە زۆر دەرپەڕیون کە تۆ دەتوانی دوو سێ یا تەنانەت چوار قەڵەمیش بخەیە پشتیان، بێ ئەوەی هەست بەجیاوازییەکی بینراو بکەی «مەبەستم ئەوە نییە ئەم تەکنیکە وەک شێوازێکی نوێ بۆ هەڵگرتنی شتومەک بەکار بێنێ. تەنانەت ئەگەر شوێنی هەڵگرتنی پەڕاوگەت تەسکیش بێ، تەنیا یەک جار بۆت هەیە ئەم تەکنیکە بەکار بێنێ.»

پرسیار: چەند بەلاتەوە ئاسانە گاڵتە بەگوێی من بکەی کە وەک گوێی گوێدرێژە، هەستت بەوە نەکردووە باسکردنی ئەم جۆرە ئەندامانەی ڕوو ڕەنگە وەک جوێنپێدان بێ؟

وەڵام: لە ڕاستیدا، لانی کەم منیش وەک تۆ بەجیدی بیر لە ئەندامەکانی ڕوو دەکەمەوە، هەرچەندە ڕوانگەکانمان جیاوازە و تۆ وەک زۆر خەڵکی تر بەناڕەوایی ڕەخنەت لێ گیراوە یان تەنانەت گاڵتەت پێ کراوە، دەستەبەرکردنەوەی ڕێز لەخۆنانت بەشێکە لە ئەرکی سەرشانت لە ژیاندا.

ئەوەندەی لەسەر منە ئەوەیە، خەڵکی ئەمەریکی فێری ئەوە بکەم ناوی ئاژەڵ نەهێنن تەنیا لە بارێکدا نەبێ کە ئاماژە بەخودی ئاژەڵەکان دەکەن. هەستیاریی خەڵک بەرامبەر قسەی ڕووشێنەر لە سەردەمی ئێمەدا زیادی کردووە کەچی یەکێک لەو شتانەی کە خەڵک خوویان پێوە گرتووە ئەوەیە کە بەبێ بیرکردنەوە لەخۆڕا ناوی ناشیرین دەدەنە پاڵ ئەندامەکانی ڕوو. ئەمڕۆ کەم کەس دەوێرێ گاڵتە بەکەسانی خاوەن پێداویستیی تایبەت بکا جا چ جای ئەوەی بوێرێ وشەی "پەککەوتە" بەکار بێنێ. بەڵام ئەو کەسانەی دەکەونە ئاراستەی تر چێژ لە وتنی "گوێی وەک گوێدرێژ" و "ڕوومەت سمۆرە" و "لموز سەگانی"وەردەگرن.

جارێکی تر ئەگەر بینیت کەسێک گاڵتەی بەئەندامێکی ڕوو کرد وەک ڕووخوێنەوەیەک ئاوا لە دەمی بدەوە: "باشە دەزانی ئەو هێمایە چ بەهرەیەکی گەورەی بەخشیوە بەخاوەنەکەی". تەنیا بۆ ئەوەی بتوانین وەڵامی ئەو جۆرە کەسانە بدەینەوە، شایستەیە ڕووخوێندنەوە فێربین.

گۆشەی گوێ پێوەندیی بەچۆنیەتیی هەڵسوکەوتی مرۆڤ لەگەڵ نەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە. وا دابنێ شەپۆلەکانی هەوای ئەم ژوورە هەڵگری پەیامی جۆراوجۆرن کە لەلایەن کۆمەڵگەوە هاتبن، پەیامی لەم جۆرە: "جلت با بەم شێوەیە بێ"، "بەم شێوەیە دانیشە"، "تا قسەت لەگەڵ نەکەن تۆش مەدوێ".

زانایانی کۆمەڵناسان دەتوانن ڕۆژێکی تەواو بەلێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی لەسەر هەموو ئەو نەریتە کۆمەڵایەتییانەی کە زۆر جار بەشێوەیەکی هەستپێنەکراو بەسەرماندا دەسەپێنرێن، بەسەر بەرن. بۆ ئەوەی بزانی گوێ چ پێوەندییەکی بەم وێنە خەیاڵییەوە هەیە، هەموو ئەو خەڵکەی ئێستا لەو بینایەن بێنە بەرچاوت. وا دابنێ هەرکەسەو دەستەوانەیەکی – لە ڕاستیدا جووتێک دەستەوانەی گۆڵچییانی بەیسبۆڵی پێ دراوە، تا بەهۆیەوە پەیامەکان وەربگرێ.

وا دیارە خەڵکی خاوەن گوێی گۆشەتیژ هەموو پەیامەکان خێرا وەردەگرن و ئەوەندە بەڕێکی هەڵیان دەدەنە ناو مێشکیان کە شەقەقەی لێوە دێ. ئەو سەرانە بێنە بەرچاوت کە بەیەکەوەوە لە کاتی گرتنەوەی هەر پەیامێکدا، دەلەقێنەوە: "بەڵێ، تێ گەیشتم". لەوە تێ

دەگەی کە ئەو گوێیەی بەتەختی بەکەللەوە نووساوە ئاماژە بەوە دەکا کە کەسەکە لە ڕووی هەڵسوکەوتەوە زۆر حەز لە خۆبەستنەوە بەکەسانی ترەوەدەکا تەنانەت ئەگەر ئەو خۆبەستنەوەیە پابەندی بکا پێڕەوی لە خوو و ڕەوشتێکی بێ ماناش بکا.

سەلیقە ناوێکە بۆ ئەم بەهرەیە. ناوێکی تر بۆ ئەم خەسڵەتە هۆشیاریی کۆمەڵایەتییە. ئەگەر گوێی تۆ ئەم جۆرە گۆشەیەی هەبێ شانازی بەخۆت بکە لەبەرئەوەی لە ڕووی ئەو ڕەوشت و پۆشاک و شێوازانەی تر کە بەهۆیانەوە خەڵک ژیریی هاوبەشیان بەدەر دەخەن تۆزقاڵێک جیاوازی لە نێوان خۆت و ئەواندا نابینییەوە، وایە؟ ئەگەر بۆ خۆت بتەوێ لەگەڵیان نەگونجێی، ئەم بڕیارەشت ویستەکییە. لە بواری کارکردندا لە توانای خۆت بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ هەرشوێنێک کە پێت بنێیە ناوی، سوودمەند دەبی. خۆگونجاندنی چی، لە ناو شوێنەکەدا دەتوێیەوە، هەروەک ماستی مەیوت لێ دێ.

ئەی ئاریشەکەت چییە؟ تا چەند دەتوانی ڕێز لە خەڵکێک بگری کە بەسووکی هەڵسوکەوت دەکەن؟ تەنانەت ئەگەر هەوڵ بدەی ڕەخنەگرانە سەیری خەڵک نەکەی دان بەوەدا بنێ کە ڕەخنەگری. کاتێک چاوت بەکەسێکی نامۆ دەکەوێ کە هەڵسوکەوتێکی سەیر لەسەر شەقام یاخۆ لە میوانداریيەک دەنوێنێ، دەستبەجێ ئەم کەسە ڕێزی لە لات نامێنێ.

ڕەنگە کێشە ڕاستەقینەکە ئەوە بێ کە ڕەوشت بەرزییەکەی خۆت زۆر سروشتییە بۆیە وا چاوەڕوان دەکەی کە هەموو خەڵکیش وەک خۆت بێ. خوێندنەوەی ڕوو ئەمە ڕوون دەکاتەوە: مەرج نییە خەڵکی تر کەودەن، بن ئەوان تەنیا لە بەهرەکەی تۆ بێ بەشن. بۆ ئەوەی زیاتر دڵت بحەسێتەوە، بزانە کە بەهرەی تۆ لە پیشەکەتدا یەکجار یاریدەت دەدا بەتایبەتی ئەگەر پیشەکەت لەگەڵ داوونەریتدا بگونجێ. با بڵێین حەز دەکەی ببی بەدادوەرێکی دادگای باڵا. پێ دەچێ بۆ ئەندامە هەرە پێڕەوکارەکانی ئەم دادگەیە واتە بۆ "ڕێینکویست" و "تۆماس" و "سکالیا" گوێی گۆشەتیژ یەکێک لە مەرجەداواکراوەکانی ئەم کارە بووبێ.

گۆشەی گوێی دادوەرە سەربەستەکان هەندێک دەرپۆقانی پێوە دیارە. گوێی ڕاستی "ئۆکۆنەر" گۆشەی تیژە و دەرخەری شێوازی کەسیی ئۆکۆنەرە لە بواری کارکردن، بەڵام گوێی چەپی گۆشەکراوەیە. گوێیەکانی "کەنێدی"یش دوو ئاراستەی دژبەیەکیان هەبوو. پاش کەمێکی تر لەوە تێ دەگەی خاوەنداریەتیی دوو شتی جیاواز لە یەک ڕوودا واتای چییە. وەک بۆ کاتی ئێستا ئەوەندە بەسە کە بزانی کەنێدی و ئۆکۆنەر کاتێک ویستبیان لەگەڵ دادگەیە یەکجار پارێزگارەکەی ڕێینکویستدا خۆیان بگونجێن پەیامی جۆراوجۆریان

ئاراستەی مێشکی خۆیان کردووە.

"ستیڤنس" و "برێیەر" و "گینسبێرگ" و "ساوتر"، دادوەرانی بەنزیکەیی لیبرالّی دادگەی بالآ، سەروو جووتە گوێیەکی گۆشەکراوەیان هەیە.

گۆشەی گوێ هەروەک بەشەکانی تری ڕوو دەرخەری ملکەچی بۆ هەموو فەلسەفەیەکی شەرعی یان بیروڕایەکی سیاسی نییە. گۆشەی گوێ دەرخەری پێویستیی کەسێکە بۆ خۆبەستنەوەیەکی ئارەزوومەندانە بەکۆمەڵگەوە. ساوتری دادگەی بالآش کە بەبەراورد لەگەڵ دادوەرانی سەربەخۆی تر سەربەخۆییەکی زیاتری هەیە، گۆشەی گوێی ئێجگار کراوەیە و ئەمەش ئاماژە بەوە دەکا کە دیدی کەسەکە بەرامبەر بەکۆمەڵگە وەک هی بێگانەیەک وایە. سەرۆک "جۆرج ئێچ"، ئەگەر تۆش لەگەڵ من پێش دامەزراندنی ساوتری بەناو پێڕەوکار لێکۆڵینەوەت کردبایە، دەمتوانی ئاگادارت بکەمەوە هەوڵ نەدەی پێشبینیی بیر و بۆچوونەکانی ساوتر بکەی.

خەڵکی خاوەن گوێی گۆشەکراوە ئەگەر لەلایەن دادگەی بالآوە چاودێری هەڵسوکەوتیان نەکرێ ڕەنگە گاڵتە بەکولتووری پێڕەوکاری بکەن. یەکێک لە نموونە هەرەباشەکانم "مەت گرونینگ"ی دەرهێنەری "The Simpthons"ە. بەڵێ، مەبەستم "واکی"یە، کەچی پێڕەوکاران ئەم بەرنامەیان بەباشترین بەرنامەی تەلەڤزیۆنیی تایبەت بەبەها بەرزەکانی خێزان داناوە.

سالّی سالآنیش "چارلز دیکنز"ی ڕۆماننووسی بەریتانییش شارەزایەکی بەرجەستەکردنی نەشازی بوو. ئەگەر مرۆڤ لە هەموو ڕوویەکەوە جیاوازیی کۆمەلآیەتیی هەبێ نەشازی زۆر بەئاسانی لێی بەدەر دەکەوێ. بەلآم کەسەکە هەر هەست بەوە ناکات کە بۆ خۆی وا هەڵسوکەوت دەکا. هەرچەندە دیکنز نەشازیی بەرجەستە دەکرد، بەلآم چیرۆکەکانی بەدڵی ئەو کەسانە بوو کە کردەوەکانیان لەگەڵ پێوەری ڤیکتۆرییەکاندا دەگونجان. کەسێکی تری خاوەن گوێی گۆشەتیژ "دەبلیو ئێس گیلبێرت"ە کە ڕێچکەیەکی نەگۆڕی لە داڕشتنی گاڵتەجارترین ئۆپرا کۆمێدییەکان بەزمانی ئینگلیزی پێڕەو کردووە.

هەڵبەتە دڵسۆزترین پێڕەوکارەکانیش هیچ خۆشییەک لە ناو نەگونجانی کۆمەلآیەتیدا نادۆزنەوە. وا بزانم سیانگ میێنی کۆن لەلایەن کەسانی خۆگونجێنەری ئەوتۆ کە تۆزقاڵێک هەستی گاڵتەجارییان نەبووە، دارێژراوە. سیانگ میێن هەڵسەنگاندنێکی تایبەتی بۆ خەڵکی خاوەن گوێی گۆشەکراوە هەیە:" ئەو خەڵکانەی گوێیان دەرپەڕیوە گرفتی عاتفییان هەیە، چەندی گوێ لە کەللەوە نزیکتر بێ ئەوەندە باشترە".

ڕەنگە ٣٠٠٠ سالّ پێش، ئەم قسەیە بۆ چین ڕاست بووبێ. لە هەموو ڕوویەکەوە چین

کۆمەڵگەیەک نەبووە پێشوازی لە بیری سەربەست بکا. ئەگەر مرۆڤ نەیتوانیبا بەباشی پێڕەوی لە داوونەریت بکا، هیچی پێ نەدەکرا. ئەوەش لە خودی خۆیدا بەس بوو بۆ ئەوەی گرفتی عاتیفی بێنێتە ئاراوە. بەڵام کولتووری ئەمڕۆی ئەمەریکا ڕێز لەو کەسانە دەگرێت کە خاوەن گوێی گۆشەکراوەن، جگە لە "ڕۆس پێرۆت" کە نموونەیەکی بەرچاوە دەتوانین زۆر نموونە لەسەر کەسانی خاوەن ئیرادە خۆپێگەیەنەری تر بدۆزینەوە کە بەرهەڵستیکردن دژی بەدیهێنانی چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگە سوودی پێ گەیاندوون، بەڵێ، ئەوە ڕاستە کە گوێی گۆشەکراوە پێوەندی بەهەڵسوکەوتەوە هەیە کە بەهۆیەوە تۆ لەخۆوە دەتوانی بەئارەزووی خۆت هەڵسوکەوت بکەی. تەنیا پاشان تێ دەگەی کە خەڵکی تر چاوەڕوانی چییان لێ کردووی و بەدوای هەوسارە لە دەستچووەکەدا دەڕۆی.

بەبۆچوونی تۆ، "دێنیس رۆدمان" لەبەرئەوەی جلی ژنانە لەبەر دەکا، ڕەنگە ئەستێرەی نموونەییی تۆپی باسکە نەبێ، بەڵام بۆ کەسێکی خاوەن گوێیەکی زۆر گۆشەکراوە رۆدمان ئەوەندە نائاسایی نییە.

جگە لە تۆپی باسکە لە شوێنی کاریشدا ڕێز لەو کەسانە دەگیرێ کە شوێنکەوتووی بیروباوەڕی خۆیانن. بۆ نموونە ئەمڕۆ تەوەری سەرەکیی زانستی ئەمریکی لێکۆلینەوە لە جینەکانی مرۆڤە و، کتوپڕ لەسەر ئەم لووتکەیە تۆ "ویلیام هێسلتن"ی بنیاتنەری زانستەکانی جینەکانی مرۆڤ دەبینی. زۆر پێش ئەوەی ئەم بابەتە ببێتە تیشکۆی لێکۆڵینەوە، هێسلتن بەگوێرەی پرۆگرامە بۆماوەیی و" ڕۆحی"یەکانی کەسانی گوێ دەرپەڕیو هەڵسوکەوتی کردبوو.

هەڵکەوتووە یەکجار سەرکەوتووەکانی تری خاوەن گوێی گۆشەکراوە بریتین لە: "جێف بێزۆس"ی دامەزرێنەری ماڵپەڕی "ئامازۆن دۆت کۆم" و "مایکڵ دێڵ"ی دامەزرێنەری کۆمپانیای "دێڵ کۆمپیوتەر" تەنیا گوێی ڕاستی گۆشەکراوەیە و "دێیڤید کێڵ"ی بەرهەمهێنەری بەرنامەی تەلەڤزیۆنیی "Ally MaBeal" و " The Practice"ە، ئەو بەرنامانەی ڕەخنە لە نەریتە کۆمەڵایەتییەکان دەگرن و تێکیان دەشکێنن.

ئەگەر گۆشەی گوێی تۆش کراوەیە تەنانەت ئەگەر بەڕواڵەت خۆت لەگەڵ کۆمەڵگەدا گونجاندبێ ئەو هەڵبژاردنە تەنیا ویستەکییە، لەبەرئەوەی ئەگەر بەڕواڵەت خۆت بگونجێنی لە بەرژەوەندی تۆ دایە. بەڵام ئەگەر گاڵتەت بەداوونەریت بێ بەم شێوەیە زیاتر ڕەچاوی بەرژەوەندی خۆت کردووە. لە کاتی پێچەوانەبوونەوەی چاوەڕوانییەکانی خەڵکیش دەتوانی بڵێی : "چی، من گرینگی بەوشتانە بدەم؟" کە ئەمەش دروشمی "ئالفرێد ئی نیۆمان" بووە،

قارەمانی ناو "Mad Magazine" کە خاوەنی گوێیەکی یەکجار گۆشەکراوەیە.

لە ژیانی "بەنزیکەیی" واقیعیدا گوێی "جێی ئێم بار" گۆشەیەکی گونجاوی هەبووە بۆ ئەوەی بتوانێ "پیتێر پان" بخولٔقێنێ. "پیتێر پان" ئەو کۆڕەیە کە نایەوێ گەورە بێ و خۆی پابەندی ئەو شتانە بکا کە لە کەسێکی هەراشەوە چاوەڕوان دەکرێن. "مەهاتما گاندی"ی ڕابەڕی شـۆڕشـە دوور لە توندوتیـژییـەکـەی هیند و "ڕۆبێـرت گـۆدارد"ی پێـشـەنگی سارۆخسازیی ئەمریکا لە ڕیزی هەراشە یاخیبووە بەدەسەڵاتەکان دان. ئەگەر گوێی "ئۆلی نۆرس"یش ئەوەندە دەرپەڕیو نەبا، ئاخـۆ ئەو هەر هـەمـان فـەرمـانە ونجـرکـەرانـەکـەی دەردەکرد؟ ئەگەر لەسـەر ڕووی زەوی کەسێک هەبێ کە گـوێیـەکانی ناتەبا بن ئەو کەسـە تەنیا هەر "نۆرس" بووە.

خـەڵکی خـاوەن گوێـی گۆشـە ناوەندی کـە گوێیـان لەگەڵ هیـچ کام لە دوو جۆرەکەی تردا ناگـونجێ، ئەو گـرفـتـانـەیان تووش نابێ کـە پێشـتـر لەبارەی خـۆگـونجـاندن باس کـران. ئەوپەڕی ڕەنگە تووشی بارێکی ئەوتۆ بن کە بەرگەی هەموو خەڵکی تر نەگرن.

## بەشەکانی گوێ

لە پێوانی ئەندازەدا چەند زیرەکی؟ با وەک گۆڕانێک ئەمجارە گوێ بپێوین. بەشـەکانی گوێ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بەشێوەیەکی بەرچاو دەگۆڕێن. بۆ پێوانی ئەم ئەندازانە پێویستە بەجیا ئەم خاڵانەی خوارەوە دەستنیشان بکەی:

– نەرمەگوێ: دۆزینەوەی ئاسانە. زوو ئەم بەشە دەناسییەوە بەتایبەتی ئەگەر گوارەت لە گوێدا بێ.

– بازنەی دەرەکی: دوورترە لەسـەر و ڕەنگە بـەلاتەوە شـتێکی نوێ بـێ. ئەم بەشـە دوای نەرمەگوێ ئاسانترین بەشی گوێیە بۆ ڕاکێشان. بەڵام کە ڕای دەکێشی «تکایە، بەنەرمی ڕای کێشـە، هیچ بەشێکی خوێندنەوەی ڕوو نـابێ بەئازار بێ» هەستێکی تەواو جیـاوازت دەبێ. بەراوردی نێوان هەردوو هەستەکە بکە دوایی تێ دەگەی مەبەستم چییە.

– ڕەنگە تۆزێکت پێ بچێ تا بازنەی ناوەکی بناسـیـیـەوە کـە ڕووبەرێکی قـەراغـیـیـە و نەرمـەگوێی لەخۆ گرتووە. بۆ ئەوەی بازنەی ناوەوە بگووشی لە ڕاستیدا، پێویستە گوێت ڕابکێشێ – با دۆشاومـژت لە سـەرەوە و کەلەموستت لە خوارەوە بێ– ئاوا بازنـەکە لەو مەودایە دایە کە تێیدا بەشی ژێرەوەی گوێت بەسەرتەوە دەنووسێ.

– بازنەی دەرەکی و ناوەکی بەهۆی سنوورێکی گۆشـتـئـاسـا کە قـەراغێکی چەمـاوەیە و




بەشەکانی گوێ

تێیدا پێست وەک هەویری ڕۆخ شیرنییەکی مرەباییی جوان برژاودا لوول بووەتەوە، لێک دادەبڕێن. ئەم سنووورە دەشێ دیار بێ و بەئاسانی ببینرێ یان ڕەنگە بەپێچەوانەشەوە بێ. ئەو کاتەی دەیگوشی هەستێکی جیاوازت دەبێ. ئەم بەشە لەبەر باری لوولپێچبوونی «لەگەڵ دەرەکیترین بەشی گوێت واتە بازنەی دەرەکیی گوێت» ڕەقترین بەشە لە پێکهاتەی گوێدا.

هەمووی تێ گەیشتی؟ بەدەستێوەردان لە هەموو بەشەکانی گوێت، خۆت ڕابێنە. مەگەر خاوەن گوێیەکی زۆر دەرپەڕیو بی دەنا ناچار دەبی بەزۆر گوێت ڕابکێشی و بەملا و ئەولادا بیچەمێنییەوە تا لە نەینۆکدا ببینی. بزانە دەتوانی قەراغی نێوان بازنەی دەرەکی و ناوەکیی گوێی خۆت بدۆزییەوە؟ ئاخۆ سنوورەکە دیارە یان بەئاستەم دەبینرێ؟ وە ئاخۆ تێبینی ئەوەت کردووە کە بازنەی ناوەکی لە تەنیشت کونە گوێی ڕاستەقینەیە، بەڵام کونەکە و بازنەی ناوەکی هەمان شت نین. هەستکردن بەتیرەغەکە تاموچێژێکی تایبەتی هەیە. بزانە دەتوانی دەست بەڕێڕەوەی تیرەغەی گوێی خۆتدا بێنی کە لە ڕێڕەوەی بازنەی ناوەکی دەست پێ دەکا و پاشان بۆ سەرەوە دەڕوا و دوایی بۆ شێوەدان بەبازنەی ناوەکیی گوێت دەچەمێتەوە.

پرسیار: بەزەییت پێماندا بێ، ئەم بابەتە ئەو مەتەڵە پڕ پێچ و پەنایانەم دەخاتەوە بیر کە ئاراستەی منداڵی خۆمی دەکەم. دەستم بەدەوری سنوورەکەدا هێناوە و وا بزانم دەتوانم جیاوازی بکەم لە نێوان بازنەی دەرەکی و بازنەی ناوەکی. بەڵام نازانم ئەگەر شێوەی لوولخواردنی قەرواغەکە ئاوابێ ئاخۆ دەبێ بەبەشێکی بازنەی دەرەکیی دابنێم؟

وەڵام: خاڵێکی یەکجار جوانە، دیارە لە مەتەڵی پڕ پێچ و پەنا بلیمەتی. بەشێوەیەکی سروشتی تێگەیشتنی هیچ بەشێکی ڕوو لە بەشەکانی گوێ قورستر نییە.

کەواتە هێزێکی زیاترت دەوێ. هەر کە توانیت نەرمەگوێ و بازنەی ناوەکی و دەرەکی بناسییەوە، هەنگاوی دووەمت ئەوەیە چاوت لەوە ڕابێنی کە ئاخۆ قەراغەکە دەکەوێتە بازنەی ناوەکی یان دەرەکی. لە هەندێک باردا قەراغەکە بۆ خۆی دەرپەڕیوە و سەر بەهیچ کامیان نییە. کەواتە قەراغێکی دەرپەڕیوە. هەموو ئەم خاڵە وردانە گرینگن.

پرسیار: تۆ دەڵێی ئەم خاڵانە وردن. ئاخۆ ئاساییە ئەگەر لەم شتانە شارەزا نەبووبین، جارێ وازیان لێ بێنین؟ ئەی ئەگەر بەدەستێوەردان لە گوێ دڵت تێک هەڵبکا؟

وەڵام: بەدڵنیاییەوە دەتوانی تا ئەو کاتەی بۆ دووەم جار ئەم کتێبەت نەخوێندبێتەوە واز

لەم بەشە بێنی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە چەند ڕاستییەکن لەبارەی ئەندازەکانی بازنەکانی گوێ:

– بازنەی ناوەکیی گەورە بەشێوەیەکی گشتی بازنەیەکی دەرەکیی بچووکی لە دەور دەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا بازنە دەرەکییەکە زۆر بچووک نییە.

– بەپێچەوانەوە بازنەی ناوەکیی بچووک، بازنەیەکی دەرەکیی گەورەی لە دەور دەبێ.

– یان ڕەنگە بازنەی ناوەکی و دەرەکی هاوئەندازە بن.

ئاخۆ ئەندازەی بازنەی گوێ چ واتایەکی هەیە؟

بەشەکانی گوێ ئەو سەرئێشەیە دێنێ کە بۆ دۆزینەوەیان تووشی دەبی، لەبەرئەوەی باسی ئەو ڕێگە هەستپێنەکراوانەت بۆ دەکەن کە بەهۆیانەوە کەسێک دەرک بەواقیع دەکا.

بەڵێ، ئێمە کە مرۆڤین دەتوانین بەهۆی شارەزابوون لە تۆێیە جیاوازەکانی واقیع ڕووبەڕووی ببینەوە «ئەو خەڵکەی کە ئەم کارە بەسەرکەوتوویی ئەنجام نادەن لە ژێر پاڵەپەستۆیەکی درێژخایەندا دەژین و ڕەنگە تەنانەت تووشی نەخۆشیی ئاوتیزم یان شیزۆفرێنیا یان جۆرەکانی تری نەخۆشیی زەینی بن.»

بەڵام زۆربەی خەڵک بەشێوەیەکی تا ڕادەیەک یەکانگر دەرک بەواقیع دەکەن. هەرچەندە ئێمە ئەم کارە بەناویستەکییانە ئەنجام دەدەین، بەڵام تێیدا سەرکەوتووین. لە ڕاستیدا ئێمە ئەم کارە ئەوەندە بەڕێکی ئەنجام دەدەین کە زۆربەمان ئەو جۆرە واقیعەی کە باوەڕمان پێیەتی بەتاکە واقیعی ڕاستەقینە دادەنێین. لەگەڵ ئەوەشدا ڕووخوێنەوان سەرپشکن لەوەی کە واقیعی جۆراوجۆر بدۆزنەوە. ئێمە تەنانەت دەتوانین ڕاستەوخۆ لە ڕێی بەشەکانی گوێوە، مەزندەی ئەوە بکەین کە ئاخۆ کەسەکە زیاتر بڕوای بەکام واقیع هەیە.

کارەکە بەم شێوەیەیە: بازنەی ناوەکی ئاماژە بەوە دەکا کە کەسەکە گرینگی بەواقیعی زەینیی Subjective وەک هەستەکان و سۆفیگەری و بیروباوەڕی فەلسەفی دەدا. بازنەی دەرەکی ئاماژە دەکا بەوەی کەسەکە گرینگی بەجۆرە واقیعێک دەدا کە پێی دەوترێ "بابەتییانە" Objecive هەروەک ئەم ڕاستییانە کە کێ چی کرد و شتەکە کەی و لە کوێ ڕووی دا. ڕۆژنامە باس لە ژیانی بابەتییانە دەکا. کۆوارە ئەدەبییەکان و ئەوانی هاوشێوە باس لە واقیعە زەینییەکان دەکەن.

چ کەسانێک بەشێوەیەکی نموونەیی لە بڵاوکراوە هونەرییەکاندا بابەت دەنووسن؟

بەزۆری خـەڵکانێک کە بـازنەی ناوەکیی گـوێیـان گـەورەیە- ئەوان شـاعـیر و هونەرمـەند و فەیلەسووفـەکانی جیهانن. بۆ ئەم خەڵکە ئێجگار هەستیارە، ڕووداوەکان لە شـێوەی خوازە دان. بیر لە هـەوڵدانی "جۆن برادشاو" بکەوە کە بۆ پەرەدان بەچەمکی "The Inner Child – ویژدان" زۆر تێ کۆشـاوە. کەسـێک کە گوێیـەکانی لە ڕووی گۆشـەوە دژیەک و بـازنەکانی گوێـی هـاوئەندازە بن، لەوانەیە بشیـڕێنێ: "ویژدانی چی؟ منداڵی تەمـەن یەک ڕۆژی هێندەی کەسێکی ٤٠ سـاڵان تێ دەگا."

کـەواتـە لەوانەیە بەڕاسـتـی مـەزندەی ئـەوەت کـردبێ کـە گـوێی "دەبلیـو بی ییـتس" یان "بێرتراند ڕاسڵ" نەک هـی"جۆرج واشنتۆن" بازنەی ناوەکیی گەورەی هـەبووبێ.

بەڵام تاکە سـەرۆکی ئێمـە کە بازنەی نـاوەکیی گوێی لە بازنەی دەرەکییـەکەی گـەورەتر بووبێ "فـرانکلین دیـلانۆ ڕۆزڤلێت"ە. لە دەرهێنـانی بەرنامـەکـانیـدا بەناوی "New Deal – بەڵێنێکی نوێ" و "Social Security – ئاسـایشی کـۆمـەڵایەتی"دا تەنـانەت زمـانەکـەی کـە بەکاری هێنابوو سەمبولئامێز بوو. جوان ڕێک کەوتووە.

ئاریشــەی ڕێ تێـچـووی هـاوڕێی ئـەم هێـمـایە ئـەوەیە کە کەسـەکە زۆر پێوەسـتـی دنیـای خۆیەتی. ڕەنگە تۆ بەدەر لە لێکدانەوەی خـۆت زۆر بڕوات بە"واقـیع" نەبێ. بۆ نموونە بیـر لە چیرۆکی ئەو ئافرەتە بکەوە کە بازنەی دەرەکیی گوێی زۆر بچووکە و لە ڕاستـیدا هـەر وەک ئەوە وایـە کـە هـەبـوونیـشـی نەبێ. "سـاڵی" وتـی: "ئەو کـاتەی پێنـج سـاڵان بـووم بەتۆنێکی جیدییەوە بە دایکمم وت: ئەگەر حەز لە کەسێک نەکەم هـەر هەست بە هـەبوونیشـی ناکەم و ئیتر بڕایەوە".

کەس حەز ناکات بەهەند وەرنەگیرێ. کەسێک کە بازنەی دەرەکیی گوێی زۆر گەورە بێ، بەلایەوە دژوارترە کە ڕێز لە کەسێک بگرێ کە بڕوای بەواقیعی بابەتییانەوە نەبێ.

بازنەی دەرەکیی گەورە ئاماژە بەبەهرەیەکی بەسوود دەدا. بیر لە "مارک ڤیکتۆر هەنسن" بکەوە کە وتەبێژێکی بزوێنەر بوو و بەسـەرهـاتەکانی لە بەرهـەمـێک بەناوی "Chicken Soup for the Soul – شـۆربـای مـریشـک بۆ ڕۆح"دا کـۆ کـردووەتەوە. یان بـەشـێـوەیەکی زۆر ڕوونتر بیر لە "بێتی ئێدوارد"ی مامۆستای هونەر بکەوە کە لە ڕێی بەرهەمەکەیەوە بەناوی "Drowing on the Right Side of the Brain –نیگارکـێـشـان لـەسـەر بەشـە تەواوەکـەی مێشکدا"، قوتابییان هـان دەدا بەر لەوەی قەڵەمیان بەسەر لاپەڕەدا بـخشێنن، جوان بڕوانن و دوورکەونەوە لە کورتەڕێ و سەمبولە کلێشەییەکان.

بەڵام بازنـەی دەرەکـیی گـەورە، بەواتای شـادوومـانی بـەردەوام و ژیانێکی هـێـمن نیـیـە. بازنەکـان پێـوەندییـان بەژیانی خـودی کەسـەکـەوە نیـیـە. ئەو کـاتەت بەبیـرە کـە "مـایکڵ دووکاکیس"ی کاندیدی سەرۆک کۆماری و "جۆرج بوش" ڕکابەرێتییان دەکرد؟ ئەو کاتەی پرسیاریان لێی کرد چ کاردانەوەیەکی دەبێ ئەگەر هاوسەرەکەی دەستدرێژیی سێکسیی بکرێتە سەر، دووکاکیس خەڵکی ئەمریکیی بەوەڵامە بێبەزەییانەکەی تاساند.

هەروەک سیاسەتوانان، وەرزشوانانی شارەزاش پشت بەبابەتییانەبوونیان دەبەستن و لە ناویاندا ژمارەی ئەو کەسانەی بازنەی دەرەکیی گوێیان گەورەیە زۆرە، کەسانی وەک "بێیب ڕووس" و "تێد ویلیامز"ی پێشەنگانی هێڵی ڕاکردن لە بێیسبۆڵ. "جۆکی ستیڤ کاوسن"یش سەر بەم گرووپەیە. لە دەرەوەی جیهانی وەرزش، "سۆر هیرداڵ"ی دۆزەرەوە کە هەم وەرزشـوان و هەم دۆزەرەوە و هەم کـۆمـەڵناسـە، نموونەیەکی بەرچاوە بۆ کـەسـێکی خاوەن گوێی تەواو بابەتییانە.

هەرچەندە ئەو خەڵکەی بازنەی دەرەکیی گوێیان گەورەیە، ڕەنگە کاردانەوە بەرامبەر بەهەستیاری بنوێنن، بەڵام لەبەرئەوەی پابەندی ڕاستییەکانن، دەتوانن لە پیشەکانیاندا سەرکەوتنێکی گەورە وەدەست بهێنن. بەجێ و زانستییانە و ڕێکوپێک - ئەمانە چەند سیفەتێکی تایبەت بەم هێمایەن.

هەندێک لەو گوێیانەی چاوت پێیان دەکەوێ بازنەی ناوەکی و دەرەکییان یەکسانە. ئەمەش دەربڕی بەهرەیەکە بۆ هاوسەنگکردنی شارەزاییی کەسی و هی دەرەکی. ئەگەر تۆ خاوەنی ئەم هێمایە بی ڕەنگە هاوڕێیەکانت تۆیان بەگوێگرێکی خاوەن شیان، کە بەڕێگەیەکی گونجاو سوود لە تێگەیشتنی خۆی وەردەگرێ، وەسف کردبێ.

دوکتۆر "ئابراهام ماسلۆ" خاوەنی ئەم جۆرە گوێیە بوو. بەگونجاوی لەگەڵ ئەم هێمایەدا ماسلۆ ئەو دەروونناسەیە کە بڕیاری دا لەجیاتی لێکۆڵینەوە لە نەخۆشە دەماغییەکان گرینگی بەکەسانی دنیادیدە و خۆناسیو بدا. ئەو دەرکی بەوە کردبوو کە ئەزموونەکانی گەرمەی ژیان «چرکەساتەکانی گەیشتن بەواقیعێکی خوویی قووڵ» دەشێ ببێتە بنەمایەک بۆ وەدیهێنان لە ناو ژیانی واقیعیدا. ماسلۆ ئەو بارەی هەموو هەڵسەنگاندووە.

پرسیار: ئەی قەراغەکان؟ پێ دەچێ قەراغە گوێی من نادیار بێ، ئاخۆ پێویست بەنیگەرانی دەکا؟

وەڵام: قەراغی گوێ وەک دیوارێکی جیاکەرەوەی نێوان ژیانی کەسی و ژیانی

کۆمەڵایەتییە. بەئاستەم دەرکەوتنی قەراغی گوێ مایەی نیگەرانی نییە، بەڵام ئاماژە بەوە دەکا کە تۆ شتی بابەتییانە بەکەسی وەردەگری و هەروەها پێت وایە واقیعە کەسییەکەی خۆت واتایەکی گشتیی هەیە.

پرسیار: واتە ئێمە لە خەڵکی تر جیاوازین؟ ئەدی هەموومان وا بیر ناکەینەوە؟

وەڵام: ڕاست دەکەی، بەڵام کەسێک کە قەراغی گوێی بەئاستەم دەرکەوتبێ زۆر زیاتر وا بیر دەکاتەوە. بێگومان "واڵتر میتی"ی دەسکردە سەیرەکەی "جێیمز سێربر" هەر قەراغی گوێی نەبوو. هەروەک میتی، تۆش خەیاڵێکی چالاکت هەیە. ڕەنگە بتوانی فێر بی کە چۆن سوودی لێ وەربگری.

نموونەیەکی ڕاستەقینە بۆ کەسێکی خاوەن قەراغە گوێی بەئاستەم دیار "جێیمز ویزلر"ە کە بەهۆی نیگارەکەیەوە بەناوی "Arrangment in Gray and Black – ڕێکخستن لە ناو ڕەساسی و ڕەشدا" کە زیاتر بە"Whistler's Mother –دایکی ویزڵر" ناسراوە، ناوبانگی دەرکردووە. گوێی ئەم هونەرمەندە بازنەی ناوەکی یەکجار گەورە و قەراغی نادیاری هەبووە. ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی ئەم هونەرمەندە بۆ یەکجار زۆر زەینیبوونی «کە بووە هۆی تۆمارکردنی ژمارەیەک سکالا دژی» و بۆ هەستیارییەکی لە ڕادەبەدەری بەرامبەر بەجیاوازییەکانی ڕووناکی «کە بەهۆیەوە توانیی وەک هونەرمەندێک ناوبانگ دەربکا، ناوبانگێک کە زیاتر لە سکالا بێ کۆتاییەکانی خایاند» تووشی گرفت بووە. بەپێچەوانەوە گوێی "ڕاڵف والدو ئێمێرسۆن" بازنەی ناوەکیی گەورە و قەراغی زۆر بەرچاوی هەبوو. وتارەکانی بالادەستی ئەو دەدەن لە سەلماندنی شارەزاییی ڕۆحی و دواتر لە یارمەتیدانی خەڵک بۆ گۆڕینی بارودۆخیان و بۆ بەکارهێنانی زانیاریی خۆیان بەڕێگەی بەسوود. با ئەم خاڵەت لە بیر بێ، ئێنجا دووبارە بەوتارەکانیدا بچۆوەوە، بەم شێوەیە نموونەی زۆرت دەست دەکەوێ.

ئەگەر بازنەی ناوەکیی گوێ قەراغی زۆری دیاری لە دەوراندەورەوە بوو واتاکەی وەک ئەوە وایە کە هێمایەکی گەورە لەسەر چیمەنی خانووەکەتدا چەقێنرا بێ، بۆ ئەوەی ڕێبوارەکان ئاگەدار بکاتەوە کە "سنووربەزاندن قەدەغەیە". لە مێشکی کەسەکەدا بابەتی گشتی و تایبەتی تێکەڵ بەیەک نابن. ئەم کەسانە کارامەن لە زێدەڕۆیی نەکردن لە بۆچوونە کەسییەکانیاندا. بازنەی ناوەکیی گوێی "تی ئێس ئێلیۆت"ی شاعیر گەورە بوو و بەقەراغە گوێیەکی زەق دەورە درابوو. بەهۆی ڕەوشت بەرزییە زاتییەکەی ئەم شاعیرەوە دەتوانی

لەوە تێ بگەی کە چۆن ئەو توانیویەتی ڕستەیەکی وەک ئەمە بنووسێ: "ئاخۆ ورەی خواردنی خۆخێکم هەیە؟".

گوێی "ئەلێگزەندر گراهام بێل"ی داهێنەر، بازنەی ناوەکی زۆر گەورەی هەبوو کە بەقەراغە گوێیەکی بەهەمان ڕادە دیار دەوره درابوو. شتێکی زۆر بەجێیە کە ئەو پیاوەی تەلەفۆنی داهێناوە ببێتە نموونەیەک لەو کەسانەی کە توانای بیستنیان بەهێز و هاوسەنگە.

قەراغە گوێی زەق دەربڕی بەهرەی دەگمەنی حەزکردنە لە سنوورەکانی نێوان شتی گشتی و تایبەت. دەتوانی کاریگەریی ئەم بەهرەیە ڕاستەخۆ لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆن ببینی. تەنیا بیخە سەر بەرنامەی "ئۆپرا"، ئەو ئافرەتەی بەرنامەیەکی تاک بدوێیی لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆن پێشکێش دەکا. چ هەستی پێ بکەی چ نا، ئەرکی ئۆپرا ئەوە بووە کە هەستە زۆر شاراوەکان دەربهێنێ و بەڕوونی و بەدەنگی بەرز ئاشکرایان بکا.

لە بەردەم ئەم خانمە نکۆڵیکردن سوودی نییە. جێی سەرسڕمان نییە کە "ئۆپرا وێفری" ئەو میوانانە هەڵدەبژێرێ کە دەرکەوتنی نهێنییەکانیان سنوورەکانی کەسیی بینەر وردوخاش دەکا. ئۆپرا تەنیا بەهۆی ژیانی خۆی ڕێگەی چوونە ناو بابەتی تابووی/ Ta-booی وەک دەستدرێژیی سێکسی و سکپڕیی تەمەنی هەرزەکاری و مەترسییەکانی کەمکردنەوەی کێشی لەشی کردووەتەوە. بەهرەی ئۆپرا لەوەدایە کە توانیویەتی سەکۆیەکی ئەوتۆ دروست بکا کە لەسەریدا دانانن بەواقیع، تەنانەت ئەگەر ئاڵۆز و دژیەک و نالەباریش بێتە بەرچاو، دوور لە مەترسی بێ.

پرسیار: داپیرەم پێی وتم نەرمە گوێی گەورە ئاماژە بەژیری دەدەن و هەر بۆیەش لە نیگارەکانیدا زۆربەی جار نەرمەگوێی گەورەی بۆ کراوە. یەکێکی تر پێی وتم ئەم هێمایە نیشانەی تەمەندرێژییە. کامیان ڕاستە؟

وەڵام: لەو هەموو شتەی وتت ئەوەی ڕاستترینیان بێ ئەوەیە کە بەڵێ، ئەوە نەریتێکە کە بوودا لە پەیکەر و نیگارەکانیدا نەرمەگوێی گەورەی بۆ دەکرێ. سەبارەت بەو بەشەی پرسیارەکەشت لەبارەی تەمەندرێژی، پێم باشە لە نزیکترین ساردخانەی مردووانی نەناس لێکۆڵینەوەیەک بکەی. سەبارەت بەزاناییش نەرمەگوێی گەورە هێمای زانایییە، بەڵام نەرمەگوێی بچووکیش هەمان واتای هەیە. هەر یەکە لەم دوو هێمایانە تایبەتن بەجۆرە زاناییەک.

بۆ تێگەیشتن لەوە باشترە بزانی نەرمەگوێ نیشانەی گرینگیدانە بەواقیعی فیزیکی.

پرسـار: بەڵام من وا تێ گەیشـتم کە بازنەی دەرەکیی گوێ پێوەندیی بەڕاسـتییـەکانەوە هەیە. ئاخۆ ئەوە هەمان شت نییە؟

وەڵام: لە ڕاستیدا، نەخێر. واقیعی تایبەت بەڕاستییەکان پێوەندیی بەقورسایی و ئارەقە و جلوبەرگ و زانیـاریی پێوەست بـەبوون لە ناو فۆرمـێکی فیزیکیدا هەیە. بۆ نموونە "تایلر" هیوایەتی کۆکردنەوەی ئاماری بێیسبۆڵە. ئەو ڕاسـتییانەش کە بازنەی دەرەکیی گوێ لێیان بەرپرسـە لـەبارەی ئەو لێـدانـانەیە کـە ڕێگە بـەلێـدەر دەدا لە دەوری هەر چـوار خـاڵدا بێ وەسـتان ڕا بکا و هەروەها ئەو خـاڵانەی کە یاریزانەکە نەیتوانیوە پێیان بگات و شـتی لەم جۆرە.

بەپێـچـەوانەوە، واقیـعی فـیـزیکیی پێـوەندی بەلایەنـی دەروونییـەوە هەیە، ئـاخۆ فـریزی دەسکردی گۆڕەپان چۆنە؟ چۆن یاریزانەکان لە ناو جلەکانیاندا دەجووڵێنەوە؟ کێ لە ناو تیـمــەکــەدا پێ دەچێ زیاتر لەوانی تر حــەزی لە تف هـاوێشتن بێ؟ لەبەر ئەو ســیـفــەتە خاکییانەی دراونە پاڵ نەرمەگوێ، با باسێکی چڕوپڕتری ئەم هێمایە بۆ بەشی شەشەم کە لەسەر "سێکس"ە هەڵبگرین.

## هۆشیاری سەبارەت بەلاسەنگی

ئێسـتا کە تۆ لە دوو سێت لە نهێنییەکانی ڕوو، واتە لە برۆ و گوێت کۆڵیوەتەوە، واتای ئەوەیە کە ئیتر ڕووخوێنەوەیەکی تازەکار نی. زانیـاریی ئەو بەشانەی ڕوو کە پێشتر بیرت بۆیان نەدەچوو سەرەتاتکێت لێ دەکەن. بڕوام پێ بکە، خۆشییەکە خەریکە دەست پێ دەکا. لەبەرئەوەی توانای لێکۆڵەرەوایەتییت خێرا گەشـە دەکا ئێستا کاتێکی گونجاوە تا لە ڕێی بچکۆلە جیاوازییەکی ترەوە برەو بەشارەزاییەکەت بدەی.

کێ بیری بۆ ئەوە دەچوو کە: بەشێک لە لێکۆڵینەوە هەرە کاریگەرەکەی تۆ پەردە لەسـەر شـتێک لا دەدا کـە زۆربەی خـەڵک بەنهێنییـەوە بەهۆیەوە شـەرمیـان بەخـۆیە وە یان هەر هەستیشی پێ ناکەن.

بەڕاشکاوی، مەبەستم ئەوەیە کە جەستەی خەڵک خواروخێچە.

بەر لەوەی ترس دات بگرێ و ڕووت لە پشت زەرفـە کاغـەزییەکەی بەردەستت بشـارییەوە، پێویستـە بزانی کە بۆ ڕووخوێنەوەیەک مەرج نییە، خواروخێچی لە بنەڕەتدا شتێکی خراپ

بێ، بگرە شتێکی دڵکەرەوە و ڕۆشنکەرەوە و زۆر مرۆڤانەیە.

ڕووخوێنەوان تەنانەت زاراوەیەکی تەکنیکیشیان بۆ داناوە کە بریتییە لە "لاسەنگی". لە هەر ڕوویەکدا بەگوێرەی جۆر و هێما، جیاوازی لە نێوان هەردوو لای ڕوودا هەیە.

بۆ نموونە، هی تۆش ئاوایە. ئەمە بەخۆت بسەلمێنە. سەیری نەینۆک بکە. لایەکی ڕووت بەلاپەڕەیەکی سپی داپۆشە. تاکە برۆیەک و تاکە چاوێک و نیوە لووتێک و کونە لووتێک و... هتد دەبینی. ئێستا بەلاپەڕەکە لایەکەی تر داپۆشە.

لای ڕاست و چەپی ڕوو زۆر جیاوازن، تا ڕادەیەک کە دەشێ خاوەنی هەر لایەکیان کەسێکی جیاواز بێ.

پرسیار: بۆچی وایە؟ کەواتە پێویستە بەهاوارکردن پەنا بۆ نزیکترین نەشتەرگەری جوانکاری بەرم؟

وەڵام: هیوادارم ئەمە نەکەی. لاسەنگی هەڵە نییە، بگرە پرۆسەیەکی پەرەسەندنە. ڕووی منداڵ بەزۆری لە هەردوو لادا بەشێوەیەکی هاوتا گەشە دەکا. گۆڕانەکە بەرەبەرە پەرە دەسەنێ و هەر گۆڕانێکیش هۆیەکی هەیە.

لای ڕاستی ڕووی تۆ دەربڕی خودی خۆتە لە ناو کۆمەڵگەدا- دەربڕی یەکەم هەستە کە تۆ لە ناخی خەڵکی تردا دەی ورووژێنی و نیشاندەری چۆنیەتیی گونجانتە لە ناو پیشەکەتدا. لای چەپ جیهانی تایبەتی تۆ ئاشکرا دەکا واتە تۆ چۆن لەگەڵ خێزان و هاوڕێیەکانت هەڵسوکەوت دەکەی.

منداڵ تایبەتمەندییەکی زۆری نییە. تەنانەت قسە منداڵانەکانیشی شتێکی تایبەت نییە. بەڵام لەگەڵ گەشەکردنمان ئێمە شارەزای چۆنیەتیی خۆنواندن لە ناو گومەڵگە دەبین. چەمکێک بۆ ئەم واتایە بریتییە لە دنیادیدەیی. دەربڕینێکی تر بۆ ئەمە بریتییە لە پاریزگاریکردن لەخۆ. دڵنیام تۆ ڕێگە دژوارەکەی بنیاتنانی رووکەشێکی کۆمەڵایەتیت بڕیوە. کۆنفیوشەسێک یان هەر کەسێکی تر لەوانەیە پێتی وتبێ: " ئەو کەسەی کە لە ڕادەبەدەر هەستی خۆی بەدەر بخات، وەک منداڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ".

خەڵک بۆ بەرگریکردن لەخۆ دوو جۆرە نواندنیان هەیە: یەکێکیان بۆ ناو کۆمەڵ، بەرامبەر بەنەناسەکان و ئەوەی تریان بۆ جیهانی تایبەت بەرامبەر بەهاوڕێیەکان.

چێژی خوێندنەوەی ڕوو لەم بەشەدایە. لەو شوێنەی کە دوو شێوازی جیاوازت هەیە واتە کتوپڕ لەو بەشەی ڕوو کە ئەم جیاوازییەی تێدا دەردەکەوێ، ئا لەم شوێنەدا ڕووی تۆ

لاسـەنگە. کە بووی بەڕووخـوێنەوەیەکی پێشکەوتوو پێویسـتە لایەنە لێکچوو و جیاوازەکان بدۆزییەوە. بەڵام بۆ ئێستا ڕێگەی لێکدانەوەی لاسـەنگی زۆر ئاسانە:

– لە بواری ئیشوکاردا لای ڕاستی ڕوو بخوێنەوە.

– بۆ پێوەندییەکان لای چەپ بخوێنەوە.

– هـەروەها کاتێکە بەردەوام سـەیری لای ڕاست و چەپی ڕووی کەسی بەرامبەرت دەکەی لە بیـرت نەچێ لە مـێشکی خـۆتدا لای چەپ و ڕاست وەربگێـڕێ، هـەروەک چـۆن دەسـتی ڕاستت بۆ تەوقەکردن لەگەڵ دەستی ڕاستی کەسی بەرامبەرت درێژ دەکەی.

پرسـیار: ئاخـۆ تەنیـا من هەست بەپەرێشـانی دەکـەم؟ ئێسـتا لاسـەنگی لە ناو هـەموو شتێکدا دەبینم. چۆن دەتوانم ئەمە چارەسەر بکەم؟

وەڵام: بەخـۆڕاگـری– هـەرچەندە من ئێـستا باسـێکی گشـتیت بۆ دەکـەم، بەڵام پەرەدان بەشـارەزایی لە خـوێندنەوەی ڕوو، پێویسـتی بەکات و ڕاهێنانـە. زنجیـرەی پەرەسـەندنەکە بەشێوەیەکی نموونەیی بەم جۆرەیە:

١– با نیـازت خـوێندنەوەی ڕوو بێ. دەبێ تەنیـا بەدوای زانیـاریی تایبـەت بەهێـمـای ڕوو بگەڕێی. کەواتە ئەو شـتانەی کە هۆشت پەرشوبڵاو دەکەن «وەک سـووراوی سەر ددانی ئافرەتان یان خووە کۆنەکانی خۆت بۆ سەیرکردنی ڕوو» بۆ کاتێکی تر دوا بخە.

٢– با خێراییـەکەت بەو ڕادەیە بێ کە بتوانی بەجیا هـەر هەموو هێمایەکان ببینی. سەر لە خۆت مەشێوێنە. گوێ و بەشەکانی تری ڕوو زۆرجار لێکدانەوەیان یەکجار ئاسانە.

٣– لایەکی ڕوو بـەجـیـا بـخـوێنەوە تـا ئەو کـاتەی هـەست بەوە دەکـەی ئـامـادەییت هـەیە بۆ لێکدانەوەی لاسـەنگییەکە. لە بواری ئیشـوکاردا لای ڕاسـت و بۆ پێوەندییـەکانیش لای چەپ بخوێنەوە.

٤– بزانە ئاخـۆ ئەو هێـمـایەی دۆزیوتەوە، زۆرە یان نـا، لەبەرئەوەی ئەمـە کـاریگەریی لەسـەر لێکدانەوەکەت دەبێ.

٥– ئەو کـاتەی هـەسـتت کـرد ئـامـادەییت هـەیە خـوێندنەوەکـەت بەلێکدانەوەی لاسـەنگییـەکە دەوڵەمەندتر بکە.

پرسیار: ئەگەر بکرێ تکایە نموونەیەک لەسەر لێکدانەوەی لاسەنگی بهێنەوە.

وەڵام: باشـە، با تۆ بەنموونە وەربگرین. ئاخـۆ هـەرگیـز هـەسـتت بەجـیـاوازیی هـەڵکەوتی گوێت کردووە؟

پرسیار: مەبەستت ئەوەیە هۆیەک بۆ بەیەکلاداکەوتنی چاوێلکەکەم هەیە؟ ڕاست دەکەی. گوێی چەپم زۆر نزمە و نەرمەگوێیەکەی دەکەوێتە خوار ئاستی سەری لووتم. بەڵام گوێی ڕاستم بەرزە و بەرزترە لە برۆم. ئەی خوایە، کەواتە ئەمە چی دەگەیەنێ؟

وەڵام: لە کاتی کارکردندا بڕیاری خێرا و باش دەدەی. بەڵام بۆ بڕیارەکانی تایبەت بەخۆت وەک بۆ مانەوەت لەسەر کارەکەت یان شوێنی ژیانت، وا بزانم بەر لەوەی بڕیار بدەی زۆر قووڵتر بیر دەکەیەوە.

پرسیار: کتومت ئاوایە، سەیرە، من بەردەوام وام لێک دەداوە کە بۆ ئەو بڕیارانەی کە پێوەندییان بەژیانی کەسیمەوە هەیە لە پارەی خۆم خەرج دەکەم، بۆیە زۆر زیاتر دەست بەپارەوە دەگرم. ڕات چییە بەرامبەر بەم لێکدانەوەیە؟

وەڵام: ژیان زۆر ئاستی هەیە. تۆ کە کەسێکی تێگەیشتووی زۆرجار گوێت لەم قسەیە بووە. لێکدانەوە لە ڕێی ڕووخوێندنەوە ژمارەی واتاکان زیاد دەکا. هەروەک چۆن تۆ دەتەوێ پارە پاشکەوتکراوەکەت لە حیسابی بانکی دابنێی، ڕوو خوێندنەوەش یارمەتیت دەدا بۆ کۆکردنەوەی زانیایی لە ناو حیسابی تایبەت بەژیریی خۆت.

لە ئێستا بەدواوە ئەو کاتەی خەڵکی خاوەن گوێی جێکەوتوو لە شوێنی نزمت بینی سەرەداوێکت لە چۆنیەتیی بڕیاردانیان دەست دەکەوێ. جا ئەگەر کەسەکە زەنگین یان هەژار یان دەسبڵاو یان قرچۆک بێ، ئەمە هیچ جیاوازییەک ناخوڵقێنێ «سەبارەت بەلایەنی دەسبڵاوییش، دواتر تێ دەگەی کە لە ڕاستیدا لە ناو بەشێکی ڕوودا ئەم خەسڵەتە بەدەر دەکەوێ».

لەبەرئەوەی تۆ فرۆشیاریت، باشترە بزانی کڕیارێک چۆن بڕیار دەدا و چۆن پارە خەرج دەکا. ئەو گریمانەیەی کە دەڵێ: "خەڵک لە کاتی خەرجکردنی پارەی خۆیان وریاترن"، مەرج نییە ڕاست بێ. ئەمە لایەنێکی شێوازی کەسییە و ئاخۆ تۆ حەز ناکەی فێری خوێندنەوەی بێ؟ لە بەشی لووتدا باس کراوە، بەڵام بەر لەوە با تیشک بخەینە سەر بەرچاوترین ئەندامی ڕوو.

# ٦

## چاو

چاو ئەمــەی لە دەست دێ، زۆرجــار ســەرنجــمــان ڕادەکـێـشـێ جــا چ ئێـمـە بەرۆمـانسـیـیـەتەوە لە ڕەنگەکەی ڕامـابین و وێڵی واتایەک بـین و چ بەو نیگا پڕ هەسـتـەی کـە بـۆ هیچ ئەندامـێکی تری ڕوو نیـمــانە، سـەیری بکەین. لەگـەڵ ئەوەشدا بەزۆری شـێـوەی سـەیرکردنی چاو کۆسپ دەخـاتە سـەر ڕێمان. ئەو ڕاسـتییـانە چین کە ئێمـە دەتوانین بەتێڕامـان لە بـەشـێک کە تۆزێک ئەولاتر- واتە لـە دەوروبەری چاو بێ، بیـانـخـوێنینەوە. بەشــە وشـکەکـان، پێکهــاتەکـە، دەتـوانێ زانیــارییــەکی زۆرمــان لـەبارەی لایەنـە شــاراوەکــانی بیــر و بۆچوون بـۆ دابین بکـا. ئەو "ڕاسـتـیـیـە"ی لە ڕووی کەسێکدا نەخشـێنراوە، ڕەنگە بەهۆی دەربڕینـەوە داپۆشـرابێ یان بەئاشکرا بەپێچەوانەی ڕاسـتییە ڕەگاژووەکەی خوێندنەوەی ڕوو بێ. ڕەنگە ئەوە ڕۆمانسـی نەبێ، بەڵام ئەگەر ئێستا من سەڵت بام، بەهەمان ڕادەی گەڕانم بۆ کڕینی ئەو شتەی لە ناو چاوی هـاوسـەرێکی شیـاو دایە، بەدوای پێـڵـووشـدا دەگـەڕام. تۆی سـەیرکـەری خـەڵک، چ ســەڵت بـی چ خـێــزاندار پێــویســتــە ئەم بەشــەی ڕوو بەســەرچاوەیەکی بێ کـۆتـایی سـەرنجڕاکێشـی لە قـەڵەم بدەی، پێویسـتە تۆ توانای جیـاکردنەوەی دەربڕین «کە زۆربەی خەڵک هەوڵ دەدەن بەسـەریدا زاڵ بن» لە واقیـعێکی قـووڵتر"کە زۆربەی خـەڵک لە بنەڕەتدا ناتوانن بەسـەریدا زاڵ بن" هەبێ. بەتایبـەتی لەبەرئەوەی پێت وایە بەڕادەیەکی زۆر، هەمـوو شـتێکی تایبـەت بەچاو دەزانێ، ئـەم بەشـەی کـتـێب ناچارت دەکا دووبارە بیر بـکەیتـەوە و تەنانـەت چاوپۆشی لە بـۆچوونت بکەی. لـە هەمـووی سـەیرتر، ڕەنگە تۆ شـتـی ئەوتـۆ لە ناو چاوی خۆتدا بدۆزییەوە کە پێشتر هەرگیز هەستت پێی نەکردووە.

## چەماوەی ژێرپێڵوو

ڕادەی چەمـانەوەی ژێرپێـڵـووی چاو، شـتـێکە کـە جگە لەو ئافـرەتـەی کـە هەر تاکـە برژانگێکی مەسکارە لێ دەدا، بۆ ئەوەی تیر لە دڵی پیاوان بدا، دەنا بەدەگمەن هەستی پێ دەکرێ. کاتێک لەم لایەنە بەهەندوەرنەگیراوەی چاو دەکۆڵییەوە هەست بەوە دەکەی کە تا ڕادەیەک بەئاسانی توانای گۆڕینی شێوەی ئەم چەماوەیەت هەیە. نەینۆکێک بێنە و سەیری خۆت بکە، لە ناو دوو کورتە فیلم کە خۆت تێیاندا ڕۆڵ دەگێڕی و منیش دەرهێنەریانم:

فـیلمی یەکـەم مـیلۆدرامـایەکـە بەناوی "سـەربڵـندی و شکۆ و مـەرگی قـێـزەون". تۆ بێ ڕەچاوکردنی ڕەگەزەکەت ڕۆڵی ناسکۆڵە کچەی ئەکتەری سەرەکیی فیلم دەگێڕی. فیلمێکی هێمنە و پلانەکەی تا ڕادەیەک پێشبینیکراوە بۆیە با بڕۆینە سەر دوا دیمەن. بەداخەوە تۆ بەسکەی شـەمـەندەفـەرەوە بەسـتـراوییـەوە. کـاتێک سـەرت هـەڵدەبڕی لە ناکـاو چاوت بەناکەسـەکە دەکەوێ کە بەسەر سـەرتەوە هەڵوەستـاوە تا بەئاشکرا چێژوەرگرتنی خۆی لە نەهامـەتیی تـۆ دەربـبڕێ، بـەڵام زیاتریش بۆ ئەوەیـەتی گـوێـی لە دوا وتەت بێ، کـاتێک ئەمـە دەخوێنییەوە هەست وەربگرە:

"تۆی زۆڵ، بڕوام پێت کرد. ئێستـا زانیم کـاتێک وتت قـەواڵەی سـامـانەکـەم وەک بارمـەتە بەکار دێنێ، درۆت دەکرد. هەر جارەی پێشنیـازت دەکرد شووت پـێ بکەم هـەڵبـەتە ڕەفزم دەکردییـەوە. بەڵام تۆی یەکـجار سـپـڵـە ڕەتکردنەوەکـانی منت فـەرامـۆش کـرد و پاشـان کارێکت کرد کە چاوپۆشیی لێ ناکرێ، کارێکی تەنانەت خراپتر لە دەسبەسەرداگرتنی ماڵ و سـامـانی من: بیـرنامـەی ڕۆژانەمت خـوێندوە، تۆی نەنگی مـرۆڤـایـەتی ڕۆژی ڕەشت هـەر دادێ".

دیسـان هـەمان شت دەکـەیەوە. مـستـە ناسکەکـانت کـۆڵ دەکەیەوە و بەهـەمـوو بوونتـەوە لە کەسـی سپڵە مۆڕ دەبییەوە. هـەست بەڕق و ئازار بکە. ئێستا دەربڕینی سەر ڕووت مەگۆڕە، سەیری نەینۆکەکەت بکە و سەیری شێوەی ژێرپێڵووت بکە.

هـەناسـەیەکی قـووڵ وەربگرە. ڕووت بگەڕینـەوە سـەر دۆخی ئاسـایی، ئێـستـا خـۆت بۆ فـیلمی دووەم ئامـادە بکە. فـیلمـی دووەم فـیلمـێکی خـێـزانیی خـۆشـە بـەناوی "شـەیدایی هـەوەسـبـازنـە لە نیـشـتـمانی ڤـالەنتـاین". ئەمـجارەیان تۆ دەبیـیـەج خـاوەن تایبـەتمەندی سێکسی و ڕەگەزیی خۆت. دیسان تۆ قارەمانی خۆشـەویستییەکەی و هـەم دیسـان پلانەکە یەکجار پێشبینیکراوە. ئەلف بێ دەبینێ. دەکەونە داوی خۆشەویستی. بەشـەڕ دێن. ئێستا

سۆزە ئاگرینەکەیان پێ دەچێ کزەی لێوە هاتبێت و ڕەنگە تینەکەی ئەوەندە کەم بووبێتەوە کە جەرگیانی بڕیبێ. نیگەران مەبە لەبەرئەوەی ئەنجامی هەژێنەر بەڕێوەیە. بەشێوەیەکی زۆر چاوەڕواننەکراو ئەو کەسەی کە لە ناو فیلمەکەدا ڕۆڵی بەرامبەر بەتۆ دەگێڕێ خۆشەویستیی نهێنێی گەورە و پڕ سۆزی خۆی بەرامبەر بەتۆ دەدرکێنێ.

ئا، پێتم نەوتبوو کە بۆ خۆت ئەو هاوئەکتەرەی خۆت دەدۆزییەوە. کەسێکی بێ ئەندازە ڕوحسووک هەڵبژێرە. ئەوە بێنە بەرچاوت کە ئێوە بەیەکەوەن و توند یەکترتان لەباوەش گرتووە. ئینجا تۆ لە باردۆخێکی خەیاڵی دای بۆ ئەوەی لە شتی تایبەت بپێچییەوە:

کەواتە بیر لەوە بکەوە کە تۆ چاوت بڕیوەتە ناو چاوی خۆشەویستەکەت، ئەو کاتەی کە گرینگترین پرسیارەکەی لێ دەکەی:

"مەبەستت ئەوەیە کە من لە هەر هەموو ئەو خەڵکەی کە لە ژیانتدا بینیوتن جوانتر و زیرەکتر و بەخشندەتر و بەبەزەییتر و داهێنەرتر، و تەواو بێگەردترم؟ پێم بڵێ کەی بۆ یەکەم جار هەستت بەوە کرد؟"

هەست وەربگرە. لە بیرت نەچێ هەست وەربگری.

دەربڕینەکەت مەگۆڕە. ئەمجارەش سەیری ژێرپێڵووت بکە.

ئەم دیمەنانە زۆر زانیاریت لەبارەی چەماوەی ژێرپێڵووی چاو بۆ دابین دەکەن «بەڵام پێویستە تۆ توانای زۆر بۆ چاندنی ڕووت هەبێ دەنا وا بزانم دەبێ خۆت لە شانۆگەری ڕابێنی».

– لە هەندێک بارودۆخی دیاریکراودا، وەک ئەوەی ناو فیلمی دووەم، تۆ دەتوانی شێوەیەکی خڕ بدەی بەچاوت. چەمانەوەی ژێرپێڵوو، دەتوانێ تا ئەو ڕادەیە بێ کە زمانی ئینگلیزی زاراوەیەکی تایبەتی بۆ هەیە کە پێی دەڵێن "چاوخڕکردنەوە". بەشێوەیەکی گشتی ئەگەر تۆ هەست بەشەیدایی، زانینخوازی، یان نەپارێزراوی بکەی یان بەهەر هۆیەکی تر ئامادەیییەکی زۆرت بۆ دەربڕینی هەست و سۆز هەبێ چاوت ئەم بارە وەردەگرێ.

– لە بارودۆخی تردا، وەک ئەوەی ناو فیلمی یەکەم تۆ دەتوانی چاوت تەسک بکەیەوە، ئەمەش ژێرپێڵووی ڕێک دروست دەکا کە ڕەنگدانەوەیەکە بۆ نیگەرانی، هەستبریندارى، گومان، شەرم و بەشێوەیەکی گشتی هەستەکانی تری پێوەست بەڕووخانی عاتیفی.

– ئەو چاوانەی بەتەواوی خڕن «لەسەر پێوانێکی ١٠ پلەیی ١٠ پلەیان هەیە» سوودبەخشن، بەڵام ئەو چاوانەی کە ئێجگار ڕێکیشن «واتە لەسەر پێوانێکی ١٠ پلەیی ١

پلەیان هەیە» بەهەمان ڕادە، بەڵام بەشێوەیکی جیاواز سوودبەخشن. هەمان شت ڕاستە بۆ ئەو چاوانەی کە دەکەونە نێوان ئەم دوو تەوەرە واتە لە ڕووی پلەی ڕێکی و چەمانەوەوە ناوەنجین «لەسەر پێوانێکی ١٠ پلەیی ٥ پلەیان هەیە.»

پێویستە واتای ئەم ڕادە جیاوازانەی چەمانەوەی پێڵوو بزانی لەبەرئەوەی هەر کەسێک ڕیکخستنێکی لە لا پەسندە بەهەمان شێوەی کە تۆ پرۆگرامێکی وشەدارشتنی کۆمپیوتەریت لەچاو ئەوانی تر پێ پەسندترە. بەدڵنیاییەوە تۆ دەتوانی پێوانەیەکی ٣٠ پلەیی بەکار بێنی، بەڵام ڕەنگە پێوانێکی ستانداردتر پێوانێکی ١٠ پلەیی بێ و تا ئەو کاتەی بۆ خۆت ڕێکخستنەکە دەگوڕی هەر بەم شێوەیە بمێنێتەوە.

بەهەمان شێوە ژێرپێڵووەکانت ڕێکخستنێکی جێگیریان هەیە. هەروەها ئەو شتەی کە ڕێک ئێستا داوات لێ دەکەم بیخوێنییەوە «هەروەک بەردەوام ئەوەت لە بیر نەچێ کە گرینگە لە هەمان ئاستدا سەیر بکەی» ئەوەیە کە ئاخۆ چۆن چەماوەی هەریەکە لە ژێر پێڵووەکانت بەگوێرەی پێوانێکی ١٠ پلەیی دەخەملێنێ.

ئەو کاتەی هەڵسوکەوتت ئاساییە، چەماوەی پێڵووت دەرخەری ڕادەی گەرموگوڕیتە لەگەڵ ئەو خەڵکە نوێیەی لە ژیانتدا تووشیان دەبی. پێوانی پێڵووی چاوی ڕاست، پێوەندیی بەچۆنیەتیی مامەڵەکردنت هەیە لەگەڵ ئەو نەناسانەی کە لە بواری کاردا تووشت دێن. پێوانی چەماوی پێڵووی چاوی چەپ هێمایەکە بۆ چۆنیەتیی مامەڵەکردنت لەگەڵ ئەو خەڵکە نوێیەی کە بەهاوڕێیان لە قەڵەم دەدەی. ئەگەر پلەکە لە نێوان ٨ تا ١٠ بوو، بەمەرجێک ١٠یەکە زۆرترین ڕادەی چەمانەوەکە بێ، ژێرپێڵووەکان بەچەماوە هەژمار بکە. پێڵووی چەماوە دەربڕی ئەوەیە کە تۆ مەیلێکی زۆرت هەیە بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵک تەنانەت لەگەڵ خەڵکی تەواو نەناسیش تیکەڵ بی. بەچاوی تۆ هەر کەسێک وەک مامۆستایەکی ڕێ تێچوویە و تۆش فێرخوازێکی بەپەرۆشی.

سەرۆک "فرانکلین دیلانۆ ڕۆزڤلێت" کەسێکی کراوە بوو. گوایە ئەو ٥٠٠٠ کەسی بەناوی یەکەمیانەوە ناسیوە. ئەگەر زیاتر بەمێژوودا بچینەوە هەمان کرانەوە لە پیاوی دۆزەرەوەی هێزی کێشکردن، لە "ئیزاک نیوتۆن"دا، لە "دانتێ"ی شاعیری شارەزای بەهەشت و دۆزەخ و لە "نوح وێبستر"دا، یەکەم فەرهەنگدانەری ئەمریکی، دەدۆزینەوە. نموونەیەکی هاوچەرختر "ئادۆلفۆ پیرێز ئیسکویڤل"ە، خەباتکار بۆ مافەکانی مرۆڤ لە ئارژانتین کە سەرەڕای هەموو ئەو چەرمەسەرییانەی کە تووشی هاتوون توانیویەتی پارێزگاری لە کرانەوەیی خۆی بکا.



ژێرەپێڵووی چەماوە
١٠



ژێرەپێڵووی ڕێک
١



ژێرەپێڵووی
ناوەنجی

چەماوەی ژێرەپێڵوو

کەواتە خاڵە لاوازەکەی ژێرپێڵووی چەماوە چییە؟ هەندێک جار کەسەکە خۆشباوەڕە، بەڵام بەردەوامش هەستبرینداره. هەستیاریی منداڵانه خەڵک دەڕەنجێنێ بۆیە زۆربەی خەڵک هەوڵ دەدەن لەم هەستە ڕزگاریان بێ. "ویلیام ئیێف بەکلێ"ی کۆر، دەمڕاستی پێڕەوکار، پلەی چەمانەوەی پێڵووی ١٠یە. تەنانەت ئەو کاتەش کە ئەو بەقسەی نەستەق وەڵامی نەیارێک دەداتەوە، هەست بەوە دەکرێ کە پێش دەستپێکردنی شەڕەقسە پیاوانە بارودۆخەکەی هەڵسەنگاندبێ. ئەو هەروەک نووسەرێکی سێکیولار تەنانەت هەنگاوە نائاساکەشی هاوێشتووە، بەوەی لە ژینامەی خۆیدا باسی لە ژیانی کاسۆلیکیی خۆی کردووە. ئەگەر ئەمە خۆئاشکراکردن نەبێ ئەی دەبێ چی بێ؟

ئەوانەی ژێرپێڵووی ڕێکیان هەیە، کۆمەڵێک خاڵی بەهێزی جیاوازیان هەیە. یەکەم شت پێ دەچێ ئەوان ڕەخنەگری لێهاتوو بن کە خەڵکی تر لە کاتیان دەبەن. بەشێوەیەکی نموونەیی ئەوان لە ماوەی چەند چرکەیەکدا، خەڵکی نەناس هەڵدەسەنگێنن و زۆربەیان بەرامبەر بەوریایی ڕەفتار دەکەن. بۆچی بەخەڵکی سۆزدار و هزر پەرشوبڵاو و کەسانی لەوجۆرە کاتیان بەفیڕۆ بدەن؟

ئاریشەکە هەڵبەتە ئەوەیە کە تۆ نەک تەنیا کەسێکی لە بنەوەی، بگرە ڕەنگە ڕەخنەگریش بی. ڕەنگە کۆمەڵە برادەرێکی ڕێ تێچووی ئێجگار باش لە دەست بدەی. بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە سەر خاڵی بەهێزیت، تۆ هەرگیز زیاتر لە تاقە هاوڕێیەکت نابێ. ئەگەر هەردوو ژێرپێڵووت ڕێک بوون، ئەو کاتە هۆی ئەمە دەدۆزییەوە. هاوڕێی بەردەوامی تۆ ئەو کەسەیە کە لەو ئەزموونە قورسەی تۆ خەڵکی پێ تاقی دەکەیەوە، دەربچێ.

بەس بۆ ئەوەی پێ بکەنی جارێکی تر ئەگەر کەسێکت دی کە پلەی چەمانەوەی ژێرپێڵووی ١ بوو، لێی بپرسە: "لە کەیەوە باشترین هاورێی خۆت دۆزیوەتەوە؟".

وەڵامێکی نموونەیی: " لە وەتەی باخچەی ساوایان"ە.

"ڕوش لیمبا"ی یەکجار پێڕەوکار ڕەنگە شێواز و سەرنجڕاکێشیی مەیدانی شەڕەگا بەرجەستە بکا، بەڵام ئاخۆ لایەنگرانی چی تر بەرامبەری بەوەفا دەبن؟ ڕەنگە ئەوان هەڵوێستێکیان بەرامبەر بەو وەرگرتبێ لەبەرئەوەی پلەی چەمانەوەی ژێرپێڵووی ٥ە. سیاسەتوانانی تری یەکجار وریا برێتین لە سەرۆک "جۆرج بوش"ی پێشوو و "دان کایل"ی جێگری کە گوایە کەسانێکی یەکجار دڵسۆز بوونە. ژێرپێڵووی "جێس جاکسۆن"ی قەشە ڕەنگە واقوڕماوت بکا لەبەرئەوەی پێڵووی سەرەوەی ئێجگار چەماوەیە. پێش خوێندنەوەی

ڕوو ڕەنگە کەسێک وا بیر بکاتەوە کە ژێرپێڵوو و ژوورە پێڵوو هەمان ئاستی چەمانەوەیان هەیە. ڕەنگە وا بێتە بەرچاو، بەڵام لە ڕووبەری ڕوودا پێڵوو بەشێکە کە توانایەکی زۆری بۆ گۆڕان هەیە.

ئەو کاتەی "هیلاری کلینتۆن" بووە خاتوونی یەکەمی ئەمریکا، پلەی چەمانەوەی ژێرپێڵووی بەنەگۆڕی ١٠ بوو. بەڵام لە ماوەی دووەمی خولی سەرۆکایەتیی هاوسەرەکەی دیدی ڕەخنەگران ئەم پلەیەی دابەزاند. بەدڵنیاییەوە متمانەی کۆمەڵایەتیی هیلاری تا پلەی ١ دابەزی.

لەبەرئەوەی سیاسەتوانان زۆر بەوردی و بەناشیرینی ڕەخنەیان لێ دەگیرێ، شتێکی ئاساییە ئەگەر پەرە بەمجۆرە وریاییە بدەن. ئەوەی کە زۆر سەرسڕمێن بێ ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆری ئەکتەری سینەماییش، کە بەتایبەتی بەشۆخ ناسراون، بەهەمان شێوە کراوە نین. "کیم باسینگر" و "مادۆنا" و "چێرڵ" شوێنکەوتووی هەمان شێوازە وریایەکەی "ماریلین مۆنرۆ"ن.

لە جیهانی پیاوانیشدا ڕەنگە تۆ پێشبینیی ئەوە بکەی کە پلەی ١ لە کۆمەڵە گەنجێکی بەهێزی وەک "کلینت ئیستوود" و "جەک نیکڵسۆن"دا هەبێ، بەڵام ڕەنگە تووشی سەرسڕمان بی ئەگەر بزانی هەمان هێما لە ناو بتەکانی سینەما، "تۆم کروز" و "لووک پێری"یشدا بەدی دەکرێ.

خەڵکی خاوەن پلەیەکی ناوەنجیی چەمانەوەی ژێرپێڵوو "واتە لە نێوان ٤-٧ پلە" بۆ بەرگریکردن لە خۆیان فێری کۆمەڵە شارەزاییەکی بەکەڵک بوونە. لە قۆناخی تاقیکردنەوەدا ئەوان لەگەڵ ناسیاوە نوێیەکاندا کراوە نین، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ خەڵکی زۆر بەئاگاوە تا ئەو ڕادەیە کراوەن کە دەرگە بۆ وەرگرتنی هاوڕێی نوێ ئاوەڵە دەکا. وتەی "دێیڤید بێرنس" لەبارەی ناوبانگ جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەگەر مرۆڤ بییەوێ توانای بەرهەڵستیکردن دژی کەم ڕێز لەخۆنان و خەمۆکێی هەبێ، پێویستە پەرە بە ستراتیجیەتی "هەستکردن بە باشی" بدا. بێرنس داوا لە پێوەندیکەرانی دەکا کە کراوە بن، بەڵام تەنیا تا ڕادەیەکی بەجێ. ئەم ئامۆژگارییەش لە پلەی ناوەنجیی چەمانەوەی ژێرپێڵووی بێرنس سەرچاوەی گرتووە.

پرسیار: چۆن زانیاریی تایبەت بەپلەی چەمانەوەی ژێرپێڵوو لە بەرژەوەندی ژینی کۆمەڵایەتیم بەکار بێنم؟ لەبەرئەوەی سەڵتم، ئامادەم هەموو شتێک لەم پێناوەدا بەکار بێنم.

وەڵام: سەیری چاوی خۆت بکە و خاڵەکانی هێزی شێوازی کەسیی خۆت پەسند بکە:

– ئەگەر تۆ کەسیکی وریا بی، چاوەڕوانی ئەوە مەبە، بتوانی بۆ خۆت هاوڕێ بدۆزییەوە. کەسێک کە پلەی چەمانەوەی ژێرپێڵووی ١ یان ٢ بێ، تەنیا لەگەڵ کەسێکی خەیاڵی پێوەندیی خۆشەویستی دەبەستێ. پێویستە متمانەت بەخەڵک هەبێ و ئەمەش ڕێگەیەکی پشتپێبەستراوە بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵک.

– بەپێچەوانەوە ئەگەر تۆ خاوەنی پلە بەرزەکەی چەمانەوەی ژێرپێڵوو بی، بزانە کە زۆر بەئاسانی خۆشەویستی بەسەرتدا زاڵ دەبێ. باشترە ناوەناوە بەخۆتدا بچییەوە تا بزانی کە ئاخۆ ئەو شتەی دەترەنجێنێ بەهۆی پێوەندییە دڵشکێنەرەکانت بووە یان نا. دڵە ئازارچەشتووەکەی تۆ زۆرجار پێویستی بەتیمارکردن هەیە.

– ئەگەر پلەی چەمانەوەی ژێرپێڵووی تۆ ناوەنجی بێ، پیرۆزبایی لە خۆت بکە بەبۆنەی توانای گونجانی کۆمەڵایەتیت. وا چاوەڕوان مەکە کە هەموو هاوژوانەکانت هەمان ڕادە بەراوردییەکەی بەئاسانی مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی نەناسیان هەبێ. سەیری چاو و نەختێک خوارتری چاویان بکە. پلەی چەمانەوەی ژێرپێڵوو یارمەتیت دەدا بۆ چوونە ناو پێوەندییەکانەوە.

## پف و برژانگ

"پاف"ت بەبیرە، هەمان ئەژدیها سیحراوییەکە؟ هەرچەندە ئەم گۆرانییە ئاوازێکی خۆشی هەیە، بەڵام ئەژدیهایەکان بەشێوەیەکی گشتی سیحری شوومیان لێ دەوەشێتەوە. بەدڵنیاییەوە هەمان شت ڕاستە بۆ ئەو پفە ئەژدیهائاسایانەی کە لەسەر هەندێک ڕوودا بەدەر دەکەون. هەروەک هەر هێمایەکی تری ڕوو پفیش دەربڕی بەهرەیە، بەڵام زیاتر لە زۆربەی هێمایەکانی تر لەسەر خەڵکەکە بەگران دەوەستێ.

چاوی زۆربەی خەڵک پفدار نییە. پف لەگەڵ ئەو هێمایە بەربڵاوانەی دواتر باسی لێوە دەکەین، واتە پڕێتیی کەمی پێڵوو و پێڵووی یەکانە و جووتە چاوی قووڵ تێکەڵ مەکە. پف بەو تۆپەڵە گۆشتە زیادە دەوترێ کە لە ژێر برۆوە سەر هەڵدەدا و بەشێک لە ڕووبەری ژێرەوەی خۆی دەپۆشێنێ.

– پفی کەم بەشێکی کەمی پێڵوو دەپۆشێنێ.

– پفی زۆر بەڕادەیەک گەورەیە کە بەشێکی خودی چاو دەپۆشێنێ.

– ڕەنگە چاوی تۆ هیچ پفـێکی نەبێ، واتە سـەر پێـڵـوو، هیچ زیادە گـۆشـتـێکی لێ وەدەرنەکەوێ و تەنانەت ئـەو ڕۆژانەش کە ناوچەکانی سـەر چاو و ژێرەوەی چاویشت توزێک دەرببۆقێن، هیچ تۆپەڵە گۆشتێک نادۆزییەوە کە کەوتبێتە سەر پێڵوو یان چاوت.

بەشـێـوەیەکی نموونـەیی هۆی سـەرهەڵدانی پف دەگـەڕێتـەوە بـۆ ئەوەی کـەسـەکـە خـۆی فەرامـۆش دەکا. هۆی ئەم فـەرامۆشکارییەش ئەوەیـە کە کەسـەکە زۆر خەریکی خەڵکی ترە. ئەو هەوڵ دەدا دڵی خـەڵک خۆش بکا و یارمـەتییـان بدا و پارەیان لێ وەدەست بێنێ و شـتی لەم جـۆرە. ئەم کـەسـە گـرینگی بەو پـەیامـە بـچـووکـانـە نادا کـە بـەبەردەوامی لـەلایەن جـەسـتـەیـەوە پێ دەگـەن، پەیامی وەک "لێم گـەڕێ با پشـوویەک بدەم" یان "لێم گـەڕێ با لـەم نووسینگەیە دەربچم. دەمەوێ یاری بکەم".

ئەگـەر ئەم خـۆفـەرامـۆشکردنە بەردەوام بێ پـفـەکـان گـەشـە دەکـەن. ئەو شـتـە زلانەی کـە بەشـێک لە چاو دەپۆشـێن دەربڕی ئەوەن کـە کـەسـەکـە گرینگی بە تەندروسـتیی خـۆی نادا. ئەگەر واسـوس بی، کە بەنەشتـەگەری ئەم کوتە گۆشتە لابەری ئەی بۆ بیر لەوەش ناکەیەوە کە هۆی سـەرهەڵدانی ئەم زیادەیە گۆشـتـە چارەسـەر بـکەی. بۆ نموونە ڕەنگە ئالێرژییـەکی نەناسراو بوویێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەم پفانە. شـارەزایانی پزیشکیی چینی و شـارەزایانی خـۆراک و هـەورەهـاش چارەسـەرکـارانـی سـروشـتی ڕەنگە یارمـەتیت بدەن بـۆ ئەوەی بزانی جەستەت ویسـتوویەتی چ پەیامێکت پێ بگەیەنی و بەم شێوەیە تۆ دەتوانـی ئەو شتەی کە لە ناو ڕووتدا سـەرنجی خـەڵک ڕادەکێشـێ لە ناو بەری «ئەم ڕێگەیە هـەم بۆ پفەکانی سەر چاو و هـەم بۆ پفەکانی ژێرەوەشی بەکار دێ.»

بەدەر لە ئەگـەری وریاکـردنەوەی تەندروسـتی پف دەربڕی زۆر ئاوێتـەبوونە لەگەڵ پیشـە. پف هێـمـای کـەسـێکە کـە پاڵنەرێکی هەیە کـەسـێکی خـۆبەخـتکەر بۆ وەدەسـتـهـێنانی دەسکەوت.

بەشێوەیەکی مـەجازی ئاریشـە هاوڕێ لەگەڵ پف، ڕەنگە سـەرکـەوتنیشـی بەدوادا بێ. کەم کەس بەویسـتی خـۆی، خـۆی بۆ سـەرکـەوتن بەخـت دەکا، ئـەمـەش چاو پفکردووەکـان شـێت دەکا. نموونەیەک بۆ ئەم جۆرە کـەسـانە "جـۆ جێـرارد"ە کـە بەگوێرەی کتـێبی "گاینێس بۆ ژمـارە پێوانەییـیـەکانی جیـهـانی" بەگەورەترین فرۆشـیاری جیـهـان ناسـراوە لە ڕوویەوە پێ دەچێ پیاوێکی سـەرنجڕاکێش بێ کەچی ئەو کەسێکە کە هەڵەی دەبەنگەکان دڵتەنگی دەکا.

پفی کەم، ئامـاژە دەکا بەناڕەزاییـیـەکی کەم. کەسەکە کەم بەرگەی هەڵەی بچووک دەگرێ

و ئەمـــەش هەلی بەئاشکرا هـەمـوارکـردنەوەی شـێـوازە ڕێگەپێـدراوەکـانـی کـارکـردن دەرەخسـێنێ. کەسـی ڕەخنەگر دەتوانێ خەڵکی فشەکەر ئاقڵ بکا. کەواتە سوپاس بۆ خوا کە بەڕێوەبەری وەک "نانسی ئۆسـتن" و "تۆم پیتر" هەن کە بەدووقـۆڵی کتێبی "A Passion for Excllence"یان نووسیوە و هەردووکیان پفێکی ناوەنجییان هەیە. ڕەنگە ئاستێکی بەرزتری ناڕەزایی یارمەتیی "جۆن واین"ی ئەکتەری دابێ تا بەهۆی بەڕاستی جێکردنەوەی خۆی لە ناو دڵی ئەمریکییەکاندا شانازی بەخۆی بکا.

ئاخۆ شـتـەکە بەڕێکەوتە کـە لاپەڕەکانی "Forbes – فۆربیس" وێنەی ئـەو میلیـۆنێرانەی تێـدایە کـە چاویان نەخـتـێک پفی هەیە؟ وا بزانم ڕێکەوت نیـیـە، بەڵام ئەگـەر دەتەوێ کاریگەریی سروشتە پڕوزەکەی پفی چاو بسەلمێنی بۆچی پرسیار لە ژمێریاری ئەو کەسانە ناکەی؟ دەتوانی پێیان بڵێی تۆ قوتابییەکی کۆلێجی کە لێکۆڵینەوە لەسەر کاریگەرییەکانی پفی چاو دەکەی. پێویستە تۆ بزانی کە ئاخۆ سروشتی پفەکان هاوتایە لەگەڵ حیسابە بانکییە پڕەکان.

تەنانەت ئـەو پفـەی کـە ئەوەندە گەورەیە کـە ڕێگە لە دیتن بگرێ جۆرە نیـعمـەتێکی زۆر ئاوێتەتر هاوڕێیـەتی. بەبەراورد لەگەڵ بەشەکانی تری ڕوو تۆ لەم هێمایەدا ڕەنگە مەیلێکی زۆر بۆ سـەرکەوتن بخـوێنییـەوە کە هـاوڕێ لەگەڵ تووڕەییـەکی بەردەوام و خۆپاراستن و تەنانەت لەخۆباییبوون و ناپاکیش بێ. یان ڕەنگە هەر هەموویان لە ناو ڕووی "راسپوتین"ی قەشـەی شـوومی ناو مـێژووی ڕووسـیـادا بخوێنیینەوە. لە مـێژووی ئەمریکادا زۆرێک لە سـەرۆکەکـان کە کـەمـترین جـەماوەریان هەبووە خـاوەن پفی گەورە بـوونە وەک "ئەندروو جـانسن" و "یولیـسـێس ئێس گـرانت" و "گـرۆڤـر کلیـڤـلاند" و "ویلیـام هاوارد تـافت" و "بێنجامین هەریسن" و "مارتین ڤان بێرن" و "میلێرد فیلمۆر".

بێگومـان هـەندێک خـەڵک تەنانـەت لە شـێـوازیشـدا بێ تـام سـەخـتگیـرن. بۆچوونە ڕەخنەگـرانەکـەیان ڕەنگە هـۆی سـەرنجڕاکـێشـیـشـیـان بێ و پـەردەیەک لەسـەر لایەنە ناحـەزەکەی تەقـەلایـان بۆ سـەرکەوتـن دابنێ. ئاخـۆ "سـێر ئارسـر کۆنان دۆیل" دەیتـوانی هەمان "شێرلووک هۆڵمز" بنووسێ ئەگەر بۆ خۆی ئەوەندە ڕەخنەگر نەبووایە؟ "دەبلیوو سی فیلدز" بێنە بەرچاوت کە چی تر بۆڵەبۆڵ ناکات. لە ماوەی جەنگی جیـهـانیی دووەمـدا شـێـتگیـرییـەکـەی "وینسـتن چێـرچیل" کـە لە پفی چاوییـەوە سـەرچاوەی گـرتبـوو، وەک سـەرچاوەیەکی ئاسـوودەیی بۆ ملیـونەهـا خـەڵک بوو. ئەمـڕۆ، کـە "پەت بوچانان"ی سیاسەتوان تووڕەییە پڕ بۆڵەبۆڵەکەی دەردەکا، ئەو کەسانەی پێی سەرسامن بەنزیکەیی

دەبووروێنـەوە. "کـاڵ ریپکن"ی کـوڕ، کـە قـارەمـانـی تۆپی پێـیـە هەرجـارەی دێتـە مـەیدان هاندەرانی لە خۆی دڵنیا دەکاتەوە، هەموو شتەکە تەنیا پێوەندیی بەپفەوە هەیە و بەس.

پرسـیـار: بێ ئـەوەی مـەبەسـتـم لایەنـگری ڕەگـەزی بێ، وا پێـدەچێ کـە پیـاوان لە ڕووی هەبوونی پفـەوە پشکـی شێریان بەر کەوتووە، ئاخۆ چـاوی ئافرەتـانیش بەهەمـان ڕادە پفی دەبێ؟

وەڵام: بەردەوام تووڕەیی- هـەر هەمووممـان بەشمـان پێیـەوە هەیە و لەوەدا کە دەڵێی چاوی پیـاوان زیاتر لە هـی ئافرەتان پفی هەیە و بەتایبـەتیش هێمـای پفی گەورەیان هەیە، ڕاست دەکەی. بەڵام ڕەگەزی من لەجیاتی پف بەهۆی برژانگی تەنکەوە جیاوازییەک دەخوڵقێنێ.

برژانگ بۆ مرۆڤ وەک سـمێڵـە بۆ پشیلە. پشیلە سـمـێڵ وەک ئامـێرێکی هەسـتـیار بۆ پشکنین بەکار دێنێ. هەرچی مرۆڤـە برژانگ بۆ لێکۆڵینەوەی فیـزیکی بەکار ناهێنـێ. لەگەڵ ئەوەشـدا برژانگی ئێمـە ڕەنگدانەوەیەکە بۆ هەسـتـیـاری فەسلەجیـمان. چەندی برژانگەکان تەنکتر بن بەهەمان ڕادە کەسەکە دەشڵەژێن.

کـەواتە هـەر کـەسـێکی خـاوەن برژانـگێکی تـەنک ناچارە کـاردانەوەی هـەبێ جـا چ وەک پشیلە جرتوفرتی لێوە بێ یان هەروەک سەگ بحـەپێنێ. مەبەستی مـن لە سەگ ئەو جۆرە سەگە وردیلانەیە کە شەڕانی دیارە و وەک سەگێکی "شڵپ و هۆڕ لێوە هاتوو" خۆشەویستە کەچی هێشتاش توانای گەزەلێدانی هەیە. مەبـەستم ئـەوە نییە کـە ئەم ئافرەتانە مـەرجـە دەقـاودەق یان بەمـەجازی لەتوپەتت بکەن، بەڵام ئەگەری تووڕەییـیـەکی سـەرچاوەگـرتوو لە مـوو ڕێـی تێ دەچێ. بەهرەیەکـە برێتـیـە لە هەسـتـیاری کـە ڕەنگە لە کـۆتاییدا هەسـتی نایابیشی بەدوادا بێ هەروەک بۆ زەینی وەسـتـایەکی نەوسنی چێشتلێنان لە بۆنکردن یان وردبینیی هونەرمەندێک لە ڕەنگ.

## مەودای نێوان هەردوو چاو

مـەودای نێوان هـەردوو چاو هێمـایەکی تری ڕووت پێ دەناسـێنێ. مەودای نێوان هـەردوو چاو پێوەندی بە... بوەستە، پێویستە سەرەتا هێمایەکە بناسییەوە.

- مەبەست لە مەودای نێوان دوو چاو ئەوەیە کە تا چ ڕادەیەک چاوەکان لێک نزیکن.

- جـووتـە چاوی لێک نزیک، وەک دوو دراوسێ لێک نـزیکن کـــە دیواری لووت لێکیـــان دەکاتەوە.

– جووتە چاوی لێک دوور، وەک ئەو بنامۆزایانەی کە یەکێکیان لە کۆتاییی ئاراستەیەکدا بژیت و ئەوی تریان لە کۆتاییی ئاراستەی پێچەوانەدا، لێک دوور کەوتوونەوە.

ئەوەت لە بیر بێ کە زۆربەی خەڵک مەودای نێوان هەردوو چاویان ناوەنجییە و ئەمەش هێمایەکە کە پێویست ناکا بخوێندرێتەوە. کەواتە بۆ سەلماندنی مەودای نێوان دوو چاو، نە سەرنجێکی ورد بدە و نە منگە منگ بکە و نە بەنائومێدی بەپەنجەکانت مەوداکە بپێوە. تەنیا ئەگەر نزیکی یان دوورییەکە زۆر ئاشکرا بوو دەنا لە هێمایەکی تر بکۆڵەوە «هەروەها ڕووی کەسێکی تریش بخوێنەوە لەبەرئەوەی ئەو نەناسەی کە تۆ بەپەنجەکانت کەتوویە سەر ڕووی، لە ترسی ژیانی خۆی لە ژوورکە ڕادەکا.»

کەواتە ئاخۆ بەبۆچوونی تۆ واتای مەودای نێوان هەردوو چاو چییە. ئەم هێمایە پێوەندیی بەڕوانگەی هەستەوە – Conscious Outlook هەیە، بەڵام ئاخۆ ئەم لایەنە چییە؟

ئەگەر بەمەزندەی تۆ شتەکە قووڵاییی بۆچوون بێ، کەواتە خاڵێکت بۆ خۆت تۆمار کردووە.

ئەگەر تۆ بەخێرایی بتوانی مەودای نێوان هەردوو چاو میلیمەتر بە میلیمەتر بەوردی بپێوی، کەس خەڵاتت ناکا، بەڵام ڕەنگە بتوانی سیفەتی خاوەنداریەتی چاوی لێک نزیک بدەیە پاڵ خۆت. ئەمەش واتای ئەوەیە خەڵکی خاوەن هەر جورە مەودایەکی تری نێوان دوو چاو توانای پێوانی میلیمەترەکانیان نییە.

ئەگەر تۆ جووتە چاوی لێک نزیکت هەبێ خاوەن بەهرەی سەرنجێکی وردی . لە هەر لایەنێکی ژیاندا کە بەلاتەوە گرینگ بێ کەس زیاتر لە تۆ تێبینیی وردەکارییەکان ناکا. تۆ لەسەر هیچ کەس و هیچ شتێک باز نادەی. کەواتە تۆ لەو پێشانە یان هەر کارێکی تردا کە پێوستی بەسەرنجێکی وردەوە هەیە، دەبی بەوەستا. نموونەش بۆ کەسانی خاوەن ئەم هێمایە برێتین لە"پۆل ریڤێر"ی زیوگەر و "ویلیام سافیر"ی فەرهەنگدانەر و دکتۆر"سیوس"ی نووسەری کتێبی منداڵان و "کیری تی کاناوا"ی بەردەوام دەنگ ناسک و "مارک نۆفلیر"ی گیتارژەنی سەرسڕهێن.

با یاریزانانی گۆڵف ئەمە ببیستن: بەبۆچوونی من تاکە هێمایەکی ڕوو کە هەبوونی بەواتای شارەزابوونە لە هەر جۆرە کارێکدا خۆی لە وەرزشی ئێوەدا دەرخستووە. ئەستەمە بتوانرێ یاریزانێکی پلەیەک بدۆزرێتەوە کە خاوەن جووتە چاوێکی لێک نزیک نەبێ. نموونەش "تایگر وۆدز" و "نیک فالدۆ" و "جەک نیکلاس" و "ئێیمی ئاڵکۆت" و "تۆمی ئارمۆر"ن.



جووتە چاوی لێک
نزیکبووە



جووتە چاوی لێک
دوور



مەودای ناوەنجی
نێوان هەردوو چاو

مەودای نێوان هەردوو چاو

پرسیار: بۆچی گۆڵف؟ چ پێوەندییەکی بەجووتە چاوەوە هەیە؟

وەڵام: پێویستە یاریزانانی گۆڵف هەست بەکەمترین جیاوازییەکانی فریز و لێژایی و داردەستەکە بکەن. بیر لەو توانا یەکجار وردە پێویستانە بکەوە کە پێوەندییان بەچاوی لێک نزیک هەیە. هەڵبەتە لە یاریی گۆڵفدا جووتە چاوێک بەس نییە بۆ گەرەنتیکردنی سەرکەوتن. پێویستە لێدانەکانیش تەواو بن. ئەگەر تۆ خاوەنی ئەم تایبەتمەندییە بەهێزە بی، ئاخۆ خاڵە لاوازەکەت دەبێ چی بێ. لە ڕەخنەگرتن وریا بە لەبەرئەوەی تۆ لە تێبینیکردنی شتەکان زۆر وردی ئەو کاتەی دەست دەکەی بەدۆزینەوەی هەڵەکان دەبی بەقارەمان. "Seinfeld" کە شووێکی تەلەڤزیۆنیی بەهێزە بەشێکی زۆری کەموکوڕییە هەستپێکراوەکان دەکا بەنۆکتە. ئەمەش لە جووتە چاوە زۆر لێک نزیکەکەی خودی "جێری سێینفیلد"ەوە سەرچاوەی گرتووە. بەلای منەوە سەیرکردنی بەرنامەکەی یەکێکە لە پەسندترین جۆرەکانی چارەسەروەرگرتن لە ڕێی پێکەنینەوە. بەڵام ئاخۆ من یان تۆ دەتوانین ببین بەیەکێک لە هاوژوانەکانی ئەو؟

پرسیار: ئەوانەمان کە خۆیان تووش کردووە و لەگەڵ پیاوی خاوەن جووتە چاوی لێک نزیکە ژیانیان پێک هێناوە دەبێ لە پێوەندییەکانیان چۆن بن؟

وەڵام: دەبێ سەریان لە ئاست توانای چاودێریی مێردەکانیان سڕ بمێنێ و شتەکانی تری بەئاسایی وەربگرن.

بەڵام لەگەڵ ئەو مێردانە یان کەسانی تری خاوەن چاوی لێک دوور، چاوەڕوان مەبە زۆر ورد بی. ئەگەر تەنیا وردبینییەکی ئاساییت هەبێ، بەسە. لەگەڵ ئەوەشدا کەسی چاو لێک دوورکەوتوو بەتایبەتی ئەگەر بڕۆی تاجدار بێ دەتوانێ کەسێکی ورد بێ، بەڵام ئەو کەسە هەرجۆرە لێڵییەکی ڕووکەشی بەهۆی شارەزاییە تایبەتەکەیەوە بە شتێکی گرینگ لە قەڵەم دەدا. ئەو پاسەوانانەی کە دەتوانن دارستانەکان بەتەواوی ببینن لەم پۆلە دان. بیر لە "ویلیام فولبرایت"ی چاو لێک دوورکەوتووەی دووربین بکەوە. ئەو کاتەی سەرۆکی سیناتۆرانی ئەمریکی بۆ پێوەندییەکانی دەرەوە بوو پێشەنگی ڕەخنەگرانی دژ بەلەشکرکێشیی بێگانە بوو. کاتێک "مارگرێت سەنگر" هەستی بەوە کرد هەموو ئافرەتان پێویستە زانیاریی کۆنترۆڵکردنی منداڵبوونیان پێ بدرێ، بەبلیمەتێکی سەردەمی خۆی دانرابوو. "ماریلین فێرگۆسن"ی نووسەر، گەورەترین نووسەری سەردەمە. هەروەها خەیاڵ فراوانی هەروەها یارمەتیدەر بووە بۆ "ئارسر سی کلارک"ی نووسەری چیرۆکی زانستی

خــەیاڵی داوە، کــە بــەجــوانـتــرین شــێــوە بــەهۆی "٢٠٠١، A Space Odyssey /٢٠٠١، ئۆدیسـەیەکی بۆشـایی" ناسراوە. کۆمـەڵێک بیرکـاریزان "کێرت گۆدڵ" دەپەرستن. "گرێیس مـیــرابێـلا" ســەرنووســەری ئـەو کـۆوار بەهەڕمــێنەیـە کـە لە ڕووی شـێـوازی نووســینەوە داهێنەرترین کۆوارە لە ئەمریکادا.

خـەڵکی خاوەن چاوی لێک نزیک سـەریان لە ڕێکخسـتنی یەکـەمـایەتییـەکانیـان دەردەچێ. "ئێلـێن زویلیچ"ی ئاوازدانـەر نموونەیەکـە بۆ ئەم جـۆرە کـەســانە و یەکـەم ئافـرەت بووە کـە خـەڵاتی نۆبڵـی بردبێـتـەوە. هـەروەهـاش "پۆل لۆرێنـس دونبـار"، یەکـەم نووســەری ئەفـریقی ئەمریکییە کە ناوبانگێکی نەتەوەیی بۆ خۆی وەدەست هێنابێ.

پرسـیـار: بەڕای تۆ کامـیـان ڕۆمـانسیـترن، خـەڵکی خاوەن چاوی لێک نزیک یان ئەوانەی چاویان لێک دوورە؟

وەڵام: هـاوژوانە چاو لـێک دوورەکـان ڕۆمـانسـیـترن، بەڵام هـاوسـەرە چاو لێک نزیکـەکـان بەکەڵکترن. ئەگەر بیر لەوە بکەیەوە کـە ڕۆمـانسییـەتەکەت کـاتییـە، کەواتە بەکەڵکبـوونیش ڕەنگە بەلاتەوە پەسند بێ.

## قووڵاتیی چاو

ئەو کـاتەی لە نـاو نەینۆک سـەیری جـوتە چاوێک دەکـەی، قووڵاییـی چاویش دەبێ بەهەند وەربگری. ئەمــە لە لاڕووەوە بەئاسـانترین شـێـوە دەبـینرێ. سـەیری جـێکەوتی بـرۆ بکە. لە ژێرەوەی لووتکەی چاڵی چاو دەبینرێ. ئاخـۆ هـەست بەبەخـتـەوەری ناکـەی کە گۆی چاوی ئێمـە بەپێچەوانەی گلـۆپ ناوەناوە پێـویسـتی بەگۆڕان نییـە؟ ئاخـۆ کاتێک ئەم گۆیە لە ناو چاڵی چاوت نرا، دەبێ چ قاڵبێکی وەرگرتبێ؟

– هـەندێک جار چاوت بەچاوی قووڵ دەکەوێ.

– هـەندێک جار چاوی دەرپەڕیو بەدی دەکەی.

– زۆربەی چاوەکـان لە قـووڵاتیدا نـاوەنجین و ئەم جۆرە هێـمـایەش پێـویست بەخـوێندنەوە ناکا.

– ئەی چاوی زەق؟ ڕەنگە ئەو بارە کاتەکی بێ و بەسـەیرکردنێکی درێژخـایەنی تەلەڤزیۆن چاو ئەم بارە وەربگرێ.

پرسیار: ئاخۆ نەخۆشیی سایرۆدی نابێتە هۆی دەرپەڕینی چاو؟


چاوی قووڵ


چاوی دەرپەڕیو


چاوی لە قووڵاتیدا ناوەنجی

قووڵاتیی چاو

وەڵام: دەشێ وا بێ، بەڵام بیخەرەوە یادت کە ژیان چەند ئاستێکی هەیە. ئەوەی بەلای ڕووخوێنەوەیەک گرینگ بێ، واتای هێمایەکەیە. کەواتە بۆ نیگەرانییەکانت سەبارەت بەدەرپەڕینی چاو، سەردانی پزیشک بکە، بەڵام وەک ڕووخوێنەوەیەک بزانە سوودە دەروونییەکەی هێمایەکە چییە.

قووڵاتیی چاو، دەرخەری خۆتەرخانکردنی کەسەکەیە بۆ بەشداریکردن لە گفتوگۆیەک. ئەمە هێمایەکە کە ڕاستەوخۆ دەچێتە بواری زمانی جەستەوە. کەسی خاوەن چاوی قووڵ بەبێ هۆ بەشداری لە گفتوگۆ ناکا. کەسەکە لە جێوە دادەنیشێ و گوێت بۆ هەڵدەخا. ئەمەش ڕەنگدانەوەیەکە بۆ بەشداریکردنێکی ئاسوودە. ئاگەدارت دەکەمەوە کە ئەم هێمایە هەروەها ئاماژە بەتوانایەکی بەرزی بلۆفلێدان دەکا کە مەرج نییە تەنیا لە یاری پۆکەردا سوودی لێ وەربگیرێ.

ئاریشەی دەروونیی کەسەکە چییە؟ هەموو خەڵک دەیزانێ. ڕەنگە هاوڕێیەکەت لە پشت بزە بەنەزاکەتەکەیەوە لە ناخدا چاوت لێ مۆڕ بکاتەوە. بەشێوەیەکی نموونەیی مەودای هەستە شاراوەکە لە نێوان شک و گومانێکی پارێزکارانە و گاڵتەپێکردنێکی هێمن دایە. مەرج نییە ئامانجەکە هەڵخەڵەتاندن بێ. تەنیا کەلێنێک لە نێوان هەستە دەروونییەکە و ڕواڵەتەکەدا دەبینرێ. هەرگیز لە خۆت پرسیوە کە بۆ نموونە "ڕیجیس فیلبن" لە بەرنامەی"Who Wants to Be a Millionaire –کێ دەیەوێ ببێ بەملیۆنەر"، کاتێک دەپرسێ: "ئاخۆ ئەمە دوا وەڵامتە؟ "چ شتێکی لە ناو مێشکیدا دەخولێتەوە؟

پرسیار: زۆر چاکە. کەواتە چۆن بتوانم کەسێکی چاوقووڵ بۆ کڕینی کاڵا قایل بکەم؟

وەڵام: سوود لەم هێمایە وەربگرە و تا دەتوانی زانیاریی لەسەر کۆ بکەوە.

بەدڵنیاییەوە تۆ حەز ناکەی لە بەردەم "ماگرێت مید"ی کۆمەڵناسی چاوقووڵی هەست نەخوێندراودا بکەویە منگەمنگ. یان لە بەردەم "بۆب ودوارد"ی هەواڵنێر قسەکانت درێژ بکەیەوە. ڕەنگە ودوارد لە باسکردنی تەقەلای "هیلاری کلینتۆن" بۆ گەیشتن بەئاسوودەیی دەروونی لە کۆشکی سپیدا زێدەڕۆیی کردبێ. بەڵام هەر ڕووخوێنەوەیەک دەیتوانی ئاماژەیەک بۆ ئەم کاردانەوە میزاجییە دەستنیشان بکا. ودوارد چاوی قووڵی هەبووە، بۆیە وەک کەسێک کە مەبەستی چاوپێکەوتن بووبێ لە شاردنەوەی ئامانجە ڕۆژنامەگەرییەکانی کارامە بووە.

ئاریشەی هاوتای هێمایەکە، برێتییە لە ڕێگەدان بەدروستبوونی کەلێنێکی لە ڕادەبەدەر

گەورە لە نێـوان ئەو ڕووکەشـەی کە بنیاتـی دەنێی لەگەڵ واقیـعی دەروونیـی خـۆت. ئەگەر مەوداکەی نێوانیان یەکجار زۆر بوو، ئەوا تۆ جۆرێکی گرینگی گرینگی متمانە لە دەست دەدەی.

لە ڕووی ئەرێنییـەوە ئەم هێـمـایەی ڕوو، هاوڕێی مـەرجـێکە کـە دەشـێ بـەتایبـەتی بۆ فرۆشیاری و لایەنەکانی تری ئیشوکار سوودی هەبێ. "سامولیل کێرتس جۆنسن" پیاوێکی چاوی قـووڵ و کەسـایەتییـەکی قـووڵە کـە توانیی بەرهـەمـەکـانـی پیشـەی بنەماڵەی خـۆی بەشـتێکی زیاتر لە"Johnson's Wax –بۆیاخی جـۆنسن" بنـاسـێنێ. ئەم تێـبـینییـەم ئەوەم بەدڵە کە دەڵێ:

"ئێـمـە زەمـینەی ژوور و هەروەها قـەنەفـەکـانتـان ڕەنگ دەکـەین و ڕایەخـەکـانتـان پاک دەکەینەوە و مێرووڵە سپییـەکان دەکوژین و هەوا بۆنخۆش دەکەین و ئۆتۆمبێلی پیرە پیاو ڕەنگ دەکەینەوە و، هەر کاتێک مۆسکەیەک پێتەوە بدا، بزانە کە من ئەو کاتە بزەم دێ".

بەدڵنیـاییـەوە ئەو لە ناخـەوە بزەی دێ، بەڵام ئاخـۆ دەهێـڵێ کـەس هەسـتی پـێ بکا؟ بەپێچەوانەوە کەسێکی چاو دەرپەڕیو، دەرفەتی ئەوەت پێ دەدا تا هەر ئینچێکی ئەو بزەیە ببینی. زۆر چوونە ناو گفـتوگۆ، شـێوازە پەسندەکـەیە. زمانی جـەسـتـە دەڵێ ئەم کـەسـە کەسـێکە کـە دەقاودەق لەسـەر لێواری کورسـی دادەنیشـێ. ئەگەر تۆ ئەم هێمایەت هەبێ بۆ خـۆت دەزانی کـە مـەیلی ئاشکرات بۆ بەشـداریکردن لە گـفـتـوگۆ زۆر گـرینگتـرە لەباری دەروونیت. تۆ لە ڕاستیدا و بەتەواوی لە گفتوگۆیەکەدا هەبوونت هەیە.

ئەمەش ئامۆژگارییـەکی بچووکە: ئەگەر کەسێک ئەوەندە مـژووڵی قسـەکردن بوو، قسـەی پێ مـەبڕە دەنا بەهـەمـان شـێوە کە "ئارشی بانکر" فـەرمـانی دەدا "دەنگت ببڕە" قسـەکـانی تۆش پێت دەبردرێن. بەڵێ، "جـێین سـتـاپلیتن"ی ئەکتـەر بـەخـۆ بەچاوە دەرپەڕیوەکـانییـەوە لەگەڵ ئەو ڕۆڵەی لە کۆمـیدیا تەلەڤـزیۆنییـە کلاسـیکییـەکە پێی درابوو، واتـە لەگەڵ ڕۆڵی "ئێـدیت"ی هـاوسـەری ئارشی، دەگـونجـا. هاوسـەرێکی زۆر بەرچاوتر لـەم ڕووەوە "باربارا بووش"ی هاوسەری سەرکۆماری پێشوویە کە بۆ ئاخافتن لەگەڵ خەڵک زۆر گەرموگوڕ بوو.

## ڕۆنانی پێڵوو

ئەگـەر ڕێک ئێسـتـا تۆ لـەگـەڵ خـۆم لە ناو پۆل بـای، داوام لـێ دەکردی لەگەڵم پشـوویەک بدەی. لە پرۆگرامی ڕوو خـوێندنەوەی تایبـەت بەپێگەیاندنی شـارەزایانی خـوێندنەوەی ڕوو، یەکێک لەسـەرگـەرمـییـە جـۆراوجـۆرەکـانمان ئەوەیە کـە بەدەوری ژوورەکـەدا بخـولێینەوە و دەمـوچاومـان لە یـەکتـر بـا بدەین. هەراش بـەبەراورد لەگـەڵ منداڵ ڕەنگە کـەمـتـر بۆی

برەخسێ بڕۆی خۆی تێک بئاڵێنێ، ئەو ٧٠٠ ڕێگە یان زیاترەی لێو دەرپۆقاندن بەکار بێنێ و هەست بەو کاریگەرییە پێکەنیناوییانە بکا کە بەهۆی بەکارهێنانی پەنجەکان بۆ بادانی ڕوو دەخوڵقێن و هەروەها چێژ لەو هەستە وەربگرێ کە بەهۆی ڕێکخستنێکی سەیری ڕێگە جیاوازەکانی سووڕاندنی لێو یان لووت بەسەر لایەکی ڕوودا دروست دەبن. ئێستا ئەگەر دەوێری هەوڵ بدە هەندێک دەموچاوت با بدەی. ئەوە بەکەڵکت دێ. لە تەمەنی منداڵیتدا پێیان وتووی: "چی تر دەموچاوت با مەدە دەنا هەتاهەتایە ڕووت قەد دەگرێ" بەڵام باوەڕ بەو قسەیە مەکە.

بەڵام تەنانەت هەراشە هەرە ڕێگەپێدراوەکانیش حەز ناکەن یەکێک لەو جۆرە ڕووبادانانە کە لە ناو منداڵاندا بەشێوەیەکی ڕووەو زیادبوون باوە، تاقی بکەنەوە. ئەگەر جارێکی تر وا ڕێک کەوت کە کۆمەڵێک مێردمنداڵ لە پشتەوەی ئۆتۆمبێلەکەت دانیشتبن لە ناو نەینۆکی بەرامبەرت کاتێک ئەو گەنجانە پێڵووی چاویان ئاودیو دەکەنەوە، سەیریان بکە «بەرەچاوکردنی ئەوەی ئێمەی هەراش وەک منداڵ جەستەمان نەرموشل نییە ئەم جۆرە نوێگەرییە ڕەنگە بۆمان مەترسیدار بێ. چەندیش لە ناخی خۆتدا جەربەزەت هەبێت من ئەم کارە بەشتێکی باش نازانم.»

هەراش بەشێوەیەکی گشتی گرینگی بەپێڵوو نادا. زۆربەمان تا ئێستا هەستمان بەوە نەکردووە کە پێکهاتەی پێڵوی مرۆڤ دوو جۆری هەیە. بەڵێ، کاتێک تۆ تێبینیی ئەوە دەکەی کە چۆن پێستی پێڵوو لە ئێسقانی برۆ بۆ خوارەوە دەنووشتێتەوە:

– یان پێڵووییەکی یەکانە دەدۆزییەوە کە تێیدا پێستەکە ڕاستەوخۆ لەئێسقانی برۆوە بەچاو بەستراوەتەوە.

– وە یان پێڵوییەکی دووانە دەدۆزییەوە کە دەنووشتێتەوە تا چرچوولۆچێک لە ناو چاڵی چاودا دروست بکا.

– وە یان ئەگەر نووشتانەوەیەکی ناوەندی بدۆزییەوە واتای ئەوەیە کە خۆت بەتەماشکردنی وێنەی ناسکۆڵە کچەکانی ناو کۆوار خەریک کردووە. لە ڕاستیدا با بگەڕێنەوە سەر وانەی ڕوو خوێندنەوە.

پرسیار: ئاخۆ ئەو شتەی بەپێڵووی یەکانەوە ناوی دەبەی، دەبێتە هۆی ئەوەی کە چاو هەروەک چاوی کەسێکی چینی فۆرمێکی بادامی وەربگرێ؟

وەڵام: ئەمە بەشە خۆشەکەیە هەرچەندە بەشێوەیەکی نموونەیی ئەگەر تۆ چاوی بادامیت



پێڵووی یەکانە



پێڵووی دووانە

ڕۆنانی پێڵوو

هەبێ شـۆڤـەی ئەم چاوە زیاتر لەوەی گـاڵتـەئامـێـز بێ بەلاتـەوە شـتـێکی زوویرکـەرە. ئەو چاوانەی بەچاوی بادامی ناو دەبرێ لە ڕاستیدا شێواو نین. لانی کەم ئەو جۆرە چاوانە لەو چاوە قـاوەییـیـە تۆخـانەی کـە بەپێـسـتـێکی ڕەنگ کـاڵ دەورە درابن، سـەیرتر نین. بەڕەچاوکـردنی ئەوەی کـە تۆ مـرۆڤـی و جـووتە چاوێکت هـەیە، ئەم چاوانە یان خـوار دەردەچن، یان شێواو. ئەمە بۆ دەم و برۆ و ئەندامەکانی تری ڕوویش ڕاستە. ئەو کاتەی کە تۆ لە بـەشـێکی دواتری کـتـێـبـدا زیاتر لە گـۆشـەی چاو دەکـۆڵـیـیـەوە، لەوە تـێ دەگەی کـە گۆشەی چاو بەتەواوی لە پێکهاتەی چاو جیاوازە.

ئەگەر تۆ ئەوەندە بوێر بی، بۆ ئەوەی بڕوانی، بەڕاستی بڕوانی، بەسـەر کلێشـەشـدا باز بدەی، واتای ئەوەیە لە بنەڕەتدا هیچ شتێکی نائاسایی لە گۆشەی چاوی ئـاوەڵە ئاسیاوی-ئەمریکییەکانتدا نادۆزییەوە. ئەوەی دەیدۆزییەوە تەنیا قەدێکی پێڵوویەکی یەکانەی چاوە. لە ئەمریکادا بەبەراورد لەگەڵ هەندێک پارچەی ئاسیادا کەسـانی خاوەن ئەم هێمایە سـەر بەکـەمـایەتیـیـەکـانن. ئەگەر تـۆ بۆ خـۆت ئەم هێـمـایەت نەبێ جـارێکی تر لـە کاتی دیتنی کەسێک کە خاوەن ئەم هێمایە بێت بەنهێنییەوە چاوی تێ ببڕە. لە کۆتاییدا تۆ هێمایەکەت لە لا ئاسایی دەبێ.

ڕۆنانی پێـڵـوو هەروەک ئەسـتـووراتیـیـەکـەی «کـە دوای ئەمـە دێـینە سـەر باسـکردنی» زانیاریی تایبەت بە بۆچوونی تۆ لەبارەی ژیان ئاشکرا دەکا.

تۆی خاوەن پێڵووی یەکانە ئەوەت لێ چاوەڕوان دەکرێ کە وەک کەسـێک پێوەندیت لەگەڵ خـەڵکی تردا توندوتۆڵ بێ. بـەپێچـەوانەوە، تۆی خـاوەن پێڵـووی دووانە، لە سـەرووی هەمـوو شـتێک پێشـبینیی دابڕانت بۆ دەکرێ. ئاخۆ ئەوە بەڕێکەوت بووە کە مێژووی ئەمریکا کە وڵاتی مرۆڤی ئازاد و سەربەخۆییەکی ڕووەو زیادبوونە، لەلایەن خـەڵکێکی خـاوەن پێڵـووی دووانـەوە لـە قـــەڵـەم درابـێ؟ ئاخــــۆ بـەڕێکەوت بـووە کـــە وڵاتێکی وەکـــو ژاپۆن کـــە دانیشـتووانەکانی خەڵکێکی خـاوەن پێڵووی یەکانەن، ئەم هەمـوو بایەخە بەپێکەوە هەڵکردن دەدەن؟

بەبۆچوونی من ئەوە بەڕێکەوت نەبووە.

شـێـوازی ژیانی کـەسی خـاوەن پێڵـووی یەکانە، ڕەنگە تۆزێک ملکەچی لەگەڵدا بـێ کە بەلای دانیشـتووە خـۆماڵییـە نموونەییـیەکانی واشنتۆن دی سی شـتـێکی ناسروشـتییـە. لە وەتەی جـاڕدانی سـەربەخـۆیی ئەمریکا کۆمەڵگە سـەرەکیترین یەکەمایەتیی ئێمـە نەبووە.

لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی ئەمریکی – ئاسیاوی بۆ چەندین نەوەیە کە لە ئەمریکادا دەژین و بەبۆچوونێکی تایبەت بەخەڵکی خاوەن پێڵووی یەکانە، کە بۆچوونێکی گرینگە بەڵام زۆربەی کات فەرامۆشکراوییە، بەشیان بەکۆمەڵگەی ئەمریکییەوە هەبووە. پرسیار لە گەورەترین تێگەیشتووانی بەتەمەنداچووی سەر بەهەر ڕەچەڵەکێک بکە، دەڵێن ئێمە سەر بەیەک خێزانین. هۆشیاریی یەکێتی لەگەڵ خەڵک بەرەو جۆرە تێگەیشتنێکی ڕۆحیی قووڵ پاڵمان پێوە دەنێ. لەگەڵ ئەوەشدا پێکەوەژیان لەگەڵ خەڵکی پێڵوو یەکانە مەرج نییە واتای ئەوە بێ تۆ ڕۆشنبیرییەکی ڕۆحیی تەواوت دەستەبەر کردبێ. لەجیاتی، ڕەنگە تۆ بەڕاشکاوی ئەرکەکانی سەرشانت بەرامبەر بەبرای گەورە و برای ناوەنجی و برای بچووکتر و خزمانی ترت «کە هەریەکەیان لە هەندێک زمانی ئاسیاویدا ناوێکی جیای هەیە و سیفاتی کۆمەڵایەتیی تایبەت بەخۆشی هەیە» بەبارێکی قورس دابنێی. لانی کەم بەگوێرەی بۆچوونی ژاپۆنناسێکی وەک "دەیڤ بێر"ی نۆکتەچی و بەو شێوەیەی لە کتێبە کۆمەڵایەتییە وەسف وردەکەیدا بەناوی "Dave Barry Does Japan"دا باس کراوە مۆسیقای "I Did It My Way – بەدڵی خۆمم کرد" کە هی "فرانک سیناترا"یە بەباوترین کاریۆک لە هەموو وڵاتدا دانراوە.

هەڵبەت ئەم شتە بۆ کەسێکی پێڵوو یەکانە بیرۆکەیەکی تازەیە. بەڵام ئەگەر هەروەک سیناترا تۆش پێڵووی دووانەت هەبێ لانی کەم لە وەتەی دوو ساڵییەوە فێری ئەوە کراوی کە کارەکان بەدڵی خۆت ئەنجام بدەی. چۆن خەڵک نەتوانێ بەدڵی خۆی هەڵسوکەوت بکا؟ و تکایە پێم بڵێ چ شتێکت دەست دەکەوێ ئەگەر کارەکان بەهەمان شێوازی خەڵکی تر ئەنجام بدەی؟

بیر لەو گۆرانییە بەهەڕمێنەی "نانسی"ی کچی "فرانک" بکەوە کە لە دەقەکەیدا هاتووە : "ئەم پووتانە بۆ پێ ڕۆیشتن دروست کراون و ئەمەش کتومت ئەو کارەیە کە بۆیان دیاری کراوە. ڕۆژێک لەم ڕۆژانە تۆ دەبی بەرێڕەوەی ئەم پووتانە".

دیسان، سەربەخۆییە دڵکەرەوەکەی خەڵکی خاوەن پێڵووی دووانە خۆی دەسەپێنێ. هەندێک جار ڕاستە، ئێمە بەپووت یان بێ پووت سنووری ئەم سەربەستییە دەبەزێنین. لەبەرئەوەی خەڵکی ڕۆهەڵات و ڕۆئاوا و خەڵکی پێڵوو دووانە لەگەڵ خەڵکی پێڵوو یەکانە تێکەڵ دەبن با بزانین ئاخۆ دەتوانین جیهانێک بخوڵقێنین کە تێیدا هەردوو شێوازەکە و سەربەستیی تاکایەتی و گەرموگوڕیی کۆمەڵایەتی ڕێزیان لێ گیرا بێ.

## ئەستووراتیی پێڵوو

ئەو کاتەی بەشادومانییەوە بەرەو هەرێمی چاو هەنگاو دەنێین شتێکی تریش چاوەڕێمان دەکا. ئەگەر تۆ چاوێکی پێڵوو دووانەت بینی دەتوانی جۆرێکی سەرنجڕاکێشی تریش ببینی کە برێتییە لە ئەستووراتیی پێڵوو. تێبینیی ئەو قەدە پێستە بکە کە ڕاستەوخۆ لەسەر برژانگەکانتە «زۆربەی کات پێڵووی یەکانە ئەستووراتیی پێڵووی نییە، بەڵام هەرگیز نابێ بڵێی هەر ئەستوور نییە.»

زانایانی توێکاری ناوێکی خۆشیان لەو شتە ناوە کە لەسەر بەشی ناوەکیی ئەستووراتیی پێڵوو بەدەر دەکەوێ. ناوەکە برێتییە لە "شانەی قوڵەپێیی. بەڵێ، لەو گەمەیەی منداڵاندا کە هەروەک پێشتر باسم کرد، تێیدا پێڵوویان ئاودیو دەکەنەوە، یاری بەم شانەیە دەکرێ.

مەبەستی ئێمەی هەراش لە وردبوونەوە لە ئەستووراتیی پێڵوو هۆی یەکجار تایبەت بەکەسانی هەراشی هەیە. بۆ ناسینەوەی ئەستووراتیی پێڵوو میکیاژ یاریدەدەرە. ئەو کاتەی لە ناو نەینۆک ڕاماوی وا دابنێ بڕیارت داوە پێڵووەکانت بەسێبەرێکی ڕەنگ شینی زەقی ناو سێتی سێبەری چاو برازێنییەوە. ئەو کاتەی چاوت هەڵدەبڕی ئاخۆ چەند لەو سێبەرە دەبینی:

– بۆ ئەوی سوودێکی تەواو لەو ڕەنگە وەربگری کە پارەت پێی داوە، پێویستە پێڵووی تەواو ئەستوورت هەبێ.

– لە ڕووی میکیاژکردنەوە، ئەگەر پێڵوویەکی تەنکت هەبێ، سێبەرەکە ئەوەندە نات گۆڕێ.

– ئەگەر پێڵووت نە تەنک و نە تەواو ئەستوور بێ، سەرت بەسێبەر لێدان مەیەشێنە، لەبەرئەوەی ڕازاندنەوەکە تەنیا لە کاتی چاونووقاندندا بەدەر دەکەوێ.

پرسیار: ئاخۆ مەبەستت چاوی خەواڵوویە «چاوی ژووری نووستن- ئاسا»؟ پێڵوی ئەستوور هەمان چاوی خەواڵوویە، وا نییە؟

وەڵام: ئەگەر توانیت کەسێکم پیشان بدەی کە پێڵووەکانی ئەوەندە بەرین بن کە جێی تەختی نووستنی «تەنانەت ئەگەر لەسەر تەنیشتیشەوە دانرابێ» لەسەر ببێتەوە، ئەو کاتە تۆ کەسێکت پێشان داوم کە گرفتێکی سروشتیی ڕاستەقینەی هەیە. بەڵام بەمەجازی



پێڵووی ناوەندی



پێڵووی تەنک



پێڵووی ئەستوور

ئەستووراتیی پێڵوو

ئەگەر بڵێین کەسێک پێڵوویەکانی ئەوەندە فراوانن کە شوێنی سیسەمی ماڵەوەی تێدا ببێتەوە، دەڵێم، بەڵێ، هەندێکمان پێڵووی وامان هەیە کە شوێنی تەختی نووستنی لەسەر دەبێتەوە. خەڵکی تر تەنانەت ناتوانێ شوێنی ڕادیۆ-سەعاتێکیش clock-radio لەسەر پێڵووی بکاتەوە. خەیاڵت فراوان بکە. دوای سەیری خۆت بکە «بەبیر بێت کە لە گۆشەیەکی ڕاستەوە سەیر بکەی» تا بزانی کام هێمایەت هەیە:

ئەگەر تۆ سەڵت بی و بەڕاستی وێڵی دۆزینەوەی هاوسەرێک بی، ئەستووراتیی پێڵوو دەشێ گرینگترین جۆری ناو ڕوو بێ کە پێویستە بیخوێنییەوە. ئەم هێمایە ئەوە بەدەر دەخات کە خەڵک چۆن پێناسەی دۆستایەتی دەکا.

سەیری ئەو کەسە سەڵتە خوێنشیرینەی ئەوبەری ژوورەکە بکە. بەدڵنیاییەوە ئەو کەسێکی سەرنجڕاکێشە، بەڵام ئەگەر بڕیار بێ، ئێوە بەیەکەوە بژین ئاخۆ تا چەند دەتوانێ لەگەڵت بمێنێتەوە؟ یان ئەگەر بەزمانە جیهانییەکەی خۆشەویستی ئەمە دەربڕین «کە بەئاشکرا خوازەکانی لەسەر خواردنە» ئاخۆ ئەو کەسە وەک هەویری بادام پێتەوە دەنووسێ یان بەو تاڵە سپاگێتییە دەچێ کە بۆ ئەوەی بزانرێ لە قەدەر کوڵاوە یان نا، هەڵدەدرێتە لای دیوار و بەئاستەم خۆی بەدیوار ڕادەگرێ؟

هەر جووتە هاوسەرێک پلەیەکی دیاریکراوی پێوەندییان هەیە، بەڵام ئەم پلەیە دەتوانێ لە نێوان دوو ئاراستەدا بێ. کۆمەڵێک هاوسەر ئەوەندە بەجووتە ئاوێتەی یەکترین کە بەردەوام دۆستایەتی گرێیان دەدا.

ئەوانی تر بەڕواڵەت هاوسەرن، ئەوان جۆرە یارییەکی دوو کەسی دەکەن کە تایبەتە بەکەسانی پێگەیشتوو. تۆی ڕووخوێنەوە بەخت یاوەرتە، بۆ ئەوەی بزانی ئاخۆ هاوژوانێکی نوێ حەزی لێیە، ڕێگە بەتۆش بدا کە لە ناو کۆشکەکەیدا لەگەڵی بژی یان نا، پێویست ناکا تۆ ئەو هاوژوانە بۆ سەر سندووقە لمێک بەری تا بزانی چۆن یاری دەکا. ئەستووراتیی پێڵووی کەسەکە لە هەر کات و شوێنێکدا ئەم ڕاستییەت بۆ بەدەر دەخات.

شتێکی گونجاوە کە پێڵووی ئەستوور نازناوی پێڵووی "ژووری نووستن ئاسای" "خەواڵوو"ەی لێ نراوە لەبەرئەوەی کەسەکە هەست بەوە دەکا کە ڕەگەز هیچ جۆرە پێوەندییەکەی بەم ژوورەوە نییە. ئەم هێمایە واتای ئەوەیە کە بەگوێرەی پێوەندییەکان پێشبینیی ئەوەت بۆ دەکرێ کە لە ژووری نووستندا ژیان ببەیە سەر. تۆ هەرگیز ناتوانی پەبەریتە بەر ژوورە ڕەسمییەکەی دانیشتن یان بۆ توالێتی تایبەت. هەر بیر لەمانە مەکەوە.

تۆ لە نزیک خەڵک و ڕاشکاو و خۆمانەی.

ئەگەر تۆ خۆت پێڵووی ئەستوورت هەبێ واتای ئەوەیە کە تۆ بۆ خۆت دۆستانەی و هەم چاوەڕێی دۆستایەتیش دەکەی. بەرەچاوکردنی پێویستییەکانی هاوڕێیەکەت ئەم گەرموگوڕییەش دەشێ پێوەندییەکی شکۆمەند یان مۆتەکەیەکی بەدوادا بێ. ئەم جۆرە کرانەوە عاتیفییە توانات پێ دەبەخشێ بۆ ئەوەی فێری وانەی پڕبەها لەبارەی سۆز و بەزەییی بی. بەڵام دەبێ خۆت لە خۆبەستنەوە بپارێزی.

داداگەییکردنی "ئۆ جێی سیمپسۆن"ت بەبیرە؟ ئەو وێنەیەی کە لە یەکەم بەیانیی دوای ڕۆژی کوژرانی هاوسەرەکەی لە سیمپسۆن گیرابوو ئاماژەی بەگۆڕانێکی خەیاڵی لە پێڵووی چەپیدا دەکرد. ئەم پێڵوویەی زۆر ئاوسا بوو و ئەمەش ئاماژەی بەپێویستییەکی زۆری ئەو بەنزیکیی عاتیفی دەکرد. پێڵووی ڕاستی بەهەمان قەبارەی ئاساییی مابووەوە.

ئەو کاتەی سیمپسۆن وتی ئەستەمە ئەو هاوسەری خۆی کوشتنبێ، من بیرم لەلای دەربڕینەکەی سەر پێڵوویە ئاوساوەکەی بوو، واتە پێڵووی چەپی کە تایبەتە بەژیانی هاوسەرییەتییەوە: «پێوەندیی من لەگەڵ کەسە ئازیزەکە یەکجار خراپە». کەواتە بەڕێکەوت بووە کە هەر ئەو کاتە هاوسەری سیمپسۆن کوژرابێ؟ بەداخەوە ڕەنگە بەڕێکەوت نەبووبێ.

پێڵووی بەردەوام ئەستوور، لەگەڵ ئەو شێوازە دۆستانەی کە هاوڕێیەتی لە ڕووی ئەو سەرۆکەی ماڵی ئەمریکای یەک خستەوە، خۆی بەرجەستە کردووە، هەرچەندە ئەم یەکخستنەوە نرخەکەی شەڕێکی ناوخۆیی بوو. بەلامەوە خۆشترین بەسەرهاتی "ئێبی لینکۆڵن" باس لەو کاتە دەکا کە کۆنفیدراڵی لە کۆتاییدا رووخا و لە لینکۆڵنیان پرسی حەز لە چ مۆسیقایەک دەکا، تا تیپەکە بۆی بژەنێ و ئەویش داوای "Dixie"ی کرد. ئەگەر ئەمە بەڕادەی پێویست ئەوە نەسەلمێنێ کە لینکۆڵن بەنیازی نزیکبوونەوە لە جەماوەر بووبێ، ئەی دەبوو لەوە زیاتر ئەو چی بکردایە؟

پێڵووی ئەستوور هەروەها خۆی لە شێوازی کەسیی "مارتن لووتێر کینگ"ی کوڕ، کە پێشەنگی مافەکانی شارستانییە بەرجەستە دەکا. "ڕۆبێرت ئەبێرناسی"ی قەشە کە سەردەمێک نزیکترین هاوڕێی پاشا بوو، خاوەنی ئەم جۆرە پێڵووە بووە. هەروەها "دۆنا شالالا"ی وەزیری خزمەتگوزارییەکانی تەندروستی و مرۆڤایەتی لە سەردەمی سەرۆک کلینتۆن هەمان هێمای هەبوو. ئەم کەسانە کە هەموویان خۆیان بۆ دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بەخت کردووە، بەو گەرموگوڕییەی کە لە پێڵووی ئەستووری چاوی ڕاستەوە

چاوەڕوان دەکرێ، مامەڵەیان لەگەڵ خەڵک کردووە. لە دنیای سیاسەتیش، من بەتایبەتی بەسەرهاتی "پاستی مینک"م بەدڵە. ناوبراو ئافرەتێکی گۆنگرێسی هاوایییە کە خاوەن پێڵووی زۆر ئەستوورە و لە هەڵمەتی بانگەشەکردن بۆ پۆستەکەی لە ڕووی داراییەوە بەیەک جاری پشتی بەستبوو بەبەشداریکردنی خەڵک و یارمەتیی خۆبەختکەران. باشترین خۆبەخشی مینک کێ بوو؟ هاوسەری خۆی.

لە جیهانی مێردەکانیشدا، کەسانی بەهرەمەند لە پێڵوو بریتین لە: "ئێڤا گێیبر" و "زسا زسا گێیبر"، کەسایەتییەکانی کاری شۆ. چەندین ساڵە کە هەردووکیان بەردەوام بەگەرموگوڕییەوە زەماوەندیان کردووە.

لە دنیای هونەردا، ئەستووراتیی زۆری پێڵوو خۆی لە شێوازەکانی "بۆریس پاسترناک"ی ڕۆمانووس و "گیکامۆ پوچینی"ی ئاوازدانەردا بەرجەستە کردووە. بەپێچەوانەوە ئاوازدانەرێکی تری ئۆپێرا واتە "ڕیچارد واگنر" پێڵووی زۆر تەنکی هەبووە. ئەو بەگونجاوی لەگەڵ ئەم هێمایەدا ئەو چیرۆکانەی هەڵبژاردووە کە تێیاندا خواوەندەکانی ئەسکەندیناڤی شەڕەمستیانە، کەچی چیرۆکەکانی پوچینی باس لەئەڤینداریيە تراژیکە کلێشەیییەکان دەکەن.

من بەتایبەتی لە تەمەنی هەرزەکاریمدا لەبەرئەوەی پێڵوویەکی لە ئەستووریدا ناوەنجیم هەبوو توانیم لە قوتابخانەی باڵا دەربچم، لەبەرئەوەی یەکەم بەشی ئۆپێرای "La Bo-heme"م بەئامێری ریکۆردەری خۆم لێ دەدا. گوێم لە گۆرانییە عاشقانەکان ڕادەگرت و دەنگیشم خۆش بوو بۆیە توانیم ئەرکەکانم جێبەجێ بکەم «هێشتاش بەدروستی نازانم لە پێنج بەشە کۆتاییيەکەی ئەم ئۆپێرایەدا چی ڕوو دەدا، بەڵام بیستوومە کە "میمێ"ی داماو دەمرێ.»

پرسیار: ئەی پێڵووی تەنک پێوەندیی بەچییەوە هەیە؟ لەبەرئەوەی دەزانم پێڵووی من تەنکە دەمێکە تووشی دڵەڕاوکێ بوومە؟

وەڵام: بۆچوونێکی "سەرەتا خۆم" خۆی لەم هێمایەدا بەرجەستە دەکا. دووبارە بیر لە پرسیارەکەت بکەوە تا سەرەداوێکت دەست بکەوێ.

سەرسڕمێنیی پێڵووی تەنک لەسەربەخۆیی دایە. گرینگ نییە خۆشەویستیت بەرامبەر بەکەسێک چەند قووڵ و دێرین بێ، تۆ هەر کەسی خۆتی و بەس. ڕێک لە سەرتاوە بەخۆشەویستەکەت بڵێ کە بەردەوام پێویستیت بەمەودایەکی عاتیفیی فراوان– شتی

تایبەت بەخۆت، ژیانی تایبەت بەخۆت، و ڕەنگە ژووری نووستنی تایبەت بەخۆشت هەبێ.

گوێرایەڵی ئامۆژگاری ئەو کەسانە بە: "مێلۆدی بیت"، ئەو ئافرەتەی کە پێڵوویەکی زۆر تەنکی هەیە و نووسەری "Co-Dependent No More – خۆپێکبەستنەوە ئیتر نا"یە و "ڕۆبین نۆروود"ی نووسەری "Women Who Love Too Much – ئەو ئافرەتانەی خۆشەویستییان قووڵ"ە «ئاخۆ ئەم دوو کەسە بەر لەوەی بەهەرمێنترین کتێبەکانیان بنووسن، پێڵوویەکانیان چ قاڵبێکیان هەبووە؟ بەلامەوە ئاساییە ئەگەر هەردووکیان پێڵووی زۆر ئەستووریان هەبووبێ.»

لە هەڵبژاردنی هاوسەر یان هاوکار بۆ کاری بازرگانی، ئەستووراتیی پێڵوو دەتوانێت یارمەتیت بدا بۆ پاراستنی ئەو سنوورە کەسییەی کە بەهۆیەوە هەست بەئاسوودەیی دەکەی. ڕەنگە سەرۆک بووش بۆ هاوسەنگکردنی پاریزگارییە پڕ سۆزەکەی «سۆزەکە لەو وتارانەی کە لە دوبەی دای بەدەر دەکەوێت نەک لە ڕوویدا. سەرەڕای ئەوەی ئەو پێڵوویەکی زۆر ئەستووری نییە چەماوەی ژێرپێڵوو و چاوی گۆشە داکەوتوو و گوێی خاوەن بازنەی ناوەکیی گەورە و برۆی کەوانەیی و کوڵمی هاوسەنگکەر و هێمای خۆبەختکردنیشی نییە» ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی دامەزراندوون کە پێڵوویان تەنک بووە یان هەر ئەستوور نەبووە، وەک "دیک چینی"ی جێگری و "کۆلن پاوڵ"ی وەزیری ناوەخۆ و "کۆندالیزا ڕایس"ی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی و "دۆناڵد ڕامسفیلد"ی وەزیری بەرگری و "تۆمی تامپسۆن"ی وەزیری کاروباری تەندروستی و مرۆڤایەتی و "کارێن ڤێنیمان"ی وەزیری کشتوکاڵ و "لۆرا بووش"ی هاوسەری. بەبۆچوونی من ئەگەر دڵی تۆ لێوانلێو بێ لە سۆز، ئەوا ئەگەر لەگەڵ ئەو کەسانە کە سنووری کەسیی ئاشکرایان هەیە هاوڕێیەتی بکەی، کارێکی ژیرانەت کردووە.

ئامۆژگارییەکی تر بۆ کەسانی پێڵوو تەنک: تەنانەت ئەگەر حەز لە مۆسیقای لادێیی ڕۆئاواش بکەی، بڕوا بەبۆچوونی ئەو گورانییانەی بەرامبەر بەژیان مەکە. بەگوێرەی ئەم گۆرانییانە ئافرەتێکی ڕاستەقینە دەبێ هەناسەساردێکی خۆ بەکەسێکی تر بەستووی گرینۆک بێ. هەر هەموو گۆرانبێژانی گۆرانیی لادێیی خاوەن پێڵووی زلی وەک "دۆلی پارتن" نین. زۆربەیان ئەستووراتیی پێڵوویان وەک هی هەرزەکارانە یان هەر ئەستووراتییەکی ئەوتۆیان نییە، نموونەش ئەمانەن: "ڤینس گیل" و "فێیس هیل" و "ویلی نێلسن" و "جۆرج سترێیت" و "شاینا تواین" و "تریشا یێروود".

خۆشەویستی بۆ کەسێک کە پێڵووی تەنک بێ و بەجێگیری خاوەنی هێمای سنووری ئاشکرا، واتە هێمای قەدی دووانەی پێڵوو بێ برێتییە لە بایەخدان بەسەربەخۆیی. ئەگەر تۆ ئەم پێکهاتەت هەبێ کەواتە دەست بکە بەژماردنی بەهرەکانت: تۆ وەک کەسێکی سەربەخۆ دەتوانی پێش بکەوی، دەتوانی بۆ خۆت خۆت پێ بگەیەنی. ئەگەر خێزاندار بی دەتوانی بێ ئەوەی تۆزقاڵێک خۆت بەهاوسەرتەوە ببەستییەوە خۆشت بوێ و سەربەخۆیی عاتیفی یارمەتیت دەدا تا لە هەموو پێوەندییەکانت خۆت بەبەرپرسیار بزانی.

پرسیار: مەبەستت لە "خۆت بەبەرپرسیار بزانی" چییە؟ بەرپرس لە چی؟ لەوەی پێڵووی تەنکترمان هەیە؟

وەڵام: با بڵێین تۆ و هاوسەرت بەنیازی چوون بۆ ئاهەنگی هالۆوین/جەژنی پاکانن. تۆ چی دەکەیە بەرت؟ ئەگەر پێڵووت ئەستوور بێ، ڕەنگە زیاتر بەدڵی خێزانت جل بکەیە بەرت. ئەگەر ئەو بڵێ: " دەمەوێ تۆ جلی "میکی ماوس" بکەیە بەرت"، ڕەنگە تۆ لە ناختدا ڕقت لەوە ببێتەوە کە گوێیەکی وەک میکی ماوست پێوە بێ، بەڵام تۆ لە سازشکردن ڕاهاتووی لەبەرئەوەی لە ڕوانگەی تۆوە "ئێمە" لە "من" گرینگترە.

کەواتە تۆ بەجلی میکی ماوس دەڕۆیە ئاهەنگەکە. بەڕاشکاوی بەرەنجامەکان دڵشکێنەرن. هەرچەندە هاوسەرەکەت لە ڕووی جل لەبەرکردنەوە بە"مینی" دەچێ، بەڵام بەدرێژایی شەو بەردەوام پەسن دەدرێی. خەڵک چاویان بەتۆ دەکەوێ و لێت تێ دەپەڕن و لە ژێر لێوەوە سرتەیان دێ: " ئەم لە کوێ و ئەو لە کوێ". کەواتە تۆی خاوەن پێڵووی ئەستوور چ وانەیەک لەم بەسەرهاتە وەردەگری؟ تۆ دڵی هاوسەرەکەت خۆش کردووە و ئەمەش لە هەموو شتێکی تر گرینگترە. بەڵام ئەگەر بێینە سەر هەڵبژاردنی جلوبەرگ تۆ شتێکی ئەوتۆ لەم بارەیەوە نازانی لەبەرئەوەی بەڕادەیەکی زۆر لە سەرەتاوە ڕای تۆ بۆ جل هەڵبژاردن وەرنەگیراوە، ئەرکی هەموو داهێنەرایەتییەکە و لێکدانەوە کۆمەڵایەتییەکان لە ئەستۆی کەسێکی تر دابووە.

بەپێچەوانەوە، ئەگەر تۆ پیاوێکی پێڵوو تەنک بی و هاوسەرەکەت بەشەرمەوە لێت نزیک بێتەوە و بڵێ: "ئازیزم، تکایە ببە بە"میکی"ی من"، ئاخۆ چ وەڵامێکت دەبێ. هەر گوێی پێ مەدە لەبەرئەوەی ئەو کەسەی دەبێ لە ژێر تووکە دەسکردەکەی مشکەکە ئارەقی لێ هەڵچۆڕێ تۆی، تۆ ئەو کەسەی کە بەخۆ بەگوێیە زلەکانت زرمەت لە دیوار دێ.

کەواتە ئەگەر وەڵامی تۆ "باشە" بێ، ئەوە تەنیا یەک شت دەگەیەنێ: کەوا تۆ بەویستی

خۆت حەز دەكەی ببی بە"میكی ماوس". بۆیە ئەگەر هەست دەكەی جلەكانت شەپوشۆڕن تەنیا دەبێ خۆت سەرزەنشت بكەی. بەهەمان شێوە لە بارودۆخی زۆر ڕاستەقینەی تر و لە بەرەنجامەكانیاندا تۆی پێڵوو تەنک لە هەڵسەنگاندنی وانەكانی خۆت زیاتر لەوەی بتەوێ دڵی كەسێكی تر خۆش بكەی، بابەتییانە بیر دەكەیەوە.

پرسیار: بەڕێوەبەرەكەم پێڵووی ئەستوور و جووتە چاوێكی لێک نزیكبووەی هەیە. هەرچەندە ئەو بایەخمان پێ دەدا، بەڵام ئەو خاوەنی ئەو توانا ڕەخنەگرییە وردەیە كە تۆ باست لێوە كرد. دروشمی لە كاردا ئەوەیە: " كەس سەر لە خۆی نەشێوێنێ. دڵنیام ئێوە كارەكانتان بەدروستی ئەنجام دەدەن". چۆن بێ ئەوەی سەرم لێ تێک بچێ، ئەم هەموو پەیامە تێكەڵانە لێک بدەمەوە؟

وەڵام: هاوسەنگكردنی ئەو ئاڵۆزییەی كە لە هێمایەكانی ڕوودا بەدەر دەكەوێ شتێكی سەختە، بەتایبەتی لە سەرەتادا، بەڵام بەتێپەڕینی كات لەجیاتی ئەوەی سەرت لێی دەرنەچێ، لێی شارەزاش دەبی. زانیاریی زیاتر وەڵامی زیاترت بۆ دابین دەكا.

سۆزی زێدەكی، یەكێكە لەم وەڵامانە. ڕەنگە بەڕێوەبەرەكەت ئەو شتە بڵێ كە كتومت مەبەستییەتی لەبەرئەوەی دەیەوێ بەسەر ئەو لایەنە ڕەخنەگرانەی كە لە چاوە لێک نزیكبووەكانی بەدەر دەكەوێ، زاڵ بێ. گرەو دەكەم كە گرفتێكی سەرەكیی بەڕێوەبەرەكەت بریتییە لە هاوسەنگكردنی ئەو گەرموگوڕییەی كە بەرامبەر بەخەڵک هەیەتی لەگەڵ لایەنێكی بەهەمان ڕادە زۆر، بەڵام لە ئاراستەدا پێچەوانە، واتە بەوردی سەیركردنی خەڵک و بەتوندی ڕەخنەگرتن لێیان.

پرسیار: كەواتە مەرج نییە ئەو دووڕوو بێ؟

وەڵام: ئەم خەسڵەتەی مەدە پاڵ، مەگەر هیچ لێكدانەوەیەكی ترت نەبێ. ئەگەر بەچاوی خراپ سەیری خەڵک بكەی بەرەنجامی ئەوتۆی دەبێ كە بەپێچەوانەی بەرەنجامەكانی دیدێكی لە بنەڕەتدا باشە بەرامبەریان. سەرەڕای ئەمەش ئەگەر كەسێک كە پێڵووی زۆر تەنكی هەیە، فێری ئەو وانەیەی ژیان ببێ كە لەسەر ڕەخنەگرایەتییە، ئەو كەسە دەشێ ببێتە ڕەخنەنەگرترین كەس كە تۆ لە ژیانتدا بینیوتە.

پرسیار: هەر بەم بۆنەیەوە ئاخۆ دووڕوویی لە هیچ شوێنێكدا خۆی بەرجەستە دەكا؟

وەڵام: جۆرێک لە دووڕوویی خۆی بەدەر دەخات. وریای ئەو كەسانە بە كە پێڵووی

چاوێکیـان ئەسـتـوور و هـی چاوەکەی تـریان تەنکە. بۆ نموونە کـەسـێک کـە پێڵـووی چەپی ئەستوور و هـی ڕاسـتی تەنک بێ، کەسێکە کـە لە ژیانی تایبەتیدا تا ڕادەیەکی زۆر پێوەستە بەکەسانی تر، بەڵام لە ئیشوکاردا بەرامبەر بەخۆی بۆچوونێکی "سەرەتا خۆم"ی هەیە.

پرسیار: ئەی پێچەوانەکەی؟

وەڵام: کـەسـێـک کـە پێـڵـووی چاوی ڕاسـتی زۆر ئەسـتـوور بێ، لەگـەڵ هـاوکـارەکـان گەرموگوڕییـەکی زۆری «یان لانی کەم ئاشکرای» هەیـە کە ئەمـەش بەپێچـەوانەی بۆچوونە "سەرەتا خۆم"ەکەی ناو ژیانی تایبەت.

من لە هـەردوو بارەکـەی ئەم جـۆرە تـایبـەتەی لاسـەنگی، وریای خـۆم دەبم. هیـچ کـام لە جۆرەکانی ئەستووراتیی پێڵـوو لە خـودی خۆیاندا سـەلمێنەری دووڕووبوونی کەسێک نین. بەڵام هەبوونی هەردوو ئاراسـتـەی پێچەوانە لە ناو یەک ڕوودا ڕەنگە ئاماژە بەساختەبوونی هەستەکان بکا.

## کاری لێکۆڵەری بۆ ڕووخوێنەوان

ئەی ئەگـەر بەدوای ڕاسـتـیـدا بگەڕێی؟ ئەی ئەگـەر بتـەوێ لەجـیـاتی هەمـوو ئەو جـۆرە تاقـیـکردنەوانەی بۆ تەڵەکـەبـازبوونی کـەسـێک بـەکـار دێن، سـوود لە خـوێندنەوەی ڕوو وەربگرێ؟

ئاخۆ هیچ هێمایەک بەمسۆگەری درۆزنبوونی کەسێکت بۆ ساغ دەکاتەوە؟

نەخـێـر، شـتـەکـە ئـەوەندە ئاسـان نـیـیـە. بەڵام ئەگـەر حـەز بکەی جـۆرێکی ئاڵۆزتری خـوێندنەوەی ڕوو بۆ کـاری لێکۆڵەری بەکـار بهـێنی دەتوانی زانـیـاریی ئێـجگار بەسـوود دەستەبەر بکەی.

ئەگەر دەربڕینی کەسێک بەشێوەیەکی زەق بەپێچەوانەی هـێمایەکی زۆر بەهێزی سـەر ڕووی بێ ئەو کاتـە درۆزنبوونی کەسـەکە بەدەر دەکەوێ. بۆ نموونە ئەگەر کەسێک نزمترین پلەی ڕێ تێـچووی چەمـانەوەی ژێرپێڵـووی هەبێ و یەکـجار دۆسـتـانە هـەڵسوکـەوت بکا، گومان لە هەبوونی پاڵنەرێکی شاراوە دەکەم. یان ئەگەر کەسێک خاوەن هێمایەکی بەهێزی دەم بێ کـە دواتر باسی لێوە دەکـەین و ئەم هـێمـایەش ئـاماژە بەوە بـکا کـە بۆ کـەسـەکـە درکاندنی نهێنییـەکان وەک ددانکێشـان بەئازارە، کەواتە ئەگەر کەسەکە بەویستی خـۆی حـەزی کـرد زانیـاریی یەکـجـار تایبـەت بدرکێنێ یان تەنانـەت «بەهەناسـە بڕکـێـوە» لە

ڕادەبەدەر هەست و سۆز بنوێنێ، من وریای خۆم دەبم.

لە خۆم دەپرسم بۆ، مەبەست لەم هەموو هەست دەربڕینانە دەبێ چی بێ؟

چەند ساڵ لەمەوبەر کاتێک پاڵێوراوێک بۆ پۆستی شارەوانیی ڤیرجینیا هەڵمەتێکی بانگەشەکردن لە ڕێی بڵاوکردنەوەی وێنەی بۆ بەڕێوە دەچوو، ئەم جۆرە زانینخوازییەی لە ناخدا وروووژاندم. ئەو پیاوەی باسی دەکەم هێمایەکی دانی هەبوو کە دارسکە (غەریزە)یەکی بکوژی پێشان دەدا کە قووڵترین ئاستی ڕکابەرایەتییە کە دەتوانێ خۆی لە ڕوویەکدا بەدەر بخات «باسی ئەم هێمایە لەو بەشەی کتێبدا کە بەناوی "چارەسەرکردنی گرفت لە پێوەندییەکان "ە دەخوێنییەوە». ئەم هێمایەی ددان لە بزەی پیاوەکەدا بەجوانی دیار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەربڕینەی لە بزەکەیدا نەخشی بەستبوو، بەتەواوی بەپێچەوانەی واتای ددانی بوو.

بزە کورانییەکەی دەیوت: "دڵنیا بن لەوەی داوای هەر شتێک بکەن بۆتانی جێبەجێ دەکەم، من ملکەچی ئێوەم، من فەرمانبەرە بێ فیزەکەی ئێوەم".

ئەگەر ڕوویەکی تر با باوەڕم بەم قسەیە دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەو جۆرە ددانانە، هەرگیز. لە ماوەی ئەو هەڵبژاردنە وا ڕێک کەوت کە لەگەڵ هەواڵنێرێکی "واشنتۆن پۆست"دا چاوپێکەوتن بکەم. لەگەڵ تێبینییەکانی ترم لەبارەی خوێندنەوەی ڕوو نەمتوانی باس لە نیگەرانییەکانم سەبارەت بەم پاڵێوراوە نەکەم کە هەروەک پێشینیان وتەنی وەک گورگێکی لە ناو پێستی مەڕ، دەیسەلماندم. هەواڵنێرەکە پێکەنینێکی دوورودرێژی کرد: "هاوڕێیەکم بانگەشەی ئەم پیاوە دەکا و ئەم پیاوە بەئاشکرا دەڵێ حەزی لە هەڵمەتی بانگەشەکردنە. هاوڕێیەکەم گێرایەوە دوێنێ گوێی لەم پاڵێوراوە بووە کاتێک وتبووی: "دەزانی لە هەڵمەتی بانگەشەکردن شەڕەکەیم لە هەموو شتێکی تری پێ خۆشترە. حەزم لە شەڕێکی خۆشە".

پرسیار: پێت باشە سوود لە خوێندنەوەی ڕوو وەربگرین، بۆ ئەوەی خەڵکی مەترسیدار لە ڕێی دۆزینەوەی ئەم دژایەتییانە بناسینەوە؟

وەڵام: لە ڕاستیدا وەڵامە یەکلاکەرەوەکەی من "نەخێر"ە. ئەگەر دەتەوێ لە کاتی مەترسیدا، زەنگی ورپاکەرەوەت بۆ لێ بدرێ، لەجیاتی ئەوەی هەر هێمایەکی ڕوو و زمانی جەستە و دەربڕین بخوێنییەوە، باشترە بۆ خۆت سوود لە خەرمانەخوێندنەوە وەربگری. کتێبی "Aura Reading Through All Your Senses –خەرمانەخوێندنەوە لە ڕێی هەموو هەستەکانتەوە" سێ تاقیکردنەوەی جیاواز بۆ ناسینەوەی درۆ، دەخاتە ڕوو کە هەموویان

زۆر وردن و جێبەجێکردنیان ئاسانە.

بۆ زۆربەی ئەمریکییەکان گەورەترین مەترسیی تاوان لە خودی تاوانبارانەوە سەرچاوە ناگرێ. گومان دوژمنێکی زۆر سەرسەختترە. خەڵک کە بۆ یەکەم جار باسی ڕوو خوێندنەوەیان گوێ لێ دەبێ، یەکێک لە باوترین پرسیارەکانیان ئەمەیە: " پێم بڵێ چۆن بزانم کەسێک درۆزنە؟ نیشانەکانی ناسینەوەی کەسی درۆزنم فێر کە".

لەم کارەساتە، ئاخافتنی خۆم لەگەڵ "ویندی" کە بڕیار بوو ببێتە قوتابی و بەڕاستی بۆ دۆزینەوەی نیشانەکان پەرۆش بوو، بەبیر دێتەوە. من بەپێچەوانەی خواستی ویندی ئەو بەشەم بۆی باس کرد کە گوڕوتینم پێ دەبەخشێ. باسم لەوە کرد کە چۆن خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ یاریدەی بدا بۆ تێگەیشتن لە قووڵاییەکانی سروشتی مرۆڤ و بۆ وەدەستهێنانی سۆز و بۆناسینەوەی گەورەترین بەهرەکانی خۆی. پاش ئەوەی من ئەم جیهانە پێشکەوتوویەی زانیاریم بۆی ڕوون کردەوە، بێزاریی لێ دەباریێ "مەبەستت ئەوەیە ناتوانین بۆ دەرخستنی چەوتییەکان سوود لە خوێندنەوەی ڕوو وەربگرین؟".

ئەگەر بۆ ویندی باسی ترس و نیشانەکانی ماڵبڕەکانم کردبا، بەئاسانی دەمتوانی دڵی خۆش بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی مەبەستم ڕۆشنبیرکردنی خەڵکە گفتگۆیەکە گفتگۆیەکی وشک بوو.

ئاخۆ دەزانی چەمکی "پێشبینیی ئاوات بەدیهێنەر" واتای چییە؟ ئەو شتەی کە بۆ خەڵک پێشبینیی دەکەین زۆربەی کات بەهۆی واقیعەوە دەسەلمێنرێ. بۆیە ئەگەر بەردەوام بەدوای چەوتیدا بگەڕێین، چەوتییەکە دەدۆزینەوە. وای لێ دێ باشترین تێبینیمان لەسەر خەڵک ئەوە دەبێ کە خەڵکەکە چەوت نین. بەپێچەوانەوە چی ڕوو دەدا ئەگەر ئێمە بمانەوێ لە ڕوودا بەدوای زانایی و بەهرەدا بگەڕێین؟ ئێمە دەتوانین ئەمەش بدۆزینەوە. لە ڕاستیدا ئەگەری ئەوەی تۆ ئەمڕۆ لەلایەن تاوانبارێکەوە هێرشت بکرێتە سەر بەبەراورد کەمە. بەڵام ئەگەر دیدێکی گوماناویت هەبێ بەدڵنیاییەوە، تاوان لە هەموو سووچێکدا بۆسەی بۆت ناوەتەوە. هەر بۆیە بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە خۆشیی ژیانت باشترین ڕێگە بۆ گرتنە بەر ئەوەیە کە لە خوێندنەوەی ڕوو، نەک بۆ دەرخستنی ساختەکاری بەڵکو بۆ شارەزایی لە ژیان سوود وەربگری.

## ٧

# لووت

تاقیکردنەوەیەکی هونەری: ڕوویەکی شادم بۆ بکێشە. خۆ دەزانی مەبەستم چییە، مەبەستم هێمای تایبەت بەدەربڕینی "بەهیوای ڕۆژێکی شاد"ە. لە هەموو شوێنێک تۆ چاوت بەم هێما بچووکە خنجیلانەیە دەکەوێ- لەسەر تێبینییە دەستنووسەکان و پەڕاوگە و وێنە نووسەنەکەکان و کلیپ ئارتی کۆمپیوتەر و هەروەها بەکێشراوی لە بەرزاییەکی شەش پێییدا لەسەر دیواری بازاڕی وۆڵمارتی ناوچەکەتان یان هەر شوێنێکی تردا دەیبینی.

چ دڵخۆش بی چ دڵتەنگ، ئەم ڕووانە هەر بزەت بۆ دەکەن. کەواتە دڵنیام تۆ دەزانی مەبەستم لە ڕووی شاد چییە. کەواتە ڕوویەکی شادم بۆ بکێشە.

ئێستا تۆ وەک ڕووخوێنەوەیەکی زیرەک و وریا وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەوە:

ئەم وێنەیە چ کەموکوڕییەکی هەیە؟

لووتی نییە، ئەمە کەموکوڕییەکەیەتی. ئاخۆ بێ لووتبوون بەڕێکەوتە؟ وا بزانم وا نییە. بۆ، ئاخۆ لووت چ واتایەکی هەیە؟

ڕوویەکی شاد، تەنیا چاو و دەمی تێدایە. ئێستا تۆ دەزانی چاو بەواتای ڕوانگەیە. هەرچەندە ئێمە هێشتا نەگەیشتووینە بەشی تایبەت بەدەم، بەڵام گرەو دەکەم تۆ دەتوانی مەزندەی واتاکەی بکەی... قسەکردن.

ڕوویەکی شاد بەشێوەیەکی ڕەمزی بۆچوونێکی هەیە و دەتوانێ قسە بکا. هیچ وتەیەکی خەڵک «گوێ» و شاردنەوەی بیرۆکەیەک «برۆ» ناتوانێ ئەم هەستە خۆشە پەرێشان بکا و ڕەنگە لە هەمووی گرینگتر ئەوە بێ کە لە ڕوانگەی ئەم ڕووخوێنەوەیە شتێکی زۆر بنچینەیی لا دراوە: ئەی ئەو ئەندامەی ڕوو کە دەربڕی کار و چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ

پارەیە؟ کەواتە با ئەم بەشە تایبەتە تا بەیانی دوا بخەین، دوای بخەین؟

نا، لووت ئەندامێکی سەرەکییە و لە ڕوودا گرینگە و تۆش کێشانەوەی لووتێکت پێ گران بوو. پاش خوێندنەوەی ئەم بەشەی کتێبیش ڕەنگە تۆ دیسان حەز بەکێشانەوەی لووت نەکەی، بەڵام زانیاریی زۆر زیاترت لەوەی جاران لەبارەی لووت دەست دەکەوێ، بەلەخۆگرتنی زۆر لەو هۆیانەی کە بۆچی لووتت هەر شێوەیەکی هەبێ هەر دەتسڵەمێنێتەوە.

## درێژیی لووت

لەبەرئەوەی ئێمە هەر ئێستا تاقیکردنەوەی لووتمان کرد، ئێستا پرسیارێکی تر لە ئارادایە:

چ جۆرە لووتێک بەلووتی ئەریستۆقراتی ناسراوە، لووتی درێژ یان لووتی کورت؟

هەڵبەتە لووتی درێژ، بەڵام ئاخۆ هەر هیچ لە خۆت پرسیوە بۆ؟

ئاخۆ لووتی درێژ هەروەک ناوی خێزانی لەگەڵ تۆماری باری شارستانی و سەروەت و سامان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە؟ ئاخۆ دەتوانی بەسەرپێیی لووتێکی "میراتی" دەستنیشان بکەی؟ بەداخەوە، ژیان ئەوەندە ئاسان نییە، بەڵام لانی کەم دیتنی درێژیی لووت شتێکی ئاسانە.

– لووتی کورت کورتە.

– لووتی درێژ بەبەراورد لەگەڵ پاشماوەی ڕوو درێژە.

– لووتی لە درێژیدا ناوەنجی ناوی ئەو لووتانە کە بۆ ناسینەوەیان بەزەبری سەرنجێکی وردەوە هەوڵ دەدەی بزانی ئاخۆ لووتەکە درێژە یان کورتە.

من بەم شێوەیە واتای لووت لێک دەدەمەوە: هەناسەدان ئەرکێکی بنچینەییی مرۆڤە. هەر کەس دەبێ بایی زیندوومانەوەی خۆی هەمان ڕادەی هەناسە لە ڕێی ئەندامی دابینکراوەوە وەربگرێ. ڕۆنانی ژمارەیەک لووت بەشێوەیەکە کە ئەم کارە ڕاستەوخۆ بەئەنجام دەگەیەنن. ئەم شێوازە نە ڕازاوانە هی لووتی کورتی کارکەرە.

ڕۆنانی لووتەکانی تر بەشێوەیەکە کە ئەم کارە داهێنەرانەتر بەئەنجام بگەیەنن. ئەوەی گرینگ بێ شێوازەکەیە. بەم پێیە کۆمەڵێک کارکەر جۆرە لووتێکی ڕازاوە و درێژیان پێ بەخشراوە. شێوازی کارکردنیش هاوتای لووتەکەیە: کەمتر پەلەکردن و زیاتر گرینگیدان بەشێواز.

لووتی کورت





لووتی درێژ



لووتی له درێژیدا ناوەنجی

درێژیی لووت

کەواتە ئەو بەهرەیەی کە لە لووتی کورتدا دەیبینی ئەو تێکۆشانەیە کە لە سەردەمی کۆن ڕەواجی هەبوو. ئەمریکییەکان سەردەمێک پەسنی شۆڕشی پیشەسازییان دەدا، بەڵام ئەمڕۆ لێی بەگومانن. بەم خەسڵەتە دەوترێ "ماندوونەناسی". گرینگ نییە ئەم خەسڵەتە چ ناوێکی هەبێ، گرینگ ئەوەیە خەڵکی لووت کورت دەڕۆنە شوێنی کارکردن و وەک دێوانە کار دەکەن. ئەوان بەپێی ڕۆتینێک کار دەکەن. ئەوان نەک تەنیا پڕۆژەی گەورە وەردەگرن بگرە بەتەواوی جێبەجێشی دەکەن. گرەو دەکەم لە هەر دەزگایەکدا کە بتەوێ لێکۆڵینەوەیەک لەم بارەیەوە بکەی، دەگەیە ئەو ئەنجامەی کە بێ ڕەچاوکردنی ناونیشانی کاری و ڕەچەڵەک و بڕی مووچە، کەسانی خاوەن کورتترین لووت ئەو کەسانەن کە بەردەوام لە هەمووان زیاتر ماندوو دەبن.

ئاریشەی ڕێ تێچوو ئەوەیە کە ماندووبوونی کەسەکە بەشتێکی ئاسایی دادەنرێ. "هەڵبەتە "جۆن" کارەکە دەکا. ئەوە هەر ئیشی خۆیەتی"، "پێویست ناکات دەسخۆشی لە"شیلا" بکەی بۆ ئەو هەموو زیادەکارییەی کە کردوویەتی. تین و تاقەتی زۆرە".

ئەگەر تۆ کەسێکی لووت کورت بی، ئەم ئامۆژگارییەم لێ وەربگرە: واز لە پلارهاوێشتن بێنە و ڕێککەوتنەکان و هەروەها ئەو داواکارییانەی بۆ بەرزکردنەوەی پاداشت پێشکێشت کردوون لە بیر خۆت بەرەوە.

زۆرێک لەلایەنگرانی چینی ناوەڕاستی کۆمەڵگە لووتی کورتیان هەبووە: "جەکۆب ریس"ی نووسەری "How the Other Half Lives – نیوەکەی تری کۆمەڵگە چۆن دەژیت" و "ویلیام جێنینگز برایان" کە بە"بۆرەپیاو" ناسراوە و "کلارێنس دارۆ"ی پارێزەری گشتی کە سەرەتا بەپارێزەری چینی کرێکار ناسرا بوو و "ساموئێل گۆمپرس"ی ڕێکخەری دامەزراوی کرێکاری و دایکە "جۆنز". "نۆرمەن ڕۆکوێل"، هونەرمەندی بەهرەمەند ئەندامێکی کۆمەڵەی لووت کورتان بوو. یەکێک لەو کەسانەی کە زۆر هەواداریمە "ئێرل وارێن"ی سەرۆکی دادپرسانە کە لووتێکی بچووکی هێندەی دووگمەیەکی هەبوو. ئەو وتبووی حەز دەکا بەدادپرسی "دادگەی جەماوەر" ناوی بهێنرێ.

سەبارەت بەو بیرۆکە خەیاڵییەی کە گوایە خەڵکی لووت کورت واتە خەڵکی تێکۆشەر ناچارن زێدە کار بکەن و قەرەبوو ناکرێنەوە بیر لە"گۆردۆ گێتی" بکەوە کە دەکاتە کوڕی "جین پۆل گێتی"ی قارەمان کە کرێکارێکی کارگەری نەوت بوو. گۆردۆ سامانی بنەماڵەی خۆی دوو ئەوەندە کرد و گەیاندییە ٣ ملیۆن دۆلار. "جوان کرۆک" ئەو بێوەژنەیە کە کاتی خۆی خێزانی "ڕێی" بوو و ڕێیش بازرگانێکی بەهەڵمەتە. ئێستا جوان لە بواری

خێرخوازیدا کار دەکا و ئەوەندە زەنگینە کە زەماڵەیەکی ١ ملیۆن دۆلاریی دابین کردووە- زۆر زیرەکی ئەگەر بتوانی ئەم زەماڵەیە وەربگری. ئەی "مایکل جۆردن"؟ ئەم سۆپەرستارەی جیهانی وەرزش چ لووتە کورتەکەی بۆ وەرزش چ بۆ ناوبژیوانیکردن بەکار بێنێت هەر کەسێکی بەهەڵمەتی لێ دەردەچێ.

دوا وتە ئەمەیە کە هیچ ئەندامێکی ڕوو بەلەخۆگرتنی لووتیش ناتوانێ مەزندەی بڕی مووچەی کەسێک بکا. کەواتە پێشبینیی ئەو مەکە کە لووتی درێژ ئاماژە بەمیراتی ئەریستۆقراتی بکا. سیفەتە ڕاستەقینەکەی تایبەت بەکارکەرێکی لووت درێژ چییە؟ بیر لە کارێک بکەوە کە دەبێ ڕۆژانە لە سەعات ٩ەوە تا ٥ لەسەری بەردەوام بێ. ئامانجەکەت تەنیا بەرهەمهێنانە و بەس. لە نیوەی ئەم ماوەیەدا بەڕێوەبەرەکەت تەنانەت بەڕووی خۆی نایەنێ کە تۆ چەند بەباشی کارت کردووە. بەرهەمی کاری ڕۆژانەت شتێکی خەیاڵییە. پێت باشە؟ بەدڵنیاییەوە باشە، بەڵام بۆ کەسێکی لووت کورت، لەبەرئەوەی ئەوە شێوازی ژیانیەتی. بەڵام بۆ کارکەرێکی لووت درێژ ئەمە وەسفی دۆزەخە.

لووتی درێژ بەهرەیەکە بۆ پلاندانان و ستراتیجیەت. نموونەیەک بۆ ئەمە، "تێری مێرفی"یە کە بەڕێوەبەرێکی فرە ملیۆنێر بواری خانووبەرە و زەوییە. نموونەیەکی تر "جانێت بۆ دانان"ی ڕاوێژکاری داراییە کە هەروەها بە"دکتۆر تایدوود"یش ناسراوە. هیچ کامیان بەچاونووقاندنێک نەبوونە خاوەنی ئەم سامانەیان. کاتێک تۆی لووت درێژ دەست بەکار دەبی پێویستیت بەکاتە تا داهێنەرایەتییەکەت بەدەر بخەی.

پرسیار: بوەستە، مەبەستت ئەوەیە لەبەرئەوەی من لووتێکی کورتی خنجیلانەم هەیە ناتوانم داهێنەر بم؟

وەڵام: هەموو کەس زیرەکی داهێنەرانەی هەیە. درێژایی لووت پێوەندی بەداهێنەرایەتیی ناو پرۆژەیەک هەیە. تۆی خاوەن لووت کورت بەدوای ئەو ڕێگەیەنەدا دەگەڕێی تا بەردەوام کارا و تامەزرۆی کارکردن بێ. تۆ لەگەڵ کات ڕکابەرایەتی دەکەی. لەگەڵ خۆشت هەر ئاوای. گەڵاڵەبوونی لیستەی هاوردەکان و پسوولەی کڕیاران و شتی تر کە ئەنجامی کارەکەی تۆن وەک سەرچاوەیەکی مسۆگەرن کە دەتوانی شانازییان پێوە بکەی.

بەپێچەوانەوە داهێنەرایەتییەکەی تۆی لووت درێژ ئەوەیە کە هەموو پرۆژەکە دێنییە بەرچاوی خۆت و لەوە دڵنیا دەبییەوە کە پرۆژەکە لەگەڵت دەگونجێ، ئینجا لە سەرەتاوە تا کۆتایی لەسەری بەردەوام دەبی. سەرچاوەیەکی شانازیکردنت ئامانجەکانتە و بلیمەتییەکەت بەپلەی دووەم دێ.

پرسیار: وایە، بەڵام ئەگەر بێو لووتێکی درێژ و برۆیەکی کەوانەیی لە یەک ڕوودا بن؟ لە ژیانمدا لەگەڵ ئەو کەسەی کە ئەم پێکهاتەیەی هەبووە، مامەڵەم کردووە «مەبەستم خۆمە.»

وەڵام: برۆ دەرخەری ئەوەیە کە تۆ تا چ ئاستێک لە ئەنجامدانی کارەکان وردی. درێژیی لووت ئاماژە بەوە دەکا کە تۆ چۆن دەروانییە کارەکەی خۆت و پێناسەی دەکەی. کەواتە ئەندامەکانی ڕووت ئەوەت پێشان دەدەن کە تۆ زیاتر حەزت لە پلاندانان بۆ تەواوی پڕۆژەکەیە، نەک تەنیا بۆ بەشێکی. کاتێک دەستت بەپڕۆژەکە کرد لە سەرەتادا داهێنەرایەتییەکەت لە لووتکە دایە، باشترە دوای ئەم خاڵە، ئەگەر بۆت بڕەخسێ، پڕۆژەکە ڕادەستی کەسێکی تر بکەی وە یان کارێک بدۆزییەوە کە تەنیا لە قۆناخی دەسپێکدا پێویستی بەتۆ بێ.

بەهۆی ئەو لووتە زۆر درێژەی کە تۆ هەتە، پێویستە بێ ئەوەی ڕەچاوی شێوازی خۆت بۆ جێبەجێکردنی وردەکارییەکان بکەی کارێک بدۆزییەوە کە بتوانی تێیدا ستراتیجیەتت بەکار بهێنێ. نموونە لەسەر ئەو کەسانەی کە کتومت وایان کردووە ئەمانەن: "جۆن جێیمز ئودوبۆن"ی باڵندەناس و "سێر فرانسیس باکۆن"ی سەردەمی ڕێنێسانس و "چیف جۆزێف"، کە یەکێکە لە ناوزەدترین سیتراژیکارە ئەمریکییە ڕەسەنەکان و "واڵتر باگهۆت"ی بەریتانی دامەزرێنەری کۆمەڵناسیی ڕامیاری.

لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی نموونەیی کەسی لووت درێژ لانی کەم بەهەمان ڕادە زۆرەکەی لایەنە کارەکییەکان لە کارکردندا چێژ لەلایەنە تیۆرییەکانی ئیشوکار وەردەگرێ کەواتە شتێکی ئاساییە کە زۆر فیزیازانی بەناوبانگ لووتیان درێژ بووبێ بەلەخۆگرتنی "لویس دی برۆگلی" و "پێ. ئێم. ئێس. بلاکێت" و "نیکۆلاس بلۆمبێرگن".

پرسیار: مەبەستت ئەوەیە کە بەپێچەوانەی بۆچوونی من، هاوسەری پێشووم کە لووتێکی درێژی هەیە، مفتخۆرێکی تەمەڵ نییە؟

وەڵام: تەمەڵی شتێکە کە پێوەندیی بەویستی مرۆڤەوە هەیە. هیچ شتێک لە ڕوودا ئاماژە بەتەمەڵی ناکا، جگە لەو چاوە زەقانەی کەسێک کە ڕەنگە داڵغەی لێ دابێ. "مارشا سیمیتار"ی ڕاوێژکاری پیشەیی لە ناوونیشانی کتێبەکەیدا " The ،Do What You Love – Money Will Folow ئەوکارە بکە کە حەزت لێیەتی، پارەش بەدوایدا دێ"، بەشێوەیەکی سەرەکی گرینگیی داوە بەپاڵنەر، پارەت دەست دەکەوێ لەبەرئەوەی تۆ تامەزرۆی کارەکەی.

ڕەنگە هۆیەکە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دۆزینەوەی کارێکی پاڵنەر دروستکەر، بۆ کەسێکی

لووت درێژی وەک هاوسەری پێشووت گرینگییەکی زۆری هەبێ. ئەو کاتەی ئەو ناتوانێ تەواوی ئامانجەکانی خۆی لە کارکردن دەستەبەر بکا، شێوازی کارکردنەکەی وەک ئەو هەویرەی لێ دێ کە زۆر بەهێواشی دەترشێ. ئەگەری نەمانی توانا بۆ بەردەوامی لەسەر کارەکە پاڵنەرە بنچینەییەکە واتە هەوێنەکە لە ناو دەبا. کارەکە هیچ ئەنجامێکی نابێ.

بەپێچەوانەوە تۆ لووتێکی زۆر کورتت هەیە کە ئاماژە بەوە دەدا کە تۆ هەر جۆرە کارێکت هەبێ لەبەرئەوەی بەتینەوە کار دەکەی کارەکە واتایەک وەردەگرێ. ئەمە بۆ تۆ خاڵێکی هێزە. بەڵام ناتوانی دڵنەرمی بنوێنی؟ با هاوسەری پێشووت لەلایەنەکانی تردا کەموکوڕیی هەبووبێ، بەڵام شێوازی کارکردنی لە هی تۆ جیاواز بووە، مەرج نییە ئەو تەمەڵ بووبێ، بەڵکو جیاواز بووە.

کاتێک تۆ لووتێکی زۆر کورت یان درێژت هەبێ بەئاسانی بەهەڵە لەو کەسانە تێ دەگەی کە خاوەن لووتی تەواو پێچەوانەی خۆتن. ئەی ئەو کەسانەی لووتێکی لە ناوەنجییان هەیە؟ بەرنامەڕێژیکردنیان دەگۆڕێ، لە پرۆژەی کورتخایەن و درێژخایەندا کار دەکەن- لە هەردوو جۆرەکەیاندا کارکردنیان باشە. بیر لە "دوکتۆر دیپاک چۆپرا" بکەوە کە نووسەرێکی بەهرەمەند و وتاربێژێکی پرچەماوەر و هەروەها وەک پزیشک، هێشتاش لە پیشەدا بەردەوامە. ئەو بەلێهاتووییەوە ئازوگوێز بەپرۆژەکان دەکا، بێ ئەوەی ماوەکە گرفتێکی بۆ دروست بکا، ئەمەش بەجۆرێک دەبێتە هۆی ئەوەی ئەنجامدانی کارەکە بەشتێکی ئاسان بێتە بەرچاو.

لەبەرئەوەی قەبارەی کارەکە بۆ کەسانی خاوەن لووتی ناوەنجی کێشەیەک ناخوڵقێنێ ئەوان ڕەنگە بەئاسانی هاوکارەکانیان بەکەسانێک دابنێن کە یان مفتخۆرن یان بەهۆی پرکارییەوە هەناسەیان براوە. و سەبارەت بەرەخنەگرتنیش...

## لووت لە لاڕووەوە

من ئەم بەشەی کتێب پێشکێش دەکەم بەو ٦٠ میلیۆن ئەمریکییە بۆڵەبۆڵکەرەی کە ڕقیان لە لووتیانە. بەئەرکی خۆمی دەزانم وەک جۆرە ڕاوێژکارێکی هاوسەرایەتی ناوبژێوانی بکەم لە نێوان لووت و پاشماوەی تری جەستەتدا. هۆیەک بۆ ئەو ڕاستییەی کە ئێمە نەتەوەیەکین کە ڕقمان لە لووتمانە پێوەندیی بەکولتوورە هونەرییە تایبەتییەکەمانەوە هەیە. بەپێی ئەم کولتوورە تاکە لووتی جوان لووتێکی شووشی کورتە. ئەگەر سەیری کارتۆنەکانی دیزنیت کردبێ مێشکت بەتەواوی ئەم بیرۆکەیەی تێدا چەسپیوە: لە خۆتەوە هەست بەوە دەکەی کە

پاکی و جوانی لەگەڵ ئەندازەی لووتدا ئاراستە دەگوڕن.

تۆ چەند فیلمت بەهەموو جۆرەکانییەوە دیوە بەر لەوەی توانیبێتت پەیامی ئەو دیمەنانە تێ بگەی کە لە لاڕووەوە گیراون؟ بۆچی لە فیلمەکاندا بەزۆری لووتی جوانی ڕێک پێشان دەدرێ؟ ئاشکرایە کە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شێوەکانی تری لووت لە شان و شەوکەتی ئەستێرەیەکی سینەماییدا نین.

ئای لەو بیروباوەڕە چەوتە. با لانی کەم ئەم بارە کولتوورییە ڕەچاو بکەین. داوات لێ دەکەم هەموو ئەو بوێرییە کە پێویستە بدەی بەخۆت با ڕاستەوخۆ بچینە ناو بابەتە وردەکەی دیمەنی لووت لە لاڕووەوە.

– ئەگەر لووتت ڕێک بوو، هیچ گازندەیەکت نابێ. ئەگەر بەپێچەوانە بوو، ئەوە فەرامۆش مەکە کە بەدەر لە نەشتەرگەرانی جوانکاریی هاونەتەوەمان، هێزی کولتووریی ئەمریکیش دژایەتیت دەکا. بەردەوام بە لەسەر خوێندنەوە، تا بزانی لووتە ڕاستەقینەکەت چۆنە.

هەر بەم بۆنەیەوە، ئاخۆ بەرێکەوت بووە کە وشەی "نۆستۆلۆجی" وشەیەکی زانستیانەیە بۆ پۆلێنکردنی نەخۆشییەکان؟ ئەم هەموو بۆچوونە خراپە سەبارەت بەلووت هۆیەکەی چییە؟ بۆچی ئێمە ناتوانین وشەی ئەرێنیتری وەک "نۆستالژیا"، واتە تامەزرۆبوون بۆ ئەو کاتانەی کە تێیدا بەڕاستی دڵت دەکرێتەوە وەک ئەو کاتەی کە بۆ دواجار لە ناو نەینۆکدا لە ناوەڕاستی ڕووی خۆت ڕاماوی، دابهێنین.

بەهەرحاڵ با دڵت بەرامبەر بەم ئەندامە سەرەکییەی ژیانت نەرم بێ. دوو نەینۆک بێنە تا بتوانی بەڕاستی وێنەیەکی ئاشکرای لووتت ببینی و بەم شێوەیە ڕێزی لێ بگری:

– ڕەنگە لووتی خۆت بەلووتێکی قیت دابنێی کە لە ڕێکییەوە بەرەوە چەمانەوە بۆ سەرەوە لا دەدا. چەماوەکە ڕەنگە زۆر بێ یان کەم و لە هەر شوێنێکدا دەربچێ لووتەکە هەر بەقیت دادەنرێ. ئەم چەماوەیە ڕەنگە لە هەر شوێنێکی نێوان ئێسقانی لووت و سەری لووتدا بەدەر بکەوێ.

– سێیەم ڕێ تێچوون بۆ شێوەی لووت لە لاڕووەوە برێتییە لە لووتی لە شێوەدا چەماوە. ئەم چەماوەیە ڕەنگە لە هەر خاڵێکی نێوان ئێسقانی لووت و سەری لووتدا بەدەر بکەوێ و لووتەکە هەر بەچەماوە دادەنرێ.

پرسیار: ئاخۆ مەبەستت لە چەماوە هەمان تاسەی سەری لووتە داماوەکەی منە؟

وەڵام: کۆمەڵێک لەم شێوە بەرەوە دەرەوە کشاوانە لەوانی تر زۆر دیارترن، بەڵام هەر

چۆنێک بێ، بەتاسە دانانرێن. تاسە تەنیا وشەیەکی ناشیرینە کە بۆ بەشەکانی لووت بەکار دێ.

لووتێکی لە ڕاستیدا تاسەدار قۆرتێکی ئاشکرای هەیە وەک ئەوە وایە کە دەنکە نۆکێک لەسەر قاپێک دانرابێ. تەنیا ئەگەر لووت بەهۆیەکی دیاریکراوە شکابێ، ئەم بارە وەردەگرێ.

پرسیار: خەریک بوو ئەم پرسیارە بکەم کە چۆن لووتێکی شکاوی وەک لووتی من دەخوێندرێتەوە؟

وەڵام: هەروەک لووتەکانی تر.

پرسیار: بەڵام لووتەکە خۆ شێوە ڕەسەنەکەی نەماوە، وایە؟

وەڵام: ئەوەی گرینگە ئەو شتەیە کە تۆ ئێستا هەتە. هەر هۆیەکی تری گۆڕانی ڕووت دەچێتە خانەی مێژووی خۆتەوە کە ئەمەش وەک مێژوو گرینگە. بەڵام پێوەندیی نییە بەخوێندنەوەی ئەو ڕووەی کە ئێستا هەتە.

شێوەی لووت لە لاڕووەوە دەرخەری تایبەتیترین بەهرەکانتە لە کارکردن کە وەک پێناسەیەکی تایبەت بەئیشوکار لەگەڵ خۆتدا دەیگێڕێ.

کەسی خاوەن لووتی ڕێک دەڵێ: " لیستەکان ئامادەن". تۆ زۆر بەڕێکوپێکی کار دەکەی و ئەو کاتە لەگەڵ کارەکەت دەگونجێی ئەگەر لە خاڵی یەکەمەوە دەست پێ بکەی و لەسەر لیستی کارەکانت بەردەوام بی و لەگەڵ بەرەو پێشڤەچوونت نیشانەی – لەسەر ژمارەی کارە بەکۆتاگەیشتووەکان دابنێی.

تۆ چەند بەختەوەری! فەرمانگە نموونەییەکانی ئەمریکا کە تێیاندا جەخت لەسەر پێڕەو دەکرێتەوە لەلایەن خەڵکی خاوەن لووتی ڕێک و بۆ خەڵکی خاوەن هەمان جۆری لووت دامەزراون.

لە ئەنجامدا تاکە ئاریشەی تۆ هەمان خەسڵەتە نابەجێیەکەیە، بەرگەنەگرتنی هەموو خەڵکی تر. خۆ تێ دەگەی مەبەستم کێیە، ئەو هاوکارە "گێلۆکانە"ت کە بەبەراورد لەگەڵ تۆ بەنزیکەیی پێ ناچێ هیچ کامیان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک کار بکەن.

بەتایبەتی ئەگەر لووتت زۆر ڕێک و درێژ بێ، «واتە ئەو جۆرەی کە من بەلووتێکی ڕێکی بەزەبری ناو دەبەم» کەواتە پێوەرکانت بۆ بەزەبربوون بەشێوەیەکی ڕووەو زیادبوون بەرزە. لووتی وەک لووتی تۆ هۆی بەرزەفڕبوونی ئەم کەسانە بووە: "چارلز لیندبێرگ" کە ڕەنگە لووتی لە ماوەی یەکەم فڕینی تاکەکەسی بەسەر ئاسمانی زەریای ئەتلانتیکدا ڕێنمایی

بووبێ، "فرانسیس کریک"ی خوێنەرەوەی کۆدی بۆماوەیی، "ئێرنێست هێمینگوای"، کە یەکێکە لە کاریگەرترین ڕۆماننووسەکانی ناو ئەدەبیاتی ئەمریکا، "سیکویا"، ئەو بلیمەتەی کە ئەلفوبێی نووسینی زمانی "Cheroke"ی دانا و "بۆکر تی واشنتۆن" کە خوێندنی بالای لە ڕێی کردنەوەی پەیمانگەی (Tuskegee) چەسپاند.

لە کۆتاییدا بەمەزندەی تۆ خاوەنی کام جۆرە لووت نەخشەی ئەو باڵەخانە یەکجار بەرزە هەوربڕانەی کە بەسەنتەری بازرگانیی جیهانیی نیۆیۆرک ناسراون، داناوە؟ ئەگەر وەڵامەکەت کەسێکی خاوەن لووتی ڕێک بووبێ کەواتە بۆ خۆت خاڵێک تۆمار دەکەی. دوو خاڵی تریش بۆ خۆت تۆمار بکە ئەگەر ناوی ئەندازیارەکەشت زانیبێ کە "مینۆرو یاماساکی"یە.

لووتی قیتش بەهەمان شێوە دەرخەری بەهرەی کارییە، بەڵام وا چاوەڕێ مەبە کەسی خاوەن ئەم لووتە زۆر بەڕێکوپێکی کار بکا. ئەم خەڵکە هەڵگری جۆرە کارتێکی پلانی کارین کە لەسەری نووسراوە: " خۆشەویستی لە ناو ئیشوکاردا. هەست و سۆز لە کاردا گرینگە". ئەگەر تۆش سەر بەم گرووپە بی لە ڕاستیدا گەورەترین بەهرەی تۆ لە کاردا بریتییە لە گفتوگۆکردن لەگەڵ هەست و سۆزەکانت. لەجیاتی پشووی ڕەسمی بۆ خواردنەوەی قاوە تۆ پێویستیت بەکاتە بۆ هەماهەنگیکردن:

"سڵاوت لێ بێ هەستی زگماکی، ئەم کارەت پێ چۆنە؟ ئاخۆ هیچ گرفتێکی تێدا دەبینی؟ ئەگەر گرفتێک هەبێ ئاخۆ چۆن دەتوانم چارەی بکەم."

گفتوگۆی لەم جۆرە ڕەنگە شێتانە بێتە بەرچاو، بەڵام شتێکی لەوە شێتۆکانیتر ڕوو دەدا ئەگەر بێو خۆت لەم گفتۆگۆیانە بێ بەش بکەی. ئەگەر بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ هەستی زگماکی پشوو وەرنەگری ئەوا وەک دەبەنگێک بەر لە تەواوبوونی پڕۆژەکانت تووشی کەمتەرخەمی دەبی. وا بزانم ڕۆحی تۆ ناهێڵێ تا ئەو کاتەی توانای داهێنەرانەی خۆت دەرنەخستبێ، واز لە کارەکە بێنێ.

تۆ ئەوەش دەرک دەکەی کە هەر کاتێک تەنیا لەسەر پێڕەو بڕۆی لەجیاتی ئەوەی وەک کارکەرێکی لووت ڕێک هەست بەگەرموگوڕی بکەی، تووشی خەمۆکییەکی زۆر دەبێ. ئەمە بەڕێکەوتە؟ بۆ خۆت سوود لەپشوویەکی تایبەت بەگفتگۆکردن لەگەڵ هەستی زگماکیت وەربگرە و بزانە چۆن هەوری خەموکی لە ئاسمانت دەرەوێننەوە. لەپڕێکدا تۆ خۆت لە ژێر ئاسمانێکی ساماڵ و لە بەردەم فێنکترین شنەبای پایزدا «یان هەر کەشوهەوایەکی تر کە خولیای بی» دەدۆزییەوە.

هەر بەم بۆنەیەوە، ئاخۆ هەستت بەوە کرد کە من لە وەسفی ئەم شێوە تایبەتەی لووتدا بەهرەیەکی شاعیرانەم بەدەر خستووە؟ ئەگەر هەستت پێی کردبێ هۆیەکە ئەوەیە کە بۆ خۆت هەستێکی شاعیرانەت هەیە. یان ڕەنگە منت ناسیبێتەوە لەبەرئەوەی هێمای لووتی من بۆ کاری پشتبەستوو بەهەستی زگماکی یەکێکە لە هێمایە زۆر تۆخەکان.

بۆ کارکردنیش کرێکارە لووت قیتەکان، پێویستیان بەپەسندان هەیە تا بەباشترین شێوە کار بکەن، ئێمە بەڕادەیەکی زۆر ڕەخنەمان لێ دەگیرێ. بەڵام لەبەرئەوەی عاتیفییانە کار دەکەین لە ئالوگۆڕکردنی هەست و سۆز دەستبالاین. نموونە بۆ کەسانی خاوەن ئەم هێمایە بریتین لە: "تۆم هەنکس" و "مێری تێیلر مۆر"ی ئەکتەر و "شاری لویس" کە بەردەوام سەماپێکەری لێبووک بووە و "ئەندرێس سیگۆڤیا"ی گیتارژەن و "ویلا کێیسر"ی ڕۆماننووس. ئەو کاتەی "جۆن دینڤر"ی گۆرانیبێژی کۆچکردوو پرسیاری لێ کرا کە ئاخۆ سەرچاوەی بێ هاوتابوونی کارەکەی چییە، وتی ئەو تەنیا گۆرانی بەسەر هەستی خۆشی ژیاندا دەڵێ. سامان و هەروەها ناوبانگە زۆرەکەی "نۆرمەن کازنز" لەو تێگەیشتنەوە سەرچاوەی گرتووە کە پێکەنین دەتوانێ بەرەنگاری لۆجیکە شوومەکەی نەخۆشی ببێتەوە. "لویس هێی"ی سەرکردەی فەلسەفەی سەردەمی نوێ کە نووسەری "Heal Your Body – تیماری جەستەی خۆت بکە"یە یارمەتیی ملیۆنها خەڵکی داوە تا لەبری ئەوەی تەنیا نەخۆشییەکە دەستنیشان بکەن لێی تێ بگەن.

ئەگەر خودی کارەکە لێک بدەینەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە خەڵک بەرێگەی تریش دەتوانن خۆیان لە بەتەنیا گرینگیدان بەکارەکەی داببڕێنێ. ئەم داهێنانە لە لووتی چەماوەدا خۆی دەردەخات. ئەگەر لووتت چەماوە بێ لەسەر کارتی کاریت نووسراوە: "کەسی داهێنەری ئامادەی کارکردنە". شتەکە بەم شێوەیەیە واتە چەندی چەماوە دەرەکییەکەی لووت گەورەتر بێ، تۆ ئەوەندە زیاتر بەهرەت بۆ «و پێویستیشت بە» کاری داهێنەرانە زیاترە.

پرسیار: بوەستە...

وەڵام: پرسیارەکەت لەبارەی لووتی خۆتە؟ پێ دەچێ لووتت پێویستی بەهیچ یارمەتییەکی من نەبێ.

پرسیار: با لە سەرەتاوە دەست پێ بکەینەوە. لووتم زۆر چەماوەیە و خۆشم فیزیازانم. مەبەستت ئەوەیە دەبێ لەمەودوا من ئامێرێکی ئۆکۆردیۆن و کۆمەڵە ڕەنگێکی چەور لەگەڵ خۆمدا بگێڕم؟

وەڵام: مەرج نییە داهێنەرایەتی ئەم شێوازە ئاشکرایانە وەربگرێ. داهێنەرایەتی، واتای ئەوەیە کە تۆ چارەسەرێکی بێ هاوتا بۆ گرفتێک بدۆزییەوە. تۆ سەرچاوەکانی بەردەستت دەبینی و دەشزانی ئامانجەکانت چین. داهێنەرایەتییەکەت لەوەدایە کە ڕێگەیەکی بلیمەت بۆ بەکارهێنانی سەرچاوەکانی بەردەستت بدۆزییەوە. ئابووریناسان ئەمە بەزیاترکردنی زرینگەزرینگی ناوگیرفان ناو دەبەن. تۆ کە فیزیازانی ناوی بنێ ڕێکوپێکی.

پرسیار: مەبەستت ئەوەیە من کە لووتم چەماوە نییە، هەرگیز ناتوانم داهێنەر بم؟

وەڵام: لە ڕاستیدا هەر شێوەیەکی لووت جۆرە داهێنەرایەتییەکی تایبەتی هەیە. و لە بیرت نەچێ کە ئەم جۆرە هێمایە تەنیا پێوەندیی بەشێوەی کارکردنەوە هەیە. داهێنەرایەتیی تۆ لە بوارەکانی تر لە برۆ و تاڵە موو و ئەندازەکانی لێو و شوێنەکانی تری ڕووت دەرکەوتووە.

هۆی ئەوەی من کەسانی لووت چەماوەم بەوە جیا کردوە کە کارەکەیان داهێنەرایەتییەکی تایبەتی تێدایە ئەوەیە کە ئەگەر تۆش ئەم هێمایەت هەبێ ناچاری داهێنەرانە کار بکەی و ئەمەش شتێکی ئارەزوومەندانە نییە. واتە ئەگەر بتەوێ لە کارەکە ڕازی بی، دەبێ داهێنەرانە کار بکەی.

پرسیار: کەواتە لووتە ڕێکەکەی من کە شایەنی "فەرمانگەکانی ئەمریکا"یە چ جۆرە داهێنەرایەتییەکی لەگەڵ دایە؟

وەڵام: تۆ بۆ کەوتنە سەر سککەی سەرکەوتن و لەسەر مانەوەی، سوود داهێنەرایەتییەکەت وەردەگری. ئاخۆ چۆن دەتوانی بەناو ئەم هەموو پێڕەوەدا وەک گوللە ڕەت ببی؟ ڕۆژانە چەند جار ئەمە دووبارە دەکەیەوە؟ تۆ بۆ هاندانی خۆت داهێنەرایەتی بەخەرج دەدەی.

داهێنەرایەتیی لووتی قیت لەوەدایە کە کەسەکە ڕێگەی ئەوتۆ دەدۆزێتەوە تا بەهۆی واقیعەوە کار بەهەستی زگماکیی خۆی بکا.

بەپێچەوانەوە داهێنەرایەتیی کەسی لووت چەماوە برێتییە لە گرینگیدانێکی زۆر بەسەرچاوەکانی بەردەست. ئاخۆ بەیەکەوە بەستنەوەی کام خەڵک و کام بەهرە و کام شتومەک یان چەمک بەشێوەیەکی سەرووئاسایی سوودی دەبێ؟ ئاخۆ چۆن بتوانی کارەکەت بەڕێگەیەکی ئەوتۆ بکەی کە پێشتر هەرگیز تاقی نەکرابێتەوە؟ مۆسیقاران داهێنەرایەتیی خۆیان خەرجی ڕێگەکانی لەراندنەوەی دەنگ دەکەن، سەماکەرانیش بۆ بنەماکانی سەما بەکاری دەهێنن و کارەکە بەم ڕەوتەیە. پێ دەچێ ئەو لووتانەی کە بەرەو

دەرەوە چەماونەوە هەستیارییەکی تایبەتیان هەبێ بەرامبەر بەهەر شتێک کە لە دەرەوە بێ و بەکەڵکی پیشەی هونەرمەندێک بێ.

بیر لە"پابلۆ کاسالس"ی چیلۆژەن و "ئارۆن کۆپلاند"ی ئاوازدانەر و "ئەگنێس دی میلێر"ی سەمادانەر و "میخاییل شۆلۆخۆڤ"ی ڕۆمانووس و "ئاریسا فرانکلین"ی گۆرانبێژ و گۆرانیدانەر بکەوە. کەسێکی تر کە ناوبانگێکی هاوتای ئەمانەی هەبێ "گۆردن پارکس"ە کە داهێنەرێکی دەستباڵای جوانییە و نەک تەنیا مۆسیقارێکی شارەزایە بگرە شاعیر و وێنەگریشە.

پرسیار: ئەگەر لووتێک بەڕاستی چاڵی هەبوو نەک چەماوە، ئەوە واتای چییە؟

وەڵام: مادام کارەکەت بەپچڕپچڕی بەرەو پێش دەچێ. لە هەر پرۆژەیەکدا کە وەری دەگری لانی کەم یەک جار داهێنەرایەتییەکەت خۆی بەدەر دەخات.

کاردانەوەکەت ئەوەیە کە خەڵک بەئاسانی لێت ڕازی نابێ، هەڵبەتە ڕێی تێ دەچێ کە تۆ "دووک ئیلینگتۆن"ێکی ترت لێ دەربچێ.

پرسیار: ئاخۆ بۆ من کە فرۆشیارم نەشتەرگەرییەکی جوانکاریی لووت بۆ ئەوی لووتم ڕێک بکا هیچ سوودی دەبێ؟

وەڵام: ڕەنگە. وا باوە کە شێوەکانی لووتی بەدەر لە لووتی ڕێک بەشێوەیەکی نابەجێ بە"ڕەگەزی" ناو دەبردرێن، کە ئەمەش بۆ میللەتێک کە هۆی شکۆمەندییەکەی فرەنەتەوەبوونیەتی، بەڵام ڕەگەزپەرستی هەر تێدا بەربڵاوە بۆچوونێکی سەیرە. هەڵبەتە ناونانی لووتی بەدەر لە لووتی ڕێک بە لووتی "ئیتاڵی" و لووتی "پۆڵەندی" کارێکی دوو ئەوەندە نابەجێیە لەبەرئەوەی خەڵکی سەر بەهەر گرووپێکی ڕەگەزی ڕەنگە لووتی چەماوە یان قیتیان هەبێ، بەڵام کێ دەڵێ ڕەگەزپەرستی شتێکی بەجێیە؟

بەهەرحاڵ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە خاڵە لاوازەکانی ئەو کەسانەی "باشترین" لووتیان نییە، ئاشکرایە. ئەوەی کەمتر ئاشکرا بێ ڕاستییەکی ترە. ئاخۆ ئەمریکییەکان فێری چ بنەمایەکی کارکردن کراون. ئێمە فێری ئەوە کراوین کە ڕێز لە شێوازێکی کاری بگرین کە پێڕەوی هەبێ "واتە شێوازە کەسییەکەی کەسێکی لووت ڕێک".

کەواتە ئەگەر تۆ خەسڵەتە دەرەکی و دەروونییەکانی کەسێکی لووت ڕێکت هەبێ، شێوەی کارکردنت ڕەنگە لەلایەن کەسانی ترەوە بەشێوە"ڕاست"ەکە ناو ببردرێ. شێوازە کارییەکانی تر کە لەلایەن خەڵکی خاوەن شێوەی تری لووت بەرجەستە دەکرێن ڕەنگە بەئاسانی پەسند نەکرێن. لەگەڵ ئەوەشدا هەر کاتێک داهێنەرایەتییەکەی کەسانی لووت

چەمــاوە و لووت قــیــتــە دەرک کــرا ئەو کــاتە خــەڵک لــەوە تێ دەگــەن ئەم لووتــانە ئامــاژە بەشێوازی کاریی زۆر تایبەت و زۆر بەسەنگ دەکەن.

کەواتە پێش ئەوەی خۆت بگەیەنییە نزیکترین نەشتەرگەری جوانکاری پێم باشە حەز لەو لووتە بکەی کە ئێستا هەتە. نرخی بەهرەکانت بزانە. ئەگەر بەهرەکانت بەدروستی بەکار بێنی، زۆر باشتر لە جاران لەوە تێ دەگەی کە خوا شتی بێ واتا ناخوڵقێنێ.

## بەشی ناوەکی لووت

لووت لە چی پێک هاتووە؟ گۆشت و خوێن و کرکراگە هەروەها جار بەجاریش چڵمی تێدایە و ئەگەر تۆ هەوادارێکی "دێیڤ بێری" بی یەکەم جار بیرت بۆ ئەم چڵمە چووە. هەر شتێک لە ناو مێشکت خۆی قوت کردبێتەوە دڵنیام ئەو شتە یەکێک لە پڕ واتاترین جۆرەکانی لووت واتە ناواخنی لووت نەبووە. ئەم ناواخنە ئاماژە دەکا بەبڕی گۆشتی دەوری لووت لە ئێسقانی لووتەوە تا سەری لووت کە لە لاڕووەوە بەدەر دەکەوێ.

پرسیار: مەبەستت پاناتیی لووتە؟

وەڵام: پێم باشترە وشەی "پان" بەکار نەهێنرێ لەبەرئەوەی هەڵگری زۆر واتای زێدەکییە کە پێوەندییان بەکلێشەی ڕەگەزییەوە هەیە. سەرەڕای ئەوەش وشەی "پان" زۆر ورد نییە. ئەوەی گرینگە ئەوەیە کە ئاخۆ تەواوی بەشەکانی لووت بەهەمان ڕادەی ناوچەی ئێسقانی لووت گۆشتن؟ ئاخۆ بڕی ئەم گۆشتە، ئەم ناواخنە، لە سەرەوە بۆ خوارەوە کەم دەکا یان زیاد؟ جگە لەمەش چەمکی پاناتیی ڕەچاوی ئەو جیاوازییە ناکا کە بۆ ئەو کەسانەی لووت دەخوێننەوە زۆر گرینگە: کۆمەڵە لووتێک لە ناوەڕاستدا ئێسکێکی باریکیان هەیە. ئەگەر لووتێک ئەم ئێسکەی تێدا دیار بێ ناواخنەکەی تەنکە.

– لووتی ناواخن تەنک ئەو لووتەیە کــە تێــیــدا ئێــسکی لووت زۆر دیارە و دەتوانی بەنزیکەیی بەئێسکێکی ڕووتی دابنێی.

– لووتی ناواخن ئەستوور ئەو لووتەیە کە ئێسکەکەی نابینرێ، بەڵام لەجیاتی بەرینیی لووت دیار دەبێ.

– ئەگەر لووتێک لە ناوچەی ئێسقانیی لووتەوە باریک بێ و پاشان کە بۆ خوارەوە دێ، بەرین ببێتەوە لووتێکی ناواخن سێگۆشە پێک دێنێ. هەندێک جار ئەمە بەزەقی دەر دەکەوێ و هەندێک جاریش ئەوەندە دیار نییە، بەڵام تۆ تا ئێستا لە دینی زۆرەکان

ڕاهاتووی و دەتوانی شارەزاییەکەت بۆ ئەم هێمایە و هەرجۆرێکی تری ناواخنی لووت بەکار بێنی.

پرسیار: هەمیشە پێم وابوو کە لووت زلبوون جۆرە قەڵەوییەکە کە لە ناو خێزاندا بڵاوە دەبێتەوە. ئاخۆ مەبەستت ئەوەیە کە بەڕاستی ئەم "ناواخنە" واتایەکی هەیە؟

وەڵام: لەبەرئەوەی ئەمە بەشێکی رووی مرۆڤە کەواتە واتای هەیە. ئەگەر لە ناو خێزانتدا هێمایەکی هاوبەش هەبێ بزانە کام ئەندامانەی خێزان هەیانە و کامانەیان شێوەیەکی تریان هەیە؟ ئەگەر ئەندامێکی خێزانت بەڕاستی هێمایەکی وەک هی تۆی هەبێ هەردووکتان شێوازێکی کەسیی لێکچووتان دەبێ کە پێوەندی بەو هێمایەوە هەیە. کەمتر ڕێک دەکەوێ کە لێکچوونێک بدۆزرێتەوە و ئەمەش بەپێچەوانەی بۆچوونی خەڵکە.

پرسیار: کەواتە من کە ئەم هەموو ساڵانە وتوومە لووتی من و باوکم کتومت وەک یەکە، هەڵە بوومە؟

وەڵام: زۆربەی کات ئەندامانی خێزان بەو ڕادەیەی بۆی دەچن لێکچوونی جەستەییان نییە. بەبەراوردکردنی وێنەکانی باوکت و شێوەی لووتی خۆت ئاخۆ دەتوانی جیاوازییەکان ببینی؟ من دەڵێم ڕەنگە لووتی باوکت لە لارووەوە بەهی تۆ بچێ نەک لە درێژییەکەیدا. هەروەها ڕەنگە ناواخنی لووتی تۆش لە هی ئەو جیاوازە. ناواخنی لووت دەرخەری ئەوەیە کە ئاخۆ تۆ حەز دەکەی لەگەڵ چەند کەس لە پڕۆژەیەکی کاریدا بەشداری بکەی. ئاخۆ لە چ بارێکدا هەست بەئاسوودەیی دەکەی؟

ئەگەر تۆ حەز بکەی بەتەنیا دەست بەپڕۆژەیەک بکەی و بەتەنیا لەسەری بەردەوام بی و بەتەنیاش کۆتایی پێ بێنی ئەگەری زۆرە کە تۆ کەسێکی خاوەن لووتی ناواخن تەنک بی. ئەمە شێوازێکی تایبەتی سەربەخۆییە لە کاردا و تێگەیشتنی ئەم لایەنەی شێوازی کەسی دەتوانێ یاریدەت بدا بۆ ئەوەی باشترین سوود لە بەهرەیەکی سەرەکی وەربگری. بەڵام تەنیا یەک گرفتت هەیە، چی دەکەی ئەگەر سەرکارەکەت بەسەرتەوە هەڵوەستێ و لەگەڵت دەست پێ بکا:

"هێشتا کارەکەت تەواو نەکردووە؟ کەی ئەم کارە تەواو دەبێ؟ ئاخۆ بەو شێوەیەی پێم وتی کار دەکەی؟"

ئاح، خەڵکی لووت تەنک حەز لە کەڵە سەرکار ناکەن. ئەم قسەیە بەهەر کەسێک بڵێ کە بیەوێ بەوردی سەرپەرشتیت بکا:

"من ئەگەر دەستم بەپرۆژەیەک کرد یەکێک لە گەورەترین ئەو کەسە خۆهاندەرانەم کە لە ژیانتدا بینیوتە. زۆر لە تۆ زیاتر دەتوانم لە خۆم کار بکێشم. بەجێم بێڵە تا بەباشترین شێوە کار بکەم".

ڕەنگە ئەو قسەیەش زیاد بکەی کە چاودێریکردنت هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ قامچی لێدان لە ئەسپێکی تۆپیو نییە تەنیا ئەوە نەبێ کە لەباری تۆدا ئەوەی قامچی لێ دەدرێ ئەسپێکی پێشبڕکێیە. خۆشبەختانە "جوان گۆتێنبێرگ" لە پیشەکەیدا ڕووبەڕووی ئەم کێشەیە نەبووبووە. هەرچەندە دۆسییەکانی کاروباری ناخۆیی ٥٠٠ ساڵ پێش وەک بلوور ڕوون نین، بەڵام وا بزانم باشترە وا دابنێین کە ئەو کاتەی ئەم پیاوە گەورەیە ئامێری چاپی داهێناوە کەس بەسەرسەرییەوە هەڵنەوەستاوە.

"گریتا گاربۆ"ی ئەکتەر لووتێکی گونجاوی هەبوو بۆ ئەوەی قسەی دڵی تۆ، واتە وتە بەناوبانگەکەی بدرکێنێ: " دەمەوێ بەتەنیا بم". لە ژیانی واقیعیشدا گاربۆ لە ناو چۆڵگەی خۆیدا کۆچی دوایی کرد. بەڕێکەوت بووە؟ نەخێر، بەڵام پێویست بەنیگەرانی ناکا. گاربۆ هێمای تری لە ڕوودا بوو کە پێوەندییان بەیەکجار دوورەپەرێزییەکەیەوە هەبوو. تەنانەت ئەگەر ئەم هێمایە لە تۆدا هەمان ڕادە زۆرەکەی گاربۆی هەبێ، ئەستەمە پاشماوەکەی ڕووت بە هی ئەو بچێ. مردنی گاربۆ بۆ سینەما خەسارێک بوو، بەڵام تۆ دەتوانی وانەیەکی دەروونی لێ وەربگری.

لووتی ناواخن ئەستوور لە ئاراستە پێچەوانەکەی تر دایە. ئەگەر وەسفێکی "کارە دۆزەخ"یەکەی تۆ بکرێ تەنیا چوار وشە پێویستە: لە زیندانی تاکەکەسیدا بوون.

بەڵام ڕۆژی خۆشی کارکردنت لەگەڵ خەڵکی تر دایە. بۆچی پێویستت بەخەڵکە؟ خەڵک وزەت پێ دەبەخشن. بەبێ خەڵک لەگەڵ کارەکەت وشک هەڵدەگەڕێی. نموونەیەک بۆ کەسی خاوەن ئەم هێمایە "جاک کانفیلد"ە کە بەهاوبەشی بەهەرمێنترین کتێبی " Chiken Soup for the Soul –شۆربای مرشک بۆ ڕۆح"ی نووسیوە کە نە بەدەستووری ئامادەکردنی خۆراک و نە تەنانەت بەکتێبیش دەچێ و زیاتر لە هەردووکیان بەبڵاوکراوەیەکی بێ کەموکوڕیی ڕیستۆرانتێکی زنجیرەیی دەچێ کە باس لە پیاوێک دەکا کە بەدڵێکی لێوانلێو لە خۆشەویستی بۆ خەڵک دەچێتە سەرکار.

ئەگەر گۆشتێکی زۆر تاسەری لووتت دابگرێ، تۆ یەکێک لەو کەسە دەگمەنانەی کە لە ڕاستیدا حەز دەکەی لەگەڵ لێژنەیەک دەست بەپرۆژەیەک بکەی. نموونەیەک بۆ ئەمە "ماریا ڤۆن تراپ"ە کە " The Sound of Music –دەنگی مۆسیقا" باس لە سەربووردەی ئەو دەکا.

ئەو لەگەڵ هەموو ئەندامانی "Do're-mi"دا کە گۆرانیبێژن لێژنەی گۆرانیبێژانی خۆی دامەزراند.

تۆی خاوەن لووتی ناواخن سێگۆشە، حەز دەکەی بەتەنیا پرۆژەکان دەست پێ بکەی، بەڵام کاتێک پرۆژەکان دەکەونە گەڕ زیاتر هەست بەئاسوودیی دەکەی ئەگەر کارەکە بەکۆمەڵ بکەی یان بەکەسێکی تری ڕاسپێری. بەڵام ئاخۆ لەگەڵ کامیان هەست بەئاسوودەیی دەکەی؟ سەیری بەرینییە بەراوردییەکەی لووتت بکە. لووتێک کە سێگۆشەیەکی زەقتری هەبێ دەرخەری ئەوەیە کە تۆ بەڕاستی زۆر حەزت لە کاری بەکۆمەڵە.

پرسیار: لووتی من شتێکی سەیرە. ئێسکەکەی لە ناوەڕاستیدا جوان دیارە بەڵام هەردوو لای لووتیشم زۆر گۆشتن. چۆن لووتێکی ئاوا، کە هەم تەنک بێ و هەم ئەستوور، دەخوێندرێتەوە؟

وەڵام: ئەم دژایەتییە دەرخەری جیاوازیی نێوان ئەو هەستەیە کە لە ناو خەڵکدا دەیورووژێنی لەگەڵ لایەنێکی زۆر تایبەتتری شێوازی کەسیت. وای بۆ دەچم شتەکە بەمجۆرە بێ: تۆ وا لە خەڵکی تر دەکەی بەکەسێکت دابنێن کە حەزی لە کاری بەکۆمەڵە و تا ڕادەیەکیش ئەم خەسڵەتەت هەیە. بەڵام تۆ لە ناختدا زیاتر حەزت لێیە بەشێوازی خۆت کار بکەی و ئەمەش ناکۆکییەکی عاتیفی لە دەروونتدا دروست دەکا. بەڵام ئەگەر بۆ دڵدانەوەش بێ، بزانە کە ئەم جۆرە ئاڵۆزییە ڕەنگە بەسوود بێ لەبەرئەوەی تۆ لە بەرچاوی خەڵک کەسێکی کە حەزت لە کاری بەکۆمەڵە و کاتێک بەتەنیای بەدڵی خۆت کار دەکەی و کەس هەست بەوە ناکا کە تۆ ئەم لایەنە بەهێزەی دوورەپەرێزیت هەیە، وایە؟

پرسیار: وایە. تەنیا ئەو کاتەی کەسی تری ناو گرووپەکە نەمبینێ بەئەسپایی بەپێی شێوازی خۆم کار دەکەم. وا بزانم ئێستا نهێنییەکەمم درکاند.

## گۆشەی سەری لووت

بەدڵنیاییەوە تۆ دەزانی کە هەڵسووڕاندنی سکەیەکی دایم چ کارامەییەکی دەوێ. ئێستا ئێمە بەنیازین بۆ فێربوونی شارەزاییەکی وردتر هەوڵ بدەین، واتە لەسەر سەری لووت بخولێینەوە. هۆی هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لەم شارەزاییە ئەوەیە کە سەری لووت سەبارەت بەدوو لایەنی تەواو جیاوازی ژیان زانیاریمان پێ دەبەخشێ. کەواتە ئێمە سەرەتا لە لاڕووەوە سەیری سەری لووت دەکەین تا گۆشەکەی ببینین و بەم شێوەیە دوا هێمای

لووت کە پێوەندی بەئیشوکارەوە هەبێ، دەخوێنینەوە. پاشان بەدەستوبردی هەڵدەسووڕێینەوە سەر وێنەی لووت لە ڕووبەڕوووە تا ئەو زانیارییانە بخوێنییینەوە کە لە ناو خودی هەمان سەرە لووتدا جێگیرن و پێوەندییان بەپارەوە هەیە «هەڵبەتە تۆ دەزانی کە سەری لووت پێوەندی بەپارەوە هەیە، وا نییە؟»

بۆ زانینی گۆشەی سەری لووتی خۆت پێویستیت بەدوو نەینۆکە. سەری لووت لەو شوێنە دایە کە تێیدا لووت تۆپەڵ دەبێ. بنەوبانی لووتت لە نێوان هەردوو کونە لووتەکان دایە. بۆ ئەوەی گۆشەی سەری لووت دەستنیشان بکەی بەراوردی نێوان بەرزیی سەرەکە و بەرزیی بنەوبانەکە بکە.

– ئەگەر سەرەکە بەرزتر بوو کەواتە سەری لووتت قیتە.

– ئەگەر بنەوبانەکە بەرزتر بوو کەواتە یان تۆ بەسەراوژێری دانیشتووی یانیش سەری لووتت شۆڕە.

– هەروەها ئەگەر سەرت «یان لووتت» هەڵکرێنی و نەزانی سەری لووتت چ گۆشەیەکی هەیە ڕەنگە سەری لووتت و بنەوبانەکەی هاوئاست بن.

گۆشەی سەری لووت پێوەندی بەبەرنامەڕێژی و بەتایبەتی پێوەندیی بەهەنگاوە کارییەکانتەوە هەیە. ئەو گۆرانییەت بەبیر دێتەوە کە ناوی لووتی قیتی تێدا هاتووە؟ خۆ دەزانی مەبەستم کامەیە: "...Turn Five Foot Two ...Eyes of Blue ...Turned up Nose ... down Nose" و درێژەی گۆرانییە منداڵانەکە بەم شێوەیەیە: Has Anybody Seen ... My Gal?" لە کوێ بووم؟ بەڵێ، شێوەی قیت دەرخەری وتەی مەند و هەنگاوی کاریی ئارەزوومەندانە و ژیانێکی هەردەم خۆشە. من مەبەستم ئەوەیە ئەگەری ئەوە هەیە کە شاردنەوەی نهێنییەکان کارێکی سەخت بێ «دەزانی سەری لووتی من چ گۆشەیەکی هەیە؟»

جارێک خەریکی واژووکردنی کتێب بووم. ئافرەتێک کە خۆی هەروەک کارمەندی کتێبخانە ناساند بەکورتی و سەرنجڕاکیشی باسی لەوە کرد کە زانینخوازی گرینگترین سیفەتێکە مرۆڤ لە ژیاندا دەتوانێ هەیبێ. ئەوەی وای کرد قسەکەیم دوو ئەوەندە پێ خۆش بێ گۆشەی سەرە لووتی بوو کە قیتبووەترین گۆشەی سەرە لووت بوو کە دیمبوو.

پرسیار: نازانم ئەمە چ پێوەندییەکی بەهەنگاوی پیشەییی ئارەزوومەندانەوە هەیە؟

وەڵام: با نموونەیەک وەربگرین. وا دابنێ کە تۆ لە بەشێکی گواستنەوەی گشتیی

شارێکی زەبەندا کار دەکەی. تۆ گەنج و ئایدیالیستی. هەروەک هەموو هاوکارەکانت تۆش ئۆتۆمبێلەکان بەبزوێنەری قێزەونی ئالّوودەکەری ژینگە دادەنێی. ئەگەر کەس دیار نەبێ تفیان پێدا دەکەی.

بەلاّم جیاوازییەکی تۆ لەگەلّ کەسانی تری ناو فەرمانگەکەت لەسەرە لووتە زۆر قیتەکەتدایە. لە زانینخوازیدا تۆ سەرکردەی. هاوکارانت پلەی گەورەترین وتوواتکەری ناوفەرمانگەیان پێت بەخشیوە. کەواتە تۆ یەکێکی لە یەکەم ئەو کەسانەی کە دەزاننەوە سەرکارەکەتان وازی لە لێخورینی پاسکیل هێناوە و ئۆتۆمبێل لێ دەخورێ، بەلاّم نەک مۆدیلە کۆنەکان بگرە یەکێک لەو مۆدیلانەی کە بەبۆچوونی تۆ بەگازخۆر ناویان دەرکردووە. پرسیاری جۆری هەلّبژاردن:

کەواتە تۆ لەم باردا تەنیا بەرەچاوکردنی گۆشەی سەری لووت چ کاردانەوەیەکت دەبێ:

أ- ئاخۆ دەرۆیە دەرەوە و ژمارەیەکی زیاتری ئۆتۆمبێل تفباران دەکەی تا تۆڕەییە قەتیسکراوەکەت دابمرکێنی.

ب- بیر لەوە دەکەیەوە کە بۆ خۆشت بەیانی ئۆتۆمبێلەکەت ببەیە سەر کار و لە تەک ئۆتۆمبێلی سەرکارەکەت ڕای بگری لەبەرئەوەی پێت باشترە خۆتی لێ نزیک کەیەوە.

پ- ڕاستەوخۆ دەچییە فەرمانگەی سەرکارەکەت و بەرەنگاری دەبییەوە و دەست لە کار دەکێشییەوە.

ئەگەر وەلاّمەکەت "ب" بوو، ڕێی تێ دەچێ کە گۆشەی سەری لووتت شۆڕ بێ و ئەگەر "پ" بوو، ئەوە بەدەر دەخات کە تۆ بۆچوونی کەسێکی لووت قیتت هەیە.

بۆ وەرگرتنی نموونەیەکی تر لەسەر ئەو گۆشەیەی لووت کە کاری لەسەر دەکەین ئێستا لەگەلّم بگەڕێوە بۆ ڕۆژە هەژێنەرەکانی سالاّنی پێشوو و با زۆر دوور نەڕۆین بیر لە فیلمی "The Lone Ranger – پاسەوانە تەنیاکە" و هیچ نەبێ لە "دۆریس دێی" و فیلمەکانی سەردەمی "خۆشەویستم بگەڕێوە" واتە فیلمەکانی نێوان کۆتاییی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان بکەوە. لەم فیلمانەدا ژیانی ئافرەت لە دۆزینەوەی مێردێک و پارێزگاریکردن لێی کورت کرابووە.

ڕەنگە تۆش بەباشی جۆری ئەو کەسایەتییەت بەبیر بێتەوە کە دێی لە ناو ئەم فیلمانەدا بەرجەستەی کردوون: گورجوگۆلّ و سەربەخۆ و خاوەن جێراتیی بەردەوامیی ڕووەکێکی مارشمالّۆی جوان برژاو.

لووته کورته تەسکە ڤیتبووەکەی دێی بەجوانی وێنەی لێ گیرابوو. بەپێچەوانەوە من گومانم لەوە هەیە کە گۆشەی سەری لووتی هەموو مێپەروەرە Feminist کۆنە سەرەکییەکان ڕێک و هاوئاست بووبێ. ئەم هێمایە پێوەندی بەبڕیاری کاریی زۆر وردتر هەیە و بەهیچ شێوەیەک پێوەندیی بەپرکێشبوونەوە نییە. خەڵکی خاوەن ئەم هێمایە خۆیان دەخەنە مەترسی، بەڵام هۆشیارییەکی تەواویان سەبارەت بەمەترسیی ڕێ تێچوو هەیە. کەواتە با دەستخۆشیی گەرم لەو ئافرەتە دلاوەرانە بکەین کە گۆشەی سەری لووتیان دەرخەری ئەو تالاوەیە کە لە ژیاندا چەشتوویانە، ئافرەتانی وەک "سوزان بی ئانتۆنی" و "ئێلیزابێس کێیدی ستانتۆن" و "لووسی ستۆن" و "کێیری چەپمان کەت" و "فرانسیس پێرکیس" و "ئێمیلین پارکهێرست" و "مێیری چێرچ تێرڵ". لە سەردەمی خۆشماندا دەتوانین "بێتی فریدان" بەنموونە وەربگرین.

تاکە کاردانەوەی ئەم خانمانە بەهۆی ئەم هێمایەوە برێتی بووە لە بێنکورتی بەرامبەر بەهەموو خەڵکی تر، بەڵام نەک بەڕادەی بەرگەنەگرتنی ئەو پیاوانەی کە مێشکی ئافرەتیان پێ ناتەواو بوو «ئەم پیاوانە شایستەی ڤێزلێبوونەوە بوون.» بەداخەوە کە ناچارین کەموکوڕییەکانی تایبەت بەسەرە لووتی قیت یان شۆڕ هەڵبەسەنگێنین.

سەرە لووتێکی شۆڕبووە ئاماژە بەشێوازێکی ورد لە هەنگاوە کارییەکاندا دەکا. هەر کاتێک ئەم خەڵکە پلانی کاریی خۆیان داڕشت بەدووری بزانە لێی لا بدەن. ئەگەر تۆش ئاوا بی، لە گرینگیی هەوڵدان بۆ گەیشتن بەنایابترین پلە تێ دەگەی. سەری لووتت هەر گۆشەیەکی هەبێ، ڕەنگە حەز بکەی جارێکی تر کە بۆ یەکەم جار تووشی کەسێکی هەڵگری ئەم هێمایە بوویەوە، ئەم پرسیارەی لێ بکەی: "زۆربەی خەڵک یان ئەوەتا نازانن ئامانج داڕشتن لە پیشەدا واتای چییە وە یان گوێی پێ نادەن. بەبۆچوونی تۆ ئاخۆ ئامانج داڕشتن لە پیشەکەتدا سوودی بۆت دەبێ؟".

ئەگەر بەچاو زەقکردنەوە وەڵامی نەدایەوە، پێم بڵێوە.

سەرکردەیەکی سیاسیی گەورەی وەک "لیخ واڵیا" بەرژەوەندیی کۆمەڵە خەڵکێکی بەخەمی خۆی دەزانی. "ڕیچارد نیکسۆن"یش تاکە سەرۆکی ئەمریکا بوو کە ناچار بووە بۆ ئەوەی تاوانبار نەکرێت، دەست لە کاربکشێتەوە و ئەمەش نموونەیە بۆ مکووربوون لەسەر ئامانجی کاری. باری نیکسۆن زۆر بەهێزتر بوو لە چاو باری کەسێکی خاوەن هێمایەکی تری لووت واتە لووتی قیت، کە ئاماژە بەپابەندیی عاتیفی لە کاردا دەکا. پاشەکشەکردنە کورتخایەنەکەی نیکسۆنت لە سیاسەت بەبیرە واتە کاتێک کە بەڕۆژنامەنووسانی وت چی

تر نایبیننەوە؟ زەحمەتە بتوانین کەسێک بێنینە بەرچاو کە توانای بۆ بەردەوام درۆکردن سەبارەت بە وترگێیت وزەبەخشی ناخی بووە، مەگەر ئەوەی بیر لەو کۆڵنەدەرایەتییە بکەینەوە کە لە ناو سەرە لووتە شۆڕبووەکەی نیکسۆندا خۆی بەرجەستە کردووە.

بەگشتی ئەم گۆشەیەی سەری لووت ڕەنگە هاوتای زۆرزانی بێ و تەنانەت ڕەنگە ئاماژە بدا بەوەدیهێنانی فراوانخوازییەکی کەسێک بەڕێگەیەکی بێ بەزەییانە. دەتوانی ئەمە بە"بەهرەی مەکیاڤیلی" ناو ببەی " وایە، نووسەرە پیلانگێڕەکەی کتێبی "The Prince – میر"یش ئەم خەسڵەتەی هەبوو". ئاریشەی ڕێ تێچووی هاوتای ئەم هێمایە ئەوەیە کە کەسەکە دەبێ هەردەم ئاگەدار بێ نەوەک هەڵسوکەوتێک بکا کە ئەوانی تر بەخۆپەرستی لە قەڵەم بدەن.

بەڵام شێوازی خۆپەرستی ڕەنگە سوودیشی هەبێ. "دێیڤید کیلتۆن"، ئەو کەسەی کە وانەی ستراتیجیەتی سەربەخۆیی ئابووری دەداتەوە و "جیم جۆرگسن"، سەرنووسەری ڕۆژنامەی ئابووریی "ئینتێریۆر مانی"، بەنموونە وەربگرە. کێ ئیرەییی بەدڵڕفێنی گۆشەی سەرە لووتی "ڤینس لۆمباردی"ی ناوبژیوان دەبا؟

"بێرنی ئێبرز"، بەڕێوەبەری کۆمپانیای هاوبەشی "World Com"ە، کۆمپانیایەک کە بەردەوام لە فراوانبوون دایە. ئێبرز توانیویەتی تابڕی ٣٧ملیۆن دۆلار لە بەشەکانی کۆمپانیای "ئێم سی ئای" بکڕێتەوە. هەرچەندە ئەو زیاتر لە ٣٥ کۆمپانیای کڕیوەتەوە، بەڵام بەکەسێک وەسف کراوە کە ڕازی نابێ کۆمپانیایەکەی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەسەر هەمان قەوارەدا بمێنێتەوە.

کەسێکی خاوەنی سەرە لووتێکی شۆڕبووە و لە شێوەدا تیژ لە مەودای کاردا گرینگی بەبەرژەوەندیی خۆی دەدا. بۆ خەڵکی تر هەڵکردن لەگەڵ کەسێکی خاوەن ئەم هێمایە ناخۆشە. بەڵام ئەم لووتە بەکەڵکی "بازڵ ڕەسبۆن" هاتووە کە ئەو ئەکتەرەیە ڕۆڵی "شێرلووک هۆڵمز"ی لێکۆڵەری بلیمەتی گێڕاوە و بۆ ئەم ڕۆڵەش لووتێکی گونجاوی هەبووە.

سەرە لووتی ساحیرە شوومەکەی ڕۆژهەڵات کە لە ناو فیلمی " The wizard of Oz – مارمێلکەکەی ئۆز" دابوو یان ئەو زڕدایکەی کە لە ناو فیلمی "سنۆ وایت/ کچە سپییلکەی بەفر ئاسا"ی بەرهەمی دیزنیدا سێوە ژەهراوییەکە ئامادە دەکا، ئەمانەت بەبیر دێنەوە؟ هۆشیاریی گشتی پێمان دەڵێ ئەو لووتە درێژ و تیژانە کە سەرەکانیان شۆڕ بووتەوە، ئاماژە بەخۆپەرستی دەکەن. بۆ ئەو کەسەی خاوەنی ئەم لووتەیە کە بەدەگمەن ئەو کەسە هەبوونی هەیە کاردانەوەکە زیاتر لە خودی بەدکارییەکە ڕەنگە ئەوە بێ کە کەسەکە

پێویستە بەردەوام بەرهەڵستی لە پێشبینییەکانی خەڵک سەبارەت بەخۆپەرستبوونی خۆی بکا.

بۆیە نموونە هەرە باشەکەم بۆ ئەم جۆرە لووتە، "ئاین راند"ی نووسەرە کە بێباکانە پەسنی ڕەوابوونی خۆپەرستیی کردووە. بوێرم قسەکە بکەم، یان نا؟ ئەویش سەرە لووتی تیژ بوو.

پرسیار: ئەی ئەگەر لووتم هەم قیت و هەم تیژیش بوو، ئەوە واتای چییە؟

وەڵام: سەرە لووتێکی تیژ جا هەر گۆشەیەکی هەبێ ئاماژە بەڕادەیەکی زۆری هەستیاری بەرامبەر بەژینگەی کاری دەکا. تۆ زیاتر لە هەر کەسێکی تر بەدەست نارێکیی ژینگەی کاریتەوە دەناڵێنی، لە قەنەفە پەرتوپووت و ئامێرە تێکچووەکانەوە بگرە تا سیاسەتە بۆگەنەکانی فەرمانگەکەت. ئەمە ئاریشەی ڕێ تێچووی تۆیە. بەڵام هەواڵە خۆشەکە ئەوەیە کە کارکەرە سەرە لووت تیژەکان دەشتوانن پەرە بەژینگەی کاریی خۆیان بدەن. پێوەرە باڵاکانی تۆ ڕەنگە بگوازرێتەوە بۆ ئەوانی تریش.

تۆ کە لووتێکی تیژ و لە هەمان کاتدا قیتت هەیە، کەسێکی نەگبەتی. هەروەک پەندی پێشینان تۆ خاوەنی "لووتی زانینخواز"ی. لێکدانەوەکە دەگونجێ، وا نییە؟ هیچ نەبێ

– تۆ زانینخوازی.

– تۆ هەستیاری بەرامبەر بەوشتانەی لە دەوروبەرت ڕوو دەدەن.

هەرکەس نهێنییەکی بۆگەنی هەیە با ئاگەداری خۆی بێ. "ڕاڵف نێیدر" لووتی خۆی بۆ دۆزینەوەی کریاری ساختەچی بەکار خستووە. "لانگستۆن هۆگس" و "ئان مۆر لیندبێرگ"، ئەم دوو نووسەرە وێڵی دۆزینەوەی ڕاستی بوون. باشترین شوێن کە تێیدا بتوانی ئەم سەرە لووتە سەیرانە بدۆزییەوە، کوێیە؟ سەردانێکی ڕۆژنامەیەکی لۆکاڵ بکە. بانگەوازی بۆ مەکە. بەئەسپایی خۆت بخزێنە ژووری هەواڵەکان و لەوێ سەیری هەواڵنێرەکان بکە.

## قەبارەی سەری لووت

لە ئەمریکادا و لەم سەردەمە نوێیەدا، ئێمە بیرۆکەی سەیرمان لەبارەی قەبارەی لووت هەیە. ئاخۆ هیچ کام لە هاوڕێیەکانت بەم دوایانە پەنای بۆ نەشتەرگەری جوانکاری نەبردووە تا چارەسەری سەرە لووتی خۆی بکا لەبەرئەوەی پێ دەچێ بچووک بێ.

نەخێر، گرفتە ڕێ تێچووەکە سەرە لووتی گەورەیە کە یەکێکی ترە لە هێمایە باشەکانی

ڕوو کە ئێستا بەشێوەیەکی نابەجێ بەهێمایەکی "ڕەگەزی" دادەنرێ. سەیر لەوە دایە کە لە فۆرمەکانی سەرژمێریکردندا هێڵ بەسەر هەر بۆکسێکی زانیاریی تایبەت بەڕەگەزدا بێنی، ڕەنگە خەڵکی تری خاوەن هەر جۆرە ئەندازەیەکی سەرە لووت هەمان بۆکس پڕ بکەنەوە.

– سەرە لووتی خڕ بەپێچەوانەی سەرە لووتی باریکە. ڕووی کەسەکە ڕووبەری خوێندنەوەکەیە. ئاخۆ قەبارەی سەرە لووتەکە بەبەراورد لەگەڵ پاشماوەی لووتەکە و پاناتیی دەم و درێژیی چاو چەندە؟

– ئەگەر شتەکە بەئاسانی یەکلا نەبووە واتای ئەوەیە سەرە لووتەکە لە قەبارەدا ناوەندییە.

ئێستا ورە بدە بەخۆت و سەرە لووتی خۆت لە ناو نەینۆکدا سەیر بکە.

قەبارەی سەرە لووت دەرخەری ئەوەیە کە ئاخۆ چۆن دەڕوانییە ئاسایشی ئابووری. نیگەرانییە سەرەکییەکەی کەسێکی سەرە لووت خڕ پاشەکەوتکردنە بۆ داهاتوو. ئاخۆ بەڕاستی چەند پارە دەبێ لە ناو بانک گل درابێتەوە؟ ببوورە، سەرە لووت ئەمەت پێ ناڵێ. حەزکردن لە ئاسایشی مادی مەرج نییە ئاماژە بەبڕی پاشەکەوتی کەسێک بکا.

ئاخۆ هەرگیز چاوت بەڕیکلامەکانی بەرنامەی "American Express Traveler's Checks"ی "کارڵ مادلن" کەوتووە؟ سەرە لووتە گەورەکەی ئەکتەری سرووش بۆ هاتوو دەڵێ: "بەبێ پارە لە ماڵ دەرمەچوو و با بڕێکی زۆریشت پێ بێ". زۆربەی جار هەست بەوە دەکەی کە سەرە لووتی ناوەندی و خڕ زۆر زیاترن لە سەرە لووتی باریک وە بەڕەچاوکردنی ئەوەی زۆر= زۆر، دەبێ چەندی سەرە لووتەکە گەورەتر بێ، ئەوەندە زیاتر کەسەکە بیر لە پاشەکەوتکردنی پارە بکاتەوە «یان بەهۆیەوە نیگەران یان شاگەشکە بی.»

ئەو کاتەی چاوێک بەسەر بەشی ئابووریی ڕۆژنامەکەتدا بخشێنی یان سەیری بەرنامەی "Newshour with Jim Lehrer ساتەهەواڵێک لەگەڵ جیم لێهرر" بکەی، زۆر کەسی سەرە لووت خڕ دەبینی بەلەخۆوەگرتنی خودی جیمیش. لە ڕابردوودا کە بەرنامەکە پێی دەوترا " The MacNeil Lehrer Newshour - ساتەهەواڵی مەکنێیل – لێهرر" ئەو کاتەش تۆ بەردەوام "مەکنێیل"ت لە بەرچاو بوو.

کێ زۆربەی جار بیر لە پاشەکەوتکردن دەکاتەوە؟ خەڵکی هەژار و خەڵکی فراوانخواز و چاوچنۆک و خێرخواز و کۆکەرەوانی هونەر و... ناکرێ ئەم خەسڵەتە تایبەت بەگرووپێک بکرێ. ئەو کاتەی نهێنییەکان دەخوێنییەوە دەرک بەوە دەکەی کە پاشکەوتکەران خاوەن



باریک



خڕ



ناوەنجی

قەبارەی سەری لووت

مووچەی جۆراجۆر و سەر بەرەگەزی جۆراوجۆرن. ڕەنگاوڕەنگترین بەرنامەی تەلەڤزیۆنی لەبارەی ئەو کەسانەی کە پارەیان لەسەریەک کەڵەکە کردووە لەلایەن پیاوێک کە خاوەن سەرە لووتی گونجاوە بۆ ئەم کارە پێشکێش دەکرێ. هەڵبەتە ئەم پیاوە "ڕۆبین لیچ"ی پێشکێشکاری بەرنامەی "Life Style of the Rich and Famous – شێوەژیانی کەسانی زەنگین و ناودار"ە.

پرسیار: هەر دوێنێ بوو کە لەگەڵ دایک و باوکم لەسەر پارە لێمان بووە شەڕێکی پڕ هەراوهۆریا. ئەوان دەیانوت: " تۆ وا ٣٠ ساڵتە، هێشتا ژنت نەهێناوە و مووچەی ئەو کارە ڕۆژنامەگەرییەت هەژارانەیە. کەی دەتەوێ بیرێک لە داهاتووت بکەیەوە؟" ئەوان ڕاست دەکەن. بەڵام قسەکانی تۆش لەبارەی سەرە لووتی من و حەزنەکردنم لە پاشەکەوتکردنی پارەش هەر ڕاستن. بۆ بەرگریکردن لە خۆم من دەبووایە چۆن وەڵامم دابانەوە؟

وەڵام: هەر کاتێک خەڵک پێت بڵێ تۆ لەوان جیاوازی و بەم شێوەیە بێخنە باری پەرچەکردارەوە، ئەم قسەیەی ئەوان ڕەنگە ڕێگەت بۆ خۆش بکا تا بیر لەوە بکەیەوە کە ڕەنگە شێوازی کەسیی ئەوان لە بنەڕەتەوە لە هی تۆ جیاواز بێ. ڕەنگە ئەمەش نەختێک لە ئازارت کەم بکاتەوە. سەرە لووتی تۆ زۆر باریکە. ئەی هی دایک و باوکت چۆنە؟

وەڵام: سەرە لووتیان زلە، زۆر زل، بەتایبەتی هی باوکم. بەڵام قسەکانت برینداریان کردم نەک تەنیاش لەبەرئەوەی من بەهۆی لووتم کەسێکی نامۆم، بگرە لەبەرئەوەی تۆ دەڵێی هەر هێمایەکی ڕوو نیشانەی بەهرەیەکی تایبەتە کەواتە لایەنە باشەکەی هەڵویستە نابەرپرسیارانەکەم کە هاوڕێی سەرە لووتە باریکەکەمە چییە؟

وەڵام: جیا لەو بارە کۆمەڵایەتییانەی کە تۆ بەهۆی سەرە لووتێکی ئاواوە تووشیان دەبی، ئەم سەرە لووتە واتایەکی سەرسڕمێنی هەیە. ئاخۆ هەرگیز گوێبیستی هۆشیاریی خۆشگوزەرانی Prosperity Consciousness بووی؟ واتای ئەوەی کە پارە تەنیا وەک هێمایەک بۆ دابینکردنی وزە و کار و شارەزایی و پاداشتکردنەوە دابنرێ. پارە لەجیاتی ئەوەی شتێکی پاشەکەوت بۆ ڕۆژی ڕەش بێ شتێکە کە وەک ئاو لە جووڵە دایە و ئەگەر نیگەرانییەک لە ئارادا بێ، ئەوا یەک دڵۆپی تری لێ ناچکێتەوە.

هەرچەندە ئەگەری ئەوە هەیە کە هەرکەسێک بۆ باوەڕکردن بەم فراوانییەی پارە زۆری لە خۆی بکا بەڵام تۆ ئەم بیرۆکەیەت هەرس کردووە، وا نییە؟ ئاخۆ ئەوە بەبەهرەی خۆت دانانێی کە هەست بەوە دەکەی بەردەوام بەشی پێویست پارە هەر دەبێ؟ هەروەها ئاخۆ تۆ بەجۆرێک هەستت بەوە نەکردووە کە بەردەوام پارەت بۆ دابین دەکرێ.

پرسیار: کتومت وایە و بۆیە نیگەرانیش نابم و خێزانم لەبەر ئەم خەم نەخواردنەم بەشێتم لە قەڵەم دەدەن.

وەڵام: بینیت؟ هۆشیاریی خۆشگوزەرانی لە تۆدا سروشتییە و سوودەکەی ئەوەیە کە تۆ لە ژیانتدا سەربەستی و دەرفەتی ئەوەشت دەبێ کە خەڵکی تریش لەم تێگەیشتنە ڕۆحانییە سەبارەت بەپارە ڕابێنی. بەلای خەڵکی تر، بە لە خۆگرتنی دایک و باوکیشت، تۆ نموونەی کەسێکی زۆر چاونەترسی. کەواتە تا دەتوانی ئەم هەلە بقۆزەوە و لەبەرئەوەی خەم لە پارە ناخۆی شەرمت بەخۆت نەیەت.

## ئەندازەی کونە لووت

هەناسەیەکی قووڵ وەربگرە. ئەگەر پێویست بوو شتێکیش بخۆرەوە. ئێمە بەنیازین لە کونە لووت بکۆڵینەوە. دەزانم بەر لەوەی ببی بەڕووخوێنەوەیەکی تەواو پێگەیشتوو، ڕەنگە کونە لووت بەلاتەوە وەک کرێتترین بەشی ڕووت بێ. بە پێی ئەم واتایە ڕەنگە باسکردنی بابەتێکی وەک واتای ئەندازەی کونە لووتیش شتێکی تابوو بێ. تەنانەت هاوڕێییە گیانییەکانیش ڕەنگە حەز نەکەن باس لە بابەتێکی وەک واتای ئەندازەی کونە لووت بکەن. بەڵام من تامەزرۆم باسی بکەم. هۆیەک بۆ ئەم تامەزرۆبوونەم ئەوەیە کە هەر کەسێک لە بواری فرۆشیاریدا کار بکا، پێویستە لەسەر کونە لووت زانیاریی هەبێ. هۆیەکەی تریشم ئەوەیە کە بەپێچەوانەی خەڵک کە بەردەوام سەبارەت بە پاکوخاوێنیی لووت ترسیان هەیە شێوە سروشتییەکەی لووت نامترسێنێ بگرە کونە لووت ژیرییە سەرنجڕاکێشەکەی کۆڕەکەی خۆمم دەخاتەوە یاد.

ئەو کاتەی "مەت" پێڕەوکە بوو یەکێک لە خولیا سەرەکییەکانی بەکورتی و بەڕوونی لووت کۆڵینەوە بوو. ڕێنوێنی دایبابانەش کاری لێ نەدەکرد. لە ماوەی گفتگۆیەکی نێوان مەت و"میچ"ی هاوسەرمدا ئەم جۆش و خرۆشە لەسەر لووت تەواو درێژەی کێشا. بۆیە هاوسەرم بەنەزاکەتەوە وتی: " کوڕی خۆم، ئەوێ جێی ئەنگوستت نییە. تکایە هەر ئێستا دەستت لەوێ دەربێنە".

مەت یەکسەر بەگوێی باوکی کرد و پەنجەی خۆی دەرهێنا و ڕاست کردی بەلووتی باوکیدا.

هەوڵەکانی ئێمە بۆ خوێندنەوەی ڕوو بەو ڕادەیە مشومڕی تێدا نییە. با بەشێوازە زۆر نەرمونیانەکەمان بوێرانە بچینە سەر کونە لووت.



کونەلووتی
گەورە



کونەلووتی
بچووک

ئەندازەی کونەلووت

تۆ چۆن پێوانی ئەندازەی کونە لووت دەکەی؟ نیگەران مەبە پێویستیت بەهیچ شتێکی ئاشکرای وەک ڕاستە نییە. تەنیا لە ڕووبەڕووە و لەسەر یەک ئاست لەگەڵ ڕوو، سەیری کونە لووتەکان بکە.

– ئەگەر بتوانی کونە لووتەکان بەتەواوی ببینی کونە لووتت بەکونە لووتێکی گەورە دابنێ.

– ئەگەر تەنیا دوو هەواکێشت دی کەواتە کونە لووتەکان زۆر بچووکن.

– ئەگەر هەر هەواکێشێکت نەدی؟ مادام یان ئەوە سەیری بووکەڵەی باربی دەکەی یانیش کونە لووتی کەسەکە زۆر بچووکە.

ئەندازەی کونە لووت، دەکرێ بەراورد بکرێ لەگەڵ توانای پارەکێشانەوە لە بانکێک. دەزانی داغڵە چییە؟ داغڵە کونێکی تێدایە بۆ ئەوەی سکەی پێدا ئاودیو بکرێ. زۆربەمان پارە وردەکانمان لە ناو شتێکی وەک بەرکمان دادەنێین کەسەری داپۆشراو بێ و بەئاسانی دەستمان بگاتە پارەکە. بەشێوەیکی سروشتیش هەندێک کەس بڕیاریان داوە کونەکەیان فرەتر بکەن تا بەئاسانی دەستیان بەپارەکە بگات و هەندێکی تر بڕیاریان داوە کونەکەیان تەسکتر بکەن تا پارەکە بەئاسانی ڕانەکێشرێتە دەرەوە.

ئاخۆ چ کاتێک ئەم بڕیارە گرنکە دراوە؟ من خۆم لەو باوەڕە دام کە هەر ڕۆحێک بەر لەوەی ژیانێک وەربگرێ، بۆ ئەندامە سەرەکییەکانی ڕوو، گرێبەستێک دادەڕێژێ، سەیری ئەو بەشەی لەسەر "دژایەتیی بەهرە" نووسراوتەوە، بکە. بەڵام ئەگەر پێت باشترە بڕیاردانەکە بەشتێکی بەڕێکەوت لە قەڵەم بدەی کەواتە بەردەوام دەبێ وا بیر بکەیەوە کە کونە لووتەکانت ڕاستەوخۆ لە یەکێک لەو ئامێرانەوە دەرچوونە کە بۆ کڕینی شتومەک پارە هەڵدەدرێتە ناویان (Slot machime).

هەرجۆرە لێکدانەوەیەکی گرینگ بۆ ئەم بارە کرابێ، بەڵام هەزاران ساڵە کە ڕووخوێنەوان پێوەندییەکی ئاشکرایان دۆزیوەتەوە: کونە لووتی گەورە هێمای دەسبڵاوبوونێکی زۆرە، هەروەک ئاسان دەسبردنە ناو گیرفانە. ئەوانی ترمان کە کەمتر خەرج دەکەن کونە لووتیان بچووکە، ئەم خەڵکە وەک داغڵە وان.

پرسیار: ئەم شێوازەی خەرجکردن چۆن لەگەڵ پێویستیی ئاسایشی ئابووری هاوتا دەبێ؟ ئاخۆ سەرە لووتی گەورە لە خۆیە هاوڕێی کونە لووتی گەورەیە؟

وەڵام: هەر شتێک ڕێی تێ دەچێ. لە ڕاستیدا کۆمەڵێک لە دەوڵەمەندە سەرەکییەکانی

ئەمریکا سەرە لووتی گەورە و کونە لووتی بچووکیان هەیە. "ئەلێگزاندر هامیلتۆن"، یەکەم خەزینەداری لە مێژووی ئەمریکادا ئەم جۆرە لووتەی هەبوو. ئەم شێوەیەی لووت لە ناو سەرکردە بەناوبانگەکانی پیشەسازیدا ڕەواجی هەبووە: "ئەندروو کارنیج"ی بازرگان و "جێی پی مۆرگان"ی بانکدار و "جێیمز جێی هیل" کە لە پیشەسازیی هێڵی شەمەندەفەر کەسێکی بەناوبانگ بوو. ئەمڕۆ ئێمە سەلیقەیەکی زۆر لە ناو شتومەکی ماڵەوەدا دەبینین و ئەم سەلیقە لە لووتە گەورە و کونە لووتە بچووکەکانی "ئالدۆ گۆچیی"ی بازرگانەوە سەرچاوەی گرتووە.

بەڵام شێوازی خەرجکردنیش هەروەک هێمایەکانی ڕوو مسۆگەر نییە. "دوکتۆر جۆن دی ڕۆکفێلر" کە لە ناو مێژووی ئەمریکادا ڕەنگە زەنگینترین پیاو بووبێ لەو کەسانەی باس کران تەواو جیاواز بوو. سەرە لووتی ڕۆکفێلر زل بوو، بەڵام کونە لووتەکانی هاوتای کۆمەڵێک لەگەورەترین ئەو کونە لووتانە بوون کە دیتبووم. ئاخۆ دەتزانی کە ئەم سەرمایەدارە پۆڵایینە تەنیا بەپارەکۆکردنەوە ناوبانگی دەرنەکردبوو، بگرە خێرخوازێکی دڵسۆزیش بوو.

ئێوەی خێرخواز و فرۆشیار بەر لەوەی دەمتان بۆ کڕیارە کونە لووت و سەرە لووت گەورەکان ئاو بکا پێم باشە بزانن کە توانای خەرجکردنی ئەم کەسانە ئەوەندە بەئاسانی پێشبینی ناکرێ. ئەندازەی کونە لووت ناتوانێ ئەوەت پێشان بدا کە ئاخۆ کەسێکی زەنگین تۆ یان کۆمپانیایەکەت بەکەسێک یان کۆمپانیایەکی موستەحەقی خێرپێکردن دادەنێ یان نا. کونە لووتی گەورە تەنیا لەوە دڵنیات دەکاتەوە کە بڕێکی زۆری پارەی کەسێک، بەهەر شێوەیەک بێ دەبێ خەرج بکرێ، خەرجکەرە بەسۆزەکان ڕەنگە پێیان خۆشتر بێ، پارەکە خەرجی خۆیان بکەن.

لووتێکی بەهەمان ڕادە پێشبینینەکراو لووتی "ئەندروو کارنیج"ە، سەرە لووتێکی گەورە و کونە لووتی بچووک. ڕەنگە بزانی کە کارنیج هەم دەسنووقاو و هەم خێرخواز بوو. بەشێوەیەکی باوتر خەڵکی خاوەن ئەم سەرە لووتە گەورانە زۆربەی جار لە پێدانی ئامۆژگاریی تایبەت بەپارە، دەستودڵ کراوەن. "ڕاڵف نێیدر" لە پێناو کڕیارەکاندا خەبات دەکا و بەهەمان شێوەش "پۆولا بیگۆم"ی شارەزای میکیاژ کە بە "Ralph Nader Of Rouge" ناسراوە. "ئارسر فۆرمر" ئامۆژگاریی ڕێبوارەکانی کردووە کە لە جیهاندا چاوەڕێی پارەی زۆر نەبن. "جێین براینت کوین" چەند ملیۆن خەڵکی لە شارەزاییە ئابوورییەکەی خۆی بێبەش نەکردووە «هەڵبەتە ئەم چەند ملیۆن خەڵکە خوێنەران و بینەرانی تەلەڤزیۆن

دەگرێتەوە. نابێ کوین هەروەک کەسێکی وا بناسێنین کە پسوولەکانی خۆی هەروەک چوکلێت بەناو خەڵکدا بڵاو کردبێتەوە.»

پرسیار: ئەی گاندی؟ ئەو سەرە لووتێکی زلی هەبوو، وا نییە؟

وەڵام: هەرکەسێک کە ڕێگە ڕۆحانییەکەی تەرکی دنیا بگرێتە بەر، شێوازی پارەخەرجکردنی بەئاراستەی یارمەتیی خەڵکی تر دەبێ و بەهەمان شێوەش وا بیر دەکاتەوە کە سکە پارەکەی لە خودی خۆی خەرج دەکا. "مەهاتما گاندی" وەک دایکە "ترێزا" بەدەنگ هەژاران و نەدارانەوە چوو. کەواتە سەرە لووتی گەورە و کونە لووتی بچووک ڕەنگە بۆ خەڵک خێر و بەرەکەت بەدیاری بێنن.

## شێوەی کونە لووت

ئێستا ئەگەر قێزت نابێتەوە با لە کونە لووت ورد ببینەوە کە دەشێ چوار شێوەی سەرەکی وەربگرێ بەڵام هەڵبەتە هەر هەموویان لەسەر یەک لووتدا نادۆزرێنەوە لەگەڵ ئەوەشدا دوو کونە لووتی ناهاوتا، هێمایەکی بەربڵاوە. کەواتە کە کاتێک لە نەینۆکدا سەیر لووتت دەکەی، بزانە ئاخۆ دەتوانی شێوەی هەر کونە لووتێکت بەجیا بناسییەوە. ڕەنگە تۆ دوو شێوەی جیاواز بۆ کونە لووتەکانت دەستنیشان بکەی.

– کونە لووتی خڕ شێوەیەکی بازنەیی هەیە «تەنیا خوارترین بەشی کونە لووتەکە خڕە. کونە لووتی کەس وەک بازنە خڕ نییە.»

– کونە لووتی لاکێشەیی شێوەیەکی ڕێک و درێژی هەیە و زۆربەی جار لە قەبارەدا بچووکە.

– کونە لووتی کڵپەیی ڕەنگە بۆ ناسینەوە سەرەتا ناخۆشترین شێوەی کونە لووت بێ، بەڵام چاوت هەر لێی ڕادێ، لەبەرئەوەی ئەم شێوەیە باوترین شێوەی کونە لووتە. ئەم شێوە کونە لووتە سەرەتاکەی ڕێکە بەڵام پاشان بەئاراستەی لووت دەچەمێتەوە.

– کونە لووتی سێگۆشە دەگمەنترین شێوەیە. وەک ئەوە وایە کە لە ناو بیابانێکی زیخین وڵاتی میسردا بسووڕێیەوە و لە ناکاو خۆت بەقووچەکێک دابدەی. هەر ئەو ڕۆژە دادێ کە تۆ بەدیتنی جووتە کونە لووتێک کە لە قووچەکە مینیاتۆرییەکان بکا. واقت وڕ بمێنێ و هەست بەوە بکەی کە جووتە کونە لووتێکی سێگۆشەی هاوتات دۆزیوەتەوە.

ئاخۆ ئەم لایەنە بەرەو گەشتی زیاتر بۆ ناو لووت هانمان دەدا؟ تەنیا بیری لێ بکەوە.



كونەلووتی لاكێشەیی



كونەلووتی خڕ



كونەلووتی سێگۆشەیی



كونەلووتی كڵپەیی

شێوەی كونەلووت

ڕەنگە تۆ ڕۆژێک ببی بەجۆرە دەلاڵێکی گەشتوگوزاری بۆ ناو لووت.

هەرچەندە من هەوڵم داوە هەبوونی ئەم گەشتە بسەلمێنم، بەلام ڕەنگە بەتەواوی قەناعەتت بەوە نەیەت کە خوێندنەوەی کونە لووت ڕێگەیەکی نایابە بۆ دیتنی جیهان. من کە مامۆستام دەتوانم قەناعەتت پێ بێنم. دەزانم ئەگەر لە واتا ڕاستەقینەکەی کونە لووتت تێ بگەی بۆی شێت دەبی.

شتەکە بەم شێوەیەیە: شێوەی کونە لووت زانیاریت پێ دەبەخشێ سەبارەت بەشێوازی خەرجکردنی پارە. تۆی فرۆشیار ڕەنگە زیاتر حەز لەو کڕیارانە بکەی کە کونە لووتیان خڕە. ئەگەر خوا بەندەیەکی ڕووخۆشی خۆش بوێ خەڵکی کونە لووت خڕ لە بەهەشت لە ڕیزی یەکەمدا دەبن. ئەم خەڵکە دەستودڵکراوەن و شارەزاییەکی تایبەتیان هەیە لە ڕێگەی داهێنەرانە بۆ خەرجکردنی پارەکانیان.

بەشێوەیەکی ڕوونتر مەبەست ئەوەیە کە خەڵکی خاوەن کونە لووتی گەورەی زۆر خڕ دەستبلاوترین کەسانی سەر ڕووی زەوین. جارێک کە ئافرەتێکی خاوەن ئەم هێمایەی سەردانی وۆرکشۆپێکمی کرد، ئەمەم پێی وت. پێیم وت کە کونە لووتە خڕەکانی ئاماژە بەژیرییەکەی لە ئازوگوێزکردن بەقەردەکانی دەکا. ئەو ئەوەندە پێ کەنی کە لەسەر کورسییەکە بەربووەوە. کاتێک دەستی بەقسە کردەوە وتی:

"من ٢٢ کارتی متمانەم هەیە و هەر هەموویان سەتاسەت قەردیان لەسەر کۆ بووەتەوە".

جارێکی تر کە من وۆرکشۆپم کردەوە ئافرەتێکی تر کە جووتە کونە لووتێکی هاوتای یەکتری هەبوو لەسەر هەمان کورسی دانیشت. من وەک جاران هەڵسەنگاندنێکی ڕێکوپێکم کرد. ئەو وەک دیوانە دەستی بەپێکەنین کرد، بەلام لەسەر کورسییەکە بەرنەبووە.

"منیش ٢٢ کارتی متمانەم هەیە، بەلام تاکە دانەیەکیشیان لە سەتاسەت قەردی لەسەر کۆ نەبووەتەوە".

ناوی ئەم خانمانە نادرکێنم. بەلام "مێری هانت" کە جووتە کونە لووتێکی هاوتای هەیە، بەئاشکرا گوتوویەتی سەردەمێک تا بڕی ١٠٠,٠٠٠ دۆلار کەوتبووە ژێر باری قەرد. ئەمڕۆ ئەو هەروەک سەرنووسەری "چیپ ستێیک مانسلی" چۆنیەتیی گەیشتن بەزیرەکی لە بواری ئابووریدا، ڕوون دەکاتەوە.

کونە لووتی لاکێشەیی هاوتایە لەگەڵ پارەخەرجکردنێکی شرۆڤەکارانە. خەڵکی خاوەن ئەم جۆرە کونە لووتانە حەزیان لە ڕێکخستنی داهات و دەرکەوتنی خۆیانە. «هۆشیاریی

تایبەت بەلووت: خەڵکی خاوەن ئەم هێمایە کە دەوڵەمەنیش بن دڵیان زۆر بەوە خۆش دەبێ کە برە ڕاستەقینەکەی سامانیان نەدرکێنن. بەڵام ئێستا تۆ هەروەک ڕووخوێنەوەیەک دەتوانی بەپێشبینیکردنی ڕاستییەکە بەهەمان ڕادە دڵی خۆت خۆش بکەی. تۆ دەتوانی ئەو شتەی لە ناو مێشکی ئەواندا دەخولێتەوە یەکسەر لە لووتیان بخوێنییەوە.»

کونە لووتی کلّپەیی تایبەتە بەبەهرەی پارە خەرجکردنێکی بێ باکانە. ئەگەر شتێک کەوتە بەردڵت هەر دەیکڕی، بێ ئەوەی ڕەچاوی ئەوە بکەی کە ئاخۆ شتەکە بەدڵی سەرکارە کونە لووت لاکێشەییەکەت دەبێ یان نا.

باشترین نموونەم بۆ ئەم بوێرییە "کێنی کرامر"ە، ئەو پیاوەی سرووشی بۆ کەسایەتییە یەکجار مفتخۆرەکەی ناو "Seinfeld" هێنا. کونە لووتەکانی کلّپەیی و ئێجگار بچووکن. کونە لووتی سێگۆشە هاوڕێیە لەگەڵ وریاییەکی یەکجار زۆر پەرەسەندوو بۆ پارە خەرجکردن. بەرپەرچدانەوەی ڕێ تێچوو چاوچنۆکییە، بەڵام لە دیدی خەڵکەوە وایە. بۆچوونێکی دەروونیی پڕبەزەییتری ڕووخوێنەوەیەک دەڵێ ئەم کەسە لە ژیاندا دەسکورتە.

ئێستا "لی سکۆت"ی بەڕێوەبەری ئیداریی بڕیاردەری وۆڵمارت گوێی لە پارە نییە، بەڵام بەلامەوە ئاساییی دەبێ ئەگەر بۆم دەرکەوێ کە ئەو سەردەمێک لە ژێر پاڵەپەستۆیەکی ئابووریی گەورەدا بوو بێ. من حەپەسام، ئەو کاتە حەپەسام کە خەریکی سەیرکردنی وێنەکانی ناو وتارێکی کۆوارێک بووم کە لەسەر کۆمەڵە بەڕێوەبەرێکی ئیداریی بڕیاردەری شارەزا و زیرەک نووسرابوو و لەوێدا چاوم بەکونە لووتەکانی سکۆت کەوت. وێنەی ئەو لە تەک وێنەی "جێفری ئیمێلت"ی کۆمپانیای "General Electric" و "ستیڤ بالمر"ی کۆمپانیای "Microsoft" و "ڕۆبێرت ناردیلی"ی کۆمپانیای "Home Depot" و "کرێیج بارێت"ی کۆمپانیای "Intel" بوو. هەر هەموو ئەوانی تر لەگەڵ پێشبینییەکانم بۆ کارگێڕەکانی کۆمپانیا هاوبەشەکان دەگونجان، لەبەرئەوەی ئەو کونە لووتانەیان هەبوو کە لەبەر بچووکی بەنزیکەیی نەدەبینران. کونە لووتی سکۆت لە پێشبینییەکانم تووشی گومانی کردم لەبەرئەوەی ئەم کونە لووتانە تەواو گەورە بوون.

دواتر کە بەوردی سەیرم کرد، ئەوەم دۆزییەوە کە شێوەی کونە لووتی سکۆت سێگۆشەیە کە بۆ پیشەکەی شێوەیەکی گونجاوە. لە بابەتەکە تێ گەیشتم. خۆڕسکییەکانی کەسێکی دەسبلاو دەتوانرێ بەهۆی شێوازی بەوریای پارە خەرجکردنەوە هاوسەنگ بکرێ.

پرسیار: وام دەزانی ئامانجت لەم وانەوتنەوەت ئەوەیە خەڵک هان بدەی زیاتر ڕێز لە

خۆیان بنێن. من کـە بەردەوام ڕقم لەم کونـە لووتە سـێگۆشـە ناشـیرنانەی خـۆم بووەتەوە ئێستاش ئەوە دەبیستم کە پێوەندییان بەدەستنوقاوییەوە هەیە. زۆر چاکە. ئاخۆ من بەو زانیارییەوە بناخەی کەسایەتیم دابڕێژم؟

وەڵام: ڕەنگە هێمـای کـونە لـووتی سـێگۆشــە بەبەراورد لەگـەڵ هـەمـوو هێمـاکـانـی تر بەرپرچدانەوەی زیاتر بێ. بەڵام بیر لە واتاکەی بکەوە. ئێمـە لەسـەر هەسارەی فێربوونین. بەبۆچوونی من کونە لووتی تۆ هەروەک مەدالیای شـەرەفی سەربازێک بەنرخە. ئاخـۆ تۆ وانەی سەختت لەسەر چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ پارە وەرنەگرتووە؟

پرسیار: با.

وەڵام: کەواتە ئەو زانایی و سۆزەی کە وەدەستت هێناوە بەکەم مەزانە. "ماری ئانتۆنێت" بەوە ناسـراوە کـە لـە ڕووی مـادییـەوە کـەسـێکی بێ بـەزەیی بووە. گـوایە پاش ئـەوەی پێی وتراوە جـووتیـاران نانیـان نیـیـە، بخـۆن ئەو وتوویەتی: "با کـێک بخـۆن". تۆ لە ڕووی داراییـیـەوە لـە هـەر ئاسـتـێکدا بی، ڕێگە بە خـۆت نادەی قـسـەیەکی لەم جـۆرەت لە دەم دەربچێ. تۆ زیاتر لـە کەسانی خاوەن هەر جۆرە کونە لووتێکی تر توانای دۆزینەوەی ئەو کـەسـانەت هـەیە کـە بەئاشکرا و بەنـهـێنی بەدەست نەدارییـەوە دەناڵێنن. سـۆزی تۆ لە خەمەکانیان کەم دەکاتەوە و ڕەنگە تۆ هەرگیز ڕادەی ئەم کاریگەری خۆت نەزانییەوە.

پرسیار: کەی دەتەوێ باسی باشترین جۆری ئەو کونە لووتانەم بۆ بکەی کە ئافرەتێکی وەک من دەتوانێ هاوژوانێتییان بکا؟ لە چاوەڕوانییان خەریکە دەمرم.

وەڵام: ئەگـەر خـەمـی گـەورەی تۆ پارە بێ پێم باشـە بەباشی لە کـونە لووتی هـاوژوانی داهاتووت ورد ببییەوە «بەڵام نەک بەشێوەیەکی ئەوەندە ورد کە هاوژوانەکەت لێت بکەوێتە گومان و ڕا بکا». پاشان بیر لە پێویستییە کورتخایەن و درێژخایەنەکانت بکەوە.

ڕەنگە هاوژوانێکی سـەیر و دەسـبـڵاو بۆ کـاتـی خـۆشگوزەرانی بەکـەڵکی تۆ و کـونە لووتەکـانیشت بێ. ئەگـەر بتـەوێ کاتێکی خۆش بەسـەر ببـەی با هاوژوانەکەت کەسێکی خاوەن کونە لووتی گەورە و خڕ بێ. بەڵام ئاخۆ پێت باشە ئەو کەسە ببێ بەهاوسەرت؟ ئەو هۆکـارانەی کـاریگەرییـان لەسـەر ئەم بڕیارەت دەبێ برێتین لە شـێـوازی خـۆت لـە پارە خەرجکردندا و ئەو ڕاستییەش کە ئاخۆ هیچ حیسابێکی بانکیتان هەیە یان نا.

هاوژوانێکی کونە لووت لاکێشەیی ڕەنگە لە کاتی هاوژوانیدا ئەوندە دەسبڵاو نەبێ، بەڵام کاتێک حیسابی بانکیی خۆت بەتاڵ دەبێ قەدری بوجەدانانی هاوژوانەکەت دەزانی.

نهێنییەکانی کار و پارە دەبنە هۆی ئەوەی لووت وەک بەشێکی سەرنجڕاکێشی ڕوو خۆی بنوێنێ. ئێستا تۆ لە هەڵبژاردنی کار یان هاوژواندا یان لە هەڵبژاردنی مامەڵەی بازرگانیی گەورە یان کارێکی بازاڕکپدا، دەتوانی بوەستی و ئاوڕ لە لووت بدەیەوە. لووت زۆر زانیاریت لەبارەی چۆنیەتیی بەهێزترکردنی پێوەندییەکان بۆ دەستبەر دەکا. لە بەشی داهاتوودا ئێمە ئاوڕ لە ئەندامێکی ڕوو دەدەینەوە کە ڕاستەوخۆتر لە هەر هەموو ئەندامەکانی تر پێوەندیی بەهێزەوە هەیە.

٨

# کوڵم

ئاخۆ کوڵمەکانت دەربڕی هێزی تۆن؟ هەڵبەتە گومان لە دەربڕینەکەدا نییە، بگرە لە چۆنیەتیی ئەم دەربڕینە دایە. هەر ڕوویەک پێشاندەری لانی کەم تاکە بەهرەیەکە بۆ هەڵکردن لەگەڵ خەڵکی تر.

بۆ ڕووی بەدەر لە ڕووی مرۆڤ، هەواڵەکە ئەوەندە خۆش نییە. بۆ نموونە شیرینییە ئاڵقەییەکان، کونێکیان تێدایە، بەڵام دەبووایە لە شوێنی ئەم کونە کوڵم هەبووایە «یان ئەگەر ئەم شیرینییانە چاو و لووت و برۆ و دەمیان هەبووایە ئەم کونە شوێنیان بوو». ئاخۆ بەڕێکەوتە کە هەرگیز شیرینییەکی ئاڵقەیی نەبووە بە سەرۆک؟ وا بزانم بەڕێکەوت نەبووە.

خۆشبەختانە تۆ مرۆڤی و ئەمەش بەو واتایەیە کە تۆ دەتوانی بۆ ویستەکەت هەوڵ بدەی. ئاخۆ ویستەکەت پلەیەکی سیاسییە؟ یان کۆمەڵایەتی؟ برۆ وەدەستی بێنە، تۆ تەنانەت دەتوانی بەنێزەش بۆ ئەم ویستەت هەوڵ بدەی، بەڵام لەم سەردەمەدا دۆزینەوەی نێزەیەک کارێکی سەختە. بەڵام لانی کەم ئەو کوڵمانەی کە پێت بەخشراون سەردەمیانەن و لە کاراییدا پلە یەکن. هەر پێویستیشت بەکوڵم دەبێ. هەم لە فرۆشیاری و هەم لە پێوەندییەکاندا بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتەکان ڕەنگە ورەبەزێن بێ. ڕەنگە پاش ڕۆژێکی ناخۆش هەست بەوە بکەی کە لەگەڵ جەنگاوەرێکی ئەوتۆدا زۆرانبازیت کردووە کە قەڵغانەکەی هەرگیز تێک ناشکێ. لەبەرئەوە ڕێز لە خۆنانت زیاتر لە هەر قەڵغانێکی تر، پێویستیی بە نۆژەنکردنەوە هەیە.

لەڕۆژێکی وەک ئەو ڕۆژانەدا لە سووچێکدا خۆت بەخوێندنەوەی ئەم بەشە خەریک بکە و شکۆمەندیی کوڵمەکانت ببینە.

## بەرجەستەیی کوڵم

بەرجەستەبوونی کوڵم بەو واتایەیە کە ئاخۆ کوڵمەکان تا چ ڕادەیەک دەرپەڕیون:

– ژمارەیەک کوڵم ڕەنگە بەرجەستە بن و وەک پەیکەرکانی سەر زنجیرە چیای "ڕوشمۆر" واتە وەک ئەو پێکهاتە چاو دەرپۆقێنانە بێنە بەرچاو کە سەرنجت ڕادەکێشن و دەبنە هۆی ئەوەی بڵێی "واو".

– هەندێک کوڵمی تر ئاسوودەن و ڕەنگە لە بنەڕەتدا نەبنە هۆی سەرسڕمانت تەنیا لە بارێکدا نەبێ کە بەمەبەستێکی تایبەت سەیریان بکەی «بۆ نموونە ئەو کاتەی کە دەتەوێ ڕووی خۆت بەگوێرەی کتێبێکی ڕووخوێندنەوە هەڵبسەنگێنی». ئەگەر نەتتوانی بەهیچ جۆرێک کوتە کوڵمێک بدۆزییەوە کە لە ڕووەوە دەرپەڕیبێ و ناچار بی بڵێی "کوا؟" ئەو کاتە ئەم وتەیەی خۆت بەوتەیەکی ئاماژەدەر بەسەرکەوتن هەژمار بکە لەبەرئەوەی توانیوتە کوڵمی ئاسوودە بناسییەوە.

پرسیار: بەڵام تکایە پێم بڵێ کە هێشتاش ئەم کوڵمە ئاسوودانە تایبەتمەندییەکی باشیان هەیە.

وەڵام: ئەم تایبەتمەندییەیان هەیە و من ئەم زانیارییە پێشکێش دەکەم بەو خانمانەی خاوەن کوڵمی ئاسوودەن و کە لە شەرمان وەریان نەماوە. ئەو کاتەی کە تۆ لاپەڕەکانی کۆواری تایبەت بەئافرەتان هەڵدەدەیەوە چاوت بەئامۆژگارییەکانی بێ کەموکوڕیی میکیاژکردن دەکەوێ. هەر ئەو کاتەش چاوت بەڕێنوێنیی دڵشکێنەر سەبارەت بەبەرجەستەکردنی "سێو"ەکانی سەر ڕوومەتت دەکەوێ. ڕەنگە لە وتارەکەدا پێت بوترێ بۆ دروستکردنی ئەم جۆرە سێوە سیحراوییانە پێویستە ڕووت هەڵمژرێ و هەندێکمان ئەم کارە بەگێسکی کارەبایی ئەنجام دەدەین و هەوڵ دەدەین ئەو شتەی کە هەبوونی نییە بەرجەستە بکەین.

پاشان ئێمە ئەم پێکهاتە تا ڕادەیەک بەتاڵە بەمکیاژ سواق دەدەین. ئەو کاتەی کە لە کۆتاییدا کوڵمەکانی خۆمان دەرپۆقاند و سەرسامی شێوەکەی بووین، ئاخۆ ئەمە چ سوودێکی بۆمان دەبێ؟ بەرهەمەکە ڕەنگکارییەکی جوانە کە هێڵ و پەڵەی لەسەر دەرکەوتووە. ڕەنگاوڕەنگیی ئەم بەرهەمە دەرخەری ئارەزووی ئێمەیە بۆ خۆڕازاندنەوە نەک گرینگیدان بەخودی خۆمان.

ئەگەر دەتەوێ خۆت وەک ئالای ئەمریکا ڕەنگ بکەی، کێشە نییە. هەر چۆنێک بێ



کوڵمی بەرجەستە



کوڵمی ئاسوودە

بەرجەستەیی کوڵم

هەندێکمان هەست بەوە دەکەین کە بەبێ ئەم کوڵمە دەرپۆقیوە ساختانەشەوە دەتوانین جوان بین «چەندی کوڵمت تەختتر بێ واتای ئەوەیە خەڵک کەمتر چاو لە تۆ و لە کوڵمە سەرنجڕاکێشەکانت دەکەن». ئێستا تەنانەت ناوێکی خۆشیش لەم هێمایەت نراوە کە بریتییە لە کوڵمی ئاسوودە.

لەبەرئەوەی بەرجەستەیی کوڵم نیشاندەری شێوازی سەرکردایەتییە، ڕەنگە مەزندەی ئەوە بکەی کە کوڵمی بەرجەستە، هاوڕێیە لەگەڵ شێوەیەکی پڕ دەسەڵاتی سەرکردایەتی. کەسایەتیی کەسەکە نەک کوڵمەکانی لە ناو ئاپۆرەدا خۆی دەنوێنێ.

بۆچی زۆرێک لە پێشکێشکاران ئەم جۆرە کوڵمەیان هەیە؟ تامەزرۆبوون بۆ ڕاکێشانی سەرنجی جەماوەر، بووەتە هۆی ئەوەی کە بەپلەی یەکەم ئەم پیشەیە هەڵبژێرن. بەپێچەوانەوە سەردانی شوێنێک بکە کە خەڵکەکەی زیاتر سوود لە شێوە دەسەڵاتێکی کەمتر بەرچاو وەردەگرن بۆ نموونە هاوڕێیە نەناسەکانت لەسەر هێڵی ئینتەرنێت. لەم شوێنەدا زۆر کەس دەدۆزییەوە کە کۆڵمی ئاسوودە ڕووی زۆربەیانی نەخشاندووە.

بۆ پێشکێشکاری پێویستە مرۆڤ بەجەرگ بێ. دەترسم ئەم خاڵە فەرامۆش بکەی بۆیە داوات لێ دەکەم بچییە ژوورێکی پڕ لە کەسانی نەناس و بەگورانییەکەت یان سەمایەکەت یان ڕۆڵگێڕانەکەت ئەفسوونیان بکەی. "کاسرین هێپبێرن" کە بەکوڵمە زۆر بەرجەستەکانییەوە ناسراوە توانیی بەسەر ڕەخنە ڕوخێنەرەکەی "دۆرۆسی پارکر" کە وتبووی: " هێپبێرن تەواوی هەستەکانی تاقی کردووەتەوە" زاڵ بێ. ئەو هەروەها بەبوێرییەوە بەرەنگاری شەپڵە بووە. بۆ ماوەی چەندین ساڵ هێپبێرن بەجەستە و دەنگێکی لەرزۆکەوە کاری کرد و بەزەبری ویستی خۆی خێرایی دەبەخشییە جەستە و دەنگەکەی. تەنیا ئەو کاتەش کە کاریگەرییەکی دراماتیکی خوازیاری لەرزۆکی بووایە، ئەم بێ هێزییەی خۆی ئاشکرا دەکرد.

کەسێکی تری خاوەن جووتە کوڵمێکی ئازا "کاسرین گراهام"ە. کاتێک گراهام بڕیاری دا یەکەم دۆزینەوەکانی خۆی لەبارەی درۆی ووتەرگەیت لە واشنتۆن پۆستدا بڵاو بکاتەوە ئەم بڕیارەی پڕ مەترسی و لە هەمان کاتدا مێژووییش بوو.

پرسیار: هەر سەبارەت بەسیاسەت دەبێ بڵێم کە من تا ئێستا زۆر سیاسەتوانی هەڵبژێردراوی ئەوتۆم نەدیوە کە خاوەنی کوڵمی گەورە بن. ئاخۆ نابێ ئەوان سەرکردە بن؟ تۆ چۆن ئەمە لێک دەدەیەوە؟

وەڵام: بەبیرت بێ کە زیاتر لە یەک شێواز هەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەهێز بێ. ئەو دەسەڵاتە پڕ هێزەی کە هاوڕێیە لەگەڵ کوڵمی بەرجەستە ڕەنگە خەڵک تووشی دڵەڕاوکێ بکا. لە ئەمریکا ڕێک لە ڕۆژانی جارِدانی دەستووری ئەو وڵاتەوە، ئێمە حکوومەتمان وەک سیستەمێکی کۆنترۆڵ و هاوسەنگی دامەزراندووە «وا بزانم دەتوانی بەسیستەمی Cheek and Balance – کوڵم و ڕەسیدیش ناوی بنێی». لەوکاتەوە جەماوەر بووتە هۆی بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی هەڵبژاردن. بەشێوەیەکی نموونەیش ئێمە بۆ کۆشکی سپی دەنگ بەدیموکراتەکان دەدەین و بۆ کۆنگرێسیش دەنگ بەکۆمارییەکان دەدەین وە یان بەپێچەوانەوە.

ئاخۆ ئەمە تەنیا شێوان و شێتگرییە؟ یاخۆ دەتوانێ جۆرە ژیرییەکی هاوبەش واتە کردەوەیەکی هاوسەنگکەر بێ؟ لە هەردوو باردا تێبینیکردنی ئەم مەیلە نیشتیمانییە یارمەتیت دەدا بۆ تێگەیشتن لەو کوڵمانەی کە ئێمەی ئەمریکی بۆ وەرگرتنی پۆست دەنگیان پێ دەدەین. بیر لە"کلارا بارتنز" و "هاریێت تەبمان" و دایکە "تریزا"یەکان مەکەوە. ئێمە لە بەردەم ئەو خەڵکانەی لە ڕادەبەدەر بوێرانە هەڵسوکەوت دەکەن لە شەرمان دەتوێینەوە.

کەواتە ئاخۆ ئەوە بەڕێکەوت بووە کە ئێمە هەرگیز "رۆبێرت ڕێدفۆرد"مان هەڵنەبژاردووە. نەخێر و منیش هەروەک هەر ئەمریکییەکی ئایدیاڵپەرستی خەیاڵشکاو ئاخ هەڵدەکێشم. تا ئێستا ئێمە تەنیا یەک سەرۆکی خاوەن کوڵمی بەرجەستەمان هەڵبژاردووە «بە یەکی دابنێ» کە ئەویش "ئۆنێست ئێیبی". "جێی. ئێف. کێی" بەدووەم پلە دێت کە کوڵمەکانی تەنیا ئەو کاتەی بزەی دەهاتێ نەک هەموو کاتێک خۆیان دەنواند.

کوڵمی ئاسوودە ئاماژە بەجۆرێکی بێ فیز لە ویستی دەسەڵات دەکا. ئەگەر تۆ ئەم هێمایەت هەبێ هەست بەوە ناکەی کوتە کوڵمێکت لە ڕوومەتەوە دەرپەڕیبێ، بەڵام گرەو دەکەم تێبینیی ئەوەت کردووە کە لە شێوازەکەتدا پرس بەکەسانی تر دەکەی. چ ئەمە بەملکەچی چ بەدیموکراسی ناو بنرێت، ئەم خەسڵەتە هۆی متمانەی خەڵکە بەتۆ و چەندی بەوردتری سەیری ئەم لایەنە یەکجار کۆمەڵایەتییەی کوڵم بکەی، هەست بەوە دەکەی بەرجەستەییی کوڵم زۆربەی جار پێوەندی بەبابەتە سامناکەکەی ناواخنی کوڵمەوە هەیە.

## ناواخنی کوڵم

تەنانەت منداڵانی سەروو چوار ساڵ، ڕقیان لەوە دەبێتەوە کە داپیرە دێت و ڕۆ دەبێتە کوتە گۆشتێکی کوڵمیان و قسەیەکی ئاوا دەڵێ:

" کەس هەیە لە تۆ شیرنۆکەتر و خنجیلانەتر و شەیتانتر و قشتیلەتر بێ؟"

پاش ئەوەی چەندین ساڵ کوڵمت هەر قنجی لێ دەدرێت، هێشتاش ئەم پارچە گۆشتەی کوڵم دەبێتە مایەی سەرئێشەت – لانی کەم ئەگەر تۆ بەرامبەر بەپرسامترین مەرجی ئەمریکییەکان هەستیار بی. ئاخۆ هۆی خڕپنبوونی ڕوو دەگەڕێتەوە بۆ کلۆربوونی ددان یان گەندەڵی یان سەرنەکەوتن لە وەدیهێنانی ئامانجەکانت لە ژیاندا یانیش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشییەکی بێ کەموکووڕی؟ قیرۆسیا، ئێمە زەندەقمان لە قەڵەوبوون دەچێ و زۆربەی خەڵک پێی وایە پڕبوونی ڕوو بەواتای قەڵەواتیی گشتییە.

بەڵام تووشی حەپەسان دەبێ، لەبەرئەوەی ناواخنی کوڵم، مەرج نییە پێوەندیی بەقەڵەوییەوە هەبێ. کاتێک کەسێک قەڵەوتر دەبێ، ڕەنگە ڕووی پڕ نەبێ و بەپێچەوانەشەوە. ڕووی کارهێنی چرچی وام خوێندووەتەوە کە ناواخنی کوڵمیان زۆر بووە و هەروەها ئەو کارهێنە زەبەلاحانەی کە ناواخنی کوڵمیان کەم بووە.

ئەگەر بتوانی هێور ببییەوە و ڕووبەڕووی ئەم بابەتە هەستییە ببییەوە، لەوە تێ دەگەی کە ئەگەر ڕوو خڕپنیش بێ مەرج نییە ناواخنی کوڵمی زۆر بێ. بیر لە"دێلتا بێرک" بکەوە، ئەو ئەکتەرەی کە دیزاینی کۆمەڵە جلوبەرگی بۆ ئافرەتانی قەڵەو داڕشتووە. سەیری وەشانە دووبارەکانی "ڕۆزان" بکە. پڕیتیی هەردووک لەم خانمانە لە کوڵمە بەرجەستەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە، نەک لە ڕوویاندا. تەنانەت لە قەڵەوترین باردا ڕۆزان هەرگیز ناواخنی کوڵمی زۆر نەبووە – ئەو کاتەی زانیت واتای ئەم ناواخنە چییە لەوەش تێ دەگەی، بۆچی ڕۆزان ئەم ناواخنەی نەبووە.

کەواتە تۆ چۆن دەتوانی ڕادەی پڕێتی بەگوێرەی ناواخنی کوڵم بپێوی؟ ئەو گۆشتە شلکوشۆڕەی کە لە کەمەر و خاڵەکانی تری ژێری دایە، هەژمار ناکەین. کەواتە ڕاستەوخۆ سەیری یەکێک لە کوڵمەکان بکە. وەک داپیرەیەکی شێت و شەیدا، چنگی لێ بدە و ڕای کێشە. لە ناو نەینۆکدا سەیری کوتەگۆشتەکە بکە.

– ئەگەر زۆر بوو واتە ناواخنی کوڵمی تۆ زۆرە.

– ئەگەر کردەوەکە بەئازار بوو و شەویلگەت قرتەی لێوە هات دان بەوەدا بنێ کە یان



ناواخنی زۆر



ناواخنی کەم

ناواخنی کوڵم

لاساییکردنەوەیەکی پڕئازاری کردەوەی داپیرەت دەکەی وە یان ناواخنی کوڵمت کەمە.

ئێستا با بەردەوام بین و بزانین ئاخۆ لە ڕاستیدا واتاکەی چییە. تۆ دەتوانی ناواخنی کوڵم بە "سەرینی دەسەڵات" لە قەڵەم بدەی. چەندی ئەم سەرینانەت نەرمتر فشتر بن، ئەوەندە کەمتر خەڵک لە هێزەکەی تۆ دەترسن. ناواخنی زۆری کوڵم هاوڕێیە لەگەڵ شێوە دەسەڵاتێکی خاوەن پاڵپشتییەکی زۆر. چەندی ناواخنە سروشتییەکە زیاتر بێ، بەهەمان ڕادە پاڵپشتییەکە زیاترە. کەواتە شانازی بەخۆت بکە کە خاوەنی ئەم هێمایە سەیرەی.

ناواخن ئاماژە بەشێوازێکی سەرکردایەتیی دڵڕاگرانە دەکا و دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو ئەندامانی گرووپ هەست بەوە بکەن بایەخیان پێ دەدرێ. ئەم جۆرە ناواخنە یاریدەدەر بووە بۆ سەرکەوتنی "کێن بێرنز"، ئەو کەسەی کە پشتیوانییەکی زۆری بۆ نامیلکەکانی لەسەر" جاز" و "شەڕی ناوەخۆیی" و "بێیسبۆڵ" و "لویس و کلارک" وەدەست هێناوە. "ڕێیچڵ کارسن"ی ژینگەپارێزی پێشەنگ، بەهەمان شێوەی "هێلێن کێلر" کە ڕێبازە دوور لە هەڕەشەکەی یاریدەدەر بووە بۆ دانانان بەخەڵکی خاوەن پێداویستیی تایبەت، شێوازی سەرکردایەتیی خۆی بەهۆی ناواخنەوە هەموار کردووە.

ناواخنی کەمی کوڵم شێوازێکی تەواو جیاوازی دەسەڵات پێشان دەدا. لەم بارەدا کەسێک لە ناو تاکرەویدا گەشە دەکا. ڕەنگە تۆ حەز لە وەرگرتنی بیروڕای خەڵکی تر نەکەی. ڕەنگە ئەمەش لەو بیروباوەڕە دەروونییەتەوە سەرچاوەی گرتبێ کە بۆ خۆت دەتوانی باشتر کارەکە بەئەنجام بگەیەنی، لەوەی داوای یارمەتی لە هەر کەسێکی تر بکەی.

لە ڕاستیدا ڕەنگە بیروبۆچوونت ڕاست بێ. کەواتە ئاریشەی هاوڕێی ئەم هێمایە، زیاتر لە لەخۆباییبوون برێتییە لە ئیرەییبردنی خەڵک بەتۆ. مەهێڵە بارودۆخەکە وای لێ بێ.

پرسیار: ئێستا پرسیارێکی ڕاوێژکارانە هەیە. من خاوەنی ئەم کوڵمە چاڵانەم کە تۆ باسیان لێوە دەکەی، بەڵام ناواخنی لووتیشم سێگۆشەیە، ئەو ناواخنەی کە تۆ بەلووتێکی ڕاوپرسکەری دادەنێی. کەواتە ئەمە واتای چییە؟

وەڵام: هێماکانی لووت، پێوەندییان بەکارەوە هەیە. هێمایەکانی کوڵمیش پێوەندییان هەیە بەپاشماوەی تری ژیانت: بەهاوژوان و هاوژوورەکانت، بەپێوەندییە خێزانییەکانت، بەو خەڵکەی کە پشووەکانیان لەگەڵ بەسەر دەبەی، بەئاوەڵەکانت لە کەنیسە و لە یانەی تەندروستی یان لەو شوێنەی بۆ سەماکردن سەردانی دەکەی. بۆ نموونە لە کاتی

نۆژەنکردنەوەی ئامێری جل وشککەرەوەکەتدا کە هەر گۆرەوی قووت دەدا ئەو کاتەی لەگەڵ چاککەرەوەکەدا دەدوێی ئاخۆ دەنگت چ تۆنێک وەردەگرێت؟ کاتێک تۆ لە ماوەی کارکردنی ئامێرەکەدا تووشی گرفتەکە دەبی ئەو کاتە جۆرە تۆنێکی تایبەتت هەیە. بەڵام کاتێک چاککەرەوەکە سەردانی ماڵی تۆ دەکا، تۆنەکەت تەواو جیاواز دەبێ.

تێ گەیشتی، زۆر بەئاسانی دەتوانرێت کەسێک بە"ڕا و پرسکەرێکی باش" هەژمار بکرێت. خوێندنەوەی ڕوو، تەواوی وردەکارییەکان و کاتی پیادەبوونیان ڕوون دەکاتەوە.

پرسیار: ئاخۆ ئەوە دژیەکییەک ناخوڵقێنێ ئەگەر کەسێک ناواخنی کوڵمی کەم بێ «وە بەم شێوەیە پاڵپشتییەکی کەمی خەڵکی هەبێ» و شتێکی وەک لووتێکی سێگۆشەی هەبێ «کە تۆ وتت هاوڕێیە لەگەڵ بەهرەی کاری بەکۆمەڵ؟»

وەڵام: لووتی مرۆڤ دەربڕی شێوازی کارکردنیەتی لە مەودای کاری بەکۆمەڵەدا، واتە کاتێک کە مرۆڤ بەشێوەیەکی سوودبەخشانە کارێک ئەنجام بدا. کوڵم شێوازی دەسەڵاتت لە کاتەکانی تردا ڕوون دەکاتەوە. بۆ نموونە "ودی گوسریێ"ی گۆرانیبنووس لە گۆرانییەکانیدا بەشداریی بەخەڵک دەکرد "لووتی سێگۆشە" بەڵام لە ڕووی دەروونییەوە کەسێکی تەنیا بوو "ناواخنێکی زۆر کەمی کوڵم". بڕوام پێ بکە بەهۆی ئاوێتەبوونی هێمایەکانی ڕوو ئەگەری هەر لێکدانەوەیەک هەیە.

پرسیار: کەواتە ئێستا واتای ئێسکە کوڵمی بەرز چییە؟ تۆ وتت ڕۆژان ئەم ئێسکە کوڵمەی هەیە. ئاخۆ ئەوە جۆرە ناواخنێکی کوڵم نییە؟

وەڵام: مەرج نییە. تۆ باس لە جۆری جووتە کوڵم دەکەی کە دەشێ سەرەتا ئاڵۆز بێ. بەڵام دەزانم تۆ لێی شارەزا دەبی. خۆت ئامادە بکە، ئامادە بە.

## جووتە کوڵم

ئێسکە کوڵمی بەرز، یەکێکە لە زاراوە بێ نرخەکان کە لە ڕوو خوێندنەوەی نارەسمیدا باوە. خەڵک ئەم زاراوەیە بۆ ئاماژەدان بەهەر شتێک لە مەودای نێوان کوڵمی بەرجەستە بۆ کوڵمی چاڵ و بۆ سەرنجڕاکێشیی گشتی بەکار دێنن. ئەگەر جووتە کوڵم بەگوێرەی دەسەڵاتە پڕ هێزەکەی کلێشەسازیی ئەتنیکییەوە پێناسە بکرێ ئەوا خەڵک کەسێکی ئەمریکیی خۆماڵی یان هاووڵاتییەکی مەنگۆلییا بەخاوەنی ئێسکە کوڵمی بەرز دادەنێن، بەڵام ڕەنگە ئەوەشی بخەنە سەر کە کەسی خاوەن ئەم هێمایە، ڕەنگە خەڵکی Peoria یان The Bronx یان هەر ناوچەیەکی تری بەرخۆریش بێ.




جووتە کوڵم

بۆ تێگەیشتن لە هێمایەکانی ئێسکە کوڵم پێویستە چاوت لە جووتە کوڵم ڕابهێنێ. کوڵمت لە چ شوێنێک زیاتر بەدەر دەکەوێ؟

– ئاخۆ ڕاستەوخۆ لە ژێر چاڵی چاوە تا لەم بارەدا کەسەکە بەکەسێکی خاوەن ئێسکە کوڵمی بەرز هەژمار بکرێ؟

– یان زیاترین پڕێتی لە ئاراستەی پێچەوانە دایە؟ هەندێک کوڵم سەرسوڕهێنەرانە لە بەشی زۆر ژێرینی ڕوودا، پفەڵ بوونە و زیاتر لە دەم نزیکترن لەوەی لە چاو نزیک بن. من بەکوڵمی شۆڕیان دادەنێم.

– ڕێ تێچوونێکی تر کوڵمی لێک دوور، جۆرە هێمایەک کە زۆر زیاتر ئەو کاتانە بەدەر دەکەوێ کە کوڵمەکان هەم بەرجەستە و هەم چاڵ بن. بەڵێ، ئەم کوڵمە هەمان ئەو هێمایەیە کە ئەو خەڵکانەی هێشتا نەبوونە بەڕووخوێنەوە بەهەڵە ناوی "ئێسکە کوڵمی بەرز"ی لێ دەنێن.

– یان دەشێ تۆ کوڵمی لێک نزیکبووەت پێ بەخشرا بێ کە تێیدا زۆرترین پفەڵییەکە لە نزیک لووتە.

ئەگەر هێز لە پیشە و پێوەندییەکانتدا گرینگ بێ، تۆ دەبێ حەز بکەی توانای تێگەیشتن لە واقیعی جووتە کوڵمت هەبێ.

پرسیار: ئاخۆ بەهۆی دەرپەڕینی خودی ئێسکە کوڵم یان ناواخنەکەیە کە جووتە کوڵم دەردەکەوێ؟

وەڵام: یان ئێسکە کوڵم یان ناواخنەکە– هەر کامیان کە لە ناو ڕوودا زیاتر دەرپەڕیو بێ.

جووتە کوڵم، زانیاریت لەبارەی ئاستی هێزی کەسێک بۆ دابین دەکا. وزە لە ئاراستەی جیاوازدا بەواتای مەجازی و دەقاودەقیش خۆی دەنوێنێ.

لەوانەیە ئێسکە کوڵمی بەرز بەپێی نەریت، شتێکی ویستراو بێ، بەڵام ئەوەندە تامەزرۆی چاندنی کوڵم مەبە. هەڵکردن لەگەڵ ئەم هێمایە ئاسان نییە. لەگەڵ ئەم هێمایەدا تۆ زەبری کۆمەڵایەتیی خۆت بەکار دێنی بۆ داکۆکیکردن لە بەهاکانت. تۆ ڕێگە بەهیچ کەسێکی نزیک لە خۆت نادەی، کارێک بکا کە لە فەرهەنگی تۆدا هەڵەیە.

پرسیار: مەبەستت ئەو شتەیە کە بووە هۆی لە کار دابڕانم؟

وەڵام: ڕووداوەکە چۆن بوو؟

پرسیار: کۆمەڵە کاربەدەستێکی ئەو کۆمپانیایەی کە من کارم تێیدا دەکرد کارێکی

ناهەمواریان دەکرد. من تاکە کەس بووم لێپرسینەوەم لەگەڵیان کرد. ئەوان وتیان "ئەوەی ئێمە دەیکەین ڕەنگە هەڵە بێ، بەڵام ڕێگەپێدراوە. ئەگەر نارازیت، دەرگە ئاوەڵەیە". من هەستم بەوە کرد هۆی ئەم ڕووداوە ئەوە بوو کە من تاکە کاربەدەستی مێینەی ناو کۆمپانیایەکە بووم. بەڵام تۆ دەڵێی ئەمە هیچ پێوەندیی بەڕەگەزەوە نییە و پێوەندیی بەشێوازی کەسییەوە هەیە.

وەڵام: بەشێوەیەکی لێکچوو لە هەردوو ڕەگەزدا ئەگەر ئێسکە کوڵم بەرز بوو پێشبینی ئەوە بکە کەسی خاوەن ئەم هێمایە ڕەوشتبەرز بێ. ڕەنگە خەڵکی تریش بەهەمان شێوە بەهۆی هەڵسوکەوتی ناهەمواری دەوروپشتیان هەراسان بکرێن، بەڵام ئەوان نایانەوێ بەهۆی ئاشکراکردنی هەڵەکان کارەکەی خۆیان بخەنە مەترسییەوە. کێ دەوێرێ فزە بکا؟ بەرزاتیی ئێسکە کوڵم وەڵامت دەداتەوە.

پرسیار: منیش بەهۆی ئێسکە کوڵمی بەرزمەوە تووشی کێشە هاتوومە. وە خۆشییەکەی لەوەدایە کە بەشێوەیەکی ئاسایی دوا شت کە دەیکەم شەڕە. من لەو جۆرە کەسانەم کە ڕقیان لە ئازاردانی مێروولەیەکیشە. بەڵام نازانم ئەوە چ پێوەندییەکی بەکوڵمەوە هەیە؟

وەڵام: تەنانەت ئەگەر لە ڕووتدا هیچ هێمایەکی تایبەت بەشەڕانگێزی نەدوزییەوە، ئێسکە کوڵمی بەرزت ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە تۆ بۆ بەهاکانت تووشی بەرەنگاربوونەوە دەبی و، چەندی ڕۆنانی کوڵمەکە ئێسکانیتر بێ، بەهەمان ڕادە بیروبۆچوونەکانت بەڕاشکاوی دەردەبڕی.

پرسیار: ئاخۆ ئەوە هەموو ئەم بەرەنگاربوونەوانە دەهێنێ؟ سەیری ئێسکە کوڵمم بکە تا تێ بگەی بۆچی ئەم پرسیارە دەکەم.

وەڵام: بزانە، ڕاست و دروستبوون کارێکی دژوارە، بەڵام مرۆڤ دەبێ هەوڵی بۆ بدا. لە کاتەکانی بەرەنگاربوونەوەدا ڕەنگە سەرکەوتنی "جۆن کالڤین"، کۆڵەکەی پرۆتێستانیزم کە کەسێکی بێ تام ئێسکانی و خاوەن ئێسکە کوڵمی بەرز بوو، دڵت دابخورپێنێت. "لویزا مێی ئاڵکۆت"یش ئەم هێمایەی هەبوو و لە نووسینی ئەو ڕۆمانانەدا دەستباڵا بوو کە دەرخەری بەها نموونەییەکانی خێزانین بۆ "Little Women – ئافرەتانی گەنج" و "Little Men – پیاوانی گەنج".

ئەی خەڵکی خاوەن هێمای پێچەوانە، واتە کەسانی خاوەن کوڵمی شۆڕ؟ خەڵکێک کە ئەم هێمایەی هەبێ، زۆر بەرگەی بڕیارەکانی کەسانی تر دەگرێ، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوە

نییە کە تۆ خۆت هیچ ڕەوشتبەرز نی، بگرە مەبەست ئەوەیە تۆ هەست بەوە دەکەی کە لێرە، لەسەر ڕووی هەسارەی فێربوون هەموو شتێک لە فێربووندا کورت دەکرێتەوە. تۆ سەرەتا دەوروبەرت ئامۆژگاری دەکەی دوایی ڕێگەیان بۆ ئاوەڵە دەکەی. بەتەواوی بڕوات بەوە هێناوە کە بڕیارەکانی تایبەت بەخوو و ڕەوشت کەسین و نابێ بەسەر کەسانی تردا بسەپێنرێن.

ئەم خەسڵەتە ڕەنگە بەکەڵکت بێ، ئەگەر تۆ بۆ نموونە "ئیلیزابێس دۆڵ" بی و ئاواتەخوازی ئەوە بی کە ببی بەسەرکۆمار یان تەنانەت جێگری سەرکۆمار هەرچەندە کە هاوسەرەکەت داکۆکی لە پڕۆپاگەندەکردن بۆ ڤیاگرا بکا. یان ئەگەر تۆ خۆت لە جێی "هیلاری کلینتۆن" دابنێی لە ماوەی ڕێسواییەکانی هاوسەرەکەیدا. "کۆندالیزا رایس"ی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییش کوڵمی شۆڕی هەیە و ڕەنگە کە لە ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆیدا ئەوەندە بێندرێژ نەبێ.

کوڵمی لێک دوورکەوتووە ڕەنگە بەخشەری گەورەترین دەرفەتت پێ ببەخشێ بێ بۆ بەرهەڵستیکردنێکی گشتیی درێژخایەن بەتایبەتیش ئەگەر کوڵمەکان هەم بەرجەستە و هەم چاڵ بن. پێشبینیی بوێرییەکی هێور بکە کە بەتێپەڕبوونی کات هەر پەرە دەسەنێ. نموونەش ئەمانەن "نێڵسن ماندێلا"ی سەرۆک کۆماری ئەفریقای باشوور، "گێرۆنیمۆ"ی جەنگاوەری ئاپاچیی دلاوەر، "کلارا بارتن" ئەو گۆشەگیرەی کە خاچی سووری دامەزراند، "ماریان ئەندرسن"ی گۆرانیبێژ و داماڵەری دەمارگیری، و"دایکە ترێزا"ی قارەمانی ماراسۆن.

هەموو ئەم سەرکردانە بەتێپەڕینی کات توانیویانە خۆیان بسەلمێنن و ئەو کردەوە بوێرانە بەئەنجام بگەیەنن کە لەبری ئەوەی بەچەند ساڵێک بەرهەم بدەن، چەندین دەیەیان خایاندووە.

خەباتکارێکی کەمتر سەرناس کە کوڵمی لێک دوورکەوتووەی بەرچاوی هەیە "دکتۆر ئێلیزابێس کوبلر-ڕۆس"ە. لێکۆڵینەوە دەستپێشخەرانەکانی لەسەر "هۆشیاریی مەرگ" یارمەتیی ملیۆنان خەڵکی داوە تا بەسەر نکۆڵیکردن یان ترس لە سەرەنجامێکی مسۆگەردا زاڵ بن. و بەڵێ، با "ڕۆزان" لە یاد نەکەین. پێویستە تەواوی کۆمیدیکارەکان بەهێز بن، بەڵام ڕۆزان بەخۆ بەکوڵمەکانی بەهۆی نائاسایانە بێباکبوونی لە کومیدیکارەکانی تر جیایە. بیر لەو بەرنامە هونەرییە بکەوە کە ئەو لەسەر تەلەڤزیۆن پێشکێشی دەکرد،

کومـێدیایەکی ددانجیـڕکەر، بەڵام واقیـعبینانـە کە کاتی خـۆی لە سـەرووی تێگەیشـتنی کۆمەڵگەوە بوو.

پرسیار: مەبەستت ئەوەیە کوڵمی ڕۆزان بێ ناواخنە؟

وەڵام: بەڵێ، بەدرێژاییی ئەو سـاڵانەی کە زنجیرە تەلەڤزیۆنییـەکانی خـۆی تۆمار دەکرد، کـێشـی ڕۆزان زۆر گـۆڕا. تەنانەت ئەو کـاتەش کـە لە جـاران پـڕتر بوو هـەر زیادەکـێشـێک ئەگـەر لـە ڕووی ڕەنگی دابـایەوە ڕاسـتـەوخـۆ دەچووە سـەر کـوڵمــە بەرجـەسـتــە لێک دوورکەوتووەکانی و زیاتر بەرجەستەی دەکردن. مەرج نییە زیادبوونی کێشی لەش لە ناو کوڵمدا ڕەنگ بداتەوە. لەمەڕ ڕۆزانیش هەر ئاوا بووە.

پرسیـار: ئەی بۆ کوڵمـی لێک نزیکبووە چیت هەیە بیڵێی، ئاخـۆ ئێمـە ترسنۆکین؟ هـەر بۆ خـۆم حەزم لە شـێوە تایبـەتەکەی کوڵمم نەدەکرد و ئێستـاش کوڵمەکە واتایەکی قـڵپیشی هـەیە؟

وەڵام: کـوڵمـی لێک نزیکبـووە هـاوڕێیـە لـەگـەڵ بەهـرەی زاڵبــوون بـەســەر قــەیرانێکی کورتخایەن. ڕەنگە تـۆ هەرگیـز بەشـێوەیەکی ئاسـایی بەکوڵمت سـەرسـام نەبی، بەڵام ئاخـۆ شانازی بەخـۆتەوە ناکەی کە لە ژێر پاڵەپەستۆدا باش هەڵسوکەوت دەکەی؟ تۆ ئەو کەسەی کە بەردەوام بەسـەر قەیراندا زاڵ دەبی.

ئەی ئاریشـەی هاوڕێی ئەم هێمـایە چییـە؟ مەهێڵە بکەوییـە بارودۆخێکی ئەوتۆ کـە ناچار بی، ئەم توانایە بەکار بهێنی. تەنیا لەبەرئەوەی دەتوانی هەموو جارێک بەسـەر قەیراندا زاڵ بی، خۆ واتای ئەوە نییە کە کارێکی پڕپاڵەپەستۆ ناتوانێ زیان بەجەستەت بگەیەنێ.

پرسیـار: من بەڕێوەبەرم. ئاخـۆ بەباشی دەزانی لە دانانی دوامۆڵەتەکاندا ڕەچاوی جووتە کوڵم بکەم؟

وەڵام: بەدڵنیـاییـیـەوە. ئەم کردەوەیە بەتایبـەتی بۆ ئەو کارمـەندانەی خـاوەنی کـوڵمـی لێک نزیکبــووە یان لێک دوورکــەوتوون کــارێکی ژیرانەیە. ئەرکی سێ ســاڵی یان سی ســاڵی بسـپێـرە بە ڕاکـەرە پشـوودرێژەکانت. ئـەرکی سێ ڕۆژی بسـپێرە بەڕاکـەرانی مـەودایەکی کورت واتە کەسانی خاوەن کوڵمی لێک نزیکبووە.

کـۆمــەڵێک لەو کــەســانەی کــە ســەرســڕمــێنـەرانە ئەرکــەکــان ڕادەپەڕێنن ژمــارەیەک وەرزشــوانیــان تێـدایـە: "جـۆن ئێلــوێی"ی یاریزانی سـەرەکی لە تۆپی پێی ئەمــریکیـدا، "لاوێرەنس تایلر"ی هێڵی بەرگری، "شاکیلا ئۆنیل"ی ئەستێرەی تۆپی باسکە، "مێیری تی

میگر"ی مەلەوان، "سام سنید"ی یاریزانی گۆڵف.

گومان لەوەدا نییە "تۆماس گەلۆدیت" لە کاتی دامەزراندنی یەکەم قوتابخانەی بەخۆڕایی بۆ کەسانی نابیست، سوودی لە هێزی کوڵمە لێک نزیکەکانی وەرگرتبێ بۆ بازدان بەسەر کۆسپەکاندا و "واین هوزێنگا"ش ستراتیجیەتی کوڵمە لێک نزیکبووەکانی بۆ بنبڕکردنی بەکرێ وەرگرتنی ڤیدیۆی تەمەن کورتی جۆری بلۆکبەستر بەکار هێناوە.

## ئەندازەی کوڵم

ئاخۆ توانیوتە خۆت بەپێی ئەو هێمایانەی کوڵم کە تا ئێستا خوێندوومانەوە، وەسف بکەی؟ ئەو کاتەی بەبێزاری سەیری نەینۆکت کردووە تا ئەو هێمایەی ڕوو بدۆزییەوە کە هاوتایە لەگەڵ لووتکەی چیاکان ڕەنگە لە ژێر لێوەوە برمەت لێوە هاتبێ: "بەرجەستە–تەرجەستە". ناواخنی کوڵم و جووتە کوڵمیش ڕەنگە لە بەرچاوت سەر بەهیچ جۆرێک نەبن. بەڵام نیگەران مەبە. بێگومان تۆ خاوەن جۆری ئەندازەی کوڵمی کە لە هەموو جۆرەکانی تری کوڵم بنچینەییترە.

کاتێک سەیری نەینۆک دەکەی، ئەم پرسیارە بکە: "نەینۆک، ئەی نەینۆکی سەر دیوار، پێم بڵێ پاناتیی چ شوێنێکی ڕووم لە هەموو شوێنێک زیاترە؟".

ئەگەر لە نەینۆکەوە دەنگێک وەڵامی دایەوە، بزانە لە ناو چیرۆکێکی پەریاندا بەند بووی. بەپەلە خۆتی لێ ڕزگار بکە.

– بەڵام ئەگەری زیاتر ئەوەیە کە دەنگی خۆت وەڵامت بداتەوە. ڕەنگە بڵێ تۆ خاوەنی "پاناتیی کوڵم"ی کە تێیدا ڕووت لە ئێسکە کوڵم بەرەو ژێر باریکتر دەبێتەوە.

– بەپێچەوانەوە، "پاناتیی ژێرە کوڵم" ئاماژە بەواتایەکی پێچەوانە دەکا. لە ئێسکە کوڵم بەرەو ژێرەوە ڕوو پانتر دەبێ.

– "پاناتیی نێوچاوان" هێمایەکی بەبەراورد دەگمەنە کە تێیدا پاناتیی کوڵم ئەوەندە لە بەرچاو نییە لەبەرئەوەی پاناتیی نێوچاوان تەنانەت لە پاناتیی کوڵمیش زیاترە.

– "پاناتیی یەکسان" هێمایە بەربڵاوەکەی ئەم جۆرەیە. بەو واتایەی کە پاناتیی ڕووت لە کوڵمەوە تاهێڵی کارێژە یەکسانە. ئەگەر ئەم بارە بینرا گرینگ نییە کە ئاخۆ پاناتییە گشتییەکە زۆرە یان کەمە. لە هەردوو باردا پاناتییەکە جێگیرە.

ئەندازەی کوڵم دەرخەری ئەوەیە کە هێماکانی سەرکردایەتیی تۆ چۆن لە ناو کۆمەڵە



پاناتی ژێره کوڵم



پاناتی کوڵم



پاناتی یەکسان



پاناتی نێوچاوان

ئەندازەکانی کوڵم

خـەڵکێکدا ڕەنگ دەدەنـەوە. پاناتیی کـولّم هـاوڕێیـە لەگـەڵ شـێـوە دەسـەڵاتێکی "سـەرکـردە ئاسـا". مـەبەسـتم لە بـەکـارهێنانی وێرگـوڵی هەڵگەڕاوە مـەجـازییـە لەبـەرئەوەی زۆر ڕێگەی کـاریگەری تر هـەن بۆ سـەرکردایـەتی. بەڵام وا دیارە خـەڵک تەنیـا ئەو جۆرەیانی بەڕاست دەزانێت کە زۆر لە بەرچاو بێ. شێوازەکانی تری سەرکردایەتی کە ئێمە لەم بەشـەدا لێیان دەکۆڵینەوە دەتوانن بەهەمان ڕادە کاریگەر بن، بەڵام زۆر بەرچاو نین.

بەهەرحـاڵ کـەسـانی ڕوو سـەرکـردە ئاسـا، بەردەوام لەوە بـەهرەمـەندن کـە هـەسـتـێکی یەکـەمـینی پڕکـێش لە نـاو خـەڵکی تردا دەوروژێنن «هـەروەهـا زیاتریش ئـێـرەییـیـان پێ دەبردرێ». کەسانی خاوەن ئەم هـێمایە بەسـەرکردەیەکی زگماکی هـەژمار دەکرێن. و ئەگەر تۆ خاوەنی ئەم هێمایە بی شـتێکی خۆش کە ڕەنگە هەستت پێی کردبێ ئـەوەیە کە تەنانەت ئەگـەر وشـەیەکـیش نەدرکـێنی خـەڵک ئەم خـەسـڵـەتەت دەناسـێـتـەوە. لە کۆبوونـەوەیەکی خۆشەویستترین یانەکەتدا ئەو کاتەی کەللەی خەڵک دەسووڕێتەوە و پەنجەکان ئاماژەت پێ دەدەن تیشـکت دەخرێتە سـەر. ئووپس! دیسان تۆ بـۆ سـەرکردایەتیـی یانەی گەشبینان یان بەرپرسیارێتییەکی تر کە هەرگیز بەنیازی نەبووی، کاندید کراوی.

هـەندێک خـەڵکی سـەرکردە ئاسـا، ڕێز لە بەهرەکـانیـان دەگـرن، ئەوانی تر بەدرێژاییی چەندین سـاڵ بەرهـەڵسـتـیی دەکـەن. بەڵام ئەگـەر تۆ کولّمـی زۆر سـەرکـردە ئاسـات هـەبێ تەنانەت ئەگەر جانتـایەکیش لەسەر سەرت دابنێی ئەمە نابێتە ڕێگر لەوەی خەڵک نەتوانێت لە حـوزوورتدا هـەست بەخـەسڵـەتە فەرمـاندەرانەکەت نەکا. جیـا لە جانـتاکـەش ڕەنگە دەبێ ئەمـەش زیاد بکەم کە ئەگـەری زۆرە خـەرمـانەکەشت هـەمـان پەیام بگەیەنێ. بەڵام جانتـایەک لەسـەر سـەرت، هێمای کۆسپێکی تا ڕادەیەک کاریگەرە بۆ سەرکردایەتییەکی نەخوازراو.

هـەر بەبۆنەی باسکردنی سـەرکردایەتی، ئاخۆ بیرت لەوە کردووەتەوە کە چۆن گۆڕەپانی سـیـاسـیی ئەمریکـا لەچاو ئەو شـتـەی کە ئێمـە ئاسـاییـانە بەباشـترین شـێوە دەسـەڵاتی سەرکردە ئاسای دادەنێین نائـاسایەکی گەورە بەخـۆیەوە دەبینـێ؟ هەرچەندە ڕاستـە کە تۆ ناتوانی زۆر سـەرکردەی خـاوەن کولّمی بەرجەسـتە یان خـاوەن پاناتیی ڕوویەکی سەرکردە ئاسا بدۆزییەوە، بەڵام وتارنـووس و یاریدەدەرەکانی ئەم سەرکردانە لە خودی سـەرکردەکان تەواو جیـاوازن. بۆ نموونە بیـر لە"پێگی نونـان" بکەوە. ئەو لە بـەناوبانگبـوونی "ڕێیگان"ی بێکولّم و "بوش"دا دەسـتی هـەبووە. ئەو بـەفـرێزی وەک "نـەتەوەیەکی بەبەزەییـتـر و نەرمونیانتر" بەرەو پێش چوو. ڕووی نونان زۆر سەرکردە ئاسایە.

پاناتیی ژێرە کولّم دەسەڵاتێکی سەرکردایەتیی تەواو جیاواز پێشان دەدا، شێوە دەسەڵاتێکی ئاشتیخوازانەیە. ئەگەر تۆ ئەم هێمایەت هەبێ، تێبینی ئەوە دەکەی کە چەندی ماوەی ئاشناییت لەگەڵ خەڵک زیاتر بێ، ئەوەندە زیاتر خەڵکەکە ڕێزت لێ دەگرن و بەزۆرزانانەترین شێوە ئەم ڕێزگرتنە دەردەبڕن: ئەوان گرفتەکانی خۆیان بەسەر تۆدا هەڵدەڕێژن. هەروەک دایکێکی ڕێزلێنراوت لێ دێ. خەڵک بەخۆ بەگرفتەکانیان دێن بۆ لای تۆ و سکاڵا دەکەن و بۆڵەبۆڵیان دێ. ئەوان چاوەڕوانن گوێیان لێ بگری.

تکایە لە یاد نەکەی کە ئەوە ڕێزلێنانە. خەڵک دەزانێت تۆ بەدەنگ سکاڵاکانیانەوە دێی، لەبەرئەوەی تۆ لە هەر شوێنێکدا بی وەک چیایەک دێیە بەرچاو. ڕەنگە نوکتەیەکی خۆش بڵێی، باوەشیان پێدا بکەی، یان تەنیا هاوخەمانە گوێیان لێ بگری. لە ئاکامدا بۆڵەبۆڵکەران بەجێت دێڵن. بزەیەک دەکەوێتە سەر لێویان. دڵیان دەگشێتەوە و ڕێزێکی زۆر زیاترت لێ دەنێن.

"لیۆ بوسکاگلیا"، نووسەری کتێبی خۆیاریدەدەری "Love – خۆشەویستی" خاوەنی هەمان ئەندازەی کولّمی تۆیە. نازناوە نارەسمییەکەی "مستر هاگ، جەنابی باوەشپێداکەر"ە. خەڵک هەست بەسۆزی ئەو دەکەن و خۆشیان دەوێت.

بەداخەوە ڕەنگە خاوەنداریەتیی شێوە دەسەڵاتی ئاشتیخوازانە هاوڕێی کێشەیەک بێ. ئەی ئەگەر بۆ خۆت پێویستیت بەسووکبوون هەبوو ئەو کاتە چار چییە؟ خەڵکی خاوەن جۆری شێوە دەسەڵاتی وەک تۆ، زۆر زۆر گرینگی دەدەن بەهاوسەنگی لە پێوەندییەکانیاندا. بۆیە ڕەنگە تۆ بۆ دوورکەوتنەوە لە توندتیژی پەرچەکردار بنوێنێ. ئەمە نموونەیەکە:

تۆ لە شرە کۆگایەکی پشتەوەی فرۆشگادا کورسی دەفرۆشی. ئەو کاتەی باشترین کریارەکەت بێ ئەوەی بزانێت پشتت بەئازارە، شەقێک لەو پشتەت هەڵدەدا، یەکەم کاردانەوەی تۆ ئەوەیە کە بڵێی: "وا مەکە. ئازارت دام". بەڵام ئەمە ڕەنگە بەواتای هەست بریندارکردن بێ و تەنانەت بەواتای بازرگانییەکی دڵرەنجێنە. بۆیە تۆ بەبێ دەنگی بەردەوام خەم دەخۆی.

جارێکی تر کە ئەم کریارە شەقێک لە پشتت هەڵدەدا، تۆ نەختێک بەزەحمەتتر دان بەخۆتدا دەگری" بەڵام هیچیش ناڵێی. پێویست دەکا هاوسەنگییەکە تێک بدرێ؟

ئەم کریارەت ڕەنگە چەندین ساڵ لەسەر ئەم خوویەی بەردەوام بێ و تۆش لە ناختدا پەرە

بەهەراسانییەکی ڕووەو زیادبوون دەدەی. لە کۆتاییدا ئەو ڕۆژە دێ کە چی تر خۆت پێ ڕاناگیرێ. کرپارەکەت شرقێنت لێوە دێنێ و تۆش ترقێنت لێوە دێ.

تەقینەوەی لەم جۆرە مسۆگەرن، مەگەر بەر لەوەی تاوانێکی عاتیفیی گەورە پەرە بسەنێ تۆ ئەو وانەیەی ژیانت وەرگرتبێ کە لەسەر چۆنیەتیی داکۆکیکردن لە مافی خۆتە.

دوو کەسی تووڕەیی هەڵبڕێژی هەر خۆشەویستم کە خاوەن ئەم شێوە دەسەڵاتە ئاشتیخوازانەی بوون بریتین لە"باربارا میکولسکی"ی کاندیدی من بۆ ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا و "جاکی گلیسن"، ئەو کەسەی کە یەکنەوایییە حەسینەرەوەکەی ناو "The Hon-ymooners" بووە هۆی تەقینەوەی تووڕەیییەکەی.

شێوازێکی تەنانەت زۆر بەهێزتریش تایبەتە بە کەسانی خاوەن پاناتیی نێوچاوان. بیرۆکەکان بۆ تۆ ڕاستەقینەن، ڕاستەقینەتر لەو کۆسپانەی کە خەڵک لەسەر ڕێگەی گەیشتن بەئامانجەکانیان تووشیان دەبن. بەم شێوەیە دەسکەوتی تۆ لەوانی تر زیاترە و هەروەها ئەگەر ئەم خەڵکە لەگەڵ تۆدا کار بکەن ڕەنگە بەئاگری تۆوە بسووتێن. من ناوی شێوە دەسەڵاتی بەپەرۆش، لەم شێوە دەسەڵاتە دەنێم.

تەنانەت ئەگەر تۆش وەک "فرێد ئەستێیر" لە جەماوەرکێشییەکەت ڕاهاتبی، بەڵام لە ناختدا بەردەوام ماندووی. ئاخۆ هەرگیز ئەو ژمارە سەمایەی فرێدت بینیوە کە تێیدا ئەو بەسنگی چاکەت هەڵواسینەوە هەوڵی سەمایەکی سەرسوڕهێن دەدا؟ توانای فرێد بۆ پێشاندانی ئەم کارە بەکارێکی ئاسان، پێویستیی بەمەشقی بەردەوام تاگەیشتن بەباشترین پلە هەبووە و هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ وزە عەقڵییە زۆرەکەی.

ئاوەڵێکی تر کە لە پیشەکەیدا بەکەسێکی خاوەن شێوە دەسەڵاتی بەپەرۆش ناسرابێ، "بیل ماریۆت"ی کوڕە کە پرۆژەی ماریۆتی لە ساڵانە کاراییەکی ٥٠ ملیۆن دۆلاری بۆ دەسکەوتێکی نێونەتەوەیی بەبڕی ١٢٠بلیۆن دۆلار دامەزراندووە. "هەری هۆدینی"، کەسێکی تری خاوەن شێوە دەسەڵاتی بەپەرۆش ناچار بوو تەنیا بەسیحری سادەوە قایل بێ.

لە ئاراستەی پێچەوانەدا ئەو جۆرە ڕووانە بەدی دەکرێن کە بەگوێرەی کولّم بۆ تێگەیشتنێکی قووڵ لە تەقەلا دان. پاناتیی یەکسان، پێوەندیی بەشێوە دەسەڵاتێکی بەنەزاکەتەوە هەیە کە بەشێوەیەکی لێکچوو شتێکی سەرنجڕاکێش نییە. بەڵام بەکەمی مەزانە. ئەگەر تۆ لەم کۆمەڵەدا بی، ئەوا دەزانی چۆن بەپێی پێڕەو کار بکەی. بۆ تۆ

ئەنجامەکان زۆر لە خۆبەدەرەخستن گرینگترن.

تاکە ئاریشـەت بەهۆی ئەم شـێوە دەسـەڵاتە ئەوەیە کە ڕەنگە بەرەبەرە فـەرامۆش بکرێی. ناوەناوە بـەبیـر سـەرکـارەکـەت بێنەوە کـە تۆ کـەسـەکـەی بـەرهـەمـهـێنەری ئەو دەسکەوتە مەزنانەی.

"سـیندی ڤـیلاریل"، پێشـەوای پێشـووی دەسـتـەی هاندەرانی "Dallas Cowboys" زۆربەی ژیانـی خـۆی بـۆ دڵخـۆشکردن خـەڵکی تر بەسـەر بردووە. هـەرچەندە لـەبەرئەوەی ئـەو لە لووتکەی پیشەکەیدا بووە، ناکرێ بوترێت شێوە دەسەڵاتێکی سەرنجڕاکێشی نەبووە، بەڵام باشـتـرە وا دابنێین کە ئەو دەیتـوانی بەهەمـان ڕادە سـەرکـەوتوو بێ، ئەگـەر خـۆی بـەتەنیـا سەمای کردبا و بەپیشەش پێشەوای دەستەی هاندەران بووایە.

هـەروەهـا بیـر بکەوە لە کاریگەرییـە بەڕواڵەت هـێمنەکەی "سـاندرا دێی ئۆکـۆنـر"، یەکەم دادوەری ئافـرەت لە دادگەی باڵای ئەمـریکدا «و هـەروەهـا یەکێک لە دەنگدەرە ڕاڕایە هەرە بەناوبانگەکانی ئەم داداگەیە» یان بیر لە"بێ. ئێف. سکینر"ی دەروونناس بکەوە، پیـاوێک کە بەبۆنەی کـاریگەرییەکەی وەک کەسێکی ڕەفتـارگەرا خـاوەنی ناوبانگێکی کەمترە لەوەی کە شـایەنیـەتـی. "ئەلێگزەندرا سـتـۆدارد"ی دیزاینـەری ناومـاڵ، وەک کـەسـێک کە خـاوەنی بۆچوونێکی شـیاوە بۆ برەودان بـەباشـتـربوونی ژیان ناوبانگی بۆ خـۆی وەدەست هێناوە. لە سـایەی کوڵمـەکانی ئەودا من ئافـەرینم لە ناوونیـشـانی یەکێک لە کتێبەکانی بەناوی، "The Art of the Possible – هونەری کردەنییەکان" کرد.

کـام لە هـەرچوار شـێوازەکە باشـترینـە؟ لە ڕاسـتـیدا شـێوازی سـەرکـردە ئاسـا زیاتر لە ڕادەی خۆی بـەهـەند وەردەگیـرێ. ژیانی پیشـەیـی "میـشێڵ لەندن"ی ئەکتەر بەڕاسـتی پاش کـوڵمـچـاندنەوە دەسـتـی پێ کـرد. هـەر بەم بۆنـەیەش ئەگـەر تۆ خـوازیـاری دەسـەڵاتێکی کۆمـەڵایەتیی زیاتر بـی، کوڵمـچـاندنەوە نەک نەشـتـەرگەریـی جـوانکاریی لووت، ئـەو جـۆرە نەشتـەرگەرییـە جوانکارییەیە کە شایەنی پارە لێ خـەرجکردنە. بەڵام ئەگەر بتـەوێ تەنیا لە ڕێی ئەنجـامـدانی کـاری شـایسـتـەوە بۆ خـۆت ناوبانگێک وەدەست بێنی، بەهـەر یەک لەو شێوە دەسـەڵاتە کەمتر بەرچاوانەی تریش دەتوانی ئامانجەکەت بهێنییە دی.

پرسـیار: یەکێک لە کارهێنانی سـەرەکیم ئەو جۆرە شـێوەیەی پاناتیی نێوچاوانی هـەیە. بەڵام لە ڕاست و دروستیی وتەکەت سەبارەت بە بیرۆکەی شێوە دەسـەڵاتی بەپەرۆش، دڵنیا نیم. تەنیـا ئەگـەر زمـانی جـەسـتـەی ئەو پیـاوەت دیتـبووایە، ئەم پیـاوە زۆر ئاسـوودە دێتـە

بەرچاو. ئاخۆ حەز ناکەی دان بەهەڵەی خۆتدا بنێی؟

وەڵام: لە باری کارهێنەکەی تۆدا، نەخێر، بەڵام من ڕووی ئەو فرۆشیارانەم خوێندووەتەوە کە لە بەرزترین ئاستی فرۆشیاریی هاوبەشیدا کار دەکەن. لەم بارەدا شێوە دەسەڵاتی بەپەرۆش بەناهاوتایی بڵاو بووەتەوە و فرۆشیارە پلە بەرزەکان لە شاردنەوەی پەرۆشییەکەیاندا زۆر شارەزا بوونە. بەڵام چەند کەیفیان دێ ئەگەر لەلایەن ڕووخوێنەوەیەکی قەدرگرانەوە پەردەیان لەسەر هەڵماڵرێت، بۆ ئەوەی پێوەندیی خۆت و ئەو کەسە زۆر پەرە پێ بدەی لەپرێکدا ئەمە بڵێ:

"من خەریکی فێربوونی ڕوو خوێندنەوەم. ئەندازەی نێوچاوانی تۆ سەرنجی ڕاکێشاوم. بەگوێرەی ئەو شتەی خوێندوومە، کەسێکی وەک تۆ بەنهێنی بەردەوام بەپەرۆشە و هەرگیز مێشکی ناحەسێتەوە. زمانی جەستەی تۆ ئەم بارە پێشان نادا، بەڵام ئاخۆ هێشتاش ڕێی تێ دەچێ ئەم قسەیە ڕاست بێ؟".

خۆت ئامادە بکە بۆ دیتنی بزەیەکی زۆرزانانە و پیلانگێڕانە.

٩

## دەم

بۆچی ئێمە لە چاو ڕادەمێنین، بەڵام کە چاومان دەکەوێتە سەر دەم، نیگامان وەردەگێڕین؟ زۆربەی جار ئێمە نامانەوێ نیگامان زۆر لەو شوێنە بەنگ بکەین، مەگەر کەسی بەرامبەر بەنیگایەکی خێرا بزەیەکی گەرممان بۆ بنێرێ. شتەکە وەک ئەم ئاگەدارییە هەڵواسراوەی سەر دووکانێکە: " کراوەیە".

بزە دەرخەری ئەوەیە کە خەڵک دەتوانێ لە کەسەکە بچێتە پێشەوە، بەڵام دەربڕینی تر بەو واتایەن کە خاوەنی دەمەکە چووە بۆ ڕاوەماسی یان هەرچۆنێک بێ دووکانی خۆی داخستووە. بەردەوام ڕەوشتبەرزی وا دەخوازێت خۆمان لە ئەبڵەقبوون لە لێو بپارێزین، مەگەر ئەم لێوانە بەهۆی بزەیەک یان نەختە دەمەتەقەیەک یان ماچێک مەرحەباییمان لێ بکەن.

کەی بۆ دواجار تووشی هاوڕێیەکت بووی کە بەتەنیا و نوقمی دنیای خۆی بووبێ؟ بەبیرت دێتەوە چی ڕووی دا؟ مۆسیقای "سڵاو"ی تۆ وەک زەنگی کارەبایی کاری لێ کرد. هاوڕێیەکەت هاتەوە سەرخۆی و ڕووی خۆی ڕێک خست و لە هەمووی زەقتر دەربڕینێکی بۆ ناو جەماوەری لەسەر لێوی نەخشاند.

بەشێوەیەکی مەجازی، تەنانەت ئەگەر هەوڵیش نەدەین کە بەشێوەیەکی زارەکی یان نازارەکی پێوەندی بەکەسێکەوە بکەین، دەم زۆر زانیاریمان لەبارەی ئەو کەسە بۆ دابین دەکا. هەروەها ڕووخوێنەوە زۆر چێژ لەو زانیارییانە وەردەگری کە ئەم ئەندامە سەبارەت بەچۆنیەتیی خۆدەربڕینی خاوەنەکەی ئاشکرایان دەکا.

## پڕێتیی لێو

پڕێتــیی لێــو، بەواتای ئەوەیە لێــوەکــان تاچ ڕادەیەک پڕ یان تەنانەت گـۆشــتن. بۆ خوێندنەوەی ئەم جۆرەیان تۆ نابێ وەسواس بی کە لێوەکان تەنیا بەگەورە یان بچووک دابنێی. پێویستــە پڕێتیی لێو لە درێژیی دەم جیا بکەیەوە و ئێمــەش بەجیا لێیان دەکۆڵینەوە:

– لێوی پڕ لە ئاراستەیەکی لێوپڕێتی دایە.

– لێوی تەنک لە ئاراستەکەی تر دایە.

ئەو کاتەی سەیری لێوی خۆت دەکەی تکایە وەسواس بی بۆ بزەکردن لە نەینۆکدا. ئێمە دەزانین تۆ خۆت خۆش دەوێ «لانی کەم ئاواتەخوازین ئاوا بی» بەڵام بزە شێوەی دەمت دەگۆڕێ «یان لانی کەم ئاواتەخوازین بیگۆڕێ.»

پرسیار: ئاخۆ هیچ لە بابەتەکە دەگۆڕێ ئەگەر کەسێک ڕقی لە دەمی بێ؟ من بەردەوام ڕقم لەو لێوە بچووکە چرچانەی خۆم بووەتەوە.

وەڵام: پێویستە ئەم شەرمەت فڕێ بدەی و بەدنیا بڵێی: " لێوم بخوێننەوە". گوێ بگرە، ئەستەمە لێوی تۆ لە لێوی "جۆرج. ئێیچ. بووش (ڕەنگە لێوی سەرۆک "کالڤین کۆلیج" تەنکتر بووبێ– "کالیفۆرنیای هێمن"ت بەبیرە؟) تەنکتر بێ، بەڵام ئەو باکی نەبووە لەوەی داوا لە تەواوی وڵات بکا، سەیری لێوەکانی بکەن. گومان لەوەدا نییە مەشقپێدەرانی بووش ئاواتەخواز بوونە ئەو بتوانێ ئیشارەتێکی لێوی پڕ واتا بخولقێنێ کە بەشێوەیەکی گشتی بە "No More Taxes – ئیتر باجی نوێ ناسەپێنرێت" دەرک بکرێ و ڕەنگە مەبەستی بووش ئەوە بووبێ خەڵکەکە ڕاستگۆیی دەربڕینەکەی بخوێنێتەوە، هەروەک بڵێی لێوەکانی تکاکارانە دەرپۆقاندبێ وە یان بۆ سەلماندنی هەڵوێستەکەی سوودی لێ وەرگرتبن.

دواتر بەڵێنەکەی بووش سەبارەت بەباج ڕاست دەرنەچوو و ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەو ڕاستییەی کە ئەو کاتەی لێوی کەسێک بارێکی سەلمێنەر وەردەگرێ، ئێمە متمانەی پێ دەکەین. ئێمە، ئەو ئەمریکییە بەختەوەرانەی ڕووخوێنەوە بووین، هان دراین بۆ خوێندنەوەی لێوی ئەم کابرایە. ئەو پەیامەی سەبارەت بەشێوازی کەسی لە لێوی ئەم پیاوە دەردەچوو، گومانی لێ نەدەکرا. لێوی بووش ئاماژەی بەبەهرەیەکی تایبەت دەکرد. بۆ تێگەیشتن لەم بەهرەیە پێویستە تۆ یەکەم جار شارەزای پڕێتیی لێو بی و دووەم جار درێژیی دەم و سێیەم جار چۆنیەتیی ئاوێتەبوونی ئەم هێمایانە لەگەڵ یەکتر. دواتر لە

خوێندنەوەی دەمە میلیۆنێریەکەی بووش چێژ وەردەگری.

بەڵام با سەرەتا یەکەم شت وەربگرین: پرێتیی لێو پێوەندی بە خۆئاشکراکردنەوە هەیە. ئاخۆ کەسەکە حەز لە باسکردنی بابەتی کەسیی وەک نهێنییە عاتیفییەکان، ڕاتەکانە دەروونییەکان «لەسەر هەردوو ئاستی بچووک و مەزن»، شارەزاییە ئاینییەکان، حەزە سێکسییەکان، بەتامترین دۆندرمەکان، بۆچی ئەو گۆرەوییانەی ئەمڕۆ لە پێیەتی لێک نین و ئاخۆ خەڵکی تر چ شتێک لە کارامەییی ئەو فێر دەبن... دەکا. خۆ تێ دەگەی. بۆ خۆناساندن دنیایەک بابەت هەیە و پرێتیی لێو نیشاندەری ئەوەیە کە باری ئاسوودەیی خودی خۆت لە باسکردن و گوێگرتن لەم بابەتانە لەچی دایە. لەم ڕووەوە ڕادەی پرێتیی لێوی نەناسێک ئاماژەیەکی تەنانەت زۆر پشت پێ بەستراوترە بۆ گوفتاری کەسی، لەوەی پرسیار لە نەناسەکە بکرێ کە ئاخۆ خەڵکی کالیفۆرنیایە یان نا.

لێوی پڕ بۆ تەواو ئاوەڵەکردنی گفتوگۆیەک هێمایەکی سەرسڕهێنە. بەپەرچدانەوەکە بەرهەڵستیکردنە دژی ڕووشکاندنی کەسانی تر بەتایبەتی لە بەردەم خەڵکدا. ئەو بەزمەت لە یادە کە پاش ئەوە دەستی پێ کرد کە"جیمی کارتر"ی لێوپڕ لەلای پەیامنێرێکی "Playboy – پلێیبۆی" دانی بەوە نابوو "دڵی پڕ هەوەس بووە"؟

مەرج نییە کەسانی تا ڕادەیەک لێو تەنک، لەوە بترسێن کە بەهۆی کەتنێکەوە ناو و نیتکەیەک لێ بنرێ، بەرچەرچدانەوەکەیان لە بنەڕەتدا باسکردنی بابەتی کەسییە. "سەرۆک بووش"ی باوک بەنموونە وەربگرە– ئاخۆ دەتوانی بووش بەو شێوەیە بێنییە بەرچاوت کە بۆ هەر پەیامنێرێک، پەیامنێرەکەی "پلێیبۆی"یش بەلاوە، باس لە حەز و ویستەکانی خوی لە هەر ڕوویەکەوە بکا؟

خۆشبەختانە دوان لەسەر سێکس هیچ پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی نییە بەوەی کە ئاخۆ کەسەکە وەک خۆشەویستێک ئاستی کارامەییی چەندە یان چۆنە. نکۆڵیش لەوە ناکرێ کە ئەو لێوانەی تەنکن، زۆر بەکەڵکی سیاسەت و فرۆشیاری و لایەنەکانی تری سەرکەوتن لە بواری کاریدا دێن. ڕەنگە لێوتەنکی یارمەتیی "بووش"ی کوڕی دابێ بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٠دا سەر بکەوێت، لەبەرئەوەی لێوەکانی زۆر تەنکتر بوون لە لێوی "گۆر". و تەنیا بەرەچاوکردنی پرێتیی لێو، ئاخۆ دەتوانی پێشبینیی ئەوە بکەی کە کام کاندیدای سەرۆکایەتی، بووش یان گۆر، لە کاتی کاندیدابوونی لەسەر لیستی حزبەکەی خۆیدا زیاتر حەزی کردووە ماچێکی تەڕ خێزانی خۆی بکا؟ (ڕەنگە "تیپر" تاکە کەس نەبێ کە ئەم بەڵگە خۆئاشکراکەرەی لە یاد مابێ).

بەڵام ڕابواردنی "کلینتۆن" لەگەڵ "مۆنیکا لوینسکی" ڕەنگە نەگەیشتبایە گوێی میدیاکان ئەگەر مۆنیکا ناچار نەبووایە هەموو شتەکە لەلای هاوڕێیەک بدرکێنێ، بەڵام تۆ سەرنجی لێوە زۆر پڕەکانی مۆنیکا بدە «هەروەها بیر لە لێوی سەرەوەی زۆر پڕی بکە کە پێوەندیی هەیە بەدەمشڕی و ئەم هێمایەش دواتر دەخوێنییەوە.»

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێ لێوتەنکی دەشێ بۆ کاروباری بازرگانی بەسوود بێ، وا دابنێ تۆ لە ناو کۆبوونەوەیەکی کاربەدەستە باڵاکان دای. بۆ ئەوەی بەکەسێکی "پشتپێبەستراو" بێیە بەرچاو، هیچ بەپێویستی نازانی باسی بابەتی کەسی بکەی. مەرج نییە تۆ بەخۆئاشکراکردنەوە لە خەڵک نزیک ببییەوە. ئاسوودەییە سنووردارەکەت بۆ دوان لەسەر خۆت، بەرەو جۆری تەواو جیاوازی گفتوگۆ پاڵت دەنێ.

یاساییانە هیچ هەڵە نییە لە کۆبوونەوەیەکدا باسی کەسی بێتە پێش. خەڵک سەربەستە. بەڵام تەنانەت ئەگەر تاکە بەشداربوویەکی سەرەکیی کۆبوونەوەکە لێو تەنک بێ، ئەوا وتە خۆئاشکراکەرەکەت دەشێ مووچڕکێک بەلەشی بەشداربوواندا بڵاو بێنێ.

ئاخۆ لەگەڵ مێشکت دەگونجێ "لی ئاکۆکۆکا"، یەکێک لە کاربەدەستە هەرە بەناوبانگەکانی میللەتەکان، لە ناو کۆبوونەوەیەکی بازرگانیدا پشوویەک وەربگرێ بۆ ئەوەی باس لە حەز و ئارەزووی خۆی بۆ نەمری بکا؟ "دان دیلیلۆ"، نووسەری گۆشەگیر، بەخۆ بەلێوە زۆر تەنکەکانی پێ ناچێ ئەم گرفتەی هەبێ. بەپێی واشنتۆن پۆست دیلیلۆ بۆ ماوەی ٢٠ ساڵە ئەو کارتانە لەگەڵ خۆیدا دەگێڕێت کە لەسەریان نووسراوە: "نامەوێ باسی بکەم".

"گەریسن کێیلر"ی نووسەر و ئەفسانەی ڕادیۆ، گاڵتەی بەلایەنگری لە "مافە شەرمنەکان Shy Kights" دێت. بۆ خۆدەرخستنیش بێگومان ئەو بەخۆ بەو لێوە زۆر تەنکانەی شەرم دەکات. بەڵام ئەگەر بیر لەوە بکەینەوە کە ئەو وەک پێشکێشکارێک بۆ جەماوەرێک دەدوێ، بەئاشکرا کەسێکی شەرمن نییە و ئێمە ئەم لایەنەی شێوازی گوفتاری ئەو دواتر لەم بەشەی کتێبدا باس دەکەین. پێوەندییێک دژیی نێوان جۆرە شەرمێک و جۆرە کتومت پێچەوانەکەی یارمەتیی کێیلر دەدا تا لە کاتی باسکردنی شەرمنیدا ئەوەندە قسەخۆش بێ.

پرسیار: ئەی ئەگەر دەمی کەسێک ناسروشتی بوو و لێوی سەرەوە و ژێرەوەی لەپڕیدا تەواو ناهاوتا بن؟

وەڵام: بەنزیکەیی دەمی هەموو خەڵک ئەو بارە "ناسروشتی"یەی هەیە. خوێندنەوەی

پڕێتیی لێو بریتییە لە هەڵسەنگاندنێکی گشتیی پڕێتیی بەرچاوی هەردوو لێو، بەتێکڕایی. بەڵام ئێستا کە تۆ لەم جۆرە شارەزا بووی دەتوانی بەرەو پێش و بەرەو جۆری ئەندازەکانی لێو هەنگاو بنێی.

## ئەندازەکانی لێو

بۆ خوێندنەوەی ئەندازەکانی لێو، ئەوەی پێویستە بیکەی، بەراوردکردنی پڕێتیی لێوی سەرەوە لەگەڵ لێوی ژێرەوەیە.

– زۆربەی خەڵک لێوی ژێرەوەیان تا ڕادەیەک لە لێوی سەرەوە پڕترە و من ناوی "لێوی ژێرەوەی لەپڕیدا ناوەند"ی لێ دەنێم.

– ئەو لێوانەی کە لەم پێوەرە لا دەدەن، خوێندنەوەیان زۆر خۆشترە. "لێوی ژێرەوەی زۆر پڕ" بەو واتایەیە کە لێوی ژێرەوە دوو، سێ، یان چوار ئەوەندەی لێوی سەرەوەیە.

– هەرچی "لێوی سەرەوەی زۆر پڕ"یشە تێیدا لێوی سەرەوە و لێوی ژێرەوە لەپڕیدا هاوتان.

پرسیار: کەواتە لێوی سەرەوە وەک لێوی ژێرەوە مەرج نییە دوو یان سێ ئەوەندەی پڕێتیی هەبێ تا بەهێمایەکی تایبەت هەژمار بکرێ؟

وەڵام: تەواوە. بڕوام پێ بکە ئەگەر لێوی سەرەوە بەهەمان ڕادە یان تا ڕادەیەک لە لێوی ژێرەوە پڕتر بێ، هێشتاش بەزەحمەت بەکەسەکە ڕادەگیرێت.

ئەندازەکانی لێو دەرخەری دژایەتیی نێوان ڕادە بەراوردییەکەی دوان لەسەر بابەتی تایبەت بەڕاستییەکان و بابەتی بابەتیانە «کە لێوی ژێرەوە دەریان دەبڕێ» و ڕادە بەراوردییەکەی گوفتار لەسەر بابەتی هەستی و بابەتی زەینییە «کە بە لێوی سەرەوە دەردەبڕدرێن.»

پرسیار: بوەستە. مەبەستت ئەوەیە لێوی سەرەوە ئەگەر پڕ بێ، دەرخەری شێوە گوفتارێکی عاتیفییە؟

وەڵام: نەخێر. هەر بەشێکی لێو دەتوانێت دەربڕی گوفتارێکی دەرخەری پەرۆشییەکی عاتیفیی گەورە بێ یان واش نەبێ. پڕێتیی لێوی سەرەوە پێوەندیی بەو گوفتارانەوە هەیە کە تایبەتن بەبابەتی دەروونی و کەسی و تەنانەت نهێنیش.

زۆربەی ئەو خەڵکەی لێوی ژێرەوەیان لەپڕیدا ناوەندییە زیاتر باسی ڕاستییەکان دەکەن،



لێوی ژێرەوەی زۆر پڕ



لێوی ژێرەوەی لە پڕیدا ناوەندی



لێوی سەرەوەی زۆر پڕ

ئەندازەکانی لێو

نەک وردەجیاوازییەکان. بەپێچەوانەوە لێوی ژێرەوەی یەکجار پڕ شتێکی زۆر گرینگە، زانینی ئەو شتە ئەوەندە گرینگە کە تەنیا ئەو زانیارییەی کە لە خوارەوەدا هاتووە، هەموو ئەو پارەیە دێنێ کە بەم کتێبە دراوە.

واتای ئەم ئەندازەییەی لێو برێتییە لە قایلکردن. "لایلەن یانگ"، سەرناسترین پیشەگەری "سیانک مێین" دوای مەرگی "تێمێسی مێیر"، زاراوەیەکی پڕبەپێستی بۆی داناوە: لێوی خاوکەر Blarney Lips . ئاخۆ هەرگیز باسی ماچکردنی "بلارنی ستۆن/ بەردی بلارنی"ت بەرگوێ کەوتووە؟ بەگوێرەی فۆلکلۆری ئیرلەندا ئەم تاوێرە بۆ وەرگرتنی بەهرەی زۆربێژی، ماچ دەکرێ. لەو ساتە بەدواوە کە تۆ بەردەکەت ماچ کرد گوفتارت – جا با هەر شتێک بێ– کەسی گوێگر قایل و ئەفسوون دەکا.

بۆچی قایلکردن بەهەند وەرگیراوە؟ وەک کڕیارێک تۆ دەتوانی هەر کاتێک کە کەسێکی خاوەن لێوی خاوکەر بیەوێ شتێکی ناپێویستت پێ ساغ بکاتەوە، وریایی بگرییە بەر، جا ئەو شتە ڕەنگە نەخشەی خانووی سەهۆڵی بێ کە بۆ ئێسکیمۆکان پێویستە یان خاوێنترین برغۆی ئامێرێکی سەمونقاشکەر بێ و، یانیش ڕەنگە ئەو کەسە بیەوێت ناچارت بکا ئەو کاتەی وەک بازاڕدۆزەرەوەیەکی تەلەفۆنی کار دەکەی و حەمکە حەمکە پارە کۆ دەکەیەوە خەڵکت بەکۆڵ دابنێ.

هەر کە چاوت بەو لێوانە کەوت گوماناوی بە. مەبەستم ئەوە نییە خەڵکی خاوەن ئەم جۆرە لێوە، مەرجە تەڵەکەباز بن، بەڵکو قایلکەری لێهاتوون. ئەو کاتەی واشنتۆن مەگازین لیستەیەک لە ناو ٥٠ ڕۆژنامەنووسی هەرە کاریگەری میللەتەکەمان بڵاو کردەوە من توانیم لە ناویاندا ٤٦ کەسی خاوەن لێوی خاوکەر کە زۆربەیان ڕادەی زۆری هێماکەیان هەبوو، دەستنیشان بکەم. بەڵام بۆ تێکڕای خەڵکی خاوەن لێوی ژێرەوەی لە پڕیدا ناوەندی ڕەنگە تۆ بتوانی لە ناو ٥٠ کەس ٢ کەس و لە ناو ٥٠٠ کەس تەنیا دوو کەسی خاوەن ڕادە زۆرەکەی هێمایەکە بدۆزییەوە.

پاش ئەم شیکردنەوەیە ڕیزبەندێکی هەڕەمەکیی ناوی کۆمەڵە خەڵکێک هاتووە کە تەنانەت بەناوبانگترن لەو ڕۆژنامەنووسانەی خاوەن لێوی خاوکەرن. ڕەنگە تەنیا بە ژمارەیەک لەم کەسانە سەرسام بێ. خاڵە هاوبەشەکەی ئەم کەسانە برێتییە لەو وزە تایبەتەی کە لە ئەندازەکانی لێویان دایە کە هەڵگری بەهرەی قایلکردنە.

ئەگەر تۆش لێوی خاوکەرت هەبێ، پیرۆزباییت لێ دەکەم. توانای قایلکردنت ڕەنگە

ئەوەندە بەئاسـانی کارا بووبێ کە بەپێویسـتت نەزانیبێ زۆر بیـری لێ بکەیەوە. ئەم هێـمایە زیاتر لە هـەر هێـمایەکی تری ڕوو، ئاماژە بەسـەرکەوتن دەکا. تەنیـا ئەوەت لە یاد بێ کە ئەم بەهرەیە بەڕاستگۆییەوە بەکار بهێنی.

ئەگەر خاوەنی لێـوی سـەرەوەی زۆر پڕ بی ناوێکی تر بۆ ئەو بەهـرەیەت برێتییـە لە قسـە لە ڕووبوون.

ئەم بەهرەیەش سـێ بەشـی لە خۆ گرتووە:

١- تۆ ئاگات لە هـەموو هـەست و خوستێک هـەیە.

٢- زمـانێکی پاراوت هـەیە و دەتوانی بـۆ دەربڕینی وردە جـیـاوازییـەکـان وشـەی گـونجـاو بدۆزییەوە.

٣- تۆ دەتەوێ شتەکە بەهـەمووان ڕابگەیەنی.

ئەم بەشـەی کۆتایی بەزەحمەتە لەبەرئەوەی ئەو کەسـەی کە تۆ دەتەوێ قسەکەی پێ بڵێی ڕەنگە حـەز نەکـا گوێت لێ ڕابگرێ. ئاریشـەکـەت برێتـییـە لەوەی فـێر ئەوە بی کـە قسـە نەدرکێنی، تەنانەت ئەگەر قسەکە گرینگیش بێ. ئەگەر خۆت بۆ ڕانەگیرا ئەوا بەرهـەڵستیت دەکرێ. تەنانەت بەر لەوەی دەمە پاراوەکەت بکەیەوە خەڵک لێت دەکەونە شک و گومان.

لەگەڵ ئەوەشدا خـەڵکی بێ باکی قسە لە ڕوو هـەندێک جار بەبۆنەی درکاندنی واقیعـەوە دەستخۆشییان لێ دەکرێ. "چیف سیاتێڵ" تاکە ئەمریکیی خۆماڵییە کە شارێکی سەرەکیی ئەمـــریکای بەناو کـــرابێ. "چێن نینگ یانگ"ی فـــیـــزیازان خـــەڵاتـی نۆبـڵـی بردووەتەوە، "ئاروندەتـی ڕۆی"ی ڕۆمـاننووس بەبۆنەی نـووسـینی "The God of Small Things – خـوای وردە شتەکان" خەڵاتی "بووکر"ی بێزووپێوەکراوی بردووەتەوە_ بەڵێ -وردە شت، بەڵام ڕۆی بەهـەرحاڵ وەسفی کردوون.

"مـــاریان ڕایت ئێـــدڵمـــان" چاونەترســـانـە نوێنـەرایەتـیی منداڵانی کـــردووە و دەزگـــای بەڕێوەبردنی پارەی تەرخـانکراو بـۆ داکـۆکی لـە منداڵانی دامـــەزراندووە. "ڕۆبێـرت فـلاک" بەپەرۆشـییـەکی سـەرووئـاساییەوە گـۆرانی وتووە. سـیتکۆمـی "گـەری شـاندلینگ" بەبەڵگەوە گاڵتـەئامـێزترین سـیـتکۆمی تەلەڤزیۆنی بووە. ئەو زۆربـەی جـار شـتـی ئەوتۆ باس دەکا کـە بەبۆچوونی خەڵک شیـاوی باسکردن نییە. "لۆریتی مایا ئەنجێلۆ"ی شاعیریش لە درکاندنی واقیـعـە سـەرسڕهێنەکانـدا دەستـبـاڵایە. لە "Even the Stars Look Lonesome – تەنانەت ئەسـتێرەکـانیش تەنیـاییـیـان لێ دەبارێ" چیرۆکێکی قـۆشمـە لەبارەی حـەز وئارەزووەکـانی

دایکی دەگێڕێتەوە و لەبارەی خۆیەوە دەنووسێت: " من گەیشتوومە ئەو تەمەنە نازەنینەی کە تێیدا دەتوانم دان بەوە بنێم لەشپەرستی بەهەمان ڕادەی حەز و ئارەزووەکانی سێکسی و هەندیک جار زیاتریش ئارەزووم دەشکێنێ". سنوورێکی تریش بەدەستی مایا وردوخاش کرا.

پرسیار: ئەی ئەگەر کەسێکی وەک من لە فرۆشیاریدا کار بکا و ئەو جۆرە دەمە قسە لە ڕووەی هەبێ؟ ئاخۆ پێویستە من نەشتەرگەرییەکی لێو بکەم بۆ ئەوەی لێوم بگۆڕم بەلێوی خاوکەر؟

وەڵام: تۆ بەهەر جۆرە هێمایەکی ڕوو دەتوانی سەرکەوتوو بی. ئەمە پەیامە شاراوەکەی ڕوو خوێندنەوەیە. پەیامێکی تریش ئەوەیە کە تۆ خاوەنی هەر هێمایەک بی، ئەو هێمایە هەر بەکەڵکت دێ.

پرسیار: بەڵام من هەر بیروبۆچوونەکانم دەدرکێنم و شتی ئەوتۆ دەڵێم کە خەڵک دەهەژێنن. ئەمە حاڵی ژیانمە. ئاخۆ چۆن دەکرێ ئەم هێمایە لە بەرژەوەندی فرۆشیاریدا بەکار بهێنرێ؟

وەڵام: ئەگەر تازەکار بی بەژیرییەوە کاڵاکانت هەڵبژێرە بۆ فرۆشتن. بۆ تۆ ڕەنگە کارگوزارییەکان لە فرۆشتنی بەرهەمەکان ئاسانتر بێ لەبەرئەوەی تۆ دەتوانی پێداویستییە نەدرکاوەکانی کڕیارەکان لەبن زمانیان دەربێنێی.

سەرەڕای ئەمەش فرۆشیارانی سەر بەهەر تاقمێک پێویستە ڕاستەوخۆ چاو ببڕنە دەمی کڕیارەکان. ئەگەر کڕیارەکەت لێو پڕ بوو تۆ دەتوانی بۆ بەرژەوەندی فرۆشیاریت خۆبەخشانە هەندێک لە شارەزاییەکانی خۆتی بۆ باس بکەی. بەڵام کڕیاری لێو تەنک پێت دەڵێ. "ئەو دەمەت زۆر مەکەوە دەنا دەمفڕێنی".

## کەسانی خاوەن لێوی زۆر قایلکەر

ئێلڤیس پریسلی: گۆرانیبێژێکی نەمر «و بۆ هەندێک خەڵک جەستەنەمر.»

پەت بوچانان: کاندیدی سەرنەکەوتووی سەرۆکایەتی کە لە کتێبەکەیدا بەناوی "ئێ ڕیپابلیک، نات ئن ئیمپایر/ کۆمارێک نەک ئیمپراتۆریەتێک" قایلکەرانەترین بیروبۆچوونی ریڤیژنیستەکان بۆ دژایەتیکردنی هیتلەر، دەخاتە ڕوو.

مارگارێت تاتشەر: سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن.

کیۆکوک: سەرۆک خێڵ

بیل گێیتس: ئێستا سەرکردایەتیی خێڵی کۆمپیوتەرکارانی ئەمەریکا دەکا

ئەندی وارۆڵ: ئەو هونەرمەندە کولتوورییەی ناوی لە ناو ڕیزبەندەکەی ئێمەدا هاتووە.

پابلۆ پیکاشۆ: هونەرمەندی بۆچوونگەرا، تەنانەت ئەو کاتەش کە تەنیا ڕەنگی شینی بەکار هێنابێ

هەریسن فۆرد: ئەکتەری خاوەنی زۆرترین جەماوەر لە ناو مێژووی سینەمادا.

ڕاسڵ بێیکر: یەکێک لە وشکترین بلیمەتەکانی ئەمەریکا.

فران لیبۆویتز: بلیمەتێکی تەنانەت وشکتر کە ئەم بلیمەتییەی بەجۆرە قایلکەرایەتییەک دەربڕیوە کە دەبێتە هۆی ئەوەی خوێنەر بەشێوەیەکی کاتەکی وا هەست بکا بۆ خۆشی قسەزانێکی وشکە.

دێیڤ بێری: ئەمریکییەکان ئەمیشیان بەدڵکەرەوە لە قەڵەم داوە «لە خۆمانەوە وا ناڵێین»

ڕوش لیمبا: پێشکێشکارێکی بەرنامەی ڕادیۆیی ئەوەندە بەپەرۆش بوو کە پڕوپاگەندەی بۆ نووسەنەکی زلی ئەوتۆ کردووە کە لەسەریان نووسراوە "ڕوش ئیز ڕایت/ ڕوش ڕاست دەکا"

ڕۆجر هۆرشۆ: حەز لە فرۆشتنی کاتالۆگ دەکا

لێری کینگ: دەستباڵایەک لەشۆی وتووێژیدا

ئاڵ کێیپن: یەکێک لە کارامەترین تاوانباران

جێری فاڵوێڵ: کۆنە شرۆڤەکارێکی بەناوبانگی ئینجیل لەسەر تەلەڤزیۆن

پێ. تێ. بارنم: بەڕێوەبەری سێرک کە وتویەتی:" لە هەر چرکەیەکدا خۆشباوەڕێک لە دایک دەبێ".

## درێژیی دەم

ئێستا کە تۆ شارەزاییت لە هەموو شێوازەکانی پڕێتیی لێو پەیدا کردووە، واتای ئەوەیە ئامادەییت هەیە بۆ وەرگرتنی جۆری درێژیی دەم.

– دڵنیا بە لەوەی فێری خوێندنەوەی لێوی کورت ببێ.

– سەرسام بە بەلێوی درێژی بەبەراورد دەگمەن.



لێوی درێژ



لێوی کورت



لێوی لە درێژیدا ناوەندی

درێژیی دەم

– سەرنجی لێوی لە درێژیدا ناوندیی خەڵک بدە.

بۆچی هەر ئێستا درێژیی دەمی خۆت ناپێوی؟ ئەگەر دەیپێوی، تکایە نەکەی پێ بکەنی، لەبەرئەوەی بۆ خوێندنەوەیەکی وردی ئەم جۆرەیان، دەبێ دەمت دیسان ڕابگرییەوە.

ڕەنگە ئەوە بزانی کە گەورەترین ترسی ئەمریکییەکان برێتییە لە دوان لە ناو جەماوەردا. بۆ خۆت برۆ تاقیی بکەوە. ترسەکە تەنانەت لە ترسی مەرگیش زیاترە.

من دەتوانم پێوەندییەک ببینمەوە. وەک زۆربەی خەڵک منیش لێوم کورتە کە ئەمیش هاوڕێیە لەگەڵ مەیل بۆ گفتوگۆیەکی دووقۆڵی. فێربوونی ئاخافتن بۆ جەماوەر ڕەنگە بۆ کەسانی وەک ئێمە ئاریشەیەکی مەزن بێ. ئەو کاتەی من بەمەبەستی فێربوونی ڕاهێنەرایەتیی ڕامان سەرقاڵی خوێندن بووم تووشی ئەم گرفتە بووم. دەبووایە وانەی گشتی بدەمەوە. پاش چەند مانگ مەشقی بەسوێ یەکەم وتاری خۆم پێشکێش کرد. هەرچەندە تەواوی گوێگرانیش فێرخوازانی ڕاهێنەرایەتیی ڕامان بوون و تا ڕادەیەک هەمان وتارەکەیان لەبەر بوو، بەڵام نەدەوێرام سەیری تاکە کەسێکیشیان بکەم. لەجیاتی تێبینییەکانی خۆمم ڕاستەوخۆ لە ڕووی لاپەڕەکەوە دەخوێندەوە.

پاشان سەرم هەڵبڕی و لە کۆتاییدا وێرام چاو ببڕمە ناو چاوی جەماوەرەکەم. ١٥ کەس گوێیان لێ گرتبووم. هەر هەموویان هەڵدەلەرزین– بەشێوەیەکی جەستەیی هەڵدەلەرزین «هەمم. دیارە تا ڕادەیەک سامی خۆمم کاریگەرانە بڵاو کردبووە». چەند ساڵی برد تا فێری ئەوە بووم دەسەڵاتی خۆم ویستەکییانە بەکار بهێنم. ئێستا کە بەسەر ئاریشەکەدا زاڵ بووم، دەتوانم سوود لەو بەهرانە وەربگرم کە هاوڕێی لێوی کورتن: نیازپاکی و ڕاستگۆیی.

دوو مرۆڤی لێو کورت باشترین سوودیان لەم بەهرانە وەرگرتووە. مەبەستم "سورگوود مارشاڵ" و "ڕوس بێیدر گینسبێرگ"ی دادوەرانی دادگەی باڵان. "جانێت ڕینۆ"ی داواکاری گشتی نموونەی کەسێکی ڕاستگۆی یەکدڵە، تەنانەت لەو کاتەش کە درابێتە بەر لێشاوی ڕەخنە. لە جیهانی سەرگەرمیشدا ڕەنگە هۆی سەرکەوتنی "باربارا واڵترز" بگەڕێنییەوە بۆ شێوازە نیازپاکانەکەی کە بەشێوەیەک چاوپێکەوتنکارانی ئەفسوون دەکا، کە وا هەست بکەن دوو بەدوو دەدوێن نەک لە بەردەم ملیۆنەها خەڵک.

لێوی درێژ زیاتر لە ناو بواری وەشاندندا ڕەواجی هەیە. ئەم لێوە ئاماژە بەتوانای ئاخافتن لەگەڵ هەموان دەکا. پێشکێشکارانی شۆی وتووێژیی تەلەڤزیۆنی لەم بەهرەیە و ڕاستەخۆ لە کارە دەستپێشخەرانەکەی "فیل دۆناو" سوودمەند بوون. تۆ ئەمڕۆ دەتوانی

ژمارەیەکی زۆر پێشکێشکاری لێو درێژ ببینی بەلەخۆگرتنی "دێیڤید لێترمان" و "جوان ریڤرز" و "چارڵی رۆز" و "مۆری پۆڤیچ".

دۆستایەتی ناوێکی ترە بۆ ئەم بەهرەیە. ئاریشەی ڕێ تێچوو برێتییە لەوەی کە کەسەکە خۆگونجێنەرێکی کۆمەڵایەتییە، مەبەستی تۆ لە قسەکردن تەنیا گەرمگرتنە لەگەڵ ئەندامانی گرووپەکە و پاش بیرێکی قووڵ دەگەیە ئەوەی کە ئەو شتەی وتووتە لە ڕاستیدا بیروبۆچوونی خۆتە. بەهەرحاڵ ئاخۆ دەبێ بیروبۆچوونی خۆت پێشتر چی بووبێ؟

ئەو کاتەی "جولیا ڕۆبێرتز"ی ئەکتەر شووی کرد بە"لایل لۆڤێت" دوو کەسی زۆر لێو درێژ پێک شاد بوون. هەرچەندە ماوەی هاوسەرێتییان تاسەر نەبوو، بەڵام پێ دەچێ وەک هونەرمەند جەماوەرکێشییە درێژخایەنەکەیان بەڵگە بێ، بۆ دڵرفێنیی ئەو لێوانەی کە بەشێوەیەکی خوازراوە دەسەڵاتیان بەسەر فراوانترین ژمارەی ڕێ تێچووی جەماوردا هەیە.

پرسیار: ئەی لێوی ناوەندیی وەک لێوی من؟ سوودەکەی چییە؟

وەڵام: تکایە ئەو هێمایانەی کە ناوەندین بەکەم مەزانە. ئەگەر درێژیی لێوت ناوەندی بێ مەودای ئاخافتنت توانای گۆڕانی هەیە. بەهەمان ڕادەی ئاسوودەییت بۆ ئاخافتنی دووقۆڵی بەهەمان ڕادەش بۆ دوان بەرامبەر ئاپۆرەیەکدا «بەتایبەتی ئەگەر تۆ شەش حەوت جار یان زیاتر دەرفەتی مەشقکردنی وتاردانت هەبووبێ» تووشی سەرئێشە نابی. بەهێزترین شێوازی خۆدەربڕینت ڕاستگۆییییە، بەڵام تۆ لە درۆکردن دەستبالاتری لە خەڵکی لێو کورت کە زۆربەی جار لە درۆکردن یەکجار کارامەن. لە ئاهەنگێکدا دەتوانی هەروەک کەسانی لێو درێژ ڕۆڵی پێشکێشکاری وەربگری، بەڵام بەلاتەوە ئاسانترە کە لە ڕێی ئاخافتنەوە ببیە جێی سەرنجی ئاپۆرە.

بەشێوەیەکی گشتی، شێوە ئاخافتنێکی گونجێنەرانە ژیانت ئاسانتر دەکا. تاکە ئاریشەت پشووکورتییە، بەرامبەر بەخەڵکی تر. لە هەمان کاتدا خۆگونجاندن شتێکی بێ بایەخ نییە. لێوی لە درێژی و لە پانیدا ناوەندی سوودبەخش بووە بۆ"جۆنی کارسن"ی پێشکێشکاری تەمەندرێژترین و کاریگەرترین شۆی گفتوگۆئامێز تەلەڤزیۆنی. لێوە لە درێژیدا ناوەندییەکەی "واڵتر کرۆنکایت"ی بێژەری دەنگوباس تا ڕادەیەک سوودی پێ گەیاندووە و هەمان شت ڕاستە بۆ "داستن هۆفمان" کە وەک ئەکتەری ئەکتەران ڕێزی لێ نراوە.

## بەهرە تایبەتییەکانی لێو

خۆ تۆ بڕوات بەوە هەیە کە پەرییەکی تایبەت بەددان هەیە... پەرییەکی دەمیش هەیە. ئەو پەرییە کۆمەڵە بەهرەیەکی ئاخافتنی بەخشیوە بەخەڵکی تایبەت کە خاوەن لێوی زلن. تۆش ڕەنگە یەکێک لەو خەڵکانە بێ.

ئەمانە ئەو بەهرانەی دەمن کە هێشتا باسمان نەکردوون:

– لێوی زۆر درێژی تەنک

– لێوی زۆر درێژی پڕ

– لێوی زۆر کورتی تەنک

– لێوی زۆر کورتی پڕ

لێوی زۆر درێژی تەنک، ئاماژە بەدەمێکی میلیۆنێر دەکا. "جۆرج بووش" و هەروەها "لی ئاکۆکۆکا"، ئەو پیاوەی بەپەڕەشووت خۆی لە"کریسلێر" هەڵدایە خوارەوە خاوەنی ئەم دەمەن. "گەریسن کێیلر"یش هەمان هێمای هەیە کە ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی پێشتر وتم دەمی کێیلر بەڕاستی شەرمن نییە.

دەمی میلیۆنێر زۆر بەکەڵکی سیاسەت یان بازرگانی یان گاڵتەی بەتەوس دێت لەبەرئەوەی واتای ئەوەیە تۆ دەتوانی لەگەڵ هەر کەسێک لەسەر هەربابەتێک بدوێی «تا ئەو مەودایەی کە باسی کەسیی خۆت نەهێتە پێشەوە». مەرج نییە وتەکانت دەقاودەق ڕاست بن. بەڵام ئاپۆرەکە چەندیش گەورە بێ، قسەکانت وەردەگرێ.

کەسانی خاوەن دەمی میلیۆنێر لەبەرئەوەی کارهێنە ڕێ تێچووەکانیان ناخەنە بارودۆخێکی ئەوتۆ کە بەهۆی خۆئاشکراکردنەوە ڕووشکێن بکرێن، ئەوا دەتوانن هەمەچەشنانە سامانەکانیان گڵ بدەنەوە، هەروەک لەباری "فۆرێست مارس"ی باوک، پیاوی نوقڵفرۆش «فرۆشیاری حەبی ڕێگە پێنەدراو» وە یان "سام واڵتن"ی دامەزرێنەری فرۆشگای زنجیرەییی وۆڵمارت، کە لە کاتی کۆچکردنیدا بەزەنگینترین پیاوی ئەمریکا ناسرابوو، دەردەکەوێ. "کۆردیل هاڵ" هەروەک دامەزرێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان، زمانە دیپلۆماسییەکەی بۆ خزمەت بەمرۆڤایەتی بەکار هێناوە.

لێوی زۆر درێژی پڕ زیاترین وشە بەکار دێنێ. من ئەم دەمە بەدەمێکی لە زگماکەوە قسەکەر ناو دەنێم. بیر لە "ئێیمی تان"ی نووسەری پڕفرۆشترین کتێب بکەوە کە خولیای

حەسێنەری ئەوەیە بەشداری لە تیپێکی ڕۆکدا بکا. مامۆستای لەشجوانی ئافرەتان، "سوزان پۆتر"ی مێپەروەر، بەڕادەیەکی سەرسوڕهێن کێشی لەشی دابەزاندووە، بەڵام خۆشبەختانە تاکە ئاونسێکیش لە لێوەکانی کەم نەبووتەوە.

دژوارە بتوانی کەسێکی خاوەن ئەم هێمایە بدۆزییەوە کە هەستێکی گاڵتەجاڕیی سەیروسەمەری نەبێ کتومت وەک ئەوە وایە کە نەتوانی "ئێدی مۆرفی" بەکەسێکی لێو کورتی لێو تەنک بێنییە بەرچاوت.

بەڵام لێوی زۆر کورتی تەنکیش بەهرەی تایبەت بەخۆی هەیە. من ئەم لێوە بەلێوی خۆیی ناو دەبەم. بەڵێ، خاوەنی ئەم لێوە ڕەنگە هەستی خۆی دەرنەبڕێ، سووکایەتیپێکردنەکانی ڕابردوو بخاتەوە یادی و بەبۆنەی کەمدووبوونی هاوڕێیەکانی خەیاڵشکاو بکا. بەڵام ئەگەر دەمی بکاتەوە ڕەنگە وتەکانی ئەوەندە بەهێز بن کە خەڵک لە ناخەوە بتەزێن. نموونەکانیش بریتین لە"بۆب دیلان"ی گۆرانیبنووس و "مێیری کێی ئەش"ی سەرناسی بواری میکیاژ و "گیۆرگیۆ ئارمانی"ی نەخشەدانەری شێوازە دڵڕفێنەکانی بەهەندوەرنەگیراو.

با جۆرە دەمێکی یەکجار سەرنجڕاکیشی تر لە یاد نەکەین. لێوی زۆر کورت و پڕ کە هەڵگری ناوی باشترین هاوڕێیە. ئەم لێوە ئاماژە بەدرکاندنی ڕاستی دەکا، تەواوی ڕاستییەکان بەبێ پێچوپەنا. بەڵام تاکە کەموکوڕییەکی هەیە. ئەم گفتوگۆ بەپێزە بەزۆری دووقۆڵییە. ئەم تایبەتمەندییە هەستبزوێنەریی ئەم جۆرە لێوە بەتینانە ڕەنگە بتوانێ جەماوەرکێشیی "ڕیچارد گێر" و "میشێل کیتن"ی ئەکتەر ڕوون بکاتەوە.

پرسیار: ئێستا وادەی داننانە، باشە؟ من هێشتاش ڕقم لە لێومە، باشە؟ من هەرگیز حەزم لە شێوەی لێوم نەبووە و پاش ئەو هەموو باسەی کە لەبارەی ئەو جۆرە لێوانەی کردت، هێشتاش هەر حەزی پێ ناکەم. ئێستا تۆ چ ئامۆژگارییەکت هەیە؟

وەڵام: کەس زۆرت لێ ناکا حەز لە ڕووی خۆت بکەی. بۆ زۆربەی خەڵک ئەوە بەسە کە بزانن واتای هەر هێمایەکی ناپەسندییان چییە تا سەرلەنوێ بەچاوێکی تر سەیری ئەو هێمایە بکەنەوە. کەچی لەباری تۆ و دەمی تۆدا، پێ دەچێ چارەسەرێکی زۆر دژوارترت بۆ دابنێین– نەشتەرگەرییەکت پێویستە.

پرسیار: مەبەستت نەشتەرگەری جوانکارییە؟

وەڵام: نەخێر ناوی ئەم نەشتەرگەرییە لە نەشتەرگەریی جوانکارییەوە وەرگیراوە، بەڵام نەشتەرگەرییەکی سەرپێییە کە تێیدا دڵۆپە خوێنێکیشت لێ ناچکێت. وە بەتەواوەتی

نەشتـەرگەرییـەکی خـۆکردانەیە. ناوی لێ بنێ لیـپۆسـاکشن. بۆ ئەم جۆرە لیـپۆسـاکشنە پێویست نییە جەستەت سڕ بکرێت یان کەسێک چەوریت لەڕانەوە هەڵێنجێ. تاکە ئامێری پێویستت نەینۆکێکە. ئێستا نەینۆکێک بەدەستەوە بگرە. ئامادەی؟

تا دەتوانی بەقـەیمی لێوت بۆ ناوەوە هەڵمژە. لێوەکانت بەددانـەوە بنووسێنە و تا تینت تێـدایە ئەم لێـوانـەت هەڵلووشــە هەروەک ئەوەی بتــەوێ بەیەک جـاری لـە چنگ ئەم لێـوانە ڕزگارت بێ. با ڕووت ئەم بارە بەر نەدا.

جوان سـەیر بکە. ئاخۆ بەم شێوەیە ڕووی خـۆت پێ جوانترە؟ ئەگەر وایە بـەردەوام کە لە نەینۆکدا سـەیری خۆت دەکەی، دەتوانی ئەم چارەسـەرە وەربگری. ئەگەر نا دان بەوەدا بنێ کە لێوە سروشـتییـەکـانی خـۆت بێ کەموکووڕین. هەر بۆیەش ئاسـوودە بە. ئەم لێوانەت خۆش بوێ.

١٠

## شەویلگە و چەناگە

ڕاستـە، ڕەنگە شـەویلگە و چەناگـە وەک چاو پڕ هـەست نەبن، بەڵام هێـڵی ژێرەوەی ڕوو پێک دێن و دەرخـەری بابەتی بنچینەییی تایبەت بەبنەما و خوو و ڕەوشت و هەڵبژاردن و چۆنیەتیی بەرەنگاربوونەوەن.

تا ئێستا دەبێ تۆ گەیشتبییە ئەو ئاستـەی کە گرینگبوونی چەناگە و شەویلگەت بەلاوە سەیر نەبێ، وا نییە؟ ئێستا کە تۆ لەوە تێ گەیشتووی کە ئەندامەکانی ڕوو ژیانێکی تایبەت بەخۆیان هەیە کەواتە ئەگەر بەڕێز "پتێیتۆ هێد"ت لە شەقامدا لە پیاسەکردندا بینی، نابێ هەست بەهیچ شتێکی سەیر بکەی جگە لەوەی کە ئەم بەڕێزە لە قەدەر کەسێکی هەراش نییە و، ئەگەر ئەم بەڕێزە گوێیەک یان لووتێکی تری بۆت هەڵدابێ ڕەنگە تۆ بەدڵخۆشییەوە خستبێتە ناو بەرکت نەوەک ڕۆژێک پێویستت بێ. ژێریی ڕووخوێنەوەیەکیش بەم ئاسایەیە. تۆ دەزانی لە ڕوودا هیچ شتێکی بێ کەڵک یان بێ نرخ بەدی ناکرێ. هەموو ئەندامەکان وێڕای چەناگەش گرینگن تەنانەت ئەگەر بەگشتی ئەم ئەندامانە بەڕادەی پێویست دڵگیر یان ڕێزلێگیراو نەبن. بەڕاستی خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم کە بتوانم لەم بەشەی کتێبەکەدا ناوە نازدارەکەی ئەو ئەندامە بگەڕێنمەوە کە بەگشتی و بەناشیرینی بەچەناگەی "لاواز" ناسراوە، لە چ ڕوویەکەوە لاوازە؟

تۆ تووشی حـەپەسـان دێی. بەڵام با سـەرەتا ئاراسـتـەی سـەرنجـمـان لە چەناگـەوە وەربگێڕین. با لەو پێکهاتە ئێسکانییـە بکۆڵینەوە کـە لە ناو خۆیدا جـومگەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە.

## پاناتیی شەویلگە

ئێستا کاتی باس لە پاناتیی شەویلگە هاتووە.

– ئاخۆ بەوردی شەویلگەکانت چەند پانن؟ با بەم شێوەیە ئەمە لێک بدەینەوە. تۆ دەتوانی چەند زارجوو بنێشت لە ناو ئەو دەمە بئاخنی و هێشتاش کەس ئەم زارجوانە نەبینێ. تکایە لانی کەم یەک جار لە پیشەی ڕووخوێنەوەیتدا ئەو دەرفەتە بدە بەخۆت کە بەبێ بنێشت پاناتیی شەویلگە دەستنیشان بکەی. کەسێک بدۆزەرەوە کە لە ڕووبەڕووەوە شەویلگەکانی پان دیار بن «کەسێک کە پرچێکی مودێل کورتی هەبێ» و لە پشتەوەش سەیری ئەم کەسە بکە. ئاخۆ دەبینی کە شەویلگەکانی چەند دەرپەڕیون؟ واو! ئەم شەوێلگانە پانن.

– ناسینەوەی شەویلگەی باریک دژوارترە، تەنانەت لە ڕووبەڕووشەوە. ئەم شەوێلگانەش هەروەک شەویلگەی پان ئاشکرا نین. بۆت هەیە ئەم جۆرە شەوێلگانە پشتگوێ بخەی، بەڵام وەک ڕووخوێنەوەیەک نابێ فەرامۆشیان بکەی.

– شەویلگەی ناوەنجی ئەو هێمایەیە کە زۆربەی خەڵک خاوەنیەتی. ئەگەر سەیری پاناتیی گشتیی ڕوو بکەی، شەویلگەکان بەگوێری ئەم پاناتییەن و نە زیاتر و نە کەمتر لەو ڕووبەرەی کە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر کوڵم دەرپەڕیون.

شەویلگە ئاماژە دەدا بەدوو لایەنی پێوەندیداری ژیان: هێزی جەستەیی و کوڵنەدانی ڕۆحی.

جگە لە ژمارەیەکی کەم ڕیزپەڕ، شەویلگەی پان مەرجێکی داواکراوە بۆ پیشەی پیاوانە- و بۆ نموونە لە ناو یاریزانە لێهاتووەکانی تۆپی پێدا ڕەواجی هەیە. شەویلگەی پانی ناو ڕووی "میک جاگر"ی ئەستێرەی ڕۆکی خاوەن پێشینە ئەندامێکی دڵڕفێنە. جاگر ئەو کەسەی کە کۆنسێرتەکانی شاکاری وزەبەخشی کوڵنەدەرایەتییە. پیاوانی پیشەگەر، ئەگەر ئەم شەویلگە زلەیان نەبێ لە ڕێی هێمای تری ناو ڕوو کە تایبەتن بەهێز و سەرنجڕاکێشی ئەم کەموکورتییەیان قەرەبوو دەکەنەوە.

"سوپێرمان" بەنموونە وەربگرە. کەسایەتیی ڕەسەنی ناو ئەم کارتۆنە شەویلگەکانی زلن و بەهەمان شێوەش "کریستۆفر ڕیڤ"یش کە تا ئێستا سەرکەوتووترین سوپێرمانی سینەمایە شەویلگەکانی گەورەن. لە وەتەی ئەو ڕووداوەی کە شەپڵەلێدانی بەدواوە هات، ڕیڤ سوودی لەو بەهرە ڕوحییە وەرگرتووە کە لە ناو شەویلگەکەیدا ڕەنگی داوتەوە.



شەویلگەی پان



شەویلگەی باریک



شەویلگەی لە پانیدا ناوەندی

پاناتیی شەویلگە

کۆڵنەدەرایەتی یارمەتیی داوە تا بەردەوام کۆسپەکانی سەر ڕێگەی خۆی لابدا.

"دین کێین"ی سوپێرمانی تەلەڤزیۆن جگە لەو جەستەیەی کە بەهۆی ڕێکخستنێکی سەرکەوتووانەی ماسوولکەکانەوە دەکەوێتە جووڵە بەهۆی کوڵمی چەپی خۆی کە لە کاتی پێکەنیندا چاڵێکی سەرنڕاکێشی لێ دەردەکەوێ «سەیری بەشی "سێکس" بکە»، قەرەبووی شەوێلگەکەی دەکاتەوە کە لە پانیدا ناوەندییە.

ڕۆکی، "سیلڤێستەر ستالۆنی"ی ڕامبۆ ئاسا بەردەوام ڕۆڵی نوێی ئەوتۆ دەدۆزێتەوە تا شەویلگە شەپۆڵدەرەکانی بچەمێنێتەوە. بەپێچەوانەوە، "ئارنۆڵد شوارزینگر" شەویلگەکانی بەشێوەیەکی سەرسڕمێن تەسکن. لە ڕاستیدا شەویلگەی ئەو بەبەراورد لەگەڵ هی "ماریا شریڤر"ی خێزانی بچووکترە. بەڵام جارێکی تر کە سەرنجی رووی ئارنۆڵدت دا سەیری نێوچاوانە پانەکەی «کە ئاماژە بەشێوە دەسەڵاتی بەپەرۆش و وزەیەکی زەینیی بەجۆش دەکا» و برۆیە زۆر پڕەکانی «کە هێمان بۆ مێشکێکی سەرووئاسایی» بکە.

لە ڕاستیدا هێزی کەسانی خاوەن شەویلگەی تەسک لە زوو هەستکردن بەشەڕ دایە نەک خاوەندارێتی پشوودرێژیی پێویست بۆ بەردەوامبوون لە شەڕێکی درێژخایەن. ئاخۆ تۆش ئەم خەسڵەتەت هەیە؟ کەوابوو هەر کاتێک کە دەکەوییە بارودۆخی دژوار سەری گفتوگۆیە ناخۆشەکە بکەوە، یان کێشەکە خێرا چارەسەر بکە یان دوور کەوە.

کەسایەتییەکانی "تێری ماکمیلان"ی نووسەر بەم ئاسایە هەڵسوکەوت دەکەن و هیچ گومانێک لەوەدا ناهێڵنەوە کە نووسەر خاوەنی خاڵەکانی هێزی کەسێکی شەویلگە تەسکە. شەویلگەی "ڕەندی تراڤیس" و "مارتینا ماکبێرد"ی گۆرانیبێژانی گۆرانیی لادێیی هەمان بەهرەی خێرا بۆنکردنی شەڕ و دوورکەوتنەوە لە شەڕیان تێدایە.

بەپێچەوانەوە خەڵکی خاوەن شەویلگەی پان تەنانەت لە دژوارترین بارودۆخەکانیشدا چێژ لە کۆڵنەدان لە شەڕدا وەردەگرن. قارەمانانی جەنگی جیهانیی دووەم، "سێر وینستن چێرچیل" و سەرۆک "ئایزنهاور" گفتی شەویلگە زۆر پانەکەی خۆیان بەجێ گەیاند. ئەو ناوچەیەی کە تۆ ئێستا لێی دەژی ڕەنگە ناوچەیەکی نازی بووایە ئەگەر چێرچیل ئەو بیروباوەڕەی نەبووایە کە جارێک بەم شێوەیە دەری بڕیوە:

"هەرگیز چۆک مەدە، هەرگیز. هەرگیز، هەرگیز، هەرگیز بۆ هیچ شتێکی مەزن یان بچووک، ورد یان درشت، هەرگیز چۆک مەدە تەنیا لە بەردەم ڕاستگۆیی و نیازپاکیدا نەبێ".

هەڵبەتە بەتەنیا پیاوەکان نین کە لە ژیانیاندا سوودیان لە کەللەڕەقایەتیی

سەرچاوەگرتوو لە شەویلگەکانیان وەرگرتووە. نموونەی بەرچاو بریتین لە "سالی راید"، یەکەم ئافرەتی ئەمریکیی بۆشاییگەڕ، "پۆولا عەبدول"ی سەمادانەر، "لیلیاس فۆلان"ی ڕاهێنەری یۆگا و "سالی فیلد"، ئەکتەرێک کە جەماوەرکێشییەکەی یەکجار درێژخایەن بووە. "کێی شێرلی"ی شەویلگە پانیش کە شرۆڤەکارێکی ئابوورییە پێی باشە مرۆڤ بەکۆڵنەدەرانە سەرمایە کۆ بکاتەوە.

پرسیار: سەیر لەوەدایە کە تۆ لەجیاتی ئەوەی لە باسی شەویلگەدا هێزی دەستپێکردن ڕوون بکەیەوە، باس لە هێزی کۆڵنەدەرایەتی دەکەی. هەرچەندە من ١٢ ساڵە شووم کردووە، بەڵام لەبەرئەوەی زۆری برد تا بەپێوەندییەکە قایل بووم هێشتاش هاوسەرم تیزم پێ دەکا، تۆ چی دەڵێی؟

وەڵام: خۆبەدەستەوەدان بۆ کەسێکی شەویلگە پانی وەک تۆ، کێشەیەکی سەرەکییە. بەڵێ، ئاریشەکە بریتییە لە ئازارچەشتن بەهۆی ئەم خۆبەدەستەوەدانە. دەزانی بۆ؟ لە ناختدا هەست بەوە دەکەی کە چی چاوەڕوانت دەکا؟ ئەگەر بڕیارت دا خۆت گیرۆدەی پێوەندییەک یان کارێک بکەی مەگەر بەمردن «یان بەکارەساتێکی تر» بێ، دەنا واز لەم پێوەندی یان کارە ناهێنێ.

لەلایەکی ترەوە کاتێک من ڕووی "کارل سێول"ی نووسەرم بینی، ناچار بووم بە بێدەنگی پێ بکەنم. نووسەرە لەوەدا دەستباڵایە کە وا لە خەڵک دەکا کە ئەگەر یەک جار کتێبێکی بکڕن تا لە ژیان ماون بەردەوام کتێبەکانی بکڕن. شەویلگەی پان پێ دەچێ هاوڕێ بێ لەگەڵ بڕیاری خۆسەپێنەرانە لە ژیاندا. تەنانەت ئەگەر تۆ بەسەر ئازاری ئاریشەکەشتدا زاڵ بی، خەسڵەتە سەرنجڕاکێشەکەت هەر دەمێنێتەوە وە خەڵکی تریش بەهۆیەوە ڕێزت لێ دەگرن.

ئەی ئەو کەسە بەختەوەرانەی خاوەنی شەویلگەی ناوەنجین، ئێستا تۆ چیرۆکی هێمایە ناوەنجییەکانت لەبەرە. ئەگەر تۆ خاوەنی ئەم جۆرە شەویلگەیە بی، لە خۆبەدەستەوەداندا ئازار ناچێژی. لە کۆڵنەدان بۆ چاکەکاری سەرکەوتووی، بەڵام تاکە ئاریشەی ڕێ تێچووت بریتییە لە گوماناویبوون بەرامبەر بەهەڵسوکەوتی دەوروبەرت. گرینگ نییە ناکۆکییەکە لەسەر چی بێ، بەڵام تۆ بیر لەوە دەکەیەوە کە بۆچی کەسێک ناتوانێ بۆ ماوەیەکی گونجاو شەڕ بکا و پاشان واز بێنێ؟ بەڵام تۆ ناتوانی بەئاسانی بۆ خەڵک پێناسەی ئەم "ماوە گونجاو"ە بکەی، هەروەک چۆن ناسینەوی کێشە شاراوەکەی خۆت کە بریتییە لە بێنکورتی بەرامبەر بەهەموو خەڵکی تر بۆت ئاسان نییە.

## دەرپەڕینی چەناگە

ڕادەی دەرپەڕینی چەناگە چۆن دەپێورێ ؟ هەڵبەتە لە لاڕووەوە سەیری ڕوو بکە. پاشان سەرنجی تەواوی مەودای ڕوو بدە نەک بەتەنیا چەناگە. دەتوانی هێڵێکی خەیاڵی بکێشی کە لە نێوچاوانەوە دەست پێ بکا و بەسەر لووتدا بڕوا و بەسەر سەرلێویشدا ڕەت بێ و تاگەردن بەرەوخوار ڕابکێشرێ. ئاخۆ ئەو هێڵە چ گۆشەیەک وەردەگرێ؟

– ئەو کاتەی کە چەناگە دەرپەڕیو بێ، کە زۆربەی چەناگەکانیش وان، کەسەکە چەناگە دەرپەڕیوە.

– کۆمەڵێک چەناگە قووڵن کە هەندێک جار بەچەناگەی "کشاوە" ناو دەبردرێن. حەز لەم وشەیە ناکەم، لەبەرئەوەی بەو واتایەیە کە چەناگە لە کەنار دەریاوە بەهەمان شێوەی ڕووتانەوەی موو دوور دەکەوێتەوە. بەڵام خۆ چەناگە و نێوچاوان کەنارەی پرشەپۆڵی مسۆگەر نین. شێوەی چەناگە و نێوچاوان هەڵگری واتایە. لە ڕاستیدا دەرپەڕینی چەناگە واتایەکی زۆری هەیە و یەکێکە لەو هێما بەژمارە کەمانەی کە بەدەگمەن گۆڕانیان بەسەر دێ. هەندێک جار چەناگەی قووڵ بەچەناگەی "لاواز" و هەروەها بەچەناگەی "کشاوە"ش ناو دەبردرێ. هەندێک جار چەناگەی قەبارە بچووکیش بەچەناگەی "لاواز" ناو دەبردرێ. بەپێچەوانەوە هەروەک دواتر بۆت ڕوون دەبێتەوە، هیچ کام لە هێمایەکانی چەناگە شایەنی ئەو دیدە سووکە نین.

– چەناگەی تەخت لە هەموو جۆری چەناگەکان دەگمەنترە.

ئاخۆ تۆ کام هێمایەت هەیە؟

پرسیار: بەڵام ئەگەر خەڵک چەناگەی خۆیان دەربپەڕێنن ئەو کاتە دەرپەڕینەکە چی بەسەر دێ؟

وەڵام: ئەوە گرینگە. دەرپەڕاندنی بەشی ژێرینی ڕوو بۆ پێشەوە بەباشترین شێوە بەهەڵسوکەوتێکی بەرهەڵستکارانە ناسراوە. بەبۆچوونی من کەسێک کە حەز بکا بەشەو و بەڕۆژ چەناگەی دەربپەڕێنێ توانیویەتی پلەی ڕێزلێنراوی کەسێکی خاوەن چەناگەی دەرپەڕیو بۆ خۆی دەستەبەر بکا.

ئاشکرایە کە چەناگەی زۆر دەرپەڕیو پێوەندی بەڕکابەرایەتییەوە هەیە. لە ماوەی هەڵمەتەکانی بانگەشە بۆ سەرۆکایەتیدا خۆشە بەردەوام سەیری ڕکابەرەکان و هاوژینەکانیان بکەی. لەم ڕووەوە تا ئێستا کەسم نەدیوە شان لە شانی "جەکۆلین کەنەدی



چەناگەی قووڵ



چەناگەی دەرپەڕیو



چەناگەی تەخت

دەرپەڕینی چەناگە

ئۆناسیس" بدا.

لە دەرەوەی جیهانی سیاسەتیشدا گۆشە چەناگەی پڕتین خۆی لە ڕووی "جێین ئادامز"ی پێشەنگی کاری کۆمەڵایەتی و ژەنەراڵ "جۆن پێرشینگ"دا ئاشکرا کردووە. ئەگەر تۆ هیوایەتت کێبەرکێی بەلەمەکان بێ کەواتە لەوە تێ دەگەی کە چۆن شێوازە هێرشبەرانەکەی "دێنیز کۆنر" بووەتە هۆی سەرکەوتنی. یان ئەگەر پێشبڕکێی ئۆتۆمبێل زیاتر لەگەڵ تەوژمی تۆدا دەگونجێ ئەی بۆ بیر لەوە ناکەیەوە کە چۆن "کێیل یاربۆرۆ" توانیویەتی بەهۆی"Daytona500"ەوە ناوبانگ دەربکا.

"ماریان ویلیامز" خاوەنی گەلێک هێمای ئاماژەدەر بەهەستیاری و نەرمونیانییە. بەڵام دەرپەڕینە زۆرەکەی چەناگەی ئەم لایەنەی هاوسەنگ کردووە و ئازایەتیی ناو چەناگەکەی یارمەتی داوە تا دەقە ڕۆحانییە بەبەراورد نەناسراوەکەی " A Course in Miracles – کۆرسێک لەبارەی پەرجووەکانەوە" بنووسێ و پاڵپشتییەکی جەماوەریی بۆ ئەم بەرهەمە و بۆ خۆی وەدەست بێنێ.

"درو بێریمۆر"ی ئەکتەر لە ڕۆڵی خۆی لە"Charlie's Angels – فریشتەکانی چارلی"دا خۆی بەکەسێکی زۆر بەجەرگ لە قەڵەم نەدابوو بۆیە لە ژیانیدا ڕاستیدا ناچار بوو لە تاقگەیەک خۆی هەڵداتە خوارەوە. بێگومان چەناگەکەی هاندەری بووە.

بەڵام دەپەڕیوترین چەناگە لە کاری شۆدا «یان لە ڕاستیدا لە هەر بوارێکی تردا» چەناگەی "جێی لینۆ" بووە. نواندنە هەڵچوو و بەردەوامەکەی هەروەک کۆمێدیکارێک ئاماژە بەشێوازە هێرشبەرانەکەی دەکا. ئەم پیاوە کوڵ نادا مەگەر جەماوەرەکەی خۆی بەهۆی پێکەنینێکی زۆر و دوورودرێژەوە نەبوورێنیتەوە.

بەرپەرچدانەوی ڕێ تێچووی چەناگەی دەرپەڕیو برێتییە لە توندوتیژی ناپێویست. دەزانی چ جۆرە کەسانێک بەباشترین شێوە لەم خاڵە لاوازە تێ دەگەن؟ خەڵکی خاوەن چەناگەی قووڵ.

هەڵەیەکی چەند گەورەیە ئەگەر چەناگەی قووڵ بەچەناگەی "لاواز" ناو ببردرێ، مەگەر "ئیلینۆر ڕۆزڤێلت"ی خاتوونی یەکەم، کەسێکی بێ هێز بوو؟ خەڵک لانی کەم بەهەمان ڕادەی سەرسامیان بەهاوژینە سەرووئاساییەکەی بەم خاتوونەش سەرسام بوون. بەڵام زاراوەکە خەریکە ڕوون دەبێتەوە. ئەم زاراوەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چۆن خەڵک دەتوانێ بەچاوێکی سووک سەیری هێمایەکی ڕێزلێنراو بکا. چەناگەی قووڵ دەرخەری ڕۆحی

تەباییە. خەڵکی خاوەن ئەم چەناگەیە زیاتر لەوەی بیانەوێ پێوەندییەکان بەهۆی شەڕەوە لێک بترازێنن، خوازیاری ئاشتی و سازشن. ئەوان لەجیاتی ئەوەی بیانەوێ بەشتێک کە شایەنی نین ناوبانگ دەربکەن، ئامادەن زیاتر تێ بکۆشن.

ئاریشەکە چییە؟ بریتییە لەوەی چاوەڕوانی ئەوە بی لە کۆمەڵگەیەکدا کە تەبایی بەسووکی سەیر دەکرێ و توندوتیژی زیاتر لە ڕادەی پێویست بەهەند وەرگیراوە، لەلایەن خۆت و لەلایەن خەڵکەوە ڕێزت لێ بگیرێ. "جۆزیف لیبێرمان"، یەکەم کاندیدی جۆلەکەی ئەمریکا بۆ پۆستی جێگری سەرۆک، بەهۆی شێوازە تا ڕادەیەک گشتگیرەکەی لە ناو ئەنجوومەنی پیراندا ڕێزی لێ نراوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر شرۆڤەکار ئەو بەبەراورد لەگەڵ "چینی"ی چەناگە دەرپەڕیو بەمشومڕکەرێکی ناکارا لە قەڵەم دەدەن.

کاتێک لەم ڕوانگەوە دەستت بەخوێندنەوەی چەناگە کرد لەوە تێ دەگەی کە خەڵکی چەناگەقووڵ، هێمن دیارن. "هێنری بێرگسن"ی فەیلەسووف هەروەک "جێین هاوارد" قەشەی فریشتەناس خاوەنی ئەو جۆرە چەناگەیە بوو. "جۆنی میچڵ" و "ئارۆن کۆپلاند" بەستایلی جیاواز مۆسیقایان داناوە، هەردووکیان زۆر بەجۆشن بەڵام بەهۆی هەستیارییە هێورەکەی چەناگەی قووڵیانەوە هاوسەنگیی خۆیان پاراستووە.

ئەوەی پێوەندیی بەچەناگەی تەختەوە هەبێ ئەوەیە کە ئەم چەناگەیە هاوڕێیە لەگەڵ دیدێکی ئاسایی بەرامبەر بەئاشتەوایی و توندوتیژی. کەسانی چەناگە تەخت نە مافی کەسانی تر پێشێل دەکەن و نە ڕێگەش بەپێخوستکرانی مافەکانی خۆیان دەدەن. کەسانێکی بەختەوەرن تاکە ئاریشەیان هەمان بێنکورتییە بەرامبەر بەخەڵکانی تر. نموونەش ئەمانەن "لۆرا دی ئەندری تایسن"، هەماهەنگکەری چالاک و سەرۆکی ئەنجوومەنی ڕاوێژکارانی ئابووریی کلینتۆن، "پێترۆس پێترۆس غالی"ی سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان و "گیلسی کیرکلاند"ی سەماکاری باڵە.

پرسیار: ئەی ئەو کەسانەی دان بەخۆیاندا دەگرن؟ خۆ مەرج نییە تەنیا هێرشبەرێکی زویرکەر؟ زویرکەر بەبراوە لە قەڵەم بدرێ. ئاشتیخوازیش ڕێگەیەکی سەرکەوتوو بوونە.

وەڵام: کتومت وایە. بۆ ئەوەی بزانی کێ لە کۆڵنەدان دەستبالایە، سەیری شێوەی چەناگە بکە. هاوشێوەی دەم چەناگەش دوو کۆمەڵە هێمای جیاوازی هەیە، لە باری ئەستوونی و لەباری ئاسۆییدا.

## درێژیی چەناگە

ئاسانترین ڕێگە بۆ خوێندنەوەی درێژیی چەناگە بریتییە لەوەی وەک جاران لە گۆشەیەکی ڕاست و هەروەک ڕووخوێنەوەیەک بڕوانی. خێرا بەبەراوردکردنی چەناگە لەگەڵ پاشماوەی تری ڕوو درێژییەکەی بخەملێنە.

– ئاخۆ چەناگەکە درێژ دیارە؟

– یان کورتە؟

درێژیی چەناگە پێوەندیی بەخۆدانەبەر مەترسی و هەروەها زاڵبوون بەسەر تەنگانەدا هەیە.

چەناگەی درێژ ئاماژە بەکەسێک دەکا کە حەزی لە خۆدانەبەر مەترسیی جەستەیییە. هەروەها ئاماژە بەوەش دەکا کە کاتێک نەهامەتییەک سەر هەڵبدا پێویستە کەسەکە چەناگەی خۆی بەبەرپرس بزانێت. دەقاودەق زۆر هۆ هەیە بۆ ئەوەی تاوانەکە بخرێتە سەر ئەستۆی "چەناگە".

نموونەیەک بۆ ئەم جۆرە چەناگەیە "ئامیلیا ئێیرهارت"ی فڕۆکەوانە. یەکێکی تر "مێی کونین"ە، کەسێک کە لە ژێر چەوساندنەوەی نازیدا بۆ زیندوومانەوە خۆی ڕاگرت. کەسێکی ئەوەندە زیرەک بوو کە هەڵەکەی قۆستەوە و بووە ئەندامی یەکێک لە یانە هەرە تایبەتەکانی ئەمریکا،"/Governors Who Are Women/ خاتوونانی پارێزگار" «من خۆم ئەم ناوەم لێی ناوە، بەڵام ئاخۆ وشەی کورتکراوەی GWAW بەلوورەیەکی بەهێز ناچێ؟»

پایە مەزنەکەی "پاتریشا نیل" بەپلەی ئەکتەرێک ڕکابەرایەتی دەکا لەگەڵ جەماوەرکێشییەکەی کە لە بوێریی بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو شەپڵەیەی توانای ئاخافتن و خوێندنەوە و ڕۆیشتنی لێ سەندبوو، سەرچاوە دەگرێ. و "ڕێی چارلز"ی گۆرانیبێژ تەنانەت بەبوێرییەکی زیاتریش دژی نابینایی و ناسەقامگیریی عاتیفی و دژوارییەکانی جیهانی پسپۆڕێتی لە هونەردا خەباتی کردووە.

ئەی چەناگەی کورت؟ ئاخۆ شایەنی ئەوەیە کە پێی بوترێ چەناگەی لاواز؟ بەڵێ، بەمەرجێک کە تۆ تەنیا خۆدانەبەر مەترسیی جەستەیی بەپێوەر بزانی. بەڵام چەناگەی کورت هاوڕێیە لەگەڵ خۆدانەبەر مەترسیی عاتیفی.

هۆکارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ بەهێزیی خوو و ڕەوشت. ئەگەر تۆ چەناگەت کورت بێ



چەناگەی درێژ



چەناگەی کورت

درێژیی چەناگە

دەبێ هەستت بەوە کردبێ کە کەسێکی ڕاستگۆی. ڕەوشتەبەرزەکانت تەنیا لە ڕۆژانی یەکشەممە و لە کەنیسەدا خۆیان نانوێنن. لە ڕاستیدا ڕەنگە تۆ بەهۆی ئەو خوو و ڕەوشتە کەسانییەتەوە خۆت تووشی ژیانێکی زۆر ناخۆش بکەی.

با بڵێین بێ ئەوەی ئاگات لێ بێ لە بانک پێنووسێکت لەگەڵ خۆت هەڵگرتووە. ئەو کاتەی کە دەگەڕێیەوە ماڵ هەست بەم هەڵەیە دەکەی. چی ڕوو دەدا؟ ئەگەر چەناگەت درێژ بێ ئاوا بیر دەکەیەوە: " کە پێم ناخۆش بوو، بەڵام خۆ پێنووسەکە لە روبعێکیش زیاتر ناهێنێ و ئەوانیش یەک دنیا پێنووسی تریان هەیە". بەڵام تۆی چەناگە کورتی ویژدان گرگرتوو لەوانەیە نیگەرانی دات بگرێ: "ئێیبی لینکۆڵن، ناچار هەموو ئەو ڕێگەیەی بانک کە تەنانەت ١٥ میلیش درێژ بوو، بۆ دانەوی ئەو پێنووسە بېڕیتەوە. منیش هەر دەبێ ئەو پێنووسە بگەڕێنمەوە".

ڕێگەیەکی تری وەسفکردنی دەنگە بەرزەکەی "جیمنی کریکت"ی ناو ناخت ئەوەیە کە بڵێین تۆ وایەری تاوانت بۆ ڕاکێشراوە. تەنیا تاوانەکانی فەرامۆشکارییی وەک بەرێکەوت دزینی پێنووسێک نییە کە زەنگی وریاکەرەوەت بۆ لێ دەدەن. ڕەخنەی خەڵکیش هەمان ئەنجامی دەبێ. وا دابنێ پێشتر وریا کرابییەوە. تەنیا لەبەرئەوەی کە تۆ ئەو هەموو سرکێتە گونجاوانەی تاوانت پێوە بەستراوەتەوە خۆ مەرج نییە هەڵە بکەی و سرکێتەکان هەڵبدەیەوە. بۆچی خۆت ئازار دەدەی؟ هەروەک "زیگمۆند فرۆید" کە چەناگەی خۆی بەکۆڵە ڕدێنێکی درێژەوە داپۆشیبوو، دەڵێ: "هەندێک جار جگەرەیەک تەنیا جگەرەیەکە و بەس".

لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر کەسانی چەناگە کورت ڕووبەڕووی ڕەخنەش ببنەوە خۆ واتای ئەوە نییە ئەوان کەسانێکی بێ کەڵکن. بیر لە ئافرەتی وەک دوکتۆر "چین شیونگ وو" بکەوە کە لە بواری یەکجار بەشکۆی تایبەت بەپیاواندا کەوتووەتە ململانێ. لەبەرئەوەی ئەم خاتوونە بەرگەی سووکایەتیکردن بە چەناگەی کورتی نەگرتووە بۆیە وەک "شاژنی فیزیای ناوکی" ناوبانگی دەرکردووە. پاشان سەرەی "می سێ. جێمیسن"ی بۆشاییگەڕ دێ. بەبۆچوونی تۆ، ئاخۆ کۆمەڵە پیاوانی بۆشاییگەڕی هاوڕێی جێمیسن هەرگیز گاڵتەیان پێی کردووە؟

پرسیار: ئەگەر کەسێک ڕدێنی بەردایەوە ئاخۆ ڕدێن بەردانەوەکەی دەبێتە هۆی ئەوەی کە چەناگە تا ئەو ڕادەیە درێژ بکرێ کە کەسەکە خەسڵەتی خۆدانەبەر مەترسیی جەستەییی وەربگرێ؟

وەڵام: بەڵێ، چەندی ڕدێنەکە درێژتر بێ، ئەوەندە بوێرییە جەستەیییەکە زیاتر دەبێ، بەڵام نەکەی هەڵبخەڵەتێی و ڕدێنەکە لەجیاتی گوریسی خۆ پێ هەڵدان بەکار بهێنی.

## پاناتیی چەناگە

تۆ کە ئێستا فێری ئەوە بووی درێژیی چەناگە وەک جۆرێکی جیا بخوێنییەوە کەواتە ئامادەییت هەیە بۆ ئەوەی ئاسۆیی هەنگاو بنێی و لە پاناتیی چەناگەش بکۆڵییەوە. بۆ ڕاهاتنی چاوت لەم جۆرەیان باشترە سوود لە سلانگێک وەربگرین: کە بریتییە لە کووپ. "Mug Shots – وێنەی سەر کووپ "ت کە بەواتای وێنەی تایبەت بەمامەڵەیە، بیستووە، وا نییە؟ تۆ لە ڕێی دیدە نوێیەکەی ڕووخوێنەوانەتەوە دەتوانی لەوە تێ بگەی کە ئەو شێوانەی لە بەشی ژێرەوەی ڕوو دان، وەک کووپ و جۆرەکانی تری دەفری گڵین.

– هەندێک چەناگە لە تەنیشتەوە بچووک دیارن، بەڵام ڕەنگە درێژیش بن. ئەم چەناگانە شێوەیان لە کووپە چای بچووک یان بابەتەکانی تری فنجانی قاوە دەکا. ئەمانە بەچەناگەی تەسک ناو بنێ. هەروەها ئەو شێوانەش کە زیاتر لە کووپی تەواو دەچن «تەنیا ئەوە نەبێ کە دەسکیان پێوە نییە» بەتەسک دابنێ.

– چەناگەی پان بەتۆکمەیی بەشەویلگەوە بەستراوەتەوە و وەک ئەو کاسەیەیە کە لە ژێر پارچە قاپوقاچاغی تر دانراوە. هەندێک جار ئەو چەناگانە کورت و بەرین، وەک ژێرپیاڵەی ئەستوور وان. ئەوانەیان کە درێژتر و زلترن، زیاتر لەو قاپە پانانە یان تەنانەت ئەو کاسانە دەچن کە لە ڕێستۆرانتێکی دڵڕفێندا لە ژێر قاپی سووپەکەت دانراون کە ئەمەش بۆ هەر ڕێستۆرانتێک کە پێم نابێتە ناوی شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشە و بەهەمان ڕادەش بۆ هەندێک چەناگە سەرنجڕاکیشە. من تەنانەت باسی چەناگەی دەبڵیشم نەکرد. ئەگەر بەرێکەوت ئەو ئەندامەی لە بەشی ژێرەوەی ڕوو دایە، بووەتە هۆی ئەوەی بیر لە "یۆفۆ" بکەیەوە واتای ئەوەیە بەتەواوی لە جیهانی ڕوو دەرچووی.

پرسیار: ڕاڤەکردنی چەناگە بووەتە هۆی ئەوەی من هەست بەوە بکەم ئاساییانە ئەو بەشەی ڕووم فەرامۆش کردبوو. هەموو ئەو شتەی کە زۆربەی جار تێبینیم دەکرد چەناگەی درێژی ڕێک بوو. بەڵام چەناگەی کورت، پان، تەسک، ئەوە هەمووی جیهانێکی نوێیە. ئاخۆ زۆربەی خەڵک ئەم جیهانە بەرفراوانەی چەناگەیان پشتگوێ خستووە؟

وەڵام: بێگومان و ئەمەش جێگەی داخە. ئەی ئەگەر خەڵک بڵێ تاکە چاوێک کە شایەنی سەیرکردن بێ دەبێ ڕەنگێکی خۆڵەمێشیی دەگمەنی هەبێ؟ هەر ئێستا بەوردی سەرنجی



چەناگەی تەسک



چەناگەی پان

پاناتیی چەناگە

چەناگەی خۆت بدە و بزانە چۆنە. چەناگەکەت ئەوەندە ڕۆشنکەرەوەیە کە نابێ پشتگوێی بخەی. بەتایبەت ئەگەر تۆ بەنیازی هاوسەرگیری بی پێویستە بزانی چ جۆرە شێوازێکی کەسی هاوڕێی پاناتیی چەناگەکەی تۆیە.

با بزانین ئاخۆ دەتوانی واتای پاناتیی چەناگە بخەملێنی. ئەمانە چەند سەرەداوێکن:

– پاناتیی لووت، واتە ناواخنەکەی پێوەندیی بەکاری بەکۆمەڵەوە هەیە.

– پاناتیی لێو واتە درێژیی دەم پێوەندیی بەگونجاوترین ژمارەی گوێگرانی تۆوە هەیە.

– ئەگەر دیمەنی چەناگە لە ڕووبەڕووە پێوەندیی بەزاڵبوون بەسەر تەنگانەدا هەبێ، ئاخۆ دەتوانی واتای پاناتیی چەناگە بخەملێنی؟

پرسیار: ئاخۆ پاناتیی چەناگە بەواتای ئەوە نییە کە خەڵک لە دەوربەرت بێ، بۆ ئەوی دڵت خۆش بکاتەوە؟

وەڵام: ئافەرین. تەواوە، چەناگەی تەسک ئاماژە بەوە دەکا کە لە کاتی تەنگانەدا خۆڕسکییەکەت وا دەخوازێ، بەتەنیا بی یان تەنیا کەسێکی گرینگت لە لا بێ. بیر لەوە بکەوە کە "هەمفری بۆگارت"ی چەناگە تەسک چەند سەرکەوتووانە لە کۆتاییی "کاسابلانکا"دا "ئینگرید بێرگمان" بەڕێ دەکا. سەرنجی وشەکانی "مارڤن هاملیش"ی گۆرانیهۆن چەناگە تەسک بدە کە هۆنینەوە بە "Such a Lonely Life – ژیانێکی تەنیایی" ناو دەبات.

چەناگەی پان ئاماژە بەوە دەکا کە تۆ کۆمەڵە پشتیوانێکت هەیە. ئەوان لەو جیهانەی کە تۆ چاوەڕوانی دەکەی «و بەم هۆیەش دەی هێنییە دی» لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئاریشەکان یارمەتییەکی زۆرت پێشکێش دەکەن. نموونەش برێتیین لە "بێتی فۆرد"ی دامەزرێنەری سەنتەرە ناسراوەکەی چاکسازی و "وارن بێرگر" دادوەرە یەکجار بەدەسەڵاتەکەی دادگەی باڵا.

چەناگەی پانی درێژ، سیستەمێکی بەرگریی سروشتییە دژی تەنگانە. ئاریشەکە برێتییە لە خۆخستنە ناو بارودۆخێک کە تێیدا دەبێ ئەم بەرگرییە بەکار بهێنرێ. تەنیا سەیرێکی جۆرە جیاوازەکانی خۆدانەبەر مەترسی لە ژیانی ئەم کەسانەدا بکە "ڤیکتۆر بۆرگ"ی کۆمێدیکار و "میخاییل باریشنیکۆف"ی سەماکار و «هەڵگەڕاوەیەکی سۆڤیەت» و هەروەها "تۆنی براون" کە پێشکێشکاری درێژخایەنترین بەرنامەی کێشە نەتەوەییەکانی خەڵکی ئەفریقی– ئەمریکییە. ئەمانە ئەو کەسانەن کە تاوانەکە دەخەنە ئەستۆی چەناگەیان.

بەگوێرەی چەناگەیان ئەمانە کەسانێکی بەهرەمەندن.

پرسیار: من وەک بەڕیوەبەرێک زۆر باش لەو تێ دەگەم کە ستافی فرۆشیاریم لە کاتی سەرنەکەوتندا چۆن هەڵسوکەوت دەکەن. ئاخۆ دەتوانی بەگوێرەی چەناگە ئامۆژگاریم بکەی تا کارمەندەکانم بەکارایی بمێننەوە؟

وەڵام: خۆشحاڵم کە پرسیارت کرد. تا ئێستا هێماکانی دەم، سەرەداوێکیان سەبارەت بەوە پێ داوی کە چۆن خەڵک باسی گرفتەکانیان دەکەن «بەبیرتە: خەڵکی لێو پڕ بەپێچەوانەی لێو تەنکەکان دەدوێن». چەناگەش سەرەداوێکت لەبارەی لایەنە شاراوەکانی چۆنیەتیی بەرەنگاربوونەوەی دۆڕان و تەنگانە بۆ دابین دەکا.

بەمەبەستی هاندان ناوە ناوە بۆ کارمەندە چەناگە پانەکان ئاهەنگ بگێڕە. ئاهەنگ یارمەتییان دەدا بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی لە ناو گرووپدا. بەڵام بۆ خەڵکی چەناگە تەسک هەلێک بڕەخسێنە تا بەتەنیا بن بۆ ئەوەی بەسەر نەهامەتیدا زاڵ بن. هەرگیز بیر لە یارمەتییەکی هاندەرانە بۆ دڵنەواییکردنیان مەکەوە. هێزی ئەوان بەبەراورد لەگەڵ کەسانی چەناگە پان لە ئاراستەیەکی جیاوازەوە سەرچاوە دەگرێ.

## شێوەی کۆتاییی چەناگە

ئاخۆ زانینی چۆنیەتیی بڕیاردانی کەسێک هیچ سوودێکی هەیە؟ ئەگەر وەڵامەکەت بەڵێیە، دیارە حەز دەکەی کۆتاییی چەناگە بخوێنییەوە. ئەو کاتەی دەرکت بەنهێنییەکانی پاڵنەر بۆ بڕیاردان کرد، ئەوا دەتوانی بەگوێرەی بیروبۆچوونی کەسانی بڕیاردەر لێیان نزیک ببییەوە.

بەڵام سەرەتا پێویستە بزانی لە ناو ڕوودا بەدوای چیدا بگەڕێی. لە چەناگەی خۆتەوە دەست پێ بکە و سەرنجی ئەو شێوەیە بدە کە ڕێک لە کۆتاییەکەیەتی.

– تا ئێستا چەناگەی چەماوە بڵاوترین هێمایە.

– تۆ هەروەها چەناگەی ڕێکیش دەدۆزییەوە کە شێوەی خۆی لەسەر ئەو ڕووانەدا دەنەخشێنێ کە هێڵێکیان لە ژێرەوەدا دیارە.

– دۆزینەوە و هەروەها ناسینەوەی چەناگەی هەشتی لە هەر هەموو جۆرەکانی تر دژوارترە. ئەم چەناگەیە تەسکە و ئەگەر سەرنجێکی ورد بدەی باریکبوونەوەیەکی گشتی لە چەناگەدا تێبینی دەکەی.



چەناگەی چەماوە



چەناگەی ڕێک



چەناگەی هەشتی

شێوەی کۆتاییی چەناگە

چەناگەی چەماوە ئاماژە بەوە دەکا کە بنەمای بڕیارەکان بەندە لەسەر خەڵک. ئاخۆ خەڵک چ هەستێکیان بەرامبەر بەبڕیارەکەی تۆ دەبێ و ئاخۆ بڕیارەکەی تۆ چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیانی ئەوان دەبێ. چەناگە چەماوەکان لە لە کاروباری مرۆڤانیدا کار دەکەن. "تیپر گۆر" بەهۆی هەڵویست وەرگرتنی بۆ پاڵپشتیکردن لە بزووتنەوەی کەم چەماوەری " چاودێریی بەخێوکردنیان لە کۆمەڵگەیەکی نەشیاو بۆ منداڵاندا"، خۆی خستە بارودۆخێکی ناسک. کەسانی تری چەناگە چەماوە بریتین لە "تۆم چاپین" و "دێنیز هایسم" و "تۆم پاکسن" کە هەموویان گۆرانیبنووسانی گۆرانیی تایبەت بەمنداڵانن. یەکێک لە مەزنترین یاسادانەران لە مێژووی ئەمریکادا "سورگوود مارشاڵ"ی دادوەری دادگەی باڵایە کە خاوەنی چەناگەیەکی زۆر چەماوە بووە.

چەناگەی چەماوە، هەروەها پێوەندیی بەشتێکی بەسوودەوە هەیە: میواندۆستی. ئەگەر چوویە ئاهەنگێک خۆت بکە هاوڕێی کەسێکی خاوەن چەناگەی زۆر چەماوە. لە ڕووی خواردنەوە زەرەر ناکەی.

وێنەی "لورێل رۆبێرتسن" کە لەسەر ئەو کتێبەی چێشتلێنان کە لە نووسینی خۆیەتی و بەناوی "Laurel's Kitchen –چێشتخانەی لورێل"ە بەلای منەوە یەکێکە لە جوانترین وێنەکانی میواندۆستی. ئەم کتێبە بەگونجان لەگەڵ چەناگەی تەسک، بەڵام زۆر چەماوەی لورێل، گیانی دۆستایەتی و بەزەیی لای خوێنەر دەبزوێنێ.

خەڵکی خاوەن چەناگەی ڕێک، ڕەنگە زیاتر توانای خۆیان بەبەشداریکردن لە کۆبوونەوەی سیاسی یان هەڵویستی تر بەدەر بخەن. ئەم شێوازە تایبەتە بەبڕیاردان لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆجیا و بیروبۆچوونەکان.

ئاخۆ زۆر بەپەرۆشەوە گرینگیدان بەبیرۆکەیەک بەشتێکی نەکردەنی دێتە بەرچاو؟ تەنیا بیر لە"جۆرج واشنتۆن"ی چەناگە ڕێک بکەوە، کە زەحمەتە بەفەیلەسووفێکی –پشت مێز دابنرێ. ڕەنگە "جاکی ڕۆبینسن"ی یاریزانی بێیسبۆڵ بەپشتبەستن بەپێڕەو، توانای زاڵبوون بەسەر کۆسپی ڕەنگی پێستی هەبووبێ کە یاریزانانی ئەفریقی ئەمریکیی لە بەشداریکردن لە جامە سەرەکییەکانی بێسبۆڵ بێ بەش دەکرد. ئەمڕۆ لە ئەمریکادا یەکێک لەو کەسایەتییانەی شوێنکەوتووی بیروبۆچوونی خۆیەتی و زیاترین ڕای جیاوازی لەسەرە خاوەنی چەناگەیەکی زۆر ڕێکە. ئەم کەسە دوکتۆر "جاک کێڤۆرکیان"ە کە پشتگیری لە خۆکوژی– بەیارمەتیی– پزیشک دەکا. کۆتاییە چەناگە فراوانەکەی "جۆن ئەشرۆفت"ی

دادپرسی گشتی بەچینە گۆشتێکی دەرپەڕیوی بێ وێنەوە سەرنجڕاکیش بووە. ئەویش سازشنەکرانە بەرەو بیروباوەڕەکانی هەنگاوی دەنێ. هەر کۆتاییە چەناگەیەک کاردانەوەی خۆی هەیە. خەڵکی چەناگە چەماوە دەشێ لە کاتی بڕیاردان یەکجار هەستەکی بن، چونکە لەجیاتی ئەوەی ڕاستەخۆ بیر لە بەرەنجامە دوورەکان بکەنەوە کاردانەوەیان بەهەست و سۆز زیاتر دەبێ. ئێمەی خاوەن چەناگەی ڕێک، ڕووبەڕووی ئاریشەیەکی بەهەمان ڕادە گرینگ دەبینەوە، بەڵام ئەم کاردانەوەیە تەسکبینییە. بۆ ئێمە تەنیا بنەمایەک هەیە، کە یان باشە یان خراپ و هیچ پێوەرێکی ناوەندی بەدی ناکرێ. دوکتۆر "لۆرا شلیسنیگر" لە شۆوە گفتوگۆئامێز هونەرییەکەی لەسەر ڕادیۆ و لە پڕ فرۆشترین کتێبەکانیدا پەرە بەشتێکی سەرسوڕهێن دەدا: بەهاکانی کەسایەتی «هەروەها خۆ تەرخانکردنیش کە لە شەویلگە زۆر پانەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە». بەڵام کۆمەڵێک گوێگر هەستیان بەوە کردووە کە دوکتۆر لۆرا سەبارەت بەبڕیاردان لەسەر ڕاست و هەڵە «بەدەر لە بیروبۆچوونی سەبارەت بەحەزە سێکسییە خۆڕسکییەکان» تۆزێک دڵڕەقە.

منیش کە خۆم چەناگەم ڕێکە، دەزانم چەند بەئاسانی مرۆڤ دەتوانێ ببێتە کەسێکی یەکجار ڕەخنەگر. بەسەرهاتێکی ناخۆشی ژیانی من و چەناگەی من کە ئەم ئاریشەیە بەڕوونی شرۆڤە دەکا، بەنموونە وەردەگرین. لە تەمەنی ٥ساڵیی "مەت"دا بەیانییەک ئێمە سواری ئۆتۆمبێل بووین. پەلەم بوو بۆیە بەناچاری دەبووایە لە کاتی ڕەتبوون بەناو شاردا بەرچاییەکەم بخۆم. لەبەرئەوە داوام لە مەت کرد قاپێکی پلاستیکیی پڕ لە سیریەلی وشک لە کۆشی خۆی دابنێ. ئەم قاپە لێوار کورت و پان بوو بۆیە دەمتوانی ئەوە بێنمە بەرچاوم کە چۆن وەستانێکی لە ناکاو دەتوانێ برمەی پڕ خرمەخرمی ئای خوایە! بەناو ئۆتۆمبێلەکەدا بڵاو بکاتەوە. بەمەتم وت دەبێ قاپەکە لانی کەم بەدەستێکی بگرێ تا لە خواردنەکەم دەبمەوە. پاشان ئامۆژگارییەکی تینبەخشی بچووکم پێی دا تا گوێڕایەڵ بێ:

"چیرۆکی پەرییانت بەبیرە؟ قارەمانەکە ئەرکێکی قورسی پێ دەسپێردرێ تا جێبەجێی بکا و ئەگەر سەر بکەوێ دەتوانێ لەگەڵ کچی پاشا زەماوەند بکا ئەگەر نا لەملی دەدرێ. شتەکە بەم شێوەیە. ئەگەر تۆش قاپەکەت بەرداوە ڕەنگە تووشی کێشەیەکی گەورە ببییەوە".

منداڵەکەم بەرهەڵستی کردم: "بەڵام دایە، هیچ چارەنووسێکی تریش نییە؟".

بیرکردنەوە لەو وتانەی کە لە دەمی دایک و باوکێکی خاوەن چەناگەی هەشتییەوە دەردەچن دڵم دەداتەوە لەبەرئەوەی هەوساری کار دەبێ لە دەستیاندا بێ «خۆزگە توانیبام

لە ناو ئۆتۆمبێلەکەیاندا گوییان بۆ هەڵبخەم». بۆ ئەوان دەسەڵات هەم بەهرە و هەم بەڵایە کە لە ناو زەرفێکی هێندەی چەناگەیەکەدا پێچراوەتەوە.

بێگومان ئەم جۆرە چەناگەیە یارمەتیی "جیم بێیکر"ی داوە تا وەک شرۆڤەکارێکی ئینجیل لەسەر تەلەڤزیۆن بەسەر ئاپۆرەیەکی فراواندا زاڵ بێ. پاشان دەتوانی سەیری "ئەلێگزەندر هایگ"ی باوک بکەی، شەڕخوازێک کە بیروڕای جیاوازی لەسەرە و هەروەک سەرۆکی ستافی کۆشکی سپی لە سەردەمی نیکسۆندا گەیشتە دەسەڵات. بەلامەوە خۆشەویستترین خەباتکاری خاوەن چەناگەی هەشتی دووک "ویلینگتۆن"ە کە بەوە ناسراو دەسەڵاتی بەسەر ناپۆلیۆندا شکا بێ "لەجنگی واتر پلۆدا". ئەو هەروەها بۆ زاڵبوون بەسەر کەشوهەوای ناخۆشیشدا کەسێکی بەکارە بووە بەهۆی بووتەکانییەوە.

"جیمی کۆنرز"ی یاریزانی زیرەکی یاریی تێنس، کە خاوەنی چەناگەی هەشتییە، بۆ قارەمانێتیی خۆی سوودی لە پێویستییەکەی بەدەسەڵات وەرگرتووە. لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام یاریزانێکی پلە یەک نەبووە. ئەم جۆرە کۆتاییە چەناگە هەروەها لە ژیانی "بێیب دیدریکسن زاهاریاس" کە ئافرەتێکی وەرزشوانی قارەمانە، سوودبەخش بووە.

خەڵکی خاوەن چەناگەی کورتی زۆر هەشتیی ڕەنگە بەهێزترین جۆری کۆتاییی چەناگەیان هەبێ. بۆیە ئەگەر یەکێک لەم هێمایە دەگمەنانەت هەبێ، دان بەو نهێنییە بچووکەدا بنێ: خەڵکی خاوەن چەناگەی زۆر هەشتی ڕەنگە دڵناسک و نەپارێزراو بێنە بەرچاو، بەڵام ئەو هێمایە ئاماژە بەویستێکی پۆڵایین دەکا و ئاریشەی ڕێ تێچوو برێتییە لەوەی کەسەکە تەنیا لەسەر ئەو بنەمایەی کە بەخەڵکی تر پێشان بدا کە "کەس ناوێرێ پێم بڵێ سەر چاوم برۆیە" بڕیار دەدا.

بیر لە "ئێلیزابێس تایلر" بکەوە کە بەهرەی چەناگەی خۆی بەسووربوون لەسەر بەردەوام زەماوەندکردن دەربڕیوە. کۆمەڵێک لە هاوسەرەکانی نەشیاو بوون، بەڵام بڕیاری خۆی بووە و دەستی خۆش بێ، لەم ساڵانەی دواییدا چەناگەی ئێلیزابێس شێوەیەکی چەماوەی وەرگرتووە. بڕیارەکانیشی بەرەو ئاراستەیەکی مرۆڤانەی گۆڕاون لەبەرئەوەی ئێستا بەشێوەیەکی ڕووەو زیادبوون وەک خەباتکارێکی دژی ئایدز ناوی دەهێنرێ. کێ دەزانێ ژیان و چەناگە و هەڵبژاردنەکانی جلوبەرگی ئەستێرەی گەنجی چەناگە هەشتیی وەک "جێنیفر لۆپێز" و "تۆنی براکستۆن" و "چارلیز تیرۆن" چی بەسەر دێ؟ بێگومان دەسەڵات خاڵی ئەرێنیی تایبەت بەخۆی هەیە. قارەمانێکی تری کاری شۆ و ئەستێرەیەکی تەمەنی



ڕدێنی ڕێک



ڕدێنی چەماوە



ڕدێنی هەشتی

شێوەی کۆتاییی ڕدێن

ڕابردوو "مێیری پێکفۆرد"ە کە بەشێوازە سەرکەوتووەکەی و کەزییە زێڕینەکەی ناسراوە. لە ناو شارەزایانی ئابووریدا تا ئێستا ئەو بەیەکێک لە زۆرزانترین ئەو ئافرەتە بازرگانانە دادەنرێ کە سەر بەهۆلیوود بن.

پرسیار: وا بزانم من لە خوێندنەوەی هەرسێ هێماکانی کۆتاییی چەناگە باشم. بەڵام نازانم چۆن کۆتاییە چەناگەیەکی شاردراوە لە ژێر ڕدێندا ببینم؟

وەڵام: وەڵامەکە ئەوەیە مەرج نییە تۆ وەک زەویناسێک توێ بەتوێی لە چەناگە هەڵبدەیەوە. ڕدێنەکە بەپێوەر دابنێ: کۆتاییی ڕدێن هەمان کۆتاییی چەناگەی هەیە.

پرسیار: بەڵام ئەگەر پیاوێک چەناگەی ڕاستەقینەی خۆی لەڕێی جۆری ڕدێنەوە بگۆڕێ؟ ژمارەی کەسانی ڕدێن بزنانی یەک دنیا لە کەسانی چەناگە هەشتی زیاترە.

وەڵام: ئەگەر شێوەی ڕووت بگۆڕی لە ناخیشتدا شێوازی کەسیت دەگۆڕێ. وتەیەکی گەلێری هەیە کە ئەگەر بەشێوەیەکی تر دای بڕێژین دەڵێ: "بزانە خۆت لە ژێر چ ڕووێکدا دەشێرییەوە، لەبەرئەوەی بەدڵنیاییەوە ئەم ڕووە وەردەگری".

هەروەها بیر لە لێکچوونە سروشتییەکانی کۆتاییەکانی چەناگە و کۆتاییەکانی ڕدێن بکەوە. کۆتاییی ڕدێن یان چەماوە یان ڕێک و یانیش هەشتییە. تاکە جیاوازییەکە ئەوەیە کە ڕدێن هەر هێمایەکی هەبێ، هێمایەکە بەیەکێک لە زۆرەکان هەژمار دەکرێ.

ڕدێنێکی چەماوە بەڕدێنێکی سانتاکلۆزی ناسراوە. ئاخۆ ئەم هێمایە پێوەندیی بەیانێکی مرۆڤانەی پڕبەزەییەوە نییە؟ نموونەیەکی هاوچەرخ کە هەڵگری ئەم هێمایەیە مامۆستای تەندروستیی گشتیی دوکتۆر "ئەندروو وێیل"ە.

شێوە ڕێکەکەی ڕدێن بەڕدێنی پیاوی ئەشکەوت ناو دەنێم. ئەم ڕدێنە دەرخەری سەربەخۆیی و هەڵبژاردن بەگوێرەی عەقڵە و "لیۆ تۆلستۆی"ی نووسەر و فەیلەسووف خاوەنی ئەم جۆرە ڕدێنە بووە. تا ئێستا "مارکۆس دی ساد" خاوەن سامناکترین جۆری ئەم ڕدێنە بووە.

"لیۆن ترۆتسکێی"ی شۆڕشگێڕیش کتومت بەڕێز "رۆجێرز" نەبووە. "ئۆرسۆن ویلیس" تایبەتمەندیی خۆی هەیە. ئۆرسۆن ئەو ئەکتەرە دەستبالایە لە ناو بەرنامە ڕادیۆییەکەی "War of the Worlds – جەنگی جیهانەکان" بەڕێکەوت «هیوادارین بەڕێکەوت بووبێ» وڵاتی سەبارەت بەهێرشی دانیشتووانی مارس تووشی دڵەڕاوکێ کرد.

پرسیار: سەرم لێی دەرناچێ. چەناگە و ڕدێن باسی هەڵبژاردنەکانمان بۆ دەکەن، بەڵام

ئاخۆ برۆ چۆنیەتیی بیرکردنەوەی خەڵک بەرجەستە ناکا؟ و ئاخۆ بۆ هەڵبژاردن بەدڵنیاییەوە بیرکردنەوە پێویست نییە؟

وەڵام: مەهێڵە جیاوازییەکە سەرت لێ بشێوێنێ لە کاتێکدا کە دەتوانێ لەبری ئەوە بیرتیژییەکەت زیاتر بکا. مرۆڤ بەپێی هێمای برۆی بیر دەکاتەوە و دەدوێ و بەگوێرەی هێمای کۆتاییی چەناگەی یان ڕدێنی بڕیار دەدا و بڕیارەکە جێبەجێ دەکا. ئاخۆ هەستت بەوە نەکردووە شێوەکانی برۆ و چەناگە لێک دەچن؟ ڕاستە، بەڵام هێمایەکانی چەناگە تەنیا سەراوژێرن دەنا لەگەڵ هێماکانی برۆ هاوتان.

- لە چەماوەکاندا جەختەکە لەسەر خەڵکە.
- لە ڕێکەکاندا جەختەکە لەسەر بیرۆکەیە.
- لە هەشتییەکاندا جەختەکە لەسەر دەسەڵاتە.

پرسیار: ئاخۆ دەتوانی کۆمەڵە نموونەیەکی تایبەت لەسەر ئاوێتەبوونی جیاوازی هێماکانی برۆ و چەناگەم بۆ باس بکەی؟

وەڵام: ئەمەی خوارەوە پوختەیەکی ۹ پێکهاتەی ڕێ تیچوویە کە هەریەکەیان سێ نمونەی لەگەڵە.

- برۆی کەوانەیی + چەناگەی چەماوە

لە بنەما و کردەوە و کاردا خەڵک یەکەمایەتییەکە.

سەرۆک فرانکلین دێلانۆ ڕۆزڤڵێت

خاتوونی یەکەم پەت نیکسن

"ماریان ئەندرسن"ی گۆرانیبێژ

- برۆی کەوانەیی + چەناگەی ڕێک

کەسەکە تێبینی هەستەکان دەکا، بەڵام جەختەکەی لەسەر بیر و بنەما نابەرجەستەکانە.

سەرۆک ئابراهام لینکۆڵن

خاتوونی یەکەم ڕۆزالین کارتر

"چارڵز ڕیڤسن"ی سەرناسی میکیاژ

- برۆی کەوانەیی + چەناگەی هەشتی

کەسەکە کارەکان بەشێوەیەک ڕێک دەخات تا بتوانێت لە هەستیاریی خۆی بەرامبەر بەهەست و سۆزی خەڵک سوودمەند بێ.

سەرۆک فرانکلین پیرێس

خاتونی یەکەم هێلێن تافت

"جێین ئۆستن"، ڕۆماننووسی شارەزا لە تەوسی کۆمەڵایەتی

– برۆی ڕێک + چەناگەی چەماوە

کەسەکە حەز لە بیرۆکەی نابەرجەستە دەکا، بەڵام ئامانجەکانی بەگوێرەی هەستی خەڵک دەهێنێتە دی.

سەرۆک هەری ترومان

خاتوونی یەکەم مارتا واشنتۆن

"جۆنی کاش"ی گۆرانیبێژ

– برۆی ڕێک + چەناگەی ڕێک

کەسەکە سوود لە چەمکەکان وەردەگرێ بۆ داڕشتنی بنەمای گرینگتر.

سەرۆک جۆرج بوش

خاتوونی یەکەم فرانسیس کلیڤلاند

ئەکتەری زلهێز،ساموئێل گۆڵدواین

– برۆی ڕێک + چەناگەی هەشتی

بیرۆکەکان مێشکی کەسەکەیان داگیر کردووە و ئەو سوود لەم بیرۆکانە وەردەگرێ بۆ پڕکردنەوەی پێوستیی خۆی بەدەسەڵات.

سەرۆک ویلیام تافت

خاتوونی یەکەم لویزا ئادامز

بیلی زێ کید "بیلی بچکۆڵ"ی یاخیبوو

– برۆی هەشتی + چەناگەی چەماوە

پێویستە کەسەکە وردەکارییەکان ڕێک بخات، گۆشەگیرییەکی بەڕێوەبەر ئاسای هەیە و کارەکانی بەهاوسەنگییەوە بەکۆتا دێنێ.

سەرۆک مارتن ڤان بێرن

خاتوونی یەکەم بێتی فۆرد

"جۆن سێباستیەن باخ"ی مۆسیقادانەر

– برۆی هەشتی + چەناگەی ڕێک

کەسەکە پلانی پێویست بۆ بەدەستێنانی ئاکامە ویستراوەکە "کە چەمکێکە" دەدۆزێتەوە.

سەرۆک وۆردۆ ویڵسن

خاتوونی یەکەم نانسی ڕێیگان

"جاکی رۆبینسن"، یاریزانی پێشەنگ لە بێسبۆڵدا

– برۆی هەشتی + چەناگەی هەشتی

کەسەکە لە هەستەکانەوە دابڕاوە و لە هەوڵدان بۆ لەسەر دەسەڵات مانەوەدا دەشێ بێ ڕەحمی یان دڵنەرمییەکی زۆر بنوێنێ.

سەرۆک جۆن کوینسی ئادامز

خاتوونی یەکەم جەکۆلین کەنەدی ئۆناسیس

مارکۆس دی ساد

پرسیار: ڕۆز، من بەنوێنەرایەتیی چەناگەم سوپاست دەکەم. پێشتر هەرگیز زۆر بیرم لە چەناگەم نەکردبووەوە. بەر لە خوێندنەوەی ڕوو، چەناگە لەسەر ڕوو وەک تۆپەڵێک وا بوو. تاکە شتێک کە حەزم پێی کردبا چاوم بوو. ئاخۆ ئەوە بارێکی گشتییە؟

وەڵام: سەیرەکە لەوەدایە کە بارەکە گشتییە. ئەگەر لە کاتی دیتنی ڕوو خاڵی سەرنج لەسەر دەربڕین بێ هەڵبەتە چاو گرینگترین خاڵی سەرنجە. دووەم پلە هی دەمە و چەناگە ڕەنگە هیچ نرخێکی نەبێ. ڕێگەیەکی سەرەکی کە بەهۆیەوە چەناگە بتوانێ دەربڕینێکی دراماتیکی بخوڵقێنێ ئەو کاتەیە کە مرۆڤ خەریکە بگریێ. چەناگە دەشێ وەک زەرفە وەرەقێک گرمۆڵە ببێ.

چەناگە کە دەتوانێ سەبارەت بەخوو و ڕەوشت و خۆدانە بەر مەترسی و شێوازی بەرەنگاربوونەوە لە شەڕدا "بۆ ڕووخوێنەوەیەک" ئەو هەموو زانیارییە دابین بکا، شتێکی سەرسڕهێنە. هیوادارم ئەم بەشەی کتێب سرووشی بۆت هێنابێ تا بەرۆحێکی نوێوە بڕوانییە خوارترین بەشی ڕووت.

١١

# سێکس

ئەم پرسـیـارەم ئاراسـتـەی کـۆمـەڵە کـەسـانێکی سـەڵت کـرد کـە داوایان لێ کردبووم بۆیان بدوێم: "چ شتێکی هاوژوانێکی نوێ لە لات گرینگە؟".

زۆربەیان وتـیـان:"سـەرنجـڕاکـێـشـی"، "بزەیـەکی دڵخـۆشکەر" بـەپلەی دووەم و "کەسێک کە گەرموگوڕ بێتە بەرچاو" لە ناو وەڵامەکاندا بەپلەی کۆتایی هات.

دەمـویست هـاوار بکەم: " ئەی هاوار! ئاخـر ئەگـەر کـەسـێک بتـوانێت لە شـەوێکی هـەینیدا بـچێتە ژوان، ئەی ناشـتـوانێ خۆی بڕازێنێتـەوە و زەردەخەنەیەک لەسـەر لێـوی بنەخشـێنێ؟ هەمـوو ئەو شـتـەی کـە نیگایەکی دۆسـتـانە بـۆتی بەدەر دەخـا، ئـامـاژە بەهاوسـەرایەتی دەدا. ئـاخـۆ ناتـەوێ بزانی ئەو نەناسـە پاش ٦ مـانگ، چۆن هەڵسـوکـەوت دەکا، بەمەرجێک ئێوە تا ئەو کاتە لێک دانەبڕابن؟ ئاخۆ کەسایەتی لەلای تۆ گرینگ نییە؟

بەڵام من بـەنەزاکـەتەوە پرسـیـارێکی سـاناترم کـرد: "حــەز دەکـەی هاوژوانێکی نوێ چ شتێکی تۆ ببینێ؟".

ئەمجـارەیان وەڵامەکان بەتێکڕا ئەوە بوو: "دەمەوێ هـاوژوانە نوێیـەکە خودی ڕاسـتـەقینەم ببێنێ".

گـوێگرەکانم وریا کـردەوە: "بەڵام خـۆ ئێـوە بۆ خـۆتان ناتـانەوێ خـودە ڕاسـتـەقینەکـانی هـاوژوانەکانتـان ببینن. بۆیە چۆن دەبێ چاوەڕوان بن کە ئەوان خۆدە ڕاسـتەقینەکەی ئێوە ببینن".

سەرنجڕاکێشیی خەڵک پێوەندی بە "خـودە ڕاستەقینەکە"یانەوە هەیە. ئەو کـەسـەی کە تۆ دەتەوێ لە باوەشی بگری خـودی خۆشـەویسـتـەکەتە، نەک نموونەیەک کە ڕاسـتـەوخۆ لە ناو فیلمەکاندا بینیوتە.

ئەوەی لەم بەشەی کتێبانەی لێی دەکۆڵییەوە دووبارە "ڕاستەقینایەتی"یەکە هەڵدەسەنگێنێتەوە. تۆ شارەزایی پەیدا دەکەی لە هێماکانی ئاماژەدەر بەورووژاندن، گەرموگوڕی، دۆزینەوەی هاوڕێحەکەت واتە ئەو هێمایانەی کە لە مەودای نێوان پێویستیی بنەڕەتی بۆ سێکس تا تەباییی هەمیشەیی دان. ڕووخوێنەوەان بۆ دۆزینەوەی وروژێنەرایەتیی کەسێک دەزانن پێویستە سەیری شوێنی تا ڕادەیەک چاوەڕەواننەکراوی وەک سەرلێو و نەرمەگوێ بکەن.

## لەوپەڕی وروژێنەرایەتیی کۆمەڵایەتییەوە

ڕووخوێنەوان هەروەها جیاوازی دەکەن لە نێوان وروژێنەرایەتیی ڕاستەقینە و وروژێنەرایەتی کۆمەڵایەتی کە پێوەندیی بەناوبانگ و بیروبۆچوونەوە هەیە. بەگوێرەی ئەو بازنە کۆمەڵایەتییانەی کە تۆ تێیاندا دەخولێیەوە کەسێکی وروژێنەر ڕەنگە خاوەنی یەکێک لەم تایبەتمەندییانە بێ: جەستەیەکی زۆر سمێنراو، پرچێکی پڕی مۆدیل تێگزاسی، جەستەی لووسی مەلەوانێکی پرۆفیشناڵ، ماسولکەی ئەستوور و یان کەسێک کە ڕەنگە یەک تەن مکیاژی پێوە بێ یان هیچ جۆرە مکیاژێکی پێوە نەبێ.

بەم دوایانە کەسانی لێو پڕ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە خەڵک دەورووژێنن. ئەگەر لێوی کەسێک زۆر ئەستوور نەبێ ڕەنگە ئەو کەسە ئەگەر ببێتە هاوژوانی تۆ، نەتوانێ ماچێکی ترت بکا «ئەمە قوتابخانەی ماچکردنە: باشترین لێو ئەو لێوانەن کە گەورە و پڕ ڕەنگن و زۆر لێت دوور نین». ئەم وروژێنەرایەتییەی لێو، تەنیا واتایەکی کۆمەڵایەتییە. هەروەک لە بەشی تایبەت بە"دەم" خوێندتەوە، لێوی پڕ، ئاماژە بەخۆئاشکراکردن دەکا نەک وروژێنەرایەتی. نهێنییەکانی وروژێنەرایەتیی شاراوە لە ناو ڕوودا لە شوێنێکی تر دان.

ئەزموونێکی ڕووشکێنی "ڤیکی" کە یەکێک لە قوتابییەکانمە، ئەم خاڵە شی دەکاتەوە. ڤیکی لە نزیکەوە ڕووبەڕووی "کێڤن کلاین"ی ئەکتەری بالادەستی وەرگری خەڵاتی ئۆسکار بووە. کێڤن لێوی زۆر تەنکە بۆیە مامۆستایانی قوتابخانەی وروژێنەرایەتیی لێو ئەستووران نمرەیەکی زۆر کەمی بۆ دادەنێن. بەڵام لەم خاڵەدا ئەوان هەڵەن.

کاری ڤیکی لەو فێرگەیەدا بوو کە ئەم ئەکتەرە بۆ وانەوتنەوە سەردانی دەکرد. ئەرکی ڤیکی تاقیکردنەوەی لێهاتووییەکانی ئەکتەرەکە بوو و ئەم ئەرکە ئەوەندە ڕۆتینی بوو کە ڤیکی لە خەویشدا دەیتوانی ئەنجامی بدا. بەڵام کێشەیەک ڕووبەڕووی بووە:

"خەرمانەی مەیلە سێکسییەکانی ئەم پیاوە زۆر بەهێز بوو. نەمدەزانی چی لە خۆم بکەم.

خەرمانەکە ژوورەکەی داگرتبوو. دەتتوانی بەدرێژاییی هۆڵەکە هەستی پێ بکەی".

ڤیکی تەنیا لەبەرئەوەی لەگەڵ کلاین لە یەک ژووردا بوو لە کەسێکی بەشێوەیەکی ئاسایی پاراوەوە گۆڕابوو بۆ گەمژەیەکی قسە لابەلا. ئەو نەک تەنیا نەیدەتوانی قسە بکا، بگرە هەستیشی بەلەرزیی چۆکی دەکرد. لە کاتێکدا کە دڵی ڤیکی کەوتبووە ترپە مێشکە پرساکەی دەیپرسی: "ئەوە چی ڕوو دەدا؟".

ورووژانی سێکسیی سەرووئاساییی هەڕەمەکییانە. ئەوەیە ڕووداوەکە.

ئاساییە کە زۆرێک لە ئەستێرەکانی سینەما لەگەڵ یەکتر زەماوەند دەکەن. جووتە کەسێکی یەکجار ورووژێنەر لەگەڵ یەک دابنێ. ڕەنگە ئەوان ئەوەندە یەکتریان لە لا ئاسایی بێ کە لە کاتی بەیەکەوەبوونیان بتوانن تا دەش بژمێرن.

"فۆب کێیتس"ی خێزانی کلاینیش ئەکتەرێکە کە لەسەر شاشە خاوەن خەرمانەیەکی گەورە و ورووژێنەرە. ئەو کە خۆشبەختانە لەگەڵ کلاین زەماوەندی کردووە، هەمان هێمای ڕووی هەیە، واتە ئەو هێمایەی کە ئاماژە بەورووژاندنی سێکسی دەکا و ئێمە پاشان باسی لێوە دەکەین. دواتر ئێمە بەردەوام دەبین بۆ ئەوەی هێمای تر بخەینە ڕوو کە بۆ دۆزینەوە و پارێزگاریکردن لە هاوسەرێکی تەبا تەنانەت زۆر گرینگترن.

## سەرلێو

ئەستێرەکانی سینەمایی نە لە تۆ و نە لە من یان لانی کەم لە من ناکەن. سەرلێو نموونەیەکی دڵنیاکەرەوەیە بۆ ئەم ڕاستییە. ئەستێرەکانی شانۆ و سینەما شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشیان هەیە کە پێوەندیی بەشێوەی سەرلێویانەوە هەیە.

پرسیار: من ڕقم لەوە دەبێتەوە کە لە ڕووی سێکسییەوە بەکەسێکی نەشارەزا بێمە بەرچاو. بەڵام ئاخۆ هەر واتای "سەرلێو" چییە؟

وەڵام: سەرلێو، لێوی سەرەوە نییە. سەرلێو کەوتووەتە ژوورەوەی لێوی سەرەوە و ڕووبەری نێوان سەرە لووت و دەم داگیر دەکا. ئاوەڵێکم سەرلێو بە"ئەڵقەی بنەڕەتی" ناو دەبات و حەز لەوە ناوە دەکا، لەبەرئەوەی لە کاتی تاشین زۆربەی جار ئەڵقەکە دەپچڕێنێ. ئەگەر بتەوێت لە ناولێنانەکەتدا زاراوەی پزیشکی بەکار بهێنی دەتوانی ئەم بەشەی جەستە بەفیلتروم ناو ببەی. هەموو ئەو شتەی کە چاوی بۆ دەگێڕی دێراوێکە کە دەکەوێتە سەر ناوەڕاستی لێوی سەرەوەت.



سەرلێوی بەرجەستە



سەرلێوی کەم بەرجەستە

پێکهاتەی سەرلێو

ئێستا سەیری نەینۆک بکە. ئاخۆ دەتوانی دوو تیرەغەی قیت بەنزیکەیی تەریب لەگەڵ یەکتر کە دێراوێکیان لە نێواندایە، ببینی؟ یان ناتوانی شتێکی زۆر ببینی؟ چەندێتیی ئەو شتەی کە دەیبینی دەوەستێتە سەر شێوەی سەرلێو.

– سەرلێوێکی بەرجەستە دوو تیرەغەی ڕێکی هەیە.

– ئەگەر نەتتوانی تیرەغەیەکی ڕێک یانیش ناڕێک ببینی، تۆ خاوەن سەرلێوێکی کەم بەرجەستەی.

نهێنییەکی سەرنجڕاکێش لەبارەی پێکهاتەی ئەم بەشەی جەستەت هەیە. لە ژێر سەرلێوتدا «بەشێوەیەکی ورد لەسەر ئەو پووکانەی کە ڕاستەخۆ دەکەونە سەر کەڵپەکانەوە» دەتوانی هەست بەپێکهاتەیەکی ڕستە ئاسا بکەی کە پێی دەوترێ فرینوم. یان بەزمانت یان بەپەنجەکانت ئەم بەشە تاقی بکەوە. پاشان هەست بەوە دەکەی کە درێژی و شوێنی ئەم پێکهاتەیە هاوتایە لەگەڵ ئەو تیرەغانەی کە وەک سەرلێوی تۆ، خۆیان دەنوێنن.

ئەو زانیارییانەم وەرگرتوون. لەبەرئەوەی بەپێی ئەزموونی خۆم ئەگەر فرینومەکە وەک تاڵە سپاگێتییەک بەپدووە نووسابێ ئەوا مرۆڤ نازانێ فرینوم چییە. وەک خەڵکی تری خاوەن سەرلێوی کەم بەرجەستە، جەستەی منیش ئەو شێوەیەی لەشی هەڵبژاردووە کە بێ بەشە لە فرینوم. نەبوونی فرینوم لە ناو دەمدا، بەواتای دەرنەکەوتنی تیرەغەی بەرچاوە لە دەرەوەدا. کەواتە وا دیارە هەندێک خەڵک ئەم پێکهاتەیەی هەیە و هەندێکی تریش نییانە.

پرسیار: واتە ئەمە شتێکی بژاردەییە؟ مەبەست ئەوەیە کە من بەژیانێکی دابڕاو لە سێکس سزا دراوم؟

وەڵام: بەئاستەم وایە. هێور بە و هێشتاش گوێ بگرە.

واتای شێوەی سەرلێو برێتییە لە وروژاندنی سێکسی. ئاخۆ سەری خەڵک بەئاراستەی تۆوە دەسووڕێتەوە تەنانەت ئەگەر تازەش لەلای سەرتاشەوە نەهاتبییەوە؟ ئەگەر سەرلێوت بەرجەستە بێ، ئەگەری زۆرە وەڵامەکەت "بەڵێ" بێ.

تێ گەیشتی؟ ڕەنگە تۆ کەسێکی بۆڵەبۆڵکەر، خۆدوورخەر، بۆن ئارەقاوی، شەکەت، شڕوشەپڕێو بی. کێ گوێی لەم شتانەیە؟ ڕەنگە تۆ زیاتر لەو ڕادەیەی حەزت لێیەتی قەڵەو یان لاواز بێ. دەشێ تۆ لە تەمەنی دایک و باوکی ئەو کەسانەدا بی کە بەهەوەسێکی ئاشکراوە چاویان لێت بڕیوە.

بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە کە ڕووی تۆ و سەرلێوی بەرجەستەت جەخت لەسەر ورووژێنەرایەتیت بکەنەوە. پێ دەچێ خەڵکی خاوەن ئەم هێمایە هەست بە پرکێشبوونی خۆیان بکەن، هیچ نەبێ خەڵک لە وەتەی سالآنی هەرزەکاریی هۆرمۆنپەلدەرتەوە کاردانەوەی بەرامبەر بەو سەرنجراکێشییەت هەبووە.

ئەمە چ لێکدانەوەیەکی بۆ دەکرێ؟ دادپەروەرییەکە لە کوێیە؟ یەکێک لە قوتابییانم زۆرزانانە ناوی "درزی سەرەوە"ی لەسەر لێوی بەرجەستەی ئافرەت ناوە. چ میزاجت باش بێ چ خراپ ئەو خەڵکەی لەگەڵت دان بەهۆی تۆوە بیر لە سێکس دەکەنەوە.

هەڵبەتە ویستی ئازاد دێتە ناو ئەم باسە. ئەگەر تۆ کەسێکی خاوەن سەرلێوی ڤۆڵتاژبەرز بی، ئاخۆ چۆن سوود لەم شێوە دەسەلآتە وەردەگریێ؟ وزەی سێکسی وزەیەکی بێ کەموکوورییە. تۆ دەتوانی ئەو سەرنجەی کە پێت دراوە بەرەو هەر ئاراستەیەکی ویستراو ڕێنوێنیی بکەی. ڕەنگە تۆ تەنیا چێژ لەوە وەربگری کە خەڵک لەگەڵ تۆدا زیاتر هەست بەزیندوویی دەکەن. ڕەنگە لە ڕووی پیشەوە فرۆشیاری و سیاسەت سەرنجت ڕابکێشن لەبەرئەوەی ئەمانە ڕێگەی کاریگەرن بۆ ئەوەی سوود لە تەلیسمی ورووژێنەرایەتیت وەربگریێ.

سەرۆک کەنەدی و ڕەیگان و کلینتۆن بەهۆی سەرلێوە بەرجەستەکانیانەوە لە هەژماری سەرکردە سیاسییە هەرە تەلیسمگەرەکان دان. "کلۆدیا"ی قوتابی من هاوولآتییەکی واشنتۆنە کە لە وەتەی منداڵییەوە تێکەڵی لەگەڵ سیاسەتوانان هەبووە. ئەو بەم شێوەیە کاردانەوی خۆی لەودەمەی کە لەگەڵ کلینتۆندا دابووە، وەسف کرد:

"ئەو بەڕادەیەکی ئەوندە زۆر ورووژێنەرە کە بڕوای پێ ناکرێ. ئەو کاتەی ئەو لە ژوورەوەیە تۆ هەست بە ورووژێنەرایەتییەکەی دەکەی. من تەنانەت بەشێوەیەکی فیزیکی لێی نزیک نەبووم. دەبێ ئەوەشت پێ بڵێم کە هەرگیز کەسایەتییەکی سیاسیی خاوەن ئەو جۆرە وزەیەم نەدیبوو".

ئێستا پرسیارێکی تر سەر هەڵدەدا. ئاخۆ تۆ بەڕاستی خوازیاری ئەو پلەیەی کێشکردنی؟

ئاخۆ تۆ بەڕاستی چێژ لەوە وەردەگری کە وەک "کێڤن کلآین" بی، واتە چارەنووست ئەوە بێ خەڵکێک کە بەبێ تۆ کەسانێکی ئاسایین لەگەڵ تۆدا زمانیان تەتەڵە بکا یان قسەی پرۆپووچ بکەن. ئەگەر سەرلێوی تۆ بەرجەستە بێ و تەنانەت بەرجەستەبوونەکە زۆریش

نەبێ، ئاریشـەیەک هاوڕێی ئەم هێمایەیە کە برێتییـە لە چۆنیـەتیی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کـێـشکردنـەکـە. کـەم خـەڵک هـەن لە ناخـیـاندا ئارەزوومـەندی ئەوە بن وەک ئـامـرازێک بۆ سێکس هەڵسوکەوتییان لەگەڵدا بکرێ. کەواتە پرسیارەکە ئەمەیە: ئەو کاتەی تۆ سەرنجی خەڵک ڕادەکێشی، چۆن مامەڵە لەگەڵ کێشکردنەکە دەکەی؟

"دەبم بەئەستێرەیەکی سینەمایی" یەکێکە لە وەڵامەکان. ئاخۆ دەزانی ئەگەر تۆ بەنیازی وەرگرتنی ڕۆڵەکانی تایبەت بەپێوەندیی خۆشەویستی بی، سەرلێوی زۆر بەرجەستە لە ڕاستیدا یەکێکە لە مەرجەکان. ئەمانە چەند نموونەیەکن.

### پیاوانی سەرکردەی خاوەن سەرلێو

پیـرێس برۆسنان. هەریسن فۆرد. مـیل گـیبسن. ڤاڵ کـیلـمـر. براد پیت. پاتریک ستیوارت. بروس ویلیس. شـۆن کۆنری. مۆرگان فریمان. میشـێل کیتن. بروس لی. جیمی سمیتس. دێنزڵ واشنتۆن. چۆ یون-فات

### ئافرەتانی سەرکردەی خاوەن سەرلێو

هێیل بێری. جودی فۆستر. هێلێن هانت. جولیان مۆر. جولیا ڕۆبێرتز. سوزان ساراندۆن. کێیت وینسلێت. کامێرۆن دیاز. سـالما هایێک. بێتی میدلر. گوینێس پاڵترۆ. مێگ راین. شارۆن ستۆن. کاسرین زیتاجۆنز

نەبوونی سەرنجڕاکێشیی هەوەسبزوێنەرانە لەسەر لێوی کەم بەرجەستەشدا بەو واتایە نییە کە تۆ خاونی هیچ جۆرە کێشکردنێکی تر نی. تۆ لەسەر ئاستی ڕۆحیدا بەشێوەیەک بەرنامەڕێژ کراوی کە کاریگەرییە سەرەتاییـەکەت لەسـەر خـەڵک بەهۆی لایەنەکانی تری کـەسـایەتیـتـەوە بێت، لایەنی وەک بیـرتیـژییـەکـەت، بەزەییـیـەکـەت یان شـارەزاییـیـە وەرزشـییـەکانت. ئەو کاتەی خـەڵک خـەرمـانەی تۆ دەخـوێننەوە ڕەنگە ئەو بەشـەی تایبـەتە بەسـێکس دەرنەکەوێ و سـەرنج ڕانەکێشێ، تەنیا ئەو کاتانە نەبێ کە تۆ دەکەویە ناو داوی خۆشـەویستی. بەڵام خـەرمانەی تۆ بەزۆر شـێوازی تر دەتوانێ بەهرەکانی تەلیسمگەرانەی تۆ بخـاتە ڕوو و، دەبێ ئەوەش بوترێ کـە خـەڵک سـەرەتا بـەهۆی ئەو بـەهرانەتەوە تـۆیان دەکـەوێتـە بەردڵ و پاشـان لەپاشـبـیـرێکی دڵخـۆشکەردا ورووژێنەرایەتیی تۆیان بۆ بەدەر دەکەوێ.

"وپی گۆڵدبێرگ" لە پیشەکەیدا هەروەک سینەماکار و شانۆکار و پێشکێشکاری شۆی

وتووێژی سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوە. بەڵام ئەو وەک هێمایەکی سێکس سەیر ناکرێ. "بیلی کریستاڵ" یان "ڕۆبین ویلیامز"یش هەر ئاوان. شێوەی سەرلێویان کێشت ناکا، بەڵام هەر هەموویان خەرمانەی سەرووئاساییی ئەوتۆیان هەیە کە جۆرەها تەلیسمی ناپێوەست بەسێکسی لەگەڵ دایە.

لە دەرەوەی جیهانی سەرگەرمیدا، تۆ خەڵکی خاوەن سەرلێوی کەم بەرجەستەی ئەوتۆ دەدۆزییەوە کە کاریگەرییەکانیان زۆر لە بابەتی سێکس سەرترە: "جین بۆلین"ی پزیشکی دەروونی، "ئایلانا روبنفێلد"ی چارەسەرکەر، "بێتی ئێدی"ی نووسەری پڕفرۆشترین کتێب لەبارەی ئەزموونی مەرگی نزیکبووە و هەروەها "دێیڤید ئۆگیلڤی"ی کەسایەتیی ئەفسانەیی لە ڕیکلامدا، بەشێوازێکی یەکجار سوودبەخشانە سەلماندوویەتی سێکس تاکە شتێک نییە کە بازاڕی گەرم بێ.

پرسیار: با لە وروژاندنی سێکسی گەڕێین. چ بەشێکی ڕوو پێت دەڵێ کە کەسێک سێکسییە، بەڕاستی سێکسییە؟

وەڵام: ڕاستیت دەوێ؟ هەرکەس دەشێ کەسێکی سێکسی بێ، یان واش نەبێ. هەریەکەمان ژیانێکی تایبەتی هەیە.

ڕاستەوخۆترین ڕێگەی خەملاندنی وروژێنەرایەتیی تەواو لە ڕوو خوێندنەوەی چینیی دێریندا باس کراوە. بەبۆچوونی شارەزایانی سیانگ مێین هەوەسبزوێنەرترین کەسانی سەر ڕووی زەوی ئەوانەن کە چەناگەی پان و کورتیان هەیە «کتوپڕ چۆن ئەو ڕووخوێنەوانە گەیشتوونە ئەو ئەنجامە؟ من نازانم، بەڵام هیوادارم لەم لێکۆڵینەوەیەدا چێژیان وەرگرتبێ.»

لۆجیکیانە لێکدانەوەیەکەیان واتابەخشە. هیچ نەبێ، چەناگە دەرخەری ئەوەیە کە چۆن کەسێک بەسەر تەنگانەدا زاڵ دەبێ. چەناگەی کورت هاوڕێیە لەگەڵ هەستیاری بەرامبەر بەڕەخنە. چەناگەی پانیش ئاماژە دەدا بەوەی کەسەکە پێویستی بەدڵنەواییی کەسانی تر هەیە. هەردووکیان لە تەک یەکتر دابنێ و شتەکە وەک لە تەنیشت یەکتردانانی ئەو کەسەیە کە بەزۆری پێویستی بەدڵنەواییکردنە، لەگەڵ کەسێکی تری گرینگ، و ئاخۆ خۆش نییە ئەو کەسەی تر تۆ بی.

بەدڵنیاییەوە کۆمەڵە ئافرەتێکی خاوەن چەناگەی پانی کورت لە دوان لەبارەی سێکس دەمیان شڕە. بیر لەدکتۆر "ڕوس ویستمیر"ی سێکسناس بکەوە یان لە "جین هارلۆ" و "مێ وێست"ی وروژێنەرانی دەستباڵا. "سیدنی بیدڵ بارۆز" یان هەمان "زێ مێیفلاور مادام"ت

بەبیرە؟ "چارڵز برۆنسۆن"ی ئەکتەریش لە ورووژێنەرایەتییە ئاشکرایەکەی سوودمەند بووە، ڕاستە، دەشێ پیاوانیش ئەم هێمایەیان هەبێ.

پرسیار: ئاخۆ جگە لە چەناگە هیچ ئاماژەیەکی تریش نییە؟

وەڵام: "جۆزێفین تی"ی ڕۆماننووس، بیروبۆچوونێکی سەیر لەسەر ورووژێنەرایەتی دەخاتە ڕوو. لە "The Franchise Affair" کۆمەڵێک لە کەسایەتییەکان تێبینی دەدەن لەسەر جۆرێکی تایبەتی ڕەنگی چاو. ئەوان هاوڕان لەسەر ئەوەی چاوی بۆری شینکار ئاماژەیە بۆ کەسێکی زۆر هەوەسبزاو. ڕەنگە تی ڕاست بکا. بیر لە ڕەنگی چاوی کۆمەڵێک سەرناسی خاوەن جەماوەرێکی گەورە و پڕ خرۆش، واتە "پۆل نیومان" و "فرانک سیناترا" بکەوە.

ئاساییانە من نامەوێ لەسەر بنەمای ڕەنگ خەڵک هەڵبسەنگێنم و بەئاشکرا بیردۆزی ڕەنگی شینی تۆخ ڕەچاوی کۆمەڵە خەڵکێک ناکا کە چاویان شین نییە و ڕەنگە بەهەمان ڕادە ئارەزوومەندی سێکس بن. بەڵام ڕەنگە ئەم چەمکە یارمەتیت بدا، بەتایبەتی ئەگەر تۆ چاوی خۆت ئەم ڕەنگەی هەبێ. کەواتە بیر لەو ناسیاوانەت بکەوە کە ئەم خەسڵەتەیان هەیە و بزانە ئاخۆ ئەم قسەیە هیچی بنەمایەکی هەیە.

پرسیار: من لە هاوژوانیدا هەزاران جار تووشی نائومێدی بووم. بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو هاوژوانانەی بەکەڵکم نایەن هەڵسەنگاندنێکی خێرای حەزە سێکسییەکانیان دەکەم. ئاخۆ ئەمە هیچ هێمایەکی ڕوو ڕەوشتپاکی یان نێربازبوونی کەسێکت پێشان دەدا؟

وەڵام: نەخێر. ئەگەر تۆ دەتەوێ ئەوە بکەی بەپێشەی خۆت دەتوانی بەردەوام پرسیار بکەی «مەگەر لە سوپادا بی». ئەگەر نا تۆ دەتوانی حەزە سێکسییەکان لە خەرمانەی کەسەکەوە بخوێنییەوە. ئەگەر بتەوێ سوود لە خوێندنەوەی ڕوو وەربگری نزیکترین هێما بۆ ناسینەوەی حەزەسێکسییەکان ئەو هێمایەیە کە پاش ئەمە باسی لێوە دەکەین.

## گرێی شانازی

کۆمەڵێک چەناگە بەزۆریش چەناگەی پیاوان، تۆپەڵە گۆشتێکی خڕی قووتبووەیان پێوەیە کە بەدەسکی دەرگە دەچێ. بۆیە من بەگرێی شانازی ناوی دەبەم. ئەم هێمایە پشتگوێی مەخە. بەتایبەتیش ئەگەر زۆر بێ و تێیدا چەناگەکە بەهۆی چاڵێکەوە خاڵێکی تێدا دەردەکەوێ «بۆ ڕوونکردنەوەی جۆرە زۆر باوترەکە واتە چەناگەی بێ چاڵ، سەیری چەناگەی ئەو پیاوە بکە کە دواتر لەم بەشەی کتێبدا وەک نموونەیەک بۆ ڕووبەرەکانی

یەکەمایەتییەکانی ژیان ناوی هاتووە.»

گرێی شانازی پێوەندی بەشانازیکردنەوە هەیە. ئەگەر ئەو گرێیە ڕووی پیاوێکی خەملاند، پیاوەکە شانازی بەپیاوبوونی خۆی دەکا، شانازییەک کە تێیدا پیاو لەسەر شێوازی کۆنباو بەکەسی خاوەن دەسەڵات پێناسە کراوە. پیاو شایەنی ئەوەیە لە ناو ماڵدا حوکم بگێڕێ. قسەکەی یاسایە و ئەگەر دڵنەرمی بەواتای دۆڕان بێ، پیاوی لەخۆبایی ڕاستەوخۆ بەمستەکانی یان بەهەر چەکێکی تری بەردەستی دەست دەکا بەلێدان.

تۆ هەرگیز ناتەوێ لەگەڵ ئەم پیاوە تێ بکەوی. هەندێکمان ئەوەندە چاوترساو بووین کە نامانەوێ هەر باوەش بەم پیاوەدا بکەین، تەنیا لەبارێکدا نەبێ کە ئافرەتەکەش خاوەن گرێیەکی تایبەت بەخۆت بێ.

ئەگەر تۆ ئافرەتێکی خاوەن گرێی شانازی بی ڕێگەی تایبەت بەخۆت هەیە بۆ چاوترسکردنی ناحەزان. بەهۆی شانازییەکەتەوە ئەگەر کەسێک بەبێ ڕێزی هەڵسوکەوتت لەگەڵ بکا، ڕەنگە تۆ بەرقێکی چڕ کە مایەی سەرسامیی دەوروبەرتە کاردانەوەکەت دەربڕی.

پرسیار: ئاخۆ بەشێوەیەکی سروشتی هەموو کەس ڕقی نابێتەوە ئەگەر بەزمانێکی ناشیرین لەگەڵی بدوێن. ئەمە پێوەندیی بەگرێی شانازییەوە نییە، وایە؟

وەڵام: هەموو کەس ڕەنگە تێک بچێ. تۆ ڕاست دەکەی. بەڵام خەڵکی خاوەن گرێی شانازی، شێتتر دەبن. چاوێک بەناو هاوڕێ و ئاشناکانتدا بگێڕە.

ئەگەر بتەوێ لە ژیاندا بەشێوەیەکی ئەرێنی سوود لە گرێی شانازی وەربگری تەکنیکی ئەنجامدانی ئەو کارە لەوەدایە کە شانازییەکەت پێشان بدەی، بەڵام تۆپزییەکەت لە تام نەبەیە دەرەوە. بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ مانەوەت لە ژیاندا کێشەیەک نییە، بەڵام خۆ تۆ ناتەوێ ببی بەمۆتەکە. تا ئێستا بەگشتی چ کەسێک خاوەنی گەورەترین گرێ بووە؟ سەدام حوسێن- گرێیەکەی بەنزیکەیی ٢٠٪ ڕووی داگیر کردبوو.

گرێی بچووکی خنجیلانەتر دەسەڵاتی بەخشیوە بەهەردوو جەنەراڵ "جۆن ئێم شالیکاشڤیلی" و "کۆلن پاوڵ". بێگومان لە نێوان هاووڵاتیانیشدا گرێی شانازی بەشی بەژیانی "جۆ مۆنتانا"ی ناوداری تۆپی پێ و "ئێدوارد جێیمز ئۆڵمۆس"ی ئەکتەر و "ئێنریکۆ کاروسۆ"ی گۆرانیبێژی ئەفسانەییی دڵبزوێنەوە هەبووە.

هەروەها با "کریستۆفێر کۆلومبۆس" لە یاد نەکەین و هەروەهاش دۆزەرەوەیەکی تری

جیاواز، "تێد تێرنر"ی خاوەنی Atlanta Braves and Hawks و هەڵبەتە خاوەنی کەناڵی تەلەڤزیۆنیی تێرنر. تێرنر بەشێوەیەکی سروشتی ناوبانگی هاوتای ئەو ئیمپراتۆرییەتە نییە کە دای مەزراندووە، بەڵام ئەگەر بۆت ڕەخسا چاوێک بەژینامەکەی بەلەخۆگرتنی ئەو وێنانەی کە گرێی شانازییەکەی ئاشکرا دەکەن، بخشێنە. گرێیەکەی بەبەراورد لەگەڵ هی هەر کەسێکی تر جگە لە سەدام حوسێن گەورەیە. تێرنر ڕێکلامێکی زیندووی تێستێترۆنە.

پرسیار: ئاخۆ واتای گرێ لە خەڵکی نێرباز یان مێبازدا جیاوازیی هەیە؟

وەڵام: هێمای ئاماژەپێدراو ڕەنگە گرێ بێ، بەڵام سنگ نییە. واتاکەی ئەوە نییە تۆ لە خۆوە سەر بەجۆرێکی تایبەتی ڕەگەز بی. هەریەکەمان کاردانەوەی بەرامبەر بەکۆمەڵە سیفاتێکی نێرینە یان مێینە هەیە. هەروەها گرێی شانازیی نێرینە هاوڕێیە لەگەڵ نێرینەبوونێکی زۆر، جا با ئەم نێرینایەتییە لەلای تۆ هەڵگری هەر واتایەک بێ.

پرسیار: گریمانە کەسێک گرێی نەبێ. ئاخۆ هێشتاش ئەو کەسە دەتوانێت زۆر نێرینە بێ؟

وەڵام: بەدڵنیاییەوە، لەبەرئەوەی تۆ لەسەر هەسارەی ویستی ئازاددا دەژی. بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە کە: ئەو پیاوانەی گرێی شانازییان هەیە لە کاتی دیتنی سەرتاشخانەیەکی تایبەت بەیەک ڕەگەز دڵیان لە خۆ نابێتەوە، ئەو پیاوانە لە لێکدانەوەی واتای پیاوێکی ڕاستەقینەدا بۆچوونە کۆنباوەکەیان پێ پەسندترە. پیاوانی وەک تۆ کە گرێیان نییە، ڕەنگە بەهەمان ڕادە پیاوانی و تەنانەت یەکجار وروژێنەر بن، بەڵام بۆ ئێوە بەرگریکردن لە پیاوبوونی خۆتان، زۆر گرینگ نییە. ڕەنگە تۆ ئەوەندە بڕوات بەخۆت هەبێ کە ورەی مژمژۆکە خواردنیشت هەبێ و هەستیاریی خۆت بەئاشکرا دەرببڕی و تەنانەت هەست بەو پەیامە سێکسییە بکەی کە لە سمێڵتەوە دەردەچێ.

## سمێڵ

سمێڵ تەنیا کۆڵە موویەکی ڕوواو یان شتێکی نزیک لە لێو نییە. سمێڵ هێمای نێرایەتییە. مەرج نییە تۆ ڕووخوێنەوە بی تا ئەمە دەرک بکەی.

بەگوێرەی ئەم هێماسازییە جوانترە ئافرەتان سمێڵیان پێوە نەبێ. وا بزانم کاتێکی زۆر نابا کە کچێکی هەرزەکار سمێڵ دەردەکا. لەو ڕۆژانەدا ئەم هەرزەکارە ڕێگەی وەڕەسکەری وەک تاتوی سەرشان و سمینی ناوک بۆ کارتێکردن لە بەتەمەنترەکانی دەگرێتە بەر. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەرزەکارە کیژۆڵەیەکی گەنجی بوێرە، لەبەرئەوەی لەجیاتی ئەوەی

بەداودەرمـانی وەک سـپـیکەرەوە و مـووبەرەکـان هەولّی ڕزگـاربـوون لە مـووی ڕووی بدا ویستەکییانە گرینگی بەم موانە دەدا.

زانیاریی گشتیی زیاتر لەبارەی سمێڵ: پێویست ناکا تۆ ڕووخوێنەوە بی بۆ ئەوەی لە واتا ورووژێنەرەکەی شێوازی ڕازاندنەوەی سمێڵی پیاوێک تێ بگەی. ئەو کاتەی پیاو زۆر گرینگی بەسمێڵی خۆی دەدا، بەپاک و خاوێنی دەیقرتێنێ، لوولی دەدا، بای دەدا، توند ڕای دەکێشێ، ڕەنگە مەزندەی ئەوە بکەی کە وروژێنەرایەتیی سێکسی مێشکی ئەم پیاوەی داگرتووە– مێشکی خودی ئەم پیاوە. بەڵام ئەو پیاوەش کە سمێڵی خۆی وەک بزەیەکی خۆڕایی، دەردەخا، بەهەمان ڕادە شەیدای توانا سێکسییەکانی خۆیەتی. یان ئەوە واتاکەیەتی یانیش ئەو کەسێکی تەمەڵە.

تێبینیکردنی شێوازی خەملاندنەکە بەلاوە بنێ. ڕووخوێنەوان بەرەچاوکردنی ئەوەی کە ئاخۆ سمێڵ لێوی سەرەوەی پیاوی پۆشاندووە یان نا، زانیاریی ڕۆشنکەرەوەیان دەست دەکەوێ.

سمێڵێک کە ڕێگە بەدەرکەوتنی لێوی سەرەوە بدا، ڕەنگە ئەوەندە کورت بێ کە لێوی سەرەوە بەشێوەیەکی زەق لە مەودایەکی دووریشەوە دیار بێ. یان تووکەکە ڕەنگە بەجوانی لەسەر لێواری دەم گەمە بکا و وەک ئەوە وابێ کە بیەوێ بڵێ: "بتگرم یان نەتگرم؟ ڕەنگە نەتگرێ، تەنیا ئەمرۆ وا ناکەم. بەڵام سبەینێ پرسیارم لێ بکەوە".

– کاتێک پیاو سمێڵێک هەڵدەبژێرێ کە لێوی سەرەوەی دەشارێتەوە ئەوا خۆی دەکا بەخاوەنی هێمایە زۆرەکە کە سمێڵێکی زلە و وەک بەرگە قەنەفە مەودای سەرلێوی پیاوەکە تاڕدێن دادەپۆشێ و تانزمترین پلە ڕێگە لە دەرکەوتنی دەم دەگرێ. لێرەدا سمێڵ ڕەنگە ئەوەندە کورت بێ کە بەشێک لە لێوی سەرەوە دابپۆشێ.

پرسیار: چاوەڕوانی خەریکە دەمکوژێ. مەقەستم بەدەستەوەیە. ئەم قەبارانەی سمێڵ واتایان چییە؟

وەڵام: با لەجۆرە باوترەکەی دەست پێ بکەین. ئەگەر سمێڵت ڕێگە بەدەرکەوتنی لێوی سەرەوەت بدا واتای ئەوەیە تۆ بەویستی خۆت هەستەکانی یەکجار کەسیی خۆت دەدرکێنی. "کەریم عەبدولجەبار"ی ئەستێرەی تۆپی باسکە ویستێکی بەجۆشی بۆ باسکردنی ژیانی خۆی نواندووە. "بێنجامین سپۆک"ی پزیشکی منداڵان نەیویستووە بەئامۆژگاریکردنی باوکان بۆ قرتاندنی سمێڵیان سنووری خۆی ببەزێنێ کەچی سمێڵی



لێوی سەرەوە دەشارێتەوە



لێوارەکانی لێوی سەرەوە دەردەخات

سمێڵ

خۆی لەو جۆرەیانە کە ڕێگە بەدەرکەوتنی لێوی سەرەوەی دەدا. "بۆبی ماکفێرین" نەک تەنیا ڕێگە بەدەرکەوتنی لێوی سەرەوەی دەدا بگرە سروشتییانە ڕێگە بەدەنگی خۆی دەدا تا لە کاتی گۆرانیی وتندا ئۆکتێیڤ پاش ئۆکتێیڤ خۆی دەربڕێ.

کە ئاوڕێک لە مێژوو بدەینەوە ناودارترین پاشای بەریتانیا واتە هێنریی هەشتەم دەبینین کە هەروەک لە نیگارەکانیدا دەردەکەوێ کەسێکی خاوەن ئەم شێوە سمێڵە بووە و بەگوێرەی مێژوو کۆمەڵە هاوسەرێکی هەبووە. ئەمەش دەرخەری ئەوەیە کە ئەم پاشایە لانی کەم لە خستنەڕووی مەیلەی پێویست بەژن و مێردایەتی کەسێکی بەسەزمان نەبووە «ڕەنگە بزانی ئەم پاشایە کەسێکی زۆر بێ باک بووە بەڕادەیەک کە تەواوی ئەو ئافرەتانەی کوشتبوو کە پێشنیازی هاوسەرایەتیی ئەویان ڕەت کردبووە. بەڵام خۆشبەختانە ئەوە بەهیچ شێوەیەک پێوەندیی بەسمێڵەوە نییە». ئەمڕۆ تۆ بەزۆری سمێڵی جۆری لێوی – سەرەوە– بەدەرخەر لەسەر ڕووی "پیاوانی هەستیار" دەبینی واتە ئەوانەی کە دان بەوە دەنێن بەشدارییان لە سمینارەکانی فراژووبوون کردووە یانیش «ئەی هاوار بەماڵم» ئەوانەی ڕووخوێنەوەن. خەیاڵی خۆت بەکار بهێنە تا ئەم شێوازە هەستیارەی نێرینایەتی وەربگێڕییە سەر هەڵسوکەوتی ناو ژووری نووستن.

پرسیار: ئەی ئەگەر پیاوێک لێوی سەرەوەی دیار نەبێ، واتە خاوەنی ئەو خەسڵەتە بێ کە تۆ بەحەزنەکردن لە خۆئاشکراکردنی ناو دێنی و پاشان جۆری سمێڵی خۆی کرد بەسمێڵە دەمشڕەکە؟

وەڵام: یان ئەوەتا ئەو پیاوە بەتەقەلایەکی قارەمانانەوە دەیەوێ زیاتر خۆئاشکراکەر بێ، یانیش تەنیا سمێڵەکانی زۆر زۆر کورت دەکاتەوە. بەڵام لە ڕاستیدا ئاخۆ ئەمە چەند باوە؟ ئەو پیاوانەی کە بەئاسوودەیی خۆیان ئاشکرا ناکەن بەدەگمەن دەتوانن، شێوەی ئاراستە پێچەوانەکە بدەن بەڕوویان.

زیاتر ڕێی تێ دەچێ، ئەوان سمێڵێکیان هەبێ کە لێوی سەرەوەیان بشارێتەوە. لێرەدا پیاوەکە دەیەوێ نێرایەتیی خۆی بەشێوەیەکی بەهێز و تەنانەت سەرووئاسایی پێناسە بکا. سەرۆک "تێدی ڕۆزڤلێت" باشترین دروشمی بۆ دەربڕینی شێوەی سمێڵی خۆی داڕشتووە: "بەنەرمی بدوێ و گۆچانێکی گەورە لەگەڵ خۆت بگێڕە".

"چارلی چاپلین" و "گروچۆ مارکس" لەسەر شاشە کەسایەتیی ئەوتۆیان خوڵقاندووە کە پێوەندیان بەسمێڵەکانی ئەوانەوە هەبووە. بۆ چاپلین نێرایەتی لە سمێڵ هەڵقوولاو دژایەتییەکی زەقی هەبووە لەگەڵ زمانی جەستەی کە ئەوەی وەک کەسێکی دەربەدەر و ڕاڕا

پێشـان دەدا. مـارکس حـەزە زۆرەکـەی خـۆی بۆ سـێکس کردبوو بـەبابـەتی قـۆشـمـەچێتی و بەشـی زۆری گاڵتـەکەی لە شـەرم پێچـەوانەکەیەوە سـەرچاوەی دەگرت. تێ ناگـەم! ئاخـۆ گاڵتەجـاڕییـەکەی گروچۆ کەسـایەتییە ڕاسـتـەقینەکەی ئەوی تەنانەت زۆر کـاریگەرانەتر لە شەرمنایەتییە سینەماییەکەی "هارپۆ" کە کەسایەتییە ڕاستەقینەکەی هارپۆی دەشاردەوە، حـەشـار داوە؟ ئاخـۆ بەڕێکەوت بـووە کـە ئەم پیـاوە بەڕواڵـەت شـەرمنـانە برا بن؟ ئێـوەی هۆگرانی فیلم لێرەدا پێویستیم بەیارمەتیی ئێوەیە.

با بگەڕێینەوە سـەر سـمێڵ. یەکێک لە گەورەترین چیرۆکبێژانی ئەم سەردەمـە "رۆبێرت فـولگام"ە. پڕفرۆشـترین کتـێبـەکانی بزوێنـەری خـوێنەرێکی بەرفـراوان بوون. بەڵام ڕەنگە تێبینیت کـردبێ کە لە کتێبەکانیدا زانیـارییـەکی زۆرت لـەسـەر کـەسـایـەتییـەکەی دەست ناکـەوێ. ئەگەر چاوت بەنووسـەر کەوت یان وێنەیـەکیت بینی هـەست بەوە دەکەی بەر لەوەی سـمێـڵی تێکەڵ بەڕدێنێکی چەمـاوەی پڕ بێ، کـاریـگەرییـەکـی زۆری هـەبووە بۆ داپۆشـینی لێوی سـەرەوەی.

"جیم هێنسن"ی بلیمەتی قسەخۆشـی پرۆگرامی بووکەسەماکەرە، جارێک وتی: "هونەری لێبـووک ڕێگەیەکی باشـە بۆ خـۆشـاردنـەوە". ڕەنگە مـەبەسـتی سـمێـڵەکەی بووبـێ کە لەو جۆرەیانە لێوی سـەرەوەی پیاو دەشـارێتـەوە. لەبەرئەوەی ئەو جۆرە سـمێڵە شێوە ژیانێکی تایبەت دەخوڵقێنێ، کەواتە دەبێ بەجۆرێکی تایبەتی خۆشەویستیکردنیش کۆتاییی بێ.

## نەرمەگوێ

نەرمـەگوێ ئێسـتـا بەشـێکی ورووژێنەری ناو ڕووە. تەنانـەت ئەگـەر تۆ نە مـاچی بکەی نە نەوازش ئەو نـەرمـەگـوێیـە جـۆرە زانیـارییـەکی سـێکسـیی قـووڵت فـێـر دەکـا. قـەبارەی نەرمـەگوێیـەکە بپێوە. سـاناترین ڕێگەی پێوانـی بەهۆی گـوارەوە دەبێ. لە خـەیاڵتدا ئاخـۆ دەتوانی چەند پارچە خشڵ لەسەر ئەو نەرمەگوێیەی کە دەیپێوی، جێ بکەیەوە؟

– نەرمەگوێی گـەورە کۆمەڵە خشـڵێکی زۆری لەسـەر جێ دەبێتـەوە، وەک قرتێنەی وێنەدار و ئەڵقـە و گوارە و گـەوهـەری گەورەی ڕەنگ پـەلکەزێڕینەیی «نیگەران مـەبە. ئەمانە هـەمـووی بەخەیاڵە. ناچار نی بیان کڕی.»

– نەرمــەگـوێی بچـووک، ڕەنگە شـوێنی یەک یـان دوو یان سێ پارچـە خـشـڵی لەســەر ببێتەوە. ئەوە دەوەستێتە سەرئەوەی کە ئاخۆ تۆ چەند حەز دەکەی پاڵەپەستۆ بخـەیە سەر خشڵەکانت.

ئێستا خشڵەکان لابەرە. هەروەک ئەوەی سیحرێک کرابێ، نەرمەگوێیەکی بەڕێکی قەبارە پێوراوت بۆ بەدەر دەکەوێ. ئەوەش تەکنیکە، وا نییە؟

پرسیار: بەڵام ئەمە بابەتێکی جیدییە. باشە بۆ خۆت نەتوت ئێستا ئێمە لە کێبڕکێی سێکسی و لە سەرووی هەموو شتێکەوە، پێویستە خەمێک لە نەرمەگوێمان بخۆین؟

وەڵام: وا بزانم نەخێر، لەبەرئەوەی نەرمەگوێ هەر قەبارەیەکی هەبێ، هەر براوەیە و خاوەنی شێوازێکی سێکسیی براوەیە. هەر بەم بۆنەیەشەوە هیوادارام ئێستا هەست بکەن کە ئەگەر دەستان لەسەر گوێتان لا دەن هیچ مەترسییەکی تێدا نییە.

نەرمەگوێ گرینگە، لەبەرئەوەی دەرخەری زەمینەی نەستەیە. ئاخۆ کەسەکە خاوەنی ئەم خەسڵەتەیە یان نا؟ ئەم پرسیارە ئاراستەی ئارایشگەری ئەو کەسە مەکە، بەڵکو پرسیارەکە لە گوێی ئەو کەسە بکە.

پرسیار: کەواتە من دەبێ بەیەک جاری واز بێنم لەبەرئەوەی هەرگیز گوێم لە باسی زەمینە نەبووە. زەمینە هەر واتای چییە؟

وەڵام: زەمینە بەواتای گرینگیدانە بەلایەنە فیزیکییەکانی ژیان و پێوەندی بەورووژێنەرایەتییەوە هەیە، لەبەرئەوەی خەڵک لێک جیاوازن بەگوێرەی پێویستییان بەزەمینەیەک لەگەڵ هاوبەشێکدا. زۆربەی کات دژایەتییەکان سەرنجڕاکیشن. سێکس، یەکێکە لە خۆشترین ئەو ڕێگەیانەی کە بەهۆیانەوە ئەوە بەبیر خۆت دێنییەوە کە تۆ لە ناو جەستەیەکی فیزیکیدا دەژی– ئەمەش شتێکە کە گرەو دەکەم هەستت پێی کردبێ تەنانەت ئەگەر هەرگیز پێشتر زاراوەی زەمینەشت نەبیستبێ.

ئەمەش تایبەتمەندییەکانە: کەسێکی خاوەن نەرمەگوێی گەورە زەمینەی هەیە. بەهۆی ئەم هێمایەوە تۆ لەوەدا بەهێزی کە سەرنجێکی وردت هەیە. بۆ نموونە تۆ تەنیا تێبینیی چۆنیەتیی جلەکانی هاوژوانەکەت ناکەی. تۆ تێبینیی ئەوەش دەکەی تاچەند ئەو جلانە بۆی دەبێ. ئەگەر هاوژوانەکەت بڕواتە ژووری ئارایشت و بەڕەنگە سووراوێکی تر بگەڕێتەوە تۆ هەست بەم جیاوازییەش دەکەی. دەتوانی ببی بەلێکۆڵەر لەبەرئەوەی کەسێکی زۆر وردبینی.

ئاریشەی ڕێ تێچوو ئەوەیە کە هەندێک جار زۆر دەقاودەقیت. بۆ نموونە "جێری"ی ئاوەڵەت دەڵێ: "لە ڕێستورانتی " Cheap but Good"ڕێک لە ژێر هێمایە سەوزەکەی بەردەرگە دەتبینمەوە". ئەو کاتەی تۆ دەگەیە شوێنەکە دەبینی هێمایەکە شینە و

بەریناتییەکەی زیاتر لە ١٢ پێ نییە. وەک کەسێکی خاوەن نەرمەگوێی گەورە تۆ هەرگیز ڕێز لە جێری ناگرییەوە. ئەوە نەبوونی پشوودرێژییە بەرامبەر بەهەموو خەڵکی تر و شتێکی نابەجێیە.

بەڵام نکۆڵی لەوە ناکرێت کە نەرمەگوێی تۆپەڵانی سەرمایەیەکی گەورەیە. "ئالفرێد هیچکۆک"ی دەرهێنەر لەسەر شێوازی ڕاستەقینەی کەسانی خاوەن زەمینە لە ڕێگەی باسکردنی وردەکاریی قایلکەرەوە خەڵکی تا ڕادەی شێتبوون تاساندووە. "کۆنارد لۆرێنز"ی ئیسۆلۆجیست نموونەیەکە بۆ ئەو خەڵکانەی خاوەنی نەرمەگوێی گەورەی ئەوتۆن کە لە ڕێگەی گرینگیدان بەڕووداوەکانی دەروروبەریان ناوبانگیان دەرکردووە.

مەرج نییە تۆ زانایەکی ڕۆکێتناس بی یان بۆ لێکدانەوەی چۆنیەتیی ڕێزبوونی جوجکە مراوییەکان لە دوای دایکیان چاودێرێکی بەتوانا بی، تا لە گرینگیی زەمینە بۆ سێکس تێ بگەی. خەڵکی خاوەن نەرمەگوێی گەورە جیاوازن بەبەراورد لەگەڵ ئەوانی ترمان کە سێکس وەک دەرفەتێک بۆ دەستەبەرکردنی شوێنێکی لێ گیرسانەوە بەکار دێنن.

بەڵێ، نەرمەگوێی بچووک ئاماژە بەوە دەکا حەزەکانی کەسەکە زیاتر لەوەی فیزیکی بن، میتافیزیکین. ئەگەر تۆ لەم گرووپەدا بی تکایە تێ بگە مەبەستم ئەوە نییە کە تۆ ناتوانی بەشێوازە یەکجار ئارەزووشکێنەرانە جەستەییەکە ورووژێنەر بی، بەڵام بۆ تۆ گرینگیدان بەلایەنی فیزیکی لە ڕێ لادانە. لە سێکسدا هەروەک پاشماوەی تری ژیانت، ڕۆحی ناو جەستەی کەسی بەرامبەرت زیاتر کێشت دەکا.

وا بزانم بەگوێرەی ئەندازەکانی گوێ "ئێم سکۆت پێک"ی نووسەر کە بەرهەمەکانی پڕ فرۆشترین بەرهەمن خاوەنی نەرمەگوێی بچووک بێ. گوێی ئەم نووسەرە خاوەنی بازنەی ناوەکیی گەورەیە. ئەمەش ئاماژە بەوە دەکا کە لە شێوازی پێوەندی لەگەڵ خەڵکدا جەختەکە لەسەر ڕامانە ڕۆحانییەکەیە. شتێکی زۆر سەیر نییە کە نووسەر "زێ رۆد لێس تراڤلد/ ڕێگەی کەم گوزەرپێکراو"ی نووسیوە. کێ بیری بۆ ئەوە دەچوو کەسێکی خاوەن گوێی وەک ئەو شەیدای ئۆتۆبان بێ؟

"ئال گۆر"ی جێگری سەرۆک کۆمار، بەئاشکرا شەیدایی خۆی بەرامبەر بەئۆتۆبان دەربڕیوە، بەڵام ئەم ئۆتۆبانانە ئەلیکترۆنین، نەک سروشتی. ئەم شەیداییە دەکرێ بەهۆی نەرمەگوێی بچووکی گۆڕەوە شی بکرێتەوە. نەرمەگوێیەکەی هەروەها ڕێکیشە کە ئەمەش زۆر نائاساییە، لەبەرئەوەی بەدەگمەن نەرمە گوێی ناچەماوە دەدۆزرێتەوە. ئەم هێمایە

نائاساییه، ئاماژه بەشێوازێکی نا بەرهەستی زەینی، بۆ لێکدانەوەی جوانییەکانی ژیانی فیزیکی دەکا «بەپێچەوانەوە نەرمەگوێی چەماوە ئاماژە دەکا بەگڕ و تینێکی لە دڵ هەڵقووڵاوە بەرامبەر بەخۆشییە هەستییەکانی ژیان.»

ئاخۆ دەشێ نەرمەگوێیە دەگمەنەکەی گۆر، لە ژینگەپارێزییەکەیدا پاڵنەری بووبێ؟ پرسیارەکە وەک ئەوەیە کە بڵێی ئاخۆ زەریا ئاوی تێدایە؟ نەرمە گوێی گۆر ئاماژە بەوە دەکا ئەو بەتێگەیشتنێکی میتافیزیکی نەک تەنیا فیزیکی تام و چێژ لە دەشت و دەر وەردەگرێ و خاوەنداریەتیی زەمینەیەکی زەینی وای لێ دەکا بیر لەو شتانە بکاتەوە کە حەزیان لێ دەکا بەلەخۆگرتنی شێوەی پاراستنی ئەو شتەش.

با بگەڕێینەوە سەر بابەتی سێکس. ئاخۆ کەسێکی وەک گۆر کە خاوەنی ئەو نەرمە گوێیە بچووکانەیە دەتوانێ وروژێنەر بێ؟ ئەمە کلیلی وروژێنەرایەتیی "خودە ڕاستەقینەکەم"ە. قووڵترین پێناسە بۆ ئەم وروژێنەرایەتییە لە سەرووی سەرنجڕاکێشی فیزیکیی بێگەردەوەیە. واتای ئەوەیە کە شتێک لە حوزووری کەسێکی تر دایە کە ڕۆحی تۆ بانگ دەکا. بەپێچەوانەی ئەو شێوازە وروژێنەرایەتییە سێکسییەی کە هەموو خەڵک کاردانەوەی بەرامبەری دەبێ، واتە ئەو شێوازەی لە"سەرلێو"ی بەرجەستەدا خۆی دەنوێنێ، وروژێنەرایەتیی "خودە ڕاستەقینەکەم" لە زۆر هێمادا خۆی دەنوێنێ. تۆ بەهۆی ئەو خەڵکانەی کە تا ڕادەیەک پێچەوانەتن کە کێشت دەکەن و تا ڕادەیەک لێکچوونت لەگەڵیان هەیە کە لەگەڵیان یەک دەگرێ، دەورووژێنرێی.

کەواتە هۆی کاردانەوی خۆم لەو کاتەی "ئال گۆر"م لەسەر تەلەڤزیۆن دی کە لە ئاهەنگی دەستبەکاربوونیدا سەمای دەکرد، دەگەڕێنمەوە بۆ نەرمە گوێیە زۆر بچووکەکانم. خوا شایەتە ئەو کاتە بەخۆمم وت: "ئای لەو سەماکارە سەرسڕمێنە". زۆری نەبرد زانیمەوە سەرچلان «ئەی کێی تر؟ سەرناسترین شارەزایانی سەمای نەتەوەمان» کاردانەوەی پێچەوانەیان هەبووە و گۆریان بە "ساردوسڕ" لە قەڵەم داوە. گۆر هەروەک مێشکێک و ڕۆحێکی مەزنە کە لە جەستەیەکدا خۆی دۆزیوەتەوە. بەڕای منیش ئەوە جۆرە دڵڕفێنەرایەتییەکی پڕ هێزە.

ڕێکەوتێکی خۆش: لە کاتی نووسینی ئەم بەشەی کتێبەکەدا لەگەڵ یەکێک لە باشترین هاوڕێکانم کە وەک من نەرمە گوێی زۆر بچووکی هەیە، خەریکی گفتوگۆیەکی تەلەفۆنیی بەجۆشە بووم. وتی: "ئێستا "ئال گۆر"م لە میوانداریەکی مامۆستایاندا ببینی. توانیم تەوقەی لەگەڵ بکەم. ڕۆژ تۆ ڕاست دەکەی. کەسێکی زۆر وروژێنەرە"

## ڕووبەرەکانی یەکەمایەتی

بەشێکی زۆری وورووژێنەرایەتیی "خودە ڕاستەقینەکەم" پێوەندی بەیەکەمایەتییەکانی ژیان هەیە. ئەگەر تۆ ئاواتەخوازی پێوەندییەکی درێژخایەن بی کەواتە بەگرینگیدانت بەسێ ڕووبەرەکەی یەکەمایەتییەکانی ژیان کارێکی ژیرانەت کردووە.

– یەکەمین ڕووبەری یەکەمایەتی مەودای نێوان هێڵی ڕوانی موو تا بەرزترین خاڵی برۆ لە خۆ دەگرێ، لە بنەڕەتدا ڕووبەرەکە نێوچاوان دەگرێتەوە. «ئەگەر مووی سەری کەسێک ڕووتابێتەوە بزانە هێڵی مووەکە لە کاتی پڕیدا لە کوێ بووە.»

– دووەمین ڕووبەری یەکەمایەتی مەودای نێوان بەرزترین خاڵی برۆ تا نزمترین بەشی لووت «یان نێوان دوو کونە لووتەکان یان سەرە لووت. هەڵبژاردنەکە دەوەستێتە سەر گۆشەی سەری لووت» لە خۆ دەگرێ– لە بنەڕەتدا ڕووبەرەکە چاو و لووت دەگرێتەوە.

– سێیەمین ڕووبەری یەکەمایەتی لە بن لووتەوە دەست پێ دەکا و تا کۆتاییی چەناگە «ئاگەدار بە. مەبەست چەناگەی یەکەمە» دەڕوا، لە بنەڕەتدا هەموو شتێکی لە دەم بەرەو خوارەوە لە خۆ دەگرێ.

پرسیار: توخوا من چۆن بتوانم ئەم بەشانە بپێوم؟

وەڵام: پێم باشە ڕێگەی قولانجی بەکار بهێنرێ.

مەودای نێوان هێڵی موو تا برۆ بەکەڵەموست و دۆشاومژەت بەقولانج بپێوە. لە بیرت نەچێ ئەمە دەبێتە یەکەمین ڕووبەری یەکەمایەتی. ئەم دوو پەنجانە لە شوێنەکەدا بەنەگۆڕی ڕابگرە. ئەم قولانجە دەبێتە ئامێری پێوانەکردنەکەت.

ئێستا هەمان دوو پەنجەکەت بۆ خوارەوە بەئاراستەی دووەم ڕووبەری یەکەمایەتی وەرگێڕە. ئاخۆ ڕووبەرەکە گەورەترە یان بچووکتر؟ ئەی سێیەمین ڕووبەری یەکەمایەتی؟ ئەگەر هەردووکیان گەورەتر بن لە یەکەمین ڕووبەری یەکەمایەتی ئەوا پێویستە کەڵەمۆست و دۆشامژەت زیاتر لێک بکەیەوە تا پێوانێکی تر بۆ قەبارەکە دابنێی. ئەوەی کە دەبێ بیدۆزییەوە گەورەترین ڕووبەرەکەیە.

پرسیار: ئاخۆ هەموو خەڵکی تریش وەک من دووەم ڕووبەری یەکەمایەتییان زۆر لە ڕووبەرەکانی تر گەورەتر نییە؟

وەڵام: ڕووبەرەکانی یەکەمایەتیی زۆر لەوەی بەخەیاڵتدا دێ، جیاوازترن. هەرەمەکییانە

٢٠ کەس هەڵبژێرە. ئەم جۆرەیان لە ڕوودا بخوێنەوە. ئینجا تێ دەگەی کە هەر ڕووبەرێکی یەکەمایەتی، ڕەنگە گەورەترین یان بچووکترین ڕووبەر بێ و ئەم جیاوازییانە یەکجار واتاهەڵگرن.

پرسیار: کەواتە ئاخۆ هەموو کەسانی بەتەمەن، بەهۆی چەناگەی دەبڵەکەیانەوە سێیەمین ڕووبەریان گەورەترین ڕووبەری یەکەمایەتییان نییە؟

وەڵام: تکایە پێوانەکە لە چەناگەی یەکەمەوە تێ مەپەڕێنە. بەهەمان شێوە لەو خەڵکانەی کە موویان ڕووتاوەتەوە بزانە مووەکە دەبێ لە بنەڕەتدا لە کوێ بووبێ.

بەڵام تۆ پرسیارێکی سەرنجڕاکێشت خستە ڕوو. بەگوێرەی کلێشەسازی بەرەنجامێکی مسۆگەری بەتەمەنداچوون سەرڕوتانەوەیە. هەروەها پێشت وتراوە کە ڕەنگە زیاتر لە یەک چەناگەش دەربکەی. بەڵام بیر لەوە بکەوە: دواجار کە هەردوو ئەم بارانەت لە هەمان کەس دیتبێ کەی بووە؟ گرەو دەکەم کەم ئەوەت دیتبێ. بۆ ئەوەی زیاتر لە هۆ و واتای ئەم هێما بگۆڕانە تێ بگەی، سەیری کتێبی داهاتووم لەبارەی ڕوو " Wrinkles Are God's Makeup – ژاکاوی خەملی خواوەندییە" بکە. لە هەمان کاتدا بەدڵنیاییەوە تۆ حەزت لێیە ڕێک لەم ساتەدا ڕووبەرەکانی یەکەمایەتی بخوێنییەوە بەتایبەتیش ئەگەر بەدوای هاوژینێکدا بگەڕێی. ئەم بەشانەی ڕوو «کە بێ شک لە ماوەی ژیانتدا گۆڕانیان بەسەردا دێ» دەرخەری یەکەمایەتییەکانی ژیانن.

ئەگەر یەکەم ڕووبەری یەکەمایەتی، گەورەترین ڕووبەر بێ، ئەوا کەسانی خاوەن ئەم هێمایە گرینگی بەبیرکردنەوە دەدەن. ئەوان شەیدای بیرۆکەی نابەرهەست و ڕامان و تیۆری و بابەتی لەم جۆرەن. پێشبینی بکە، ئەوان لە بواری وەک زانستەکانی تیۆری و فەلسەفە و وانەوتنەوە لەسەر ئاستی کۆلێج و لە نووسیندا دەستبالا بن. کۆمەڵێک هرزڤانی ناوزەد بریتین لە "پۆپ جۆن پۆڵ"ی دووەم و "واڵتر پیستۆن"ی ئاوازدانەر و "ئێنریکۆ فێرمی"ی فیزیازان و "نەعوم چۆمسکێ"ی زمانەوان و "کارڵ ڕۆجرز"ی دەروونناس. "مالکۆڵم فۆربیس" شاکارەکانی زەنگینترین ئەمریکییەکانی تۆمار کردووە و هەرچەندە بۆ خۆی ئەم شاکارانەی نەکردووە، بەڵام بەڕاشکاوی کەسێکی تەمەڵ نەبووە. نووسین بەهرەیەکی خەڵکی خاوەن ئەم چەشنە سەرانەیە، کەسانێکی وەک "جۆن گریشام" کە نووسەرێکی هەژێنەرە و "چارڵز شواڵتر"ی کارتۆنیست.

پرسیار: ڕەنگە لەبەرئەوەی یەکەمین ڕووبەری یەکەمایەتیم لە هەردوو ڕووبەرەکەی تر



فراوانخوازی (دووەم گەورەترین)



بیرکردنەوە (یەکەم گەورەترین)



هاوسەنگی (هەرسێ ڕووبەرەکە
وەک یەک)



خاکەڕایی (سێیەم گەورەترین)

ڕووبەرەکانی یەکەمایەتی

بچــووکـتــر بێ بۆیە من ســەرم لێی دەرنـاچێ. ئاخــۆ نێــوچاوانێکی بەبەراورد درێژ چ پێوەندییەکی بەورووژێنەرایەتییەوە هەیە؟

وەڵام: خەڵکی سەر بەم گرووپە شەیدای وشەی درێژ و ڕستەی نائاسایین. بەلایەنەوە بیرۆکەکان وروورژێنەرن. ئاریشەیان بەتایبەتی ئەو کاتەی لەگەڵی خەڵکی وەک تۆ دان ئەوەیە کە یەکجار تیۆرییانە واتە وەک کەسانێکی بایەخدەر بەبابەتی ورد و ناگرینگ یانیش کەسانێکی واقیعنەبین دێنە بەرچاو. یان لە باری "ڕۆبین ویلیامز"دا کە بەلای منەوە خۆشەویستترین کەسی ناو جیهانی سەرگەرمییە لەبەرئەوەی یەکەمین ڕووبەری یەکەمایەتیی زۆر گەورەیە، ڕەنگە ئەو بەکەسێکی وا بێتە بەرچاو کە هەر فڕی بەسەر ژیانی ئەم دنیایەوە نەبێ.

کەسانی وەک تۆ کە یەکەمین ڕووبەری یەکەمایەتییان بچووکە ڕەنگە گرفتە پێچەوانەکەیان تووش بێ. ئەو ڕەخنەیەی لە تۆ دەگیرێ ئەوە نییە کە گرینگی بە وردە جیاوازییەکان دەدەی. لە ڕاستیدا هێزی تۆ لەوەدایە کە وەک کەسێکی سەر بەگانگێک بەدوای ویستەکەت دەکەوی. "سپایک لی"ی فیلمساز و "سیزار چاڤێز"ی خەباتکاری سیاسی ئەم شێوازەیان لە بەرژەوەندی خۆیان بەکار هێناوە. "جودیس مارتین" و "ماریەن نێفرت" بەڕێگەی زۆر شیاوتر گەیشتوونەتە بەرزترین پلە لە پیشەکانیاندا (ئەوان بەشێوەیەکی زۆر باوتر بە"میس مانرز" و "داکتر مام " ناسراون.)

ئەگەر دووەمین ڕووبەری یەکەمایەتیی گەورەترین ڕووبەر بێ ئاماژەیەکە بۆ ئارەزووی فراوانخوازی. تۆ بەهۆی ئەو هێمایەوە لە وەبەدیهێنانی ویستەکەت کەسێکی بێ شەرمی و بەپەرۆشەوە گرینگی بەوەدەستێنانی پلەوپایە و پارە و باشترین شتەکان دەدەی «بەپێچەوانەوە خەڵکێک کە سێیەمین ڕووبەریان لە هەردوو ڕووبەرەکەی تر گەورەتر بێ گرینگی بەچێژوەرگرتن نەک وەدەستهێنانی باشترین شتەکان دەدەن. بوونەوەری چێژوەرگری ئاسوودەن.»

ئاخۆ بەڕێکەوت بووە کە "هێنری کیسینگر"ی سیاسەتوانی پلە بەرز کە دووەمین ڕووبەری یەکەمایەتییەکەی زۆر گەورەیە ئەم وتە بەناوبانگەکەی درکاندبێ: "دەسەڵات هەوەسێکی بەهێزە"؟ با لەسەر ئەمە دەنگ بدەین.

"جۆرج و مارتا واشنتۆن" هەردووکیان دەسەڵاتیان بەشتێکی وروورژێنەر لە قەڵەم داوە و ڕەنگە هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەردووکیان دووەمین ڕووبەری یەکەمایەتییان گەورە

بووە. هەروەک دووەمین ڕووبەری "دیتۆ ئەلێگزەندر زێ گرێیت" و "ناپۆلیۆن بۆناپارت"یش بەهەمان شێوە بووە. و با "مادۆنا"ی "فراوانخوازی کەژیلە" و هەروەها "هەریسن فۆرد"ی ئەکتەر کە گەورەترین ئەستێرەی مێژووی سینەمایە لە یاد نەکەین.

هەروەها کەسێکی خاوەن دووەمین ڕووبەری یەکەمایەتیی گەورە دەتوانێ توانای خۆی بۆ سەرکەوتنی ئابووری بەکار بهێنێ. لە"تۆم هۆپکینز" بپرسە کە بەپلە بەرزترین ڕاهێنەری فرۆشیاری ئەمریکا ناسراوە یان لە "جۆ جێرارد" بپرسە کە بەگوێرەی کتێبی " گاینێس بۆژمارە پێوانەییەکانی جیهان" وەک گەورەترین فرۆشیار ناسراوە.

فـــراوانخــــوازان ڕەنگە بەهەمـــان ڕادەی هـرزڤـــانان زیرەک بن، بەڵام لە تەوەری جەختەکەیاندا جیاوازییان هەیە. کاتێک فراوانخوازان لە بیرۆکەیەک تێ دەگەن لە تامەزرۆبوونیان بۆ بەکارهێنانی ئەم بیرۆکەیە گڕ دەگرن. لەبەرئەوەی کەسانێکی لەسەرخۆش نین، پێویستە بەبیریان بهێنرێتەوە کە بۆ دەستپێکردنی کارێک بەرنامەڕێژی بکەن. ئەگەر تۆ خۆشەویستی یەکێک لەم جۆرە کەسانە بی ئاگەداری خۆت بە، لەبەرئەوەی لە دەستپێکی پێوەندیدا دڵت ڕادەگیرێ و دواتر فەرامۆش دەکرێی.

بەپێچەوانەوە ئەوانەی دووەمین ڕووبەری یەکەمایەتییان بچووکە، بۆ هەموو شتێک بەلەخۆگرتنی پێوەندییەکانیش زۆر هەوڵ دەدەن و ئەم پاڵنەرە لە خۆبەختکردنەوە سەرچاوە دەگرێت نەک لە فراوانخوازییەوە. ئاریشەی ڕێ تێچووی ئەم کەسانە ئەوەیە کە بایەخیان پێ نادرێ، واتە گرفتێک کە ڕەنگە "ئەلێگزەندر سۆلژێنیتسن" و "ئایلیا پریگۆگین"ی براوەکانی خەڵاتی نۆبڵ بەسەریدا زاڵ بووبن.

چ بەهرەیەک هاوڕێی سێیەمین ڕووبەری یەکەمایەتییە؟ ئەگەر تۆ ئەم هێمایەت هەبێ، وروووژێنەرایەتی لە ناو مێشکتدا دەخولێتەوە. کەواتە با لەوەوە دەست پێ بکەین. بەڵێ، تۆ تا ڕادەیەک لە وروووژێنەرایەتیی خۆت دڵنیای. کولتووره هونەرییەکەی ئەمریکا ئەم بڕوابەخۆبوونەت پتەوتر دەکا، لەبەرئەوەی زۆرێک لە کەسایەتییەکانی وەرزشی و مۆدیلکارەکان هەمان هێمایان هەیە. زۆرێک لە کچان و کوڕانی سەر بەرگی کۆوارەکان خاوەنی ئەو هێمایەی تۆن «وە ئەم هێمایەی ڕوویش تەنیا لە ڕۆژاوای ناوەڕاستی ئەمریکادا باوە».

هەر دەڵێی هەموو ئەو خۆشەویستییە جەماوەرییە بەس نەبێ، بۆیە شتێکی تریش چاوەڕوانت دەکا. چەند جار پێیان وتووی: "تۆ ڕاستگۆترین کەسی سەر ڕووی زەوی"؟

چەند جار پێت وتراوە: "تۆ قسەخۆشێکی ڕوو ڕاستی"؟ تۆ کە هێندە ڕووڕاستی– ئووپ– س. مەبەستم کەسێکی خاکەڕا– خەڵک زۆر متمانەت پێ دەکەن. تۆ کەسێکی تووشی خەیاڵپلاو نابی. کەواتە ئەگەر بڵێی شتێک دەکرێ واتای ئەوەیە پێشتر لەوە دڵنیا بووی کە شتەکە کردەنییە. ڕەنگە هەبوونی ئەو زەمینەیە هۆی متمانەی خەڵک بە"مەجیک جۆنسن" لە کاتی خەباتکردنی دژی ئایدزدا ڕوون بکاتەوە «وە ئەم خەباتەش هیچ کاردانەوەیەکی نەرێنیی لەسەر کارامییەکانی ئەو لە تۆپی باسکەدا نەبووە».

"هاگ هێنفر" بەهۆی پەنابردنە بەر خۆڕسکییە خاکیترەکانی، توانسی سامانەکەی خۆی گڵ بداتەوە. هەروەها "تێنێسی ویلیامز"ی شانۆنامەنووس و "می وێست"ی ئەستێرەی سینەمایی سەرسەرهێنیش بەشێوازی تر ئەم کارەیان کردووە. "جێین فۆندا" و "ڕیچارد سایمۆنز"ی مامۆستایانی وەرزش سوودیان لە خەسڵەتی خاکەڕایی خۆیان وەرگرتووە، بۆ دووبارە ژیانبەخشینەوە بەژمارەیەکی بێ شوماری کاتبەفێڕودەرانی بن تەلەڤزیۆن. شتێکی بێ واتا نییە کە "ئان لاندرز"ی ستوونووسی ئامۆژگاری بەوە ناسراوە کە داوا لە خوێنەرانی خۆی دەکا تا "لە خەو هەستنەوە و بۆنی قاوە هەڵمژن".

بەڵێ، لەبەرئەوەی ئەم کەسانە لە گرینگیدان بەلایەنەکانی فیزیکی شارەزان و ئارەزوویان مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم لایەنانەیە بە کەسانێکی خاوەن ڕووی ورووژێنەر هەژمار دەکرێن. بەڵام بەر لەوەی تۆ ڕابکەی و پەلاماری یەکێک لەم کەسانە بدەی، بۆ ئەوەی بیکەی بەهاوسەری خۆت با ئەوەت لە یاد بێ: بۆ پێوەندییەک کە زیاتر لە ڕابواردنێکی تەمەنکورت بخایەنێت پێویستە تۆ و هاوژینەکەت خاوەنی هەمان ڕووبەری یەکەمایەتی بن. بەپێچەوانەوە پێوەندییەکەتان بەهۆی ئاریشەی ڕێ تێچووی ئەم هێمایەوە، واتە بێ ڕێزیکردن بەهەموو یەکەمایەتییەکانی تری ژیان بەکۆتا دێ. خۆ ناتەوێ بێ ڕێزی بەیەکەمایەتییەکەی تۆ بکرێ؟

ئاریشەی ئەو ڕووانەی کە سێیەمین ڕووبەری یەکەمایەتییان بچووکە بریتییە لە حەزنەکردن لەلایەنی فیزیکی. قەرەبووکردنەوەی ئەم لایەنە دەبێتە بەشێک لە ئەرکی ژیانی کەسانی خاوەن ئەم هێمایە وەک لەباری "مێری بێیکر ئێدی"، دامەزرێنەری زانستی مەسیحییەتدا دەردەکەوێ.

چەندین نەوە لە قوتابیانی زمانی ئینگلیزی هۆنراوەکەی "ویلیام وێردزوێرس"یان لە ژێر ناوی " Lines Composed a Few Miles above Tintern Abey – ئەو دێرانەی چەند میلێک لەسەرتری پەرستگای تینتێرنەوە هۆنرانەوە" خوێندووەتەوە. لەبەرئەوەی سێیەمین ڕووبەری

یەکەمایەتیی وێردزوێرس بچووک بووە گومانم لەوە هەیە کە ئەو تەنیا "چەند میلێک" لەسەرتری پەرستگایەکەوە بووبێ؟ ئەگەر هەر چاویشی پێی کەوتبێ شایەنی پیرۆزبایی لێکردنە. بێ شک وێردزوێرس شاعیرێکی گەورە بوو، بەڵام بڕوا ناکەم بەپێی نەخشەیەک ڕێی خۆی دۆزیبێتەوە.

"جولز فێیفر"ی کارتۆنیستی گەورەش شتێکی نووسیوە کە وەک ڕوونکردنەوەیەکە بۆ ژیانی کەسانی خاوەن سێیەمین ڕووبەری یەکەمایەتیی زۆر بچووک. لە وەسفکردنی ژیانی خۆیدا ئەو ئەم قسە نەستەقەی کردووە: "هەروەک ئەوەی لێی تێ گەیشتبم یەکێک لەو هۆیانەی حەزم دەکرد گەورە بم ئەوە بوو کە کەسانی هەراش ناچار نین جیمناستیک بکەن".

پرسیار: هەم لە ڕووی خۆمدا و هەم لە هی دڵدارەکەی ئێستامدا یەکەمین و دووەمین ڕووبەری یەکەمایەتی لە گەورەییدا یەکسانن. ئاخۆ ئەمە دەمانخاتە دۆزەخێکی سێکسییەوە؟

وەڵام: هەر جۆرە ئاوێتەبوونێکی ڕووبەرەکان ڕەنگە بگونجێت. بەڵام گونجانەکە ئاسانترە ئەگەر هەردوو کەسەکە لە ڕووبەرەکاندا لێکچوو بن. با هەموو ڕێ تێچوونەکانی ئاوێتەبوونی ڕووبەرەکانی لە گەورەییدا یەکسان وەربگرین.

ئەگەر ڕووبەری یەکەم و دووەم گەورەتر بوون پێشبینیی ئەوە بکە کە خۆت و دڵدارەکەت شەیدای بیرۆکە بن و پاشان لایەنێکی داهێنەرایەتی و کارەکییانەبوونیشی بۆ زیاد بکە.

هەڵسوکەوتی سێکسی ڕەنگە لە ناو سەرچاوەکاندا باس نەکرابێ. یان لانی کەم لەو کتێبانەی کە من چاوم پێیان کەوتووە، بەڵام تۆ دواتر لەوە تێ دەگەی کە تۆمارنامەی ساڵانەی کاروبارەکان بەردەوام ئاماژەی داوە بەسەرکەوتنی ئەو خەڵکانە کە ئەم داڕشتە داهێنەرانەیان هەبووە. نموونەش ئەمانەن "هارڤی فایرستۆن" کە کۆمپانیای " Firestone Tiers and Rubbers"ی دامەزراندووە و "کیرک کێرکۆریان"ی ستراتیجیزانی وەبەرهێنان و لە نێوان پلە بەرزترین بازاڕ دۆزەرەوەکانی خزمەتگوزارییە ئابوورییەکانی ئەمریکا پێویستە ئاماژە بە"نێد جۆنسن" بدرێ. "هارۆڵد گینین" وەک سەرۆکی کۆمپانیای " International Television and Telegraph" بەردەوام مەودای پرۆژەکانی فراوان دەکا لە کاتێکدا توانیویەتی سوودەکانی داراییش بەرز بکاتەوە و ئەمەش لە ڕاستیدا تەکنیکێکی زیرەکانەیە.

ئەگەر یەکەمین و سێیەمین ڕووبەر گەورەترین ڕووبەرەکان بن پێشبینیی ئەوە بکە کەسەکە خاوەن کەسایەتییەکی خاکیی بێ و خاڵی هێزی خەیاڵکردن بێ «و من لێکدانەوەی ورووژێنەرایەتییەکە بۆ خەیاڵی ئێوە بەجێ دەهێڵم». "جێیمز ئەندروود کرۆکێت" بەشێوەیەکی دەقاودەق وەک باخەوانێک بیرۆکەکانی خۆی چاندووە. "یولیسێس ئێس گرانت" سەرەتا وەک ژەنەراڵێک و دواتر وەک سەرۆکێک لەیەکخستنەوەی وڵاتەکەیدا ڕۆڵی گێڕا. دوژمنە کۆڵنەدەرەکەی گرانت، واتە ژەنەراڵ "ڕۆبێرت ئی لێ" کاتێک بۆ مانەوەی کۆنفیدراسی تەقەڵای دەکرد سوودی لە ڕووبەرەکانی یەکەمایەتیی هاوشێوە وەرگرتبوو.

ئەگەر دووەمین و سێیەمین ڕووبەر گەورەترین ڕووبەرەکان بن، پێشبینی کەسێکی بەدوای ویستکەوتوودا بکە کە هێندەی گرینگیدانی بەخۆشییە فیزیکییەکانی ژیان ئەوەندەش لایەنە مادییەکانی سەرکەوتنی لە لا گرینگە. بیر لە "جولیا چایلد" بکەوە کە بەتاقی تەنیا گۆڕانکاری لە خواردنی ئەمریکییەکاندا کرد لە پێناو ئەو کەسانەی کە چ فەڕەنسی بووبن چ غەیرە فەڕەنسی، حەزیان لە شێوازی فەڕەنسی بووە، بەڵام کەس بۆی دابین نەکردوون. "دۆڵی مەدیسن"ی خاتوونی یەکەم خزمەتکارێکی زۆری هەبووە، بەڵام زۆر داهێنەرانەتر لەو خاتوونانەی بەر لە خۆی لە کۆشکی سپیدا بوون سوودی لەم خزمەتکارانە وەرگرتبوو و بەم شێوەیە، بەجۆرە میوانداریییەکی ئەمریکییانەی تایبەت بەخۆی، ناوبانگی دەرکردبوو.

پرسیار: تۆ منت لە بیر کرد. ئەی ئەگەر هەر سێ ڕووبەرەکانی یەکەمایەتی یەکسان بوون؟

وەڵام: کە بەختەوەری! ڕووبەرەکانی یەکەمایەتیی هاوتا بەبەراورد دەگمەنن. ئەم ڕووبەرانە دەرخەری ئەوەن کە تۆ لە هەر هەموو ئەوانی ترمان کە لەم سەردەمە ناجێگیرەدا دەژین، حەز دەکەی ژیانت بەهاوسەنگی ڕابگرێ.

ژمارەیەک سەرکردەی کولتووری کە ڕوویان ئەم بەهرەی لێ دەبارێ ئەمانەن "ئێریک ئێریکسن"ی دەروونناس، "جۆن نێیسبیت"ی پێشبینی کۆمەڵایەتی، "ریچارد سکێیری"ی شرۆڤەکار و نووسەری کتێبی وێنەداری جوانی ئەوەندە پڕ وردەکاری کە لە خودی خۆیاندا سامناکن، "بێنجامین سپۆک"ی شارەزا لە چاودێریی منداڵ کە بیرۆکەکانی سەبارەت بەبەخێوکردنی هاوسەنگ کاریگەریی لەسەر ژیانی ملیۆنەها خێزانی منداڵدار هەبووە.

خەڵکی خاوەن ڕووبەرکانی یەکەمایەتیی یەکسان جیا لەو هاوسەنگییە کەسییە لەچاو

ئەوانی تر سەرپشکییەکی تریان هەیە. ئەوان لە خۆوە لە خەڵکی سەر بەهەر جۆرە یەکەمایەتییەک تێ دەگەن و لەگەڵ هەر هەموویان دۆستایەتی دەکەن. تۆ وەک ئافرەتێکی خاوەن ئەم خەسڵەتە ڕەنگە هەم لەگەڵ شەیدایەکی وەرزش و هەم لەگەڵ کەسێکی بەئیش پرووکاوی فراوانخواز و هەم لەگەڵ بلیمەتێکی گۆشەگیردا هاوژوانی بکەی. هەروەها ئەگەر مەرجەکانی تر هاوتا بن، دەتوانی لەگەڵ هەر یەک لەمانە بەختەوەر بی یان دەتوانی لە کۆنگرێسدا نوێنەرایەتیی هەر هەموویان بکەی. دەتوانی وەک "دایانا فێینشتاین" ببی بەسیناتۆر.

ئەوانی ترمان ئەگەر لەگەڵ هاوژینانماندا ڕووبەی یەکەمایەتیی لێکچوومان هەبێ ئەوا ژیانمان ئاسانتر دەبێ. بێ شک ئەگەر تۆ خاوەنی تاکە ڕووبەرێکی زۆر بچووک بی، بەر لەوەی خۆت تووشی پێوەندییەکی درێژخایەن بکەی لەگەڵ هاوژینێکدا کە ئەو ڕووبەرەی تێدا زۆر گەورەیە، باشترە قووڵتر بیر بکەیەوە.

پرسیار: ئەی ئەگەر ئەم دوو کەسە ئێستا هاوسەری یەک بن؟

وەڵام: باشترین داڵدەی تۆ ڕەنگە چاڵەکان بن. ئەگەر چاڵێکیشت نەبێ، پێویستە چاڵێک بۆ خۆت دروست بکەی. ئەگەر ئەمەت بۆ نەکرا پەنا ببە بەر هەستی گاڵتەجاڕیت بۆ ژیانە خۆشەویستەکەت، لەبەرئەوەی ژیانێکی نالەبار چاوەڕێی تۆ و هاوژینەکەت دەکا.

## چاڵەکان

هەمو خەڵک کەیفی بەچاڵەکان دێ، بۆچی؟ ئەو کاتەی واتای چاڵت زانی لە هۆیەکەی تێ دەگەی. بەڵام بەر لەوەی لەم ئەشکەوتە وردیلانەیەی ناو ڕوو بکۆڵینەوە با لەوە دڵنیا بین کە دەتوانین جۆرە سەرەکییەکانی لێک جیا بکەینەوە.

– چاڵەکانی خوێنشیرینی ئەو شێوە خرانەن کە لە کاتی بزەکردندا دەردەکەون و پاش بزەکە ون دەبن.

– چاڵەکانی جێگیر بێ ئەوەی پێوەندییان بەبزەکردنتەوە هەبێ، دەردەکەون. ئەم چاڵانە بەردەوام دیارن.

– چاڵەکانی هێڵی هێز، زیاتر لەوەی لە شێوەیەکی خڕ بکەن، وەک هێڵێکی قەدگرتوو دێنە بەرچاو. ئەو کاتەی تۆ پێ بکەنی وەک توێیە ئەستوونییەکانی ئێکۆردیۆن دێنە بەرچاو. هەندێک ڕوو تەنانەت جووتە چاڵێکی تەریبیان هەیە کە لەسەر هەردوو لای کوڵمدا بەدەر

دەکەون. تەنانەت ئەگەر کەسەکە یەکێک لەم چاڵە هێل ئاسایانەشی هەبێ، هەر بەخاوەنی ئەم هێمایە هەژمار دەکرێ.

پرسیار: لەبەرئەوەی تۆ ئەوەندە بەوردی باس لەم چاڵانە دەکەی کەواتە چ ناوێک لەسەر چاڵەکانی چەناگە، وەک ئەم چاڵەی سەر چەناگەی من دادەنێی؟

وەڵام: چاڵی چەناگە هاوتای چاڵەکانی جێگیرە، بەڵام لەبری ئەوەی لەسەر کولْمت بێ لەسەر چەناگەتە. چاڵی چەناگە بەپێچەوانەی چاڵەکانی کوڵم کە دەشێ جووتێک بن بەزۆری تاکە و ئەمەش پێوەندیی بەوەوە نییە کە تۆ چەند چەناگەی زیادەت پێوە بێ.

ئەگەر چاڵی چەناگەت وەک چاڵەکانی خوێنشیرینی تەنیا ئەو کاتەی پێ بکەنی وەدەرکەوێ تکایە ڤیدیۆیەکم بۆ بنێرە لەبەرئەوەی دەمەوێت لە مێشکمدا لەتەک کارامەییەکی دەگمەنی تر هەڵی بگرم. کارامەییەکەی تریش ئەوەیە کە کوڕەکەم لە تەمەنی پێرەوکەیدا بەلووت فیتووی لێ دەدا.

چاڵەکان پێوەندییان بەگاڵتەجارییەوە هەیە. چاڵەکانی خوێنشیرینی ئاماژە دەدەن بەوەی کەسەکە بەهرەمەندە لە یارمەتیدانی خەڵک بۆ پێکەنین. لە کاتی گرژبوونی بارودۆخدا تۆ دەروانییە لایەنە گاڵتەئامێزەکە و پلارێکی وا دەهاوێژی یان نوکتەیەکی ئەوتۆ دەدرکێنی کە گرژییەکە خاو دەکاتەوە.

ئەم سروشتە خوێنشیرینییە بەرەوایی خۆشەویستت دەکا. ئەی خاڵە لاوازەکە چییە؟ خەڵکی خاوەن چاڵ بەتایبەتی ئافرەتان ڕەنگە هێندەی هاوکارە مرومۆنەکانیان بەهەند وەرنەگیرێن.

ئەو کاتەی چاڵەکان جێگیر بن و هێمایەکەش زۆر بێ، ئەم کاردانەوە یەکجار زویرکەر و سەیرە. ویستی تۆ بۆ دڵخۆشکردنی خەڵکی تر بەئاستەم دادەمرکێ و لە سەرووی هەر جۆرە پێشبینییەکی رێ تێچوودایە و زیاتر لە بزەی " Cheshire Cat" ی ناو " Alice in Wonderlan " دەچێ. لە رووی کەسایەتییەوە وا پێشبینی دەکرێ کە تۆی خاوەن چاڵەکانی جێگیر لە چاو ئەوانی تر زۆر ئاسانتر بکەویە بەردڵان، بەڵام لە بەهەندوەرنەگیراندا گرفتەکەت لە هی ئەوانی تر گەورەترە.

ڕەنگە بەم هۆیەوە بێ کە چاڵەکان زیاتر لەسەر ڕووی ئەو کەسانەدا دەبینرێن کە لە بواری سەرگەرمیدا کار دەکەن، نەک لەسەر ڕووی زلهێزانی بازرگانی یان سیاسەتواناندا. کۆمەڵێک هونەرمەندی خاوەن چاڵی دڵگیر ئەمانەن "بۆنی ڕایت"ی گۆرانیبێژ،



چاڵی خوێنشیرینی



چاڵی جێگیر



چاڵی هێڵی هێز



چاڵی چەناگە

چاڵەکان

مووچڕەپێداهێنەرانی ناو سینەمای ئەمڕۆ "جیم کێری"، "مینی درایڤر"، "لۆرا لینی" و بتەکانی دوێنێ، "کلارک گێیبڵ" و "ڤیڤیەن لێی" و "بێتی وایت"ی هەردەم دیار لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆن. لە کۆتاییدا با "شێرلی تێمپڵ"، ئەو منداڵە ئەستێرەیە کە لە مێژووی کاری شۆدا خاوەنی بەناوبانگترین جووتە چاڵە لە یاد نەکەین. ئەم چاڵانە تا هەراشبوونی ئەو تەمەنیان کێشا و گومان لەوەدا ناکرێ کە لە ڕۆڵەکەی تری وەک باڵیۆزدا یارمەتیی ئەویان دابێ.

چاڵی هێڵی هێز دەرخەری هاوسۆزییە بەتایبەتی ئەگەر تۆ دەسەڵاتدار بی. لەجیاتی ئەوەی لافی دەسەڵاتێکی تاکانە لێ بدەی تۆ بۆ دڵخۆشکردنیان یارمەتی کەسانی پلە نزمتر لە خۆت دەدەی. بەپەرچدانەوەکە «بۆ کەسی خۆشیرینکەر و هەروەها کەسی خۆ بۆ شیرینکردوو» ئەوەیە کە ئەم ڕواڵەتە تەبایە ڕەنگە ڕەسەن نەبێ.

لەگەڵ ئەوشدا خوێنشیرینییە پڕ نەزاکەتەکەی چاڵەکانی هێڵی هێز لە ڕادەبەدەر یارمەتی هونەرمەندانی وەک "فرانک سیناترا" و "سپێنسر ترێیسی" و "شۆن کۆنری" و "ریکاردۆ مۆنتالبان" و هەروەها "باباتوند ئۆلاتونجی" «کە وەک ئەوانی تر ناسراو نییە تەنیا لەبەرئەوەی زۆر فیلم لەسەر دهۆڵ کوتەکان بەرهەم ناهێنرێن» داوە. سەرۆک "لیندن جونسن" لە چاڵەکانی هێڵی هێزدا خاوەنی زۆرترین ڕادەی هێماکەیە کە من تا ئێستا بینیومە. کەسێکی بەرچاوی تری خاوەن چاڵەکانی هێڵی هێزە، "شاکتی گاواین"ی ڕابەری فەلسەفەی سەردەمی نوێیە و ڕەنگە ئەم چاڵانەی ڕاستەوخۆ لە ڕێی کارامەییەکانی خۆی لەبەرجەستەسازیی داهێنەرانەدا خوڵقاندبێ.

خاوەنێکی تری چاڵێکی دەم بەخەندەی هێڵی هێز «لەسەر کوڵمی چەپ» "ئالان کۆهن"ە کە نووسەرێکی ڕۆحانییە و بە"دەمڕاستە پاراوەکەی دڵ" ناسراوە. پاراو و خوێنشیرین هەروەها سوودبەخش بووە بۆ "هاوارد شوالتز". ئەو هەم ژیر و هەم خوێنشیرینە و بەبۆچوونی من کەسێکی حەسێنەریشە.

ئەی چاڵی چەناگە؟ ئەوەیان ئاماژە بەڕووخۆشی لە ناو یاریی ژیاندا وێڕای کاتی بڕیاردانیش دەکا. ڕەنگە سەروەت و سامان شتێکی هەمیشەیی بێ، بەڵام ڕەنگە پابەندی بەبەڵێن هەمیشەیی نەبێ. بۆیە چاوەڕوان مەبە کەسی چەناگە چاڵدار ئەوەندە لەسەر کارێک بەردەوام بێ تا بتوانێ پارەی کڕینی سەعاتێکی زێڕین کۆ بکاتەوە.

ڕاڕایی ئاریشەیەکی ڕێ تێچوویە بۆ کەسێکی وەک تۆ کە چاڵێکی لەسەر چەناگە دیارە.

لەگەڵ ئەوەشدا سەرپشکییە مسۆگەرەکەت ئەوەیە کە سۆزەکەت ڕاستەقینەیە، دەنا ئەگەر ڕاستەقینە نەبێ هەر نابێ. نواندن لەلای تۆ ڕێگەپێنەدراوە.

پرسیار: ئاخۆ شەقی چەناگە هەمان واتای چاڵی چەناگەی هەیە؟

وەڵام: نەخێر، شەق هێڵێکی ئەستوونییە کە بەناو کۆتاییی چەناگەدا ڕەت دەبێ. شەق دەربڕی ناکۆکییە لەسەر بڕاردە سەرەکییەکانی ژیان. سوودی شەق ئەوەیە کە کەسەکە بەهۆی توانەوەی لە ناو ناکۆکیدا دەگاتە فراژووبوونێکی کەسی.

پرسیار: ئەو وانە مەزنەی کە من لەم باسەی تایبەت بەورووژێنەرایەتیدا وەرم گرتووە ئەوەیە کە ڕەنگە لە چۆنیەتیی هاوژوانیکردندا تەواو هەڵە بووبم. ئاخۆ شتێکی ڕاستە ئەگەر ئەمجارەیان لە هەڵبژاردنی هاوژواندا بەگوێرەی ئەو کەسایەتییە لە ڕوویدا بەدەر دەکەوێ، بڕیار بدەم نەک بەپێی ئەو شتەی کە ئەم هەموو ساڵانە بە وروورژێنەرم دادەنا؟

وەڵام: خۆ ئەگەر وا بکەی، زەرەری نییە. لە ڕاستیدا تۆ دەتوانی هەنگاوێکی بڵندتریش بهاوێژی و کاتێک ئامانجی خۆت دیاری کرد بەدوای ئەو کەسانەدا بگەڕێی کە هێمایەکانی ڕوویان دەرخەری ئەو خەسڵەتانەن کە لەلای تۆ گرینگترین. ڕەنگە ئافرەتی ناو خەونەکانی تۆ خاوەن چەناگەیەکی پانی کورت بێ و دووەمین ڕووبەری یەکەمایەتیی گەورە بێ و نەرمە گوێی زل یان هەرشتێکی تری هەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا کە پێشنیازی ئەوە ناکەم تۆ وەک وێنەکێشی ناو بنکەیەکی پۆلیسی ناوەخۆیی ڕووی ئافرەتەکە بەوردەکارییەوە وێنە بکە، بەڵام پێم باشە لیستەیەک لە چەند هێمایەک کە لە لات پەسند بن، دابڕێژی.

## ١٢

# چارەسەرکردنی گرفت لە پێوەندییەکاندا

لێـرە، لەســەر ڕووی هەســارەی فـێـربوون، ژیان یان خـۆش ڕابواردنـە یان وانەوەرگرتن. نموونەش بۆ ئەم ڕاستییـە پێوەندییەکانە. لەبەرئەوەی ئێمـە دوا بەشـی کتێبمـان بۆ لایەنە گەشترەکانی پێوەندییەکان تەرخان کردووە شـتێکی زۆر ڕەوایە «یان لانی کەم واقیـعبینانەیە» کە ئاوڕێک لەلایەنی گرفتـەکانیش بدەینـەوە. نزیکبـوونەوە لە یەکتـر پەروەردەمـان دەکـا، بەڵام دووریش هەمـان ئەرک دەبینێ.

کەسـانی شـارەزا لـە بواری پێوەندی وەک "جۆن گرێی"ی نووسـەری کتێبی " Men Are from Mars، Women Are from Venus – پیـاوانی مـەریخی و ئافـرەتانی ڤـینۆسی" و "دێبـۆرا تانین"ی نووسـەری "You Just Don’t Understand – ئاخـر تۆ تێ ناگەی "یارمـەتیی ژمـارەیەکی بێ سنوور هاوسـەریان داوە تا گـرفتـەکـانی ڕۆژانەیان بەهـۆی تێگەیشتن لە جیاوازییەکانی ڕەگەزی، دووبارە شرۆڤە بکەنەوە.

بەشـێـوازێکی لێکچـووش تێگەیشتن لە جـیـاوازییـەکـانی شـێـوازی کـەسی دەتـوانێ یارمـەتیمـان بدا بۆ باشـتر پێوەنیکردن و بۆ هەسـتکردن بەسـۆزێکی زیاتر و بـۆ تێگەیشتن لەوەی کە بۆچوونی ئێمـە، تەنیا تاکە بۆ چوونێکە لە نێوان گەلێک بیروڕای ڕێ تێچووی تر. ئەو کاتەی ڕووی کەسێک باری ئاسـودەیی ئەو کەسـە لە چوارچێوەی لایەنێکی دیاریکراوی ژیان ئاشکرا دەکا ئەو زانیارییە دەتوانێ یارمەتیت بدا بۆ ئەوەی خۆت لە کۆمەڵێک ناکۆکی بپارێزی و ئەوانی تریش چارەسـەر بکەی.

پرسـیـار: تکایە دەکـرێ سـەرەتا بـەخـۆپاراسـتـەنەکـانەوە دەست پێ بکەین؟ من خـۆم لایەنگری شـەڕم. بەڵام حـەز دەکـەم، ئەگـەر لە مـەبەسـتم تێ گـەیشـتـبی، سـەرەتا باسی شەڕەکە بکەی.

وەڵام: کەواتە تۆ ڕاکردنت لە شەڕکردن پێ باشترە؟ باشە. خۆپاراستن لە شەڕ کارێکی ژیرانەیە. ئاخۆ دەزانی خوێندنەوەی ڕوو بۆ خۆپاراستن چەند زیاتر لە دەربڕین خوێندنەوە کە زۆر باوترە سوودت پێ دەگەیەنێ؟

پاش ئەوەی گوێی چاوی "ئایگۆر"ت سوور هەڵگەڕاند ڕەنگە زۆر درەنگ بێ بۆ ئەوەی بتوانی بەنەزاکەتەوە بۆ نەچوونت بۆ ئاهەنگی چاخواردنەوە داوای لێبووردنی لێ بکەی. زۆری پێ ناچێ ئەو دەقیرێنێ و تۆش لەسەری دەشیرێنییەوە و تنۆک تنۆک فرمێسکە سوێرەکان هەڵدەچۆڕێنییە ناو پیاڵەکەت یانیش قاپوقاچاغەکەی ڕێک تێ دەگری.

مەبەستم ئەوە نییە کە من بێ هەستبوون بەشتێکی باش بزانم. بێگومان تۆ دەبێ شارەزاییی هێمایەکانی هەستی بی و کاردانەوەت بەرامبەر بەتووڕەییی کەسێک هەبێ، بەڵام باشترە بەر لەوەی تووڕەیییەکە ئەوەندە بکوڵێت کە بتوانی چایەکی سەفەری بخەیە ناو، کاردانەوەت بنوێنی.

بەڵام خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ پێشوەختی سەبارەت بەناوچە هەستیارەکان وریات بکاتەوە. کێ دەسمالێکی سوور لە بەردەم گایەک ڕادەوەشێنێ تا مەیلی خۆی بۆ دەمەتەقێیەکی هێمن دەرببڕێ؟ بەهەمان شێوە ڕەنگە لەو بەشەی کتێب کە لەسەر "سێکس"ە ئەوەت بەبیر بێتەوە کە ئەگەر تۆ بەگاڵتەوە باس لەوە بکەی پیاوێکی خاوەن گرێی شانازی شۆرتی پەمبە لەبەر دەکا کەواتە کەسێکی گەمژەی.

جیا لە ڕەگەز و ئەو شێوازانەی ئاخافتن کە لەلایەن "گرێی" و "تانین" دەستنیشان کراون هەر کەسێک سیفاتی نائاسایی هەیە. با بەدڵنیایی و بەگوێرەی هەموو پێوەرە ڕاستەکانی ڕوو، فێری ستراتیجییەتەکانی خۆپارێزای ببین، بۆ ئەوەی ناچار نەبین لە نێوان شەڕ و ڕاکردن یەکێکیان هەڵبژێرین.

## دە هێمای گرینگی تووڕەیی

ئەمە سیستەمی ورياکەرەوەی تایبەت بەخۆمە. لە خوارەوەدا ١٠ هێمای هەرە گرینگ ڕیز کراون کە دەبێ وەک پێوەرگەلێکی خۆپارێزانە ڕەچاو بکرێن. هەر هەموویان جگە لە هێماکانی ژمارە ٢ و ٨ و ١٠ پێشتر باس کراون.

| | هێمای ڕوو | گرفتی ڕێ تێچوو | چۆنیەتیی خۆپاراستن لە ناکۆکی |
|---|---|---|---|
| ١ | پفی سەرچاو | بێ تاقەتبوون لەسەر شتی بچووک | لە مشتومڕیی زوو واز بهێنە دەنا قینەکە هەر بەرز دەبێتەوە |
| ٢ | لۆچی ئەستوونی نێوچاوان | خەیاڵشکانی کەڵەکە بووە | ئەو کاتەی گرکانەکە دەتەقێتەوە لە گڕاوەکە دوورکەوە |
| ٣ | برۆی زۆر هەشتی زۆر پڕ | شێوازی بەرەنگاربوونەوە | ئەگەر پێویست بوو بەرگری بکە، بەڵام تەنیا ئەگەر بتەوێ شەڕ بکەی دەنا بەرهەڵستی مەکە |
| ٤ | گرێی شانازی | شانازیکردن بەپیاوبوون «یان بەهاوسەرێکی خاوەن ئەم جۆرە گرێیە» | ئەگەر دەتوانی با کەیفت بەلافلێدانەکەی بێ |
| ٥ | چەناگەی زۆر هەشتی یان ڕیشبزنانی | وریابوون بۆ لەسەر دەسەڵات مانەوە | پێ بکەنە، بەڵام با هەستی پێ نەکرێ |
| ٦ | جووتە چاوی لێک نزیک بوو | ڕەخنەگری | هەرچەندە کەسەکە بێزارکەرە، بەڵام ڕەنگە ڕاست بکا. ڕەچاوی ڕێ تێچوونەکە بکە |
| ٧ | لێوی زۆر تەنک | بێنکورتی بەرامبەر بەئاخافتنی عاتیفی | ڕێز لە سنووره عاتیفییەکانی ئەم کەسە بگرە. ئەگەر پلاری بڕات هەبێ مەهێڵە لە دەمت دەرچێ |
| ٨ | ددانی پێشەوەی گەورە | هەستێکی خۆپەرستیی بەهێز و تەنانەت خۆنەشکێنەرانە | ئەو لووتبەرزە نەوازش بکە. گاڵتەجاڕبوونیش سوودبەخشە |
| ٩ | برژانگی تەنک | تووڕەییەکی سەرچاوەگرتوو لە موو | کاردانەوە هەستەکییەکانی کەسەکە بەڕەوا بزانی |
| ١٠ | کەڵبەی گەورە | سووربوون لەسەر بردنەوە | ئەمە واڕسکە "غەریزە" کوشندە. لەسەر ڕێگەی لا بکەوە |

پرسیار: چرچولۆچی نێوچاوان؟ ئاخۆ ئەمانە بەهۆی ئامێری پرچتاشینەوە دروست دەبن؟

وەڵام: لۆچی ئەستوونیی نێوچاوان ناوێکە کە بۆ جۆرێکی تایبەت لە لۆچ بەکاری دەهێنم و ئەم لۆچە بەهۆی ڕۆحەوە دروست دەبێ نەک بەهۆی ئامێری پرچتاشینەوە. من بەنزیکەیی لێکدانەوەی واتای چرچولۆچەکانم بۆ بەرگی هاوڕێی ئەم کتێبە واتە کتێبی "Wrinkles Are God's Makeup" ژاکاوی خەملی خواوەندییە" هەڵدەگرم. بەڵام بێگومان حەز دەکەی هەر ئێستا واتای لۆچی ئەستوونیی نێوچاوانت بۆ ڕوون بکرێتەوە. بۆ ئەوەی ژاکاوییەکانی سەر جەستە بناسییەوە بەدوای ئەو هێڵانەدا بگەڕێ کە لە یەکێک یان لە هەردوو لای برۆیەکانەوە بۆ سەرەوە هەڵکشاون. بەدڵنیاییەوە پێویستە ئەم هێڵانە لەگەڵ ئەو هێڵە ئەستوونییەی کە دەشێ لە ناوەڕاستی نێوچاوان واتە لە نزیک چاوی سێیەم بێ، تێکەڵ نەکەی. چاوی سێیەمیش هێمای خۆبەختکردنە.

لۆچێکی ئەستوونیی نێوچاوان دەربڕی تووڕەیی کەڵەکەبووەیە. ئەگەر تۆ لۆچێکی ئاوات هەبێ دەزانی چەند بەزەحمەت خۆت لە تووڕەبوون دەپارێزی. گومانیش لەوەدا نییە کە زەمینەیەکی باشت بۆ تووڕەیییەکەت هەیە. هەر هێڵێکی ئەستوونی ئەوە پێشان دەدا کە حیسابی خەیاڵشکانە کەڵەکەبووەکانت گەورەیە و لە ڕاستیدا سوودیشی دێتە سەر. ئەگەر بتوانی ڕێگەی ئەوتۆ بدۆزەرەوە بۆ ئەوەی ئەم حیسابە تووڕەیییەت بەتاڵ بکەیەوە، واتە ڕێگەی سازگارتر بدۆزەوە لەو تەقینەوانەی تووڕەیی کە بەپێچەوانەوە مەسۆگەرن و لە پێناوی خۆتدا بیر لە هەوڵی کارا بۆ لێبووردەیی بکەوە.

پرسیار: ئاخۆ جیاوازیی هەیە ئەگەر هێڵەکە لەلای ڕاست بێ یان لەلای چەپ؟

وەڵام: بێگومان. لۆچێکی ئەستوونیی نێوچاوان لەسەر برۆی لای ڕاست دەرخەری تووڕەیی کەڵەکەبووی پێوەست بەکارە. لۆچێک کە لەسەر برۆی لای چەپدا دەرکەوێ، دەرخەری تووڕەیی پێوەست بەپێوەندییەکانە، بەزۆریش پێوەندی بەهاوسەر یان منداڵەوە هەیە.

پرسیار: ئەی هێمایەکەی خۆبەختکردن؟

وەڵام: ئەم هێمایە بەشێوەیەکی سروشتی وەک هێڵێکی ئەستوونی کە ڕاستەوخۆ لە سەرووی ناوچەی چاوی سێیەمە دەردەکەوێ واتە دەکەوێتە نێوان و سەرتری هەردوو برۆ. بەگوێرەی هێماسازی ئەمە ئاماژەیەکە بۆ چارەنووسێکی ڕۆحانی. بەهۆی ئەم هێمایەوە تۆ خاوەن گرێبەستێکی ژیانی کە بەهۆیەوە لەسەر پەیژەیەکی کارەباییدا بەژیاندا گوزەر

دەکەی. خەڵکی تر بەسەر پلیکانە و بەخێراییەکی کەمتر پەرە دەسەنن.

وا دیارە هێمایەکی ئێرەیی پێ براوەیە، وا نییە؟ لێرە، لەسەر رووی هەسارە فێربوون رۆحی تۆ پەروەردەبوونی بەیەکەمایەتییەک لە قەڵەم داوە. بەڵێ، ئاریشەکەیش لە ئارادایە. ئاریشەکە پێوەندیی بەوکاتەوە هەیە کە تۆ حەز بکەی بۆ ساتێک لە گورەکەت کەم بکەیەوە، ناتوانی. خەڵکی تر بەهۆی نکۆڵیکردن یان بەهۆی بەهەڵە رۆیشتن بۆ پێشەوە، واتە بەرەو ئاراستەیەک کە لە ناخی خۆیدا چەوتە دەتوانن خۆیان لە توانەوە لە ناو رۆحانییە رزگار بکەن. بەڵام تۆ ناتوانی واز لەم لایەنە بهێنی. هەندێک جار تەنانەت رەنگە تۆ ناچار بی لە پێناو ژیانە رۆحانییەکەتدا قوربانی بدەی.

بەهۆی ئەم هێمایەوە تۆ لە رێی خۆبەختکردنت بۆ ئاین خزمەت بەخەڵک دەکەی. نموونە بۆ ئەو خەڵکانەی ئەم کارەیان کردووە ئەمانەن "دایکە ترێزا"، پەرستگانشینێکی کاسۆلیکی لەگەڵ بانگەشەکەرانی خێرخوازی لەکەلکەتە و "دالی لاما"، سەرکردەی بوودایی کە لەتبتی زادگای خۆی سەری هەڵگرت و "پیر ڤیلایەت عینایەت خان"، سەرۆکی رێبازی سۆفیگەریی نێودەوڵەتی و "هاستۆن سمیز"ی زانای ئاینی و "تۆماس مۆر"، قەشەیەکی پێشوو کە یارمەتی خەڵک دەدا بۆ ئەوەی لە هەموو لایەنێکی ژیاندا پەرە بەئاینپەروەری بدەن.

ئینتیما ئاینییەکانی کەسی خۆبەختکەر، رەنگە نەناسرێنەوە هەروەک لەباری "فرێد رۆجێرز"ی قەشەدا واتە هەمان ئەو بەرێز رۆجێرزەی کە بۆچاوپێکەوتنی لەگەڵ منداڵان لەسەر تەلەڤزیۆنی جەماوەریدا سویتێرێک لەبەر دەکا. بەڵام بەدڵنیاییەوە کەسێکی هەڵگری ئەم هێمایە چ کەسێکی جەماوەری بێ چ دوورەپەرێز چ بڕوادار و چ بڕوا، کەسێکی یەکجار رۆحانییە.

بەنزیکەیی لە نێوان هەر چوار سەرۆکێکی ئەمریکادا یەکێکیان هەڵگری ئەم هێمایەیە: واشنتۆن و مۆنرۆ و لینکۆڵن و گرانت و "تێدی" رۆزڤێلت و هاردینگ و کۆلیج و فۆرد و «پێت خۆش یان ناخۆش» نیکسۆن و سەرۆک کارتر کە هێمایەکەی لە هی هەر هەموویان زۆرترە و خزمەتکردنی بەجەماوەر لە وەتەی بەجێهێشتنی پۆستەکەی گڵکۆی کردووە. "بێن فرانکلین"یش کە رێی تێ دەچێ هێشتا دڵسۆزترین نیشتیمانپەروەری ئەمریکی بێ ئەم هێمایەی هەبوو.

پرسیار: تکایە باسی برژانگم بۆ بکە. بۆچی دەبێ برژانگی تەنک پێوەندیی بەتووڕەییەوە هەبێ؟

وەڵام: برژانگ سەبارەت بەڕادەی توندوتیژیی کاردانەوەی کەسێک بەرامبەر بەباروەدۆخێکی دەستبەجێ زانیاریت بۆ دابین دەکا. ئەو کاتەی کە سیستەمی دەمارگیری لەگەڵ برژانگی ئەستووردا لێک بدرێ پێشبینیی سروشتێکی بەبەراورد ئارام بکە. بەڵام برژانگی تەنک بەواتای هەستیارییەکی فەسلەجی - دەمارییی زۆرە. لە بەرامبەر تووڕەییەکی سەرچاوەگرتوو لە موودا وریای خۆت بە.

## تێبینیکردنی ددانی هاوڕێیەک

پرسیار: باشە گرینگیی هێمایەکانی ددان لە ناو ڕیزبەندی تووڕەییدا چییە؟ لە وەتەی لە خوا بەزیاد بێ ددانم هاتووە، ئەوەندە بیرم لە ددان نەکردووەتەوە.

وەڵام: ددان بەگشتی هێمای توانای بەش بەشکردن و شیکردنەوەی شارەزاییەکانی ژیان و بڕیاردانە. هەرچەندە پەندێکی پێشینییان دەڵێ ژماردنی ددانەکانی ئەسپێکی خەڵاتکراو ڕەوشتێکی نابەجێیە بەڵام ڕەوشتێکی تەواو بەجێیە ئەگەر ددانی هاوڕێیەکی نوێت تاقی بکەیەوە بەتایبەتیش ئەگەر ئەو کەسە ددانەکانی خۆی خۆویستانە لە بزەیەکدا ڕیز بکا.

خوێندنەوەی ددان شتێکی دڵخۆشکەرە، لەبەرئەوەی ددان دەربڕی قووڵترین ئاستە کە هێمایەکانی ڕوو دەتوانن ئاشکرای بکەن: ئەم ئاستەش بریتییە لەوەی کە ئاخۆ کەسەکە چۆن فێری وانەکانی ژیان دەبێ؟ شێوازە سەرەکییەکانی فێربوونی کامانەن؟

شتێکی بەجێیە کە منداڵی ساوا بەدەگمەن ڕووبەڕووی وانەی ژیانی پێوەست بەهەڵبژاردن و ویستی ئازاد دەبێتەوە. منداڵی ساوا تەواو سەرقاڵە بەبنەماکانی وەک پێگرتن. بۆیە پێویست ناکا ئەو بەشێوەیەکی دەقاودەق یان هێماسازییانە گرینگی بەددان بدا.

شێوازەکانی فێربوون لە تەمەنێکی زووی منداڵیدا سەر هەڵدەدەن و دواتر پەرە دەسەنن. ئەم شێوازانە بەهۆی ددانی شیرییەوە دەردەبڕدرێن. ئێوەی دایک و باوکانیش ئاخۆ تێبینیی ئەوەتان کردووە کە چۆن ئەو شێوازە منداڵکارە خنجیلانانە و ئەو ددانانەی کە هاوڕێی ئەم شێوازانەن بەڕێکی لەگەڵ بەرەو پێشڤەچوونی ژیانی منداڵەکەتاندا دەست بەگونجان دەکەن؟ بەپلەی یەکەم وا دەردەکەوێ منداڵ لەگەڵ ئەم شێوازانەدا هەست بەئاسوودەیی نەکا. بەهەمان شێوە واقیعی منداڵ پەرە دەسەنێ و، ئەو کاتەی کە سەرەتا بۆ دووەم جار ددانەکان دەڕوێنەوە ئەو ددانانە لە ناو دەمی منداڵێکی بچووکدا یەکجار

گەورە دیارن. ئەم دیمەنە بەسە بۆ ئەوەی سینگی دایکێک پڕ شیر بکا، بەڵام ڕەنگە ئەو وازی لە شیردان هێنابێ. ئەو ددانە زەبەنە گەورانە ئەوەمان دەخەنەوە یاد کە شێوازەکانی فێربوونی هەراش لە دیدی منداڵێکی قۆناخی قوتابخانەی سەرەتایی چەند ئاڵۆزن.

لەگەڵ دەرکەوتنی ئەم ددانانە شێوازی جیا سەر هەڵدەدەن کە هەڵگری واتای سوودبەخشن لەبارەی شێوازی کەسی.

ددانی پێشەوە ئاماژە دەکا بەرادەی خۆپەرستیی کەسێک بەبەراورد لەگەڵ خەڵکی تر بەگشتی. زۆربەی کات ئەم دوو ددانانەی کە لە سەرەوە و لە ناوەڕاست دان تا ڕادەیەک لە ددانەکانی تر گەورەترن کە ئەمەش ئاماژە بەوە دەکا کە هەستێکی خۆبەباش زانین، پێشترێتیی هەیە بەسەر هەر هەموو هەستەکانی تر.

ناسینەوەی ددانی پێشەوەی گەورە لە سەرەتادا کارێکی ئاڵۆزە، لەبەرئەوەی ئاساییانە ددانی پێشەوە بەبەراورد لەگەڵ ددانەکانی تری ناو دەم گەورەن و واتاکەیان بریتییە لە ڕادەیەکی زۆری خۆپەرستی. ئاریشەی ڕێ تێچوو بریتییە لە جۆرە کەللەڕەقێتییەکی خۆپەرستانە کە بەدڵنیاییەوە دەشێ هەوێنی هەڵاسیانی شەڕ بێ.

"جۆ دیماگیۆ"ی ئەفسانەی بێیسبۆڵ ڕەنگە بۆ کۆڵنەدەرایەتییەکەی وەک لێدەرێک پشتی بەکەللەڕەقێتییەوە گەرم بووبێ. بەهەمان شێوەش "ستێفان کینگ" وەک نووسەری ئەو ڕۆمانانەی کە بەشێوەیەکی دڵتوندکەرانە، ترسناکن کۆڵنەدەرایەتیی نواندووە.

هێمای پێچەوانە واتە ددانی پیشەوەی بچووک لەو ددانە بڕەڕانەدا دەردەکەوێ کە لەگەڵ ددانەکانی تەنیشتیان هاوئاستن. ئەم هێمایە دەرخەری بێ فیزییە. نموونەیەک بۆ ئەم هێمایە دوکتۆر "سوزان لاف"ە. لاف چالاکێکی بواری تەندروستی و نەشتەرگەریی مەمکە کە ماندوونەناسانە بۆ هاوڕەگەزە خۆشەویستەکانی تێ دەکۆشێ. و لە ڕووی ماندوونەناسییەوە بیر لە دوکتۆر "وین دایەر" بکەوە. ئەو نووسەرێکی خاوەن بەرهەمی پڕفرۆشە کە بەناو تاقەتپڕوکێنەرایەتیی زیاتر لە ٥٠٠٠ چاوپێکەوتنی تەلەڤزیۆنی و ڕادیۆییدا گوزەری کردووە. پیاوێک کە بەهرەکەی ئەوی هەبێ دەیتوانی بەبێ ئەو چاوپێکەوتنانەش کتێبی زیاتر بفرۆشێت و لەبەرئەوەی من خۆم زۆر چاوپێکەوتنم لەگەڵ کراوە، لەوە تێ دەگەم کە ئەو کەسێکی خاکییە. چاوپێکەوتن هەر خۆش نییە. هەرچەندە من خۆم حەزم لە چاوپێکەوتنە، بەڵام نووسەرانی دەستبالا لەوە تێ دەگەن کە واتای چاوپێکەوتن بریتییە لە چەندەها سەعات دانیشتن لەپای تەلەفۆنەکەت لە ماوەی ڕیکلامە

بازرگانییەکاندا «کە لەگەڵ ڕاپۆرتی هاتوچو و کەشوهەوای ئەو شارانەی کە هەرگیز چاوت پێیان ناکەوێ بەکۆتا دێن» و چاوەڕوانیی بێ کۆتا لە ژوورەکانی ناو ستۆدیۆدا و پرسیاری لێڵ و تەنانەت سووکایەتیپێکەری ئەو کۆنە چاوپێکەوتنکارانەی کە هەرگیز تاکە وشەیەکی نووسینەکەی تۆیان نەخوێندووەتەوە.

پرسیار: مەبەستت ئەوەیە ئەو کەسانەی ددانی پێشەوەیان بچووکە، ئەوەندە خاکین کە هەرگیز هەڵناچن؟

وەڵام: ئەوان زۆر بەباشیش هەڵدەچن. هەمــوو کــەس دەشێ وا بێ. بەڵام ئەگــەر ئەو کەسانەی ددانی پێشەوەیان بچووکە هەڵبچن ئەگەری زۆرە هۆیەکەی پەرۆشی بۆ ئەوانی تر بێ، نەک خــۆیان. وا بزانم دایکە ترێزا بەبەکارهێنانی هەندێک زەبر توانیی کردەوەکەی خــۆی لە هیندوســتــان دەست پێ بکا. ســیناتۆر "باربارا مــیکولسکی" ئەگــەر لە ڕووی سیاسییەوە، شەڕی پێ بفرۆشرێ ئەوا بەجوانی هەڕەشە و گوڕەشە دەکا. تووڕەییەکەی بەهۆی ئەو شێوە کوڵمەی کە پێشتر باس کرا زیاتر دەورووژێنرێ.

پرسیار: ئەی ئەو کەڵبانەی کە بەهێمای تووڕەیی ژمارە ١٠ ناویان دەبەی؟ نا، بوەستە. سەرەتا دەبێ ئەمە بزانم: کەڵبە هەر واتای چییە؟

وەڵام: مەرج نییە تۆ لە قوتابخانەی ددانسازی بخوێنی تا لەم برە زانیارییەی تایبەت بەددان تێ بگەی. لە بەردەم نەینۆک بزەیەکی گەورەی ددانەرخەر بکە. سەیری برەرەکانی تاقمی سەرەوە بکە. چوارەکانی ناوەڕاست دەستنیشان بکە. لە هەر تەنیشتێکی ئەم چوار ددانانەوە، تۆ ددانێکی تیژی کەڵبانی واتە کەڵبەیەک دەبینی.

پرسیار: ئەی چۆن کەڵبەی کەسێک بەگەورە دەژمێردرێ؟

وەڵام: کەڵبە گەورەکان لەچاو هەر چوار ددانەکانی نێوانیان درێژترن. زۆربەی خەڵک کەڵبەکانیان لەچاو هەر چوار ددانەکەی نێوانیان کورتترن نەک درێژتر.

کەڵبە ئاماژە بەهێرشبەرایەتی دەکا و ناوێکی تر بۆ ئەم خەسڵەتە غیرەتە. کەواتە جووتە کەڵبەیەکی گەورە ئاماژە بەخۆڕسکییەکی بکوژانە دەکا.

دان بەڕاستییەکەوە بنێ. ئەگەر تۆ ئەم هێمایەت هەبێ ئاخۆ بەچڕنۆک و ددان بۆ ویستەکەت هەوڵ نادەی؟ ئەو ڕێگەیەی کە دەیگرییە بەر ڕەنگە بۆ ئەوانی تر ڕوون و ئاشکرا نەبێ، بەڵام بەرەنجامەکانیان بۆ ڕوون دەبێتەوە: تۆ بۆ براوەبوونت پەنا بۆ هەر کارێک دەبەی.

خاوەنداریەتی ئەم هێمایە شتێکی خراپ نییە، بەڵام دۆزینەوەی هێمایەکە لە کەسێکی تر بەتایبەتی ڕکابەرێکدا شتێکی سامناکە. پرسیار لە ڕکابەرانی "جولی کرۆن" بکە. ئەو پلە بەرزترین ئافرەتی ئەسپسواری ناو مێژووی پێشبڕکێی ئەسپسواریی ئەمریکییە. یان پرسیار لە "تۆنی ڕۆبینز" بکە کە یەکێکە لە وتاردەرە خاوەن پاڵنەرە هەرە سەرکەوتووەکانی نەتەوەمان.

"مادلین ئۆڵبرایت" توانیویەتی ئەو وزەیەی کە لەم هێمایەدا خۆی دەنوێنێ لە کارەکەی خۆیدا بەپلەی وەزیری دەرەوە بەکار بێنێ. وام خوێندووەتەوە دروشمی ئۆڵبرایت ئەوە بێ: "هەرشتێکی لێمان داوا بکرێ جێبەجێی دەکەین".

"جیمی ستیوارد" خاوەنی جووتە کەڵبەیەکی گەورەی قشتیلەیە. وەک بەڵگەیەک بۆ پاڵنەرە جوان شاردراوە، بەڵام پڕ هێزەکەی ستیوارد دەتوانی بیر لە پلەکەی لە جەنگدا بکەیەوە یان لەو ڕۆڵە سینەماییانەی کە تێیاندا ئەو توانیویەتی ڕۆڵی کەسایەتییەکی دڕ وەربگرێ. بەڵام خۆشترین فیلمی ئەو بەلای منەوە فیلمی کلاسیکی ئاینیی " It's a Wonderful Life – ژیانێکی سەرسڕهێنە"یە کە تێیدا ستیوارد ڕۆڵی "جۆرج بێیلی" دەگێڕێ کە ئەویش نموونەی مرۆڤێکی خۆشەویستە.

ئەگەر بەوردی سەیری نواندنەکەی ستیوارد بکەی، دیمەنی ئەوتۆ دەبینی کە تێیدا دەربڕینی شاراوەی سەرووئاسایی، لە تووڕەیی یەکجار زێدەڕۆیانە تا ملکەچکردن بۆ نەزاکەت، بەناو ڕوویدا خێرا گوزەر دەکەن. ستیوارد بەشێوەیەکی سەرسڕمێن فێری ئەو وانەیەی ژیان بووە کە چۆن هەست بەم خۆڕسکییە کوشندەیە بکا و پاشان لێی دوور بکەوێتەوە.

"ڕۆبێرت هانسن"ی سیخوری بەناوبانگیش نموونەیە بۆ هێزی کەڵبەی گەورە، بەڵام نەک بەشێوەیەکی ئەوەندە سەرسڕهێن.

دوا هێمای ددان کە دەبێ لە چوارچێوەی ناکۆکیدا ئاماژەی پێ بدرێ گەزەیە. ئەو کاتەی تاقمی سەرەوە و تاقمی خوارەوە دەکەونە سەر یەک ئاخۆ شێوەی بەریەککەوتنیان چۆنە؟

گەزەی تاقمی ژێرەوە بەو بارانە دەوترێ کە تاقمی خوارەوە لە تاقمی سەرەوە دەرپەڕیوتر بێ. ژێرەگەزەدەرێکی بەرچاو ئاماژە بەجۆرێکی تری هێرشبەرایەتی دەکا، جۆرێکی پێوەست بەبێ بەزەییبوون یان ڕقاویبوون نەک تووڕەییەکی دەربڕاو.

ئەم هێمایە بێ ڕەچاوکردنی جۆری میزاجی زاڵبوو بەسەر کەسێکدا ئاماژە

بەشـەڕکـەرێکی کوڵنەدەر دەکا. بەدڵنیـاییـیـەوە ئەم هێـمـایە سـوودێکی باشـی گـەیاندووە بەژەنەراڵ "نۆرمـان شـوارزکـۆف" کـە لە جـەنگی کـەنداودا سـەرکـردایەتیی هـێـزەکـانی ئەمریکیی دەکرد و هەروەها "دێنیز بانکس"ی دامەزرێنەری بزووتـنەوەی هیندی ئەمریکی و "دیک چینی"ی جێگری سەرۆک کە کونەجەنگاوەرێکی سیاسییە و هێشتا لە ژیان دایە.

چ ئەمـە خـاڵێکی باش بێ چ خـراپ، خـەڵکی خـاوەن گـەزەی تاقـمی سـەرەوە ژمـارەیان یەکـجـار زۆرترە. هەروەک چۆن تاقـمـە ددانی سـەرەوەی خـەڵکی خـاوەن ئەم جـۆرە گـەزەیە بەسـەر تـاقـمـە ددانی خـوارەوەیاندا دەچەمـێـتـەوە، ڕەوانـبـێـژییـانەش ئەم خـەڵکەش خـۆیان دەچەمێننەوە تا ئەوانی تر دڵخـۆش بکەن. ئەم خـەڵکە پەرۆش و هەندیک جار لە ڕادەبەدەر پەرۆشن بۆ دڵخـۆشکردنی خـەڵکی تر و مـەگـەر بتوانن بەهـۆی ڕاستکردنەوەی ددانـەکانیـان ئەم مەیلە پاش چەند ساڵێک بەربەستدار بکەن، دەنا ئەمە حاڵیانە.

ئەو کەسـانەی دەتوانن دەنگی "س" بەڕوونیـیـەکی ئیـرەییـپێـبـراو گـۆ بکەن خـاونی گـەزەی هـەردوو تاقـمن. گـوایە ئەم سـەرپشکـیـیـە بـەس نەبووبێ بۆیە لـە ڕوانگەی ڕووخـوێنەوانەوە سـەرپشکییـەکی تریشیـان هەیە. کەسـی خاوەن گـەزەی هـەردوو تاقم جۆرە هـاوسـەنگییـەکی دەروونیی دەگـمـەنی هەیە. لە کـەسـانـی خـاوەن گـەزەی هەردوو تاقـمـدا پێـویسـتـیـیـە کـۆمـەڵایەتیـیـەکان «کـە تاقـمی سـەرەوە دەریان دەبڕێ» لەگـەڵ خـۆڕسکـیـیـەکـانی تایبـەت بەزیندوومـانەوە «کـە بەتاقـمی خـوارەوە دەردەبڕدرێن» لەگـەڵ یەک دەگـونجـێن. ئـەمـەش باشترین بارە بۆ هەڵکردن لەگەڵ خەڵکدا.

پرسـیـار: با بەس بێ، خـەریکە لە ئیـرەیی دڵم شـەق دەبات. ئاخـۆ دەتوانی یەک هـۆ، تەنیـا تاکە هۆیەکم پێ بڵێی تا ئیرەیی بەخـەڵکی خـاوەن ئەم جـۆرە گەزە نموونەییـیـە زوێرکـەرانە نەبەم؟

وەڵام: هیـچ هـێـمـایەکی ددان تەنانەت خـاوەنداریەتیی گـەزەیەکی تەواو هـاوتای هەردوو تاقم ناتوانێ کەسـێک لە وەرگرتنی وانەکانی ژیان بێ منەت بکا. هەروەها ڕەنگە تۆ چەندی بتەوێ ئیرەیی بەبێ کەمـوکوڕێتیی بەڕواڵەتی کەسێک ببەی، بەڵام ڕاستییـەکە ناگـۆڕێ: هـەر مـرۆڤـێک لەسـەر ئەم هـەسـارەیە دەبێ فـێـری شـتـێک بێ ئەگـینـا ئەو مـرۆڤـە چ بەددان چ بێ ددان، نەدەبووایە هەبوونی هەبێ.

## دە ئامۆژگاری بۆ خۆپاراستن لە دەمەقاڵێ

دەرفەتێک بۆ سازش بڕەخسێنە. بیرۆکەیەکی جوانە، وا نییە؟ تۆ وەک ڕووخوێنەوە لانی کەم هەڵێکی تێکۆشان "با بڵێین" بۆ خۆپاراستن لە دەمەقرێت بۆ دەرەخسێ. یاسا زێڕینەکەی ڕووخوێنەوانت لە بیر نەچێ:

- ڕەچاوی ئەوە بکە کە شێوازی کەسیی کەسێکی تر، ئەگەر جیاوازیش بێ، دەشێ کتومت وەک شێوازی کەسیی خۆت ڕەوا بێ.

خوێندنەوەی نهێنییەکان دەتوانێ هاوکاریت بکا بۆ ئەوەی خەڵک بەسروشتی خۆیانەوە پەسند بکەی، تەنانەت ئەگەر ئەوان بەشێوەیەکی جیاواز لە شێوازی تۆ کاردانەوەیان بەرامبەر بەبارودۆخەکان هەبێ. مەبەست لەوە سووککردنی ئەو پابەندییە ڕەوشتییە نییە کە بەهۆیەوە کەسێک دژی ئەو کردەوانەی کە تەواو هەڵەن دەنگی هەڵدەبڕێ. زۆربەی ئەو هەڵسوکەوتانەی کە زویرمان دەکەن هەڵە نین بەڵکو تەنیا چاوەڕواننەکراون. ئەمەش هەر دووبارە دەبێتەوە. شتێکی ئاساییە، چاوەڕوانی ئەوە بکەین خەڵکی تریش هەمان شێوازی کەسیی وەک هی ئێمەی هەبێ. ئەمە شتێکی ئاساییە، بەڵام ڕەوا نییە لەبەرئەوەی زۆر شێوازی پەسندی جیاواز هەن. ئەمانە ١٠ ئامۆژگارین کە دەتوانن بۆ چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ باوترین ناکۆکییەکانی ڕۆژانە، کە بەهۆی جیاوازی لە شێوازی کەسیدا سەر هەڵدەدەن، یارمەتیت بدەن.

١- ڕێگە لەو لووتانە مەگرە

ئەو کاتەی لەگەڵ خەڵک کار دەکەی دەرفەتی ئەوەیان پێ بدە تا ئەو ڕادەیەی کە بتوانن کارەکە بەکۆتا بهێنن بەئارەزووی خۆیان کار بکەن. ڕەنگە تۆ فرۆشیارێکی تازەکار پێ بگەیەنی. ڕەنگە تۆ هەوڵ بدەی هاوسەرەکەت قایل بکەی بۆ ئەوەی قەفەزەی دووشی گەرماو خاوێن بکاتەوە. هەرچۆنێک بێ ئەگەر تۆ بەهرەکانی کارکردن کە لە دیمەنی لاڕووی لووتەوە دەردەکەون، بخوێنییەوە و ڕێزیان لێ بگری، سوودمەند دەبی.

خەڵکی لووت قیت پێویستیان بەدەرفەتێکە بۆ پشتبەستن بەهەستەکانیان. خەڵکی لووت چەماوە داوای هەڵێک دەکەن تا داهێنەرانە کار بکەن. ئەگەر خەڵکی خاوەن لووتی بەدەر لە لووتی ڕێک لە شێوازە نەریتییەکانی ئەنجامدانی کارەکان لایان دا، لەگەڵیان بێندرێژ بە. ئەوان بەو شێوەیە واتە بەئاراميیەکی دەروونیی زیاترەوە باشتر بەرهەم دێنن.

بەتایبەتی ئەگەر شێوازی کاریی تۆ جیاواز بێ لە ڕێزگرتندا بەخشندە بە.

٢- نابێ فەرامۆشکار بی

بەهۆی ڕێزگرتن لە شێوازەکانی جیاوازیی بەرهەمهێنان کە لە درێژیی لووتدا خۆیان دەنوێنن، خۆت لە هەر جۆرە سەرئێشەیەک ڕزگار بکە. سەرسام بە لە ئاست بەرهەمهێنەرایەتییە پڕ بارەکەی کارکەرێکی لووت کورت. بەڵام ماندووبوونەکەی بەکەم مەزانە و ئاگر لەو کەسە بەرمەدە.

بەهەمان شێوە شێوازی کارکەرێکی لووت درێژ پەسند بکە. ئەگەر تۆ بەردەوام بەشێکی پرۆژەیەکی ڕادەست بکەی کە هەر دووبارەی بکاتەوە چاوەڕوانی ئەوە مەبە کەسەکە بەجۆش و خرۆش بێ. پێویستە ئەو شارەزای بارودۆخەکە بێ تا هەست بەوە بکا کە مەبەستێکی هەیە. ئەو کاتەی تۆ بۆ پلاندانانی پرۆژەیەک پرسی پێ دەکەی، ئەو وەک درەختێکی کریسمەس دەگەشێتەوە. هەموو کارکەرێک حەز دەکا لە بەڕێوەبردندا هەلی بەشداریکردن بەبیروڕای بۆ برەخسێ، بەڵام ئەوە بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانە گرینگە کە بەخۆ بەلووتێکی درێژەوە دێنە سەر کار.

٣- ڕێگە بەکاری بەکۆمەڵ بدە

هەر کەسەو شێوازێکی کاری بەکۆمەڵی لە لا پەسندە. کارکەرانی خاوەن لووتی ناواخن پڕ لێک دامەبڕێنە. ئەوان پێویستیان بەکاری بەکۆمەڵە. ئەو شتەی بۆ تۆ وەک هەڵەیەک وایە ڕەنگە بەڕاستی بەرهەمهێنەر بێ.

هەروەها هەر کاتێک بۆت ڕەخسا کارکەرانی خاوەن لووتی ناواخن تەنک لە کاری بەکۆمەڵ بپارێزە. تەسکاتیی لووت زیاتر لە ئیسقانی لووت دەردەکەوێ. دەسپێکردنی پرۆژەیەکی نوێ لەگەڵ لێژنەیەکدا بۆ خەڵکێک کە ڕادەی پاناتیی سەری لووتیان هەرچەندێک بێ، بەڵام ئێسقانی لووتیان باریک بێ، جۆرە ئەشکەنجەیەکە.

هەروەها ئەگەر خۆشەویستەکەت لە ماڵەوەدا ڕووداوی ترسناکی ئەوتۆ کە لە کاردا ڕووی دابێ بۆت بگێڕێتەوە و تۆ بەڕووداوی ناماقووڵیان دابنێی بیر لەوە بکەوە کە ڕەنگە ناواخنی لووتت جیاواز بێ. لەم بەسەرهاتە ورد بەوە. ڕەنگە تۆ بەڕادەی پێویست لەم بابەتە ورد نەبووبییەوە.

٤- بۆچی لەسەر وردەکارییەکان هەڵدەچی؟

هەندێک خەڵک دەڵێن خوا لە ناو وردەکارییەکاندا خۆی دەنوێنێ. بەڵام بۆ ئەوانەمان کە

برۆ تاجدارن لایەنەکانی سەرنجڕاکێشیی خوا لە ناو وردەکارییەکاندا نین. وانەی مەبەست لەم وتەیەی تایبەت بەبرۆ ئەوەیە کە هەموو کەسێک لەوە ئاگەدار بکرێتەوە نەوەک بەرپرسیارێتییەکی پڕ وردەکاری بسپێرێتە دەست برۆ تاجدارێک. تۆی برۆ تاجدار ئەگەر بۆت کرا لەگەڵ برۆ سەراوبنێک گرووپێک پێک بهێنە. ڕێگە چارەی دووەمت کەسێکی برۆ ڕێکە. ئەگەر هەر بۆ خۆت بەتەنیا بووی یان لەگەڵ کۆمەڵێک برۆ تاجدار، کارت کرد سەردانی ڕاوێژکارێک بکە. ئەگەر نا بەوە قایل بە کە پێوەرەکانت نزم بکەیەوە. هەندێک جار پێویست ناکات زۆر بەوردی کار بکەی.

برۆ تاجدارەکان بۆ دەستپێکردنی پرۆژەی نوێ زۆر داهێنەرن. بەهەر شێوەیەک بێ، سوود لەو لایەنە وەربگرە. ئەوە بۆ هەموو لایەک باشترە.

٥- بزانە کەی پێویستە لاسەنگی پشتگوێ بخەی

لاسەنگی دەرخەری قوولاییەکی شارەزاییە کە شایستەی ڕێزلێنانە. بەڵام ئەمەش ئاماژەیەکی کورتی پڕ واتایە: ئەگەر ڕووی هاوکارەکەت لاسەنگییەکی زۆری هەبوو، خۆت لە تێکەڵبوون لەگەڵ ژیانی کەسیی ئەو هاوکارەت بپارێزە. پرسیار مەکە ئەگینا تووشی گیروگرفت دەبی.

پێویستە کەسایەتیی کارکەر لە دەرەوەی بواری کاردا لە بنەڕەتدا جیاواز بێ. بۆ پێوەندییەکانت لە ناو بواری کاردا گرینگی بەو هێمایانە بدە کە لەلای ڕاستی ڕوودا بەدەر دەکەون واز لەلای چەپ بێنە.

نموونەیەک برێتییە لە لاسەنگیی گوێ. من دۆزیومەتەوە کە زیاتر خەڵک گوێی ڕاستیان گۆشەتیژ و گوێی چەپیان گۆشە کراوەیە نەک بەپێچەوانەوە. شتێکی زۆر قایلکەرە. لە ڕۆژی کارکردندا ئەو کەسە بەوردی فەرمان بەجێ دێنێ و پاش ٥ی ئێوارە لە خۆشییان سەما دەکا. "سەربەخۆیی" وشەیەکی ناوەنجییە بۆ ئەم هەستە. "سەربەست و شێت"ی بۆ بەکار بێنە «کەمتر ڕێک دەکەوێ خەڵک گوێی چەپی گۆشەتیژ و گوێی ڕاستی گۆشە کراوەیان هەبێ. لێکدانەوە: پێشبینیی ئەوە بکە کە لە لێکدانەوەی واتای هاوسەربوون، دایک یان باوکبوون یان هاوڕێبووندا پێوەرەکان تا ڕادەیەک کۆنباو بن. هەروەها پێشبینیی ئەوە بکە کە کەسەکە بەئاسانی لەگەڵ هاوکارەکانی نەگونجێ. ئەمە بۆ هەندێک پیشە بەسوودە کە تێیاندا کارەکە دەوەستێتە سەر بەدیهێنانی بیروبۆچوونی کەسێکی دەرەکی وەک لە پیشەی ڕاوێژکاریی تایبەت بەبەڕێوەبەرایەتیدا. ئاریشەی ڕێ تێچوو برێتییە لە

ناکۆکیی دەروونی بەبۆنەی هەستکردن بە"ناپاکی"یەوە، یان بەواتایەکی تر ئەو کاتەی کەسەکە لەسەر کارە هەست دەکا وەک بێگانەیەک وایە». شتێکی زۆر خۆشە ئەگەر مرۆڤ هاوڕێ یان هاوسەرێکی خاوەن شێوازی سەیر و ناپێڕەوکاری هەبێ. بەڵام دیسانیش بیر بکەوە بەر لەوەی لەسەر کاردا پرسیار لە چیرۆکی تاڵی ژیانی کەسێک بکەی ئەگەر نا زێر سەیر دەشکێتەوە.

٦- تێکەڵیی هێز، بزانە ئەو شتانەی تێکەڵیان دەکەی چین

تۆ بەهاوسەر و هاوژوان و هاوکارەکان یان ئەندامانی خێزانت خواردنەوەیەکی تێکەڵە ئامادە دەکەی: هەر پێکهاتەیەکی خواردنەوەکە بریتییە لە شێوازی دەسەڵاتی هەریەکە لە کەسەکان بەلەخۆگرتنی شێوازەکەی خودی خۆشت.

ئێستا کە تۆ شارەزاییت لە خاڵەکانی هێزی خۆت پەیدا کردووە، بیر لە تێکەڵەکە بکەوە.

بۆ نموونە دوو شێوە دەسەڵاتی سەرکردە ئاسای لە کوڵمدا دەرکەوتوو ڕەنگە لە پێناوی بوونیان بەچەقی سەرنج ڕکابەرایەتی بکەن. دوو شیوە دەسەڵاتی ئاشتیخوازانە ڕەنگە یەکتر دابهێزرێن. بەڵام کاتێک ئاوەڵێکی سەرکردە ئاسا دێتە ناو کۆمەڵەکە ئاراستەی هێزەکە دەگۆڕێ. چێژ لە تێکەڵە نوێیەکە وەربگرە، بەربەرەکانێی لەگەڵ مەکە.

ئەگەر تۆ لەگەڵ کەسێکی خاوەن شێوە دەسەڵاتی بەسۆز تێکەڵ بی خۆت بۆ دژواری ئامادە بکە. بەهۆی تێکەڵاوبوونی ژمارەیەکی زۆر شێوە دەسەڵاتی جۆراوجۆر، ڕەنگە هەست بکەی خولێک بەناو ئامێری تێکدەردا سووڕابییەوە.

٧- ئەمڕۆ ڕەچاوی گوێ بکە، سبەینێ یان هەر کاتێکی تر درەنگە

ئەگەر تۆ لەگەڵ کەسێک ژیان ببەیە سەر کە گوێیەکانی زۆر نزم یان بەرز هەڵکەوتبن و هی تۆش کتومت بەپێچەوانەی هی ئەو بن پێشبینیی ئەوە بکە کە لە ڕووی بێندرێژییەوە تووشی گرفت دەبی، کەسی گوێ بەرز بەرامبەر بەکەسی گوێ نزم بێنکورتی دەنوێنێ.

٨- چەناگەیەک کە بگۆڕێ؟ فەرامۆشی بکە

لە جیریدا چەناگە دەدۆڕێنێ. قسەی من بەپێوەر دامەنێ. نەینۆکێک هەڵگرە و بزانە توانای چەمانەوەی چەناگەت بەبەراورد لەگەڵ برۆ و چاو و دەم و شەویلگەت چەندە. بەلاتەوە لۆچاندنی لووتت یان بادانی گوێت، زۆر ئاسانترە لەوەی چەناگەکەت بکۆمێنییەوە.

شتێکی چەند گونجاوە، بنەماکانی تایبەت بەبڕیاردانیش بەئاسانی ناگۆڕێن. ناکۆکیی

نێوان کۆتاییـیـە چەناگـەی ڕێک و چەمـاوە بەبێندرێژی چارەسـەر دەکرێ. بەڵام کـەسـە توندوتیژە ڕاستـەقینەکە هەرکەسێکی خاوەن کـۆتاییـە چەناگەیەکی زۆر هـەشـتـیـە. لە پێویستـیی پڕ هێزی ئەو کەسە بۆ لەسـەر دەسـەڵات مـانەوە تێ بگە. لە ڕووی دەروونییـەوە خۆتی لەگەڵ بگونجێنە، ئەگەر نا هەوسارێکی درێژی بدە دەست.

٩- پڕێتیی پێڵوو

پڕێتیی پێڵوو ڕەنگە گێژت بکا بۆیە گرینگیی پێ مەدە. ئەندازەی پێڵووی هاوسەرەکەت و «لەگەڵیدا پێویستییەکەی بەگەرموگوڕی» دەشێ خێراتر لەوەی بیرت بۆی دەچێ، بگۆڕێ. شەوێک بێ خەوی یان گریانێکی تێروپڕ بۆ گۆڕینی پێڵوو بەسە.

کەواتە ڕۆژانە ئەو کـاتەی سـڵاوێکی پڕ سـۆز دەکەی، بەسـووکە نیگایەک پڕێتـیی پێڵـوو هەڵبسـەنگێنـە. مەرج نـییـە تۆ خـۆت لەگـەڵ پێویسـتـییـە تەواو جیاوازەکانی هاوسـەرت بۆ نێـزیکبـوونەوە یان دوورکـەوتنـەوە لێی، بگونجـێنی «هیـچ نەبێ تۆ و پێـڵـوویـەکـانیـشت پێـویسـتـیـتـان هەیە»، بەڵام تـۆ دەتوانی لـە ڕێگەی بـاشـتـر تێگەیشتن لەو بـارانەی کـە هاوسـەرەکـەت بەناویـاندا ڕەت دەبێ وریاییـی خـۆت بپـارێزی. هەروەهـا ڕەنگـە تۆ خـۆت لە تاوان بپارێزی. تۆ جگە لە خۆت ناتوانی کەسێکی تر بی.

١٠- هۆشیاری سەبارەت بەئێسکە کوڵم

زۆرجـار من ئەوەم دیوە: ڕووێکی بەبەزەییی شـێـوە چەمـاوەیی، ڕقـێکی بـەرامـبـەر بەبەرەنگاربوونەوە لێ دەبارێ. پاشـان ڕەنگە تێبینیی ئێسکە کوڵمـە بەرزەکانی ئەم کەسەم کردبێ. ئەو ئێسکە کوڵمانە هەموو شتێک دەگۆڕن.

بیـخەرەوە یادت کـە ئەم هێمـایە پێوەندیی بەبەکارهێنانی هێزی کەسی بۆ پاڵپشتیکردن لە ڕەوشـتـبـەرزییـەوە هەیـە. هاوسـەر یان هـاوکـارە بەحـەیایەکـەی تۆ ڕەنگە خـۆی لە بەکارهێنانی قسـەی ڕەق بپارێزێ، بەڵام ئەگەر ئەو بەخـۆ بەئێسکە کوڵمە بەرزەکانییـەوە هەست بکا تۆ درۆیەکت کردووە، ئاگەداری خـۆت بە، لەبەرئەوەی تۆ دەربڕینی ئەوتۆ لەسـەر ڕوویدا دەبینی و گوێت لە قسەی ئەوتۆ دەبێ کە ڕەنگە هەرگیز بەخەیاڵتدا نەهاتبن.

لەگەڵ ئەو خەڵکە بەڕاشکاوی ڕەوشتبەرزانە وریای خۆت بە. ڕووڕاست بە.

## گۆشەکانی چاو

پێ دەچێ هۆی کۆمەڵێک لە بێ واتاترین گرفتەکانی ناو پێوەندییەکان بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خەڵک توانای پەسندکردنی گۆشەچاوی یەکتریان نییە. هەڵبەتە خەڵک بەوریاییەوە بەم لایەنە نازانن و گۆشەی چاو بەئاستەم لە ناو دادگەدا وەک بەڵگەیەکی یاسایی بۆ تەلاقدان بەکار دێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر تۆ لە واتای گۆشەکانی چاو تێ بگەی، لەوەش تێ دەگەی کە بۆچی ئەم گۆشانە گرینگن.

با سەرەتا هێمایەکە بناسینەوە. گۆشەی چاو بەواتای لاریی چاو لە گۆشەوە بۆ گۆشەیە بەبەراورد لەگەڵ پاشماوەی ڕوودا. ئەگەر بزانی بەدوای چیدا بگەڕێی، دیاریکردنی گۆشەی چاو سەخت نییە. بەڕاشکاوی ئاسانترین ڕێگە بۆ دۆزینەوەی ئەو هێمایەی ڕوو بریتییە لە بەکارهێنانی خاڵ. کردارەکە بەم شێوەیەیە:

لە چاوێکەوە دەست پێ بکە لەبەرئەوەی لاسەنگییەکان ڕەنگە زۆر لەوەی بۆی دەچی، زیاتر بن. لە خەیاڵتدا خاڵێک لەسەر سووچێکی ناوەکیی ئەو چاوە واتە ڕێک لەسەر فرمێسکبەرە دابنێ. خاڵێکی تر لەو شوێنەی کە لە ئاراستەی پێچەوانەدا چاو تەسک دەبێتەوە، دابنێ و بەوردی بۆ دۆزینەوەی ئەم شوێنە چاو بگێڕە. شوێنەکە زۆر جار گەلێک بەرزترە لەو بەرزاییەی کە ڕووخوێنەوەیەکی تازەکار پێشبینیی دەکا.

ئێستا کە تۆ دوو خاڵەکەی خۆت هەیە بەهێڵێکی خەیاڵی بەیەکیان بگەیەنە. ئەم هێڵە گۆشەیەک وەردەگرێ. هەر ئەم هێڵە دەرخەری ئەو شتەیە کە من بەگۆشەی چاوی ناوی دەبەم.

پرسیار: ئاخۆ ئەم گۆشەیە هیچ پێوەندییەکی بەچاوی بادەمییەوە هەیە؟

وەڵام: دڵڕەق مەبە. نەخێر. ئەم سیفەتە یەکێکە لە نابەجێترین کلێشەکانی ڕوو. زۆرجار گاڵتەم پێی کردووە و گەیشتوومە ئەو ئەنجامەی ئەو کلێشەیە هەروەک ڕێگەیەک بۆ جیاکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی چاو شتێکی تەواو نابەجێیە. ئەگەر چاوی تۆ بادامی نەبێ کەواتە تۆ دەبێ خاوەنی چ جۆرە چاوێک بی، چاوێک کە بەبەستەی سوودانی دەچێ؟

تۆ لەمەوبەر باسی خوێندنەوەی ڕووت بیستووە، بەڵام هەندێکمان لەگەڵ خوێندنەوەی چاودا گێژ دەبین و ئەمەش هەر دووبارە دەبێتەوە. لە گەڕان بەدوای هێمایەکانی ڕوودا وردبین بە. هەر جارەو بەجیا بۆ هێمایەک بگەڕێ. بەهاوئاستی لەگەڵ ڕوو سەیری بکە.

ئێستا سەیری ناو نەینۆک بکە. دوو خاڵەکانی سەر هەر چاوێک بەیەک بگەیەنە و بەدوای



هەڵکشاوە



داکەوتوو



ڕاست

گۆشەکانی چاو

گۆشەکەدا برۆ و بزانە کام هێمایەت هەیە.

ئەو کاتەی چاوی خۆت لە گۆشەی چاو ڕاهێنا، تێبینیی سێ جۆرە گۆشە دەکەی.

– گۆشەکانی چاو بەزۆری هەڵکشاوەن.

– ئەوانی تر دادەکەون.

– هەڵبەتە پاشماوەی گۆشەکان ڕاستن.

پرسیار: لە ڕاستیدا مەبەستت ئەوەیە کەسێکی قەوقازیی نموونەیی وەک من لەلای تۆ خاوەنی چاوی گۆشە هەڵکشاوەیە؟

وەڵام: لە پێناوی خۆتدا تێ بگە. من داوات لێ دەکەم کە واز لە ناوی "قەوقازی" بێنی و ڕەچاوی لایەنە مرۆڤییەکە بکەی. ئەگەر بەم شێوەیە بیر بکەیەوە ئەوا لەوە تێ دەگەی کە نزیکەی ٨٥٪ی خەڵک لەسەرانسەری جیهاندا تا ڕادەیەک خاوەنی چاوی گۆشە هەڵکشاوەن.

چەندی هێمایە جەستەییەکە بەرچاوتر بێ بەهەمان ڕادەش کەسەکە ڕوانگەیەکی گەشبین و تەنانەت ئایدیاڵپەرستانەی هەیە. بەڵێ، چاوی گۆشە هەڵکشاوە هاوڕێیە لەگەڵ پێڕادیتنێکی زۆر لە هاوسەر و منداڵ و دایک و باوک و سەرکار و کارمەندەوە.

ژمارەیەکی زۆر لە ئەگەرەکانی هەبوونی ناکۆکی لە سەرەتاوە خۆیان دەنوێنن. خۆت بەکورتە ئەزموونێکی چواروەڵامیی خێرا تاقی بکەوە. لە کامیاندا ئەگەری سەرهەڵدانی ناکۆکی هەیە:

– لە نێوان ئایدیالیستەکان و ئەو خەڵکەی کە دەبێ چاوەڕوانییە زۆرەکانی ئەوان بەدی بهێنن.

– لە نێوان دوو ئایدیالیست کە جیاوازییان هەیە لە چاوەڕوانییە زۆرەکانیان لە یەکتری.

– لە نێوان هۆش و دڵی خودی ئایدیالیستێک لەو کاتەدا کە واقیع خۆی دەسەپێنێ.

نمرەیەکی دەستخۆشی بدە بەخۆت ئەگەر وەڵامەکە ئەوە بێ:

– لە هەر هەموو بارەکانی سەرەوەدا.

هەروەها ئەم ورەبەزاندنەش نابەجێ نییە لەبەرئەوەی گرفتێکی تەنانەت خراپتریش هاوڕێی ئەم هێمایەیە. ئەم گرفتەش جۆرە گرفتێکە کە ئەو کەسانەی بەپێی پێناسەکە گەشبینن ڕقیان لەوەیە، لێی تێ بگەن: نکۆڵیکردن. لە ناو کارهێنەکانمدا تا ئێستا ئەو

کەسەی کە خاوەن زۆرترین ڕادەی ئەم هێمایە بووە، "جۆن"ە. ڕۆژێک جۆن دەگەڕێتەوە ماڵ بۆ لای ئەو هاوسەریی ١٦ساڵ لەگەڵی ژیاوە و لەوە تێ دەگا کە ئەو جێی هێشتووە.

هاوسەرەکەی منداڵ و کەلوپەلەکان و هەموو شتێکیشی بردبوو و تەنیا دۆشەکێکی بچووکی بەجێ هێشتبوو بۆ ئەوەی جۆن لەسەری بخەوێ. جۆن بەخۆ بەچاوە گۆشە هەڵکشاوەکانی ڕوونی کردەوە: "ئەمە حەپەسانێکی گەورە بوو. ئەوەندی من ئاگەدار بم هاوسەرێتیمان بێ کەموکوڕی بوو و لە بنەڕەتدا هیچ گرفتێکمان نەبوو". بێ شک جۆن جگە لەچاوەگۆشە هەڵکشاوەکانی ژمارەیەک هێمای تری هەبووە، بەڵام تۆ تێ دەگەی مەبەستم چییە.

بەڵام با نکۆڵی لەوە نەکەین کە مەیلێکی سەرسڕمێن هاوڕێیە لەگەڵ ئەم هێمایەی چاو. ڕوانگەیەکی ئایدیالیستییانە هاوڕێیە لەگەڵ سەرکێشانە خۆدانە بەرمەترسی. ڕەنگە سەرچاوەی ئەو پەندەی کە دەڵێ:"بەر لەوەی خۆت هەڵدەی، بڕوانە" لەلایەن دایک و باوکێکی نائومێدەوە بووبن کە وتەکەیان بەمنداڵێکی خاوەن چاوی گۆشە هەڵکشاوە وتبێ، خەیاڵشکان بەزۆری ئەو کاتە ڕوو دەدا کە چاوەڕوانییەکان زۆر گەورەن. بەڵام ئاخۆ ئەوە دەتوانێ گەشبینانی ڕەسەنی جیهان دڵسارد بکاتەوە؟ هەڵبەتە کە ناتوانێ و جیهان بۆ خەیاڵشکان شوێنێکی لەبارترە.

پرسیار: چۆن ئەم سەرچڵییە گەشبینانەیە لەگەڵ ئەو وتانەی کە لەبارەی درێژیی چەناگە و سەرچڵیدا باست کردن، دەگونجێ؟ لەبەرئەوەی من لە فرۆشیارم ئەگەر لە سەرەتاوە بزانم کێ زیاتر گرەو دەکا ڕەنگە زۆر سوودی بۆم هەبێ.

وەڵام: کەسی خاوەن چاوی گۆشە هەڵکشاو بایەخ بەو شێوازانەی سەرچڵی کە لە چەناگەدا دەردەکەون. کارێکی باش دەکەی کە ئەم هۆکارانە بەیەکەوە پێوەند دەدەی! کڕیارەکانی خاوەن چەناگەی درێژ ئامادە خەتەر بکەن. بۆ نمونە خێرایی و سیستەمی کارامەیی ئۆتۆمبێلێکی نوێ سەرنجیان ڕادەکێشێ. کڕیارە چەناگەکورتەکان خۆیان لە مەترسییە جەستەیییەکان دەپارێزن، بەڵام بۆ خووڕەوشتەکانی کەسیی خۆیان دەخەنە باری مەترسیدارەوە. ئەگەر من فرۆشیار بم سەرەتا تایبەتمەندییەکانی ئیمەنیی ئۆتۆمبێلێکی نوێیان بۆ باس دەکەم و لەگەڵیدا ئاماژە بەوەش دەکەم کە ئەگەر کەسەکە بیەوێ ڕێبوارێک هەڵبگرێ، ئۆتۆمبێلەکە بۆ ئەم مەبەستەش دەست دەدا.

هەڵبەتە کڕیارانی خاوەن گۆشە چاوی زۆر هەڵکشاوە و کونە لووتی زۆر خڕ خەونی هەر

فرۆشیارێکن. ئەوانە لە ڕووی داراییەوە سەرکێشترین کەسن لەبەرئەوەی بڕوایان بەهەر ڕێ تێچوونێکی گەشاوە هەیە. هەر تاکێکی کۆمەڵگە جگە لە ڕاستەوخۆ سوودمەندبوونی لە بیروبۆچوونێکی گەشبینانە ئەو کاتەش سوودمەند دەبێ کە ڕەچەشکێنێک سنوورەکان دەبەزێنێ تا کردنییەکان بدۆزێتەوە. "هێلێن کێلر" بیروڕا کرچوکاڵەکانی جیهانی لەبارەی توانای کەسێکی خاوەن پێداویستیی تایبەت وردوخاش کرد. "ڕۆزا پارکس" بەرەنگاری جیاکاری بەرهەڵستی کرد. "ستەدز تێرکڵ" بەخستنەڕووی مێژووی تۆمارکراوی خەڵک لەسەر کاسێت بەهای بەم خەڵکە بەخشیوە. دەیە پاش دەیە "ئەبیگێیل ڤان بێرن" ئامۆژگاریی پێشکێش بەدڵدار و خەیاڵشکاو و کەسانی تەواو نائاسایی کردووە.

چ بەهرەیەک هاوڕێی چاوی گۆشەی داکەوتوویە؟ نیگەران مەبە، تۆش بەشت بەبەهرەوە هەیە. بەکورتی بەهرەکانت ئەوانەن کە تۆ گرفت دۆزەرەوە و گرفت چارەسەرکەری.

پرسیار: ئەی خوا بیبڕێ. ئەی ئەگەر گرفت دۆزینەوە بەتەنیا پیشەی من بی؟ لەو جۆرە کارە فرۆشیارییەی مندا پێویستە مرۆڤ گرفتەکان چارەسەر بکا.

وەڵام: بەس تۆ وا نی. زۆربەی خەڵک تەنانەت ئەگەر هەمان پیشەی تۆیان هەبێ بەو شێوەی کە تۆ گرینگی بەگرفتەکان دەدەی، گرینگییان پێ نادەن. هەروەها ڕەنگە بەهەمان ڕادەی تۆش سەرکەوتوو بن. شێوازەکانیان جیاوازن. هەر ئەوەندە و بەس.

بۆ نموونە ئەگەر تۆ ئەم هێمایەی تایبەت بەچاوت هەبێ بیر لە دوا کۆبوونەوەی خێزانی بکەوە کە تێیدا ئامادە بوویێ. ئاخۆ تۆ یەکێک لە یەکەم ئەو کەسانە نەبووی کە هەستیان بەوە کردبێ مامۆژن "گێیل" و مامە "فێردیناند" لەسەر لێواری جیابوونەوە لە یەکترین؟ ئەو کاتەی "سیلڤیا"ی ئامۆزات لەلای هەموو کەس باسی ئیشە نوێیەکەی خۆی درکاند و بڵاوی کردەوە وەک فرۆشیاری "پسکێتی چەوری خۆش" کار دەکا واتە ئەو جۆرە پسکێتە نوێیەی ئامانج لە بەرهەمهێنانی ئەوەیە کۆلیسترۆڵ بکا بە"بنێشتە خۆشەی سەر زار"، ئاخۆ تۆ ئەو کەسە نەبووی پێشبینیی گرفتە ڕێ تێچووەکانت کرد؟

دان بەوە بنێ کە تۆ گرفتەکان لەو شوێنانەدا دەدۆزییەوە کە کەسی تر نایاندۆزێتەوە و ئەمەش تۆ دەکا بەگرفت چارەسەرکەرێکی ئەفسانەیی. و سۆزی تۆ یەکێکە لە سوودە لاوەکییەکان. لەبەرئەوە نکۆڵیکردن بۆ تۆ گرفت نییە. تۆ دەتوانی گوێ بۆ گرفتەکانی خەڵک ڕابگری. بیر لە چاوە گۆشە زۆر داکەوتووەکانی "جۆن گرێی" و "دێبۆرا تانێن" بکەوە کە شارەزای سەرسڕمێنن لە بواری پێوەندییەکاندا. جیهان پێویستیی بەو کەسانە هەیە کە

تامەزرۆی گرفت دۆزینەوەن.

تاکە کاردانەوەی ڕاستەقینەی تۆ ڕێکەوتنێکی بچووکە کە تۆ بێ ئاگایانە لەگەڵ جیهاندا بەستووتە. ئەمە بەم شێوەیەیە:

"خوایە من کە لە دۆزینەوە و چارەسەرکردنی گرفتەکان زۆر باشم، دەبێ بەردەوام چاوەڕوانی ئەوە بم لە ژیانمدا لانی کەم گرفتێکی بەڕاستی سەرەکیم هەبێ".

ئەگەر ئەوە ڕێکەوتنی تۆ بێ، بۆ پێیدا ناچییەوە؟

ئەگەر گۆشەی چاوت ڕاست بێ تۆ خاوەنی ڕادەیەکی دەگمەنی واقیعبینیی. تۆ کە نە ڕەشبین و نە گەشبینی دەتوانی ئەوە بەبیر خەڵک بێنییەوە کە پەرداخێک ئاو لە هەمان کاتدا دەتوانێ هەم نیوە پڕ و هەم نیوە بەتاڵ بێ.

"ئیمیلی پۆست" سوودی لەم بەهرەیە وەرگرتووە تاوەکو یارمەتیی کەسانی سەردەمی خۆی بدا، بەڕێگە ڕاست و تەسکەکەی ڕەوشتبەرزی و هۆشیاریی کۆمەڵایەتیی ڕاستەقینەدا گوزەر بکەن. "کەسی گایزوایت"ی کارتۆنیست واقیعبینی بەرجەستە دەکا و پاشان ڕێگە بەکەسایەتییەکانی دەدا بۆ هۆشیاریی کۆمەڵایەتیی ڕاستەقینە تێ بکۆشن. کارتۆنیستێکی تر بەناوی "گەری ترودۆ" تەوسی " Doonesbury – دونزبێری" بەکار دێنێ کە زیاتر لەوەی تەوسێکی گومانهێنەرانە بێ تەوسێکی واقیعبینانەیە.

گۆشەی چاوی دوکتۆر "بێرنی شیگڵ" زۆر ڕاستە. ئەو بەگونجاون لەگەڵ ئەم هێمایەدا تێبینیی ئەوەی کردووە کە: "ڕەشبینان لە ڕوانگەیەکی زۆر وردترەوە واقیع دەبینن، بەڵام گەشبینان تەمەندرێژترن".

تاکە ئاریشەی ڕێ تێچوو بۆ خەڵکی خاوەن چاوی گۆشە ڕاست بریتییە لە بێنکورتی بەرامبەر بەتەواوی خەڵکی تر. لە هەر هەموو ئاراستە میزاجییەکانیاندا واتە لە گوڕوتینی تەشەنەکەری "دیلا ریس" و "ڕۆما دۆونی"، ئەستێرەکانی " Touch by an Angel – پەریگرتوو"ەوە بگرە تا خەفەتی شکێنەری "ویلیام گۆڵدینگ"ی نووسەری " Lord of the Flies – خوای مێشەکان" بێنکورتیی خۆی دەنوێنێ.

## گۆشەکانی دەم

لە کاتی چارەسەرکردنی گرفتدا، وشەکان گرینگییەکی تایبەتیان هەیە. هەڵبەتە کردەوەکان نین کە پەستمان دەکەن بگرە ئەو تێبینییە لە ناکاوەکانن کە لە دەمێکەوە دەردەپەڕێن. ئەگەر تۆ دایک یان باوکێک بی گرەو دەکەم هێشتاش بەبیرت دێتەوە منداڵ بۆ یەکەم جار بەشێوەیەکی چەند سەیر خواردەمەنیی ڕەق دەخوات: "ئێستا خواردنەکە دەچێتە ژوورەوە و ئێستا دێتە دەرەوە". پێ دەچێ منداڵەکە هیچ سەر لە جیاوازییەکە دەرنەکات. وا دیارە ئەمە گرفتە بەردەوام هاوڕێی مرۆڤ بێ، بەڵام نەک لە خواردندا بگرە لە قسەکردندا.

ئەو کاتەی منداڵەکە فێری قسەکردن دەبێ کاتی ئەوە هاتووە تا فێری ئەوە بکرێ باشترە بەتووڕەیی قسە نەکا. مرۆڤ لە هەر تەمەنێکدا بێ پێویستە ناوە ناوە بەبیری بهێنرێتەوە کە بەنەرمی و بەخۆشی قسە بکا، لەبەرئەوەی ڕەنگە ڕۆژێک ناچار بێ قسەکانی بخواتەوە.

ئەمە هەواڵە خۆشەکەیە بۆ هەر هەموو ئەوانەمان کە دەبێ لەگەڵ ئەو بارودۆخە پێکەنیناوییانەی ڕۆژانە کە بەهۆی قسە پەڕاندنەوە دەخولقێن، خۆمان بگونجێنین. تۆ وەک ڕووخوێنەوەیەک لە ڕێی سەیرکردنی گۆشەکانی دەمەوە دەتوانی پێشوەختی خۆت وریا و ئامادە بکەی. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ئەو کاتەی کە دەم لەباری ئاسوودەیی دایە، لێی ڕامێنە «تەنیا لە بارێکدا نەبێ کە تۆ لە شێوازی کەسیی کەسێک بکۆڵییەوە کە بەردەوام لێو بەخەندەیە. لە ڕاستیدا ئەم کەسەش بوونەوەرێکی دەگمەنە– ئەوەندە دەگمەنە کە بەئەگەری زۆرەوە پێویستیی بەکۆڵانی زیاتر هەیە».

هەر بەهەمان ئەو شێوەیەی کە بۆ چاو پێڕەو کرا، دیسان خاڵەکان بەکار بهێنەوە. ئەمجارەیان خاڵێکی خەیاڵی لەسەر هەر سووچێکی دەم و خاڵێکیش لە ناوەڕاستیدا واتە لەو شوێنەی کە دوو لێوەکە بەیەک دەگەن، دابنێ. ئەم خاڵانە بەیەک بگەیەنە تا دوو هێڵت بۆ دروست بێ واتە هەر لایەی ڕوو هێڵێکی بەر بکەوێ. زۆر جار بەڵام نەک بەردەوام لە هەردوو لای ڕوودا دەمی مرۆڤ هەمان گۆشەی دەبێ. ئێستا هەر لایەی بەجیا بخوێنەوە.

– ئاخۆ گۆشەکە لەسەر ڕوودا ڕاست هەڵکەتووە؟ کەواتە بەڕاستی هەژمار بکە.

– ئاخۆ لە سووچەکەدا هەڵکشان دەبینی؟ گۆشەکە بەهەڵکشاو هەژمار بکە.

– ئاخۆ دەم بۆ خوارەوە داکەوتووە؟ گۆشەی ئەم دەمە بەداکەوتوو دابنێ.

واتای گۆشەکانی دەم برێتییە لەوەی کە چۆن کەسێک وتەکانی خەڵکی تر لێک دەداتەوە.



ڕاست



هەڵکشاوە



داکەوتوو

گۆشەکانی دەم

بابەتەکە جیاوازە ئەگەر تۆی لە ژیاندا ئایدیالیست یان گرفت دۆزەرەوە یان واقیعبین لە کاتی ئاخافتندا خۆت کەسی قسەکەر بی. ڕەنگە ئەو کاتەی خەڵک قسەکەر بێ، تۆ کاردانەوەیەکی جیاوازت هەبێ. ئەوە ڕێگەیەکی دەروونییە بۆ وەرگرتنی ئەو شتەی کە ژیان بەسەرتی دێنێ و بەگونجاوی هەر هەمووی لە ناو ڕوودا و لە ناو خوارترین ئەندامی بزێوی ئەم ڕووەدا دەردەکەوێ.

بۆ شیکردنەوەی چۆنیەتیی کارکردنی ئەم بەهرەیە با نموونەیەک وەربگرین. با بڵێین تۆ لەگەڵ ئافرەتێک بەناوی "جێین" هاوژوانی دەکەی. ئێوارەیەک تۆ لە کاتی دەرچوونی جێین لە ڕێستورانتێکدا دەیبینی، بەڵام بۆ خۆت بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ کارهێنێکت بەپەلەی. خەریکە درەنگت دەبێ، بۆیە ئەم قسەیەت لە دەم دەردەچێ: "زۆر پەلەمە. کاتی ئەوەم نییە بوەستم و قسەت لەگەڵ بکەم. بمبوورە".

ئەگەر گۆشەی دەمی جێین ڕاست بێ، ڕەنگە کاردانەوەی بەم شێوەیە بێ: "ئەم پیاوە چییەتی؟ بۆ ئەوەندە پەلەیەتی؟"

ئەگەر گۆشەی دەمی جێین هەڵکشاو بێ، ڕەنگە بڵێ: "ئەگەری زۆرە ئەو سەرقاڵی یەکێک لە مامەڵە سەرسڕمێنەکانی ئیشوکارەکەی بێ؟ لە چاکەی خۆیەتی کە بەو هەموو پەلەکارییە وەستا و مەرحەبای لێ کردم".

ئەگەر گۆشەی دەمی جێین داکەوتوو بێ «کە بەگشتی باوترین هێمایە لە ناو هەراشەکاندا» ئەو لێکدانەوەی زیاتر ڕێی تێ دەچێ ئەمەیانە: "دەنگی چەند ساردوسڕ بوو. دە بزانە، هەر دەڵێی ئێمە سەردەمێک هاوڕێ نەبووین. ئەو کاتەم بەبیر هاتەوە کە "هابێرت"یش هەر ئەم کارەی کرد".

تێ گەیشتی؟ چەندی گۆشەی دەم زیاتر دابکەوێ ئەوەندە خاوەنی دەمەکە وتەکان بەخراپی لێک دەداتەوە. ئاریشەکە ئاشکرایە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر دەمت هەردەم خەیاڵشکاویشت بکا، خاڵی هێزت فەرامۆش مەکە. تۆ کە خۆت یەکجار زۆر بریندار دەبی، پێ دەچێ بەرامبەر بەخەڵکی تر بەبەزەیی بنوێنی. ئەگەر هەست بکەی ئەو وتانەی درکاندووتن هەستی کەسێکیان بریندار کردووە، ئاخۆ دەسبەجێ داوای لێبووردن ناکەی؟

"Frasier" بێگومان باشترین سیتکۆمی تەلەڤزیۆنییە کە تێیدا کەسانی خاوەن دەمی گۆشە داکەوتوو بەپێکەونیناویترین شێوازەکانیانەوە ڕۆڵ دەگێڕن. دەمی ئەکتەرە سەرەکییەکە لەباری ئاسوودەییدا بەردەوام هەوڵ دەدا لە داکەوتووییەوە بۆ ڕاستی

بگۆڕێ. "نیلز"ی برای ئەکتەری سەرەکی دەمێکی زۆر گۆشە داکەوتووی هەیە و باوکیشیان کە کۆنە پۆلیسێکی توانجدەرە، دەمێکی زۆر داکەوتووی هەیە. گفتوگۆی ناو ئەم پرۆگرامە بەهۆی خێرایی هەر کەسێک بۆ لێکدانەوەی تێبینییەکانی کەسانی تر بەخراپترین ئەگەری رێ تێچوو، درێژە دەکێشێ.

ئەو دەمانەی کە بۆ سەرەوە هەڵدەکشێن لە قسە پەڕاندن ڕق هەڵناگرن. ڕەنگە بەگوێرەی ڕوویانەوە ئەم کەسانە سلاوێکی نادڵسۆزانەیان پێ ئاسایی بێ. لە ڕاستیدا ئەو لێوانەی خاوەنی ئەم هێمایەن دەرفەتی تیزکردن بەخەڵکی زۆر هەستیار بەرامبەر بەقسەیان بۆ دەرەخسێ. چەندجار خەڵک لەو قسانەی تۆ وتووتن هەمان ئەو قسانەی کە هەرگیز تەنانەت لە ڕۆژێکی ناخۆشیشدا پێیان سەغڵەت نەبووی، ڕەنجاون؟ گوێت لە ئیدیۆمی " Having a bad hair day – ڕۆژێکی زۆر بێزارکەر"بووە. زۆربەی خەڵک بەبەراورد لەگەڵ تۆ لە چنگ دەمەوە دەناڵێنن و پێ دەچێ هەموو ڕۆژێک ئەم بێزارییە دووبارە ببێتەوە.

مرۆڤە دەگمەنەکانی خاوەنی دەمی گۆشە ڕاست هەڵسووکەوتێکی خۆڕسکیانەی سەرسڕمێن دەنوێنن. تۆ لە وتەیەک قووڵ دەبییەوە تا لە مەبەستە ڕاستەقینەکە تێ بگەی. پاشان کاردانەوەت دەبێ.

خەڵکی تر ڕەنگە ئەم شێوازە بەسەیر دابنێن. بۆ تاکە جاریش بێ، تۆ بەهۆی بوونی هێمایەکی ناوەندی لە دەمتدا، ڕووبەڕووی کاردانەوەی بێنکورتی بەرامبەر بەهەموو خەڵکی تر نابییەوە. بەڵام لەجیاتی ئەمە هەموو خەڵکی تر بەرگەی تۆ ناگرێ.

ڕەنگە بۆ ئەو سەرۆکانەی ئەمریکا کە دەبووایە سەرەڕای بیروڕا جیاوازەکان بەرگری لە خۆیان بکەن، ئەم هێمایە خاڵێکی هێز بووبێ: "ئێبی لینکۆڵن" و "تێدی ڕۆزڤڵێت" و "وۆردۆ ویلسۆن" و "جێراڵد فۆرد" و هەڵبەتە "هەری ترومان"ی خاوەنی ئەم وتەیە "ئەوان بەجەهەننەم".

"لوسیل بۆڵ" بۆ خولقاندنی سیتکۆمی کلاسیکیی " I Love Lucy – لوسیم خۆش دەوێ" سوودی لەبەرگرییە بێ هەستەکەی دەمی گۆشە ڕاست وەرگرتووە.

گۆشەکانی چاو و دەمی دوکتۆر "نۆرمان ڤینسینت پیل" ڕوویەکی دڵرفێنیان پێی بەخشیوە. لەلای ڕاستی ڕوویدا، چاو و دەمی داکەوتوو بوون و لەلای چەپیدا هەڵکشاو. واتای ئەوەیە کە ئەم دوکتۆرە لە ژیاندا ئاریشەیەکی سەرەکیی هەبووە بۆ ئەوەی بیروبۆچوونێکی نەرێنی بکاتە ڕوانگەیەکی ئەرێنێ. شارەزابوون لەم وانەیەی ژیان ڕێخۆشکەر بووە، بۆی تا ببێتە گرینگترین هزرڤانی گەشبینی جیهان.

## کۆمەڵێک بەهرە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان

زۆرێک لەو هێمایانەی ڕوو کە لە بەشەکانی پێشوودا باس کران دەرخەری بەهرەی جیاوازن لە چارەسەرکردنی گرفتەکاندا. بۆیە ئەم خشتەیەی خوارەوە هەڵگری زانیاریی چێژبەخش. ئەگەر ئەو کەسەی تۆ لەگەڵی لەمشتومڕ دای هەر کام لەم هێمایانەی هەبێ ڕەنگە ئەو ڕیزبەندە یارمەتیت بدا بۆ ناسینەوەی. بیر لەوە بکەوە کە چۆن دەتوانرێ بۆ بەرژەوەندی هەردوو لاتان سوود لە بەهرەکە وەربگیرێ.

### خەیاڵ

پرسیار: "لووتکەی خەیاڵ"، ئاخۆ ئەوە ناوی زنجیرە چیایەکە کە خۆی خزاندووەتە ناو باسی گرفتەکانمان؟ دەڵێی گەیشتوویە ئەو ئەنجامەی کە گەشتکردن باشترین چارەسەر بێ؟

وەڵام: من ناوی هێما جەستەییەکەم گۆڕیوە لەبەرئەوەی ناوە کۆنەکەی بەڕاستی نالەبار بوو. گوێت لە زاراوەی "پەرچەمی بێوەژن" بووە؟ مەبەست لێی شێوەی ژمارە حەوتێکە کە هێڵی مووی نەخشاندووە. بۆیە حەز ناکەم بەپێدانی ناوێکی پێوەندیدار بەمردنەوە لە شکۆی ئەم هێمایە سەرسڕهێن کەم بکەمەوە.

بەمسۆگەری ڕەنگە ئەم هێمایە پرتینترین هێمای پێوەندیدار بەداهێنەرایەتی بێ. من بۆ ڕێزگرتن لەو هێمایە و هەروەها بۆ ڕێزلێنان لە شوێنەکەی کە بەرزترین شوێنە لە ناو ڕوودا، ناوی "لووتکەی خەیاڵی سەر هێڵی موو"م لێی ناوە.

پرسیار: بوەستە. خۆ تۆ بەڕاستی چاوەڕێ نی ئێمە بڕوا بەوە بکەین تاکە هێمایەکی بچووک ئەوپەڕی داهێنەرایەتیی پێوە بەند بێ، وایە؟

وەڵام: وایە. داهێنەرایەتی لە کۆمەڵێک هێمای ڕوودا خۆی دەنوێنێ. بۆ نموونە هەر یەکە لە سێ شێوە سەرەکییەکانی لووت لە لاڕووەوە «ڕێک و قیت و چەماوە» ئاماژە بەداهێنەرایەتییەکی جیاواز دەکەن لە ماوەی کارکردندا «بەڕیز، لەگەڵ پێڕەو و هەستی زگماکی و سەرچاوەکانی ناو ژینگەی کاریدا». ئەم هێمایانە لە ناو ڕیزبەندی هێماکانی چارەسەرکردنی گرفتدا ئاماژەیان پێ نەدراوە هەرچەندە دەشکرا ئاماژەیان پێ بدرێ.

لە ڕاستیدا بەنزیکەیی هەموو ڕوویەک نەختێک داهێنەرایەتیی پێوە دیارە و دەکرێ بۆ چارەسەرکردنی گرفت بەکار بێ. بۆ لیستەی پێشوو کە تایبەت بوو بەچارەسەرکردنی

## ١٢ بەهرە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان

| | هێمایەکە | چۆنیەتیی کارکردنی بەهرەکە |
|---|---|---|
| ١ | جووتە چاوی لێک دوور | بەرفراوانکردنی ڕوانگەی هەمووان و ڕێگەگرتن لەوەی کە مێشێک نەکرێت بەگامێش |
| ٢ | جووتە چاوی لێک نزیک بووە | وردبوونەوە لە گرفتەکە بەبچووکترین وردەکارییەکانییەوە تا ئەو کاتەی چارەسەر دەبێ-تێبینیی ئەوە بکە کە ئەم شێوازە دەتوانێت خەڵکی خاوەن جۆرەکانی تری جووتە چاو شێت بکا لەبەرئەوەی ئەم کەسە خەڵکانی دەوروبەری بێ ئومێد دەکا. |
| ٣ | لووتی ناواخن تەنک | بەتەنیا چارەسەر دەدۆزێتەوە "دەرفەت بدە بەم کارکەرە. |
| ٤ | لووتی ناواخن پڕ | بەشداری پێکردن و بەهەند وەرگرتنی هەموو ئەندامانی گرووپ و هەوڵدان بۆ ئەوەی چارەسەرەکە کارێکی هەرەوەزی بێ |
| ٥ | برۆی سەراوین | پڕکردنەوەی هەموو کونەکان و هەنگاونان بۆ چارەکردنی وردەکارییەکان کە پاشماوەی پرۆژەکەیان لەسەر بەندە |
| ٦ | برۆی هەشتی | ڕەتکردنەوەی بەفیرۆدانی یەک ساتی زیاتر لەسەر ئەو چارەسەرانەی کە کەڵکیان نییە. کوتانی هەر دەرگەیەک بۆ دۆزینەوەی پێڕەوێکی نوێ کە کاراتر بێ |
| ٧ | گوێی بەرز | واقوڕماندنی خەڵک بەهۆی بەهرەمەندی لە توانایەکی باش و ڕێبەدیکەرانە لە چارەسەرکردنی گرفتەکان |
| ٨ | گوێی نزم | بێندرێژبوون لەچاوەڕوانیدا تا ئەو کاتەی گرفتەکە بەیەک جاری چارەسەر دەکرێ |
| ٩ | جووتە کوڵمی لێک نزیک | پێشاندانی بەزەیی لە ژێر پاڵەپەستۆدا. ئەگەر پێویستە چارەسەرێک ئێستا بدۆزرێتەوە هەرچۆنێک بێ ئەم کەسە چارەسەرەکە دەدۆزێتەوە |
| ١٠ | چەناگەی قووڵ | هەرەوەزیکردن بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، بێ فیزی و وێرای بەزەیی نواندان بەرامبەر بەخەڵکی تر |
| ١١ | لێوی قایلکەر | هاندانی هەمووان بۆ هەستکردن بەوەی کە گرفتەکە چارەسەر بووە " جا چ چارەسەر کرابێ چ نا- لانی کەم ئەمە کاتەکییانە هەموو ئەو خەڵکانەی کە لە ناردنی ئاکامی گرفتێک تووڕەن، دەپارێزێت" |
| ١٢ | لووتکەی خەیاڵی سەر هێڵی موو | چارەسەرکردنی گرفتەکان بەبەکارهێنانی خەیاڵ، خەیاڵێکی داهێنەرانە کە ڕەنگە چەندین ساڵ لە سەردەمی خۆی پێشکەوتووتر بێ |

گرفت من ئەو شێوازانەی داهێنەرایەتیم هەڵبژاردووە کە یەکجار جیا کراوە و تەنانەت سەیرن.

لووتکەی خەیاڵی سەر هێڵی موو، لەبەرئەوەی بەتایبەتی پێوەندی بەرامانێکی داهێنەرانەوە هەیە، شوێنی خۆی لە ناو ڕیزبەندەکەدا کردووەتەوە. هەر هەمووشمان خاوەنی ئەم هێمایەین و دەتوانین بەهێزی بکەین، بەڵام هەندێ کەس ئەم هێمایەیان بەگەورەیی و بەجێگیری پێ بەخشراوە. ئەم هێمایە هاوڕێی تاکە ئاریشەیەکە: خەریکبوون بەهەموو خەڵکی تر بەتایبەتیش ئەوانەی کە هەست دەکەن خەیاڵکردن هەڕەشەیان لێ دەکا.

بەڵام دوکتۆر "ئەندروو وایلز"ی بیرکاریزان گازندە ناکا. بلیمەتییە سەروئاساییەکەی یارمەتیی داوە تا دوا بیردۆزی "فێرمات" بسەلمێنێ. ڕەنگە بڵێی کارێکی چەند مەزنە، فێرمات هەر کێیە؟ بەلای هەندێک بیرکاریزانەوە فێرمات لانی کەم وەک "ئێلڤیس" گرینگە و بۆ ماوەی ٣٥٠ ساڵ بیرکایزانان هەوڵی سەلماندنی بیردۆزەکەیان دەدا.

بەم دوایانەش "سیسیلیا بارتۆلی"ی خانمەگۆرانیبێژی گەنجی خاوەن دەنگی مێزۆ سپرانۆ لە پێشاندانی ئەو شێوە نائاساییەی هێڵی موو بەجیهان شەرمی نەکردووە، هەنگاوێکی جوانە. هیچ کەسێکی خاوەن ئەم هێمایە نابێ بیشارێتەوە. گرفتەکان جیهان خوازیاری ڕامانێکی زیاترن.

شارەزایانی تری ڕامان "ماریا گۆپێرت مایر" و "رۆدۆڵف ئێڵ مۆسباور"ی فیزیازانن و با "میکی ماوس"ی داهێنەرترین کەسایەتیی کارتۆنی لە ئەمریکادا لە یاد نەکەین. ئاخۆ دەتزانی کە لە ڕووی هێڵی مووەوە، میکی زۆر لە باوکی خۆی واتە لە "واڵت دیزنی" دەکا.

## ۱۳

# ستراتیجییەتەکانی فرۆشیاری

فـرۆشـیـاری کـاری کـەسـی خـاو و خلیچ نیـیـە. هەندێک جـار پێـویسـتـە تۆ بەدەســـتــوبردی هـەنگاوی بنێی. یەکـەمین هـەڵوێســتی کــارهێنـەکـانیــشت هەڵوێستێکی نەگۆڕە.

تەنیـا لـە بارێکدا نـەبێ کـە تۆ بازاڕ دۆزەرەوەیەکی تەلەفـۆنکار بـی ئەگـەر نا خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ لە فرۆشیاریدا یارمەتیت بدا.

ڕوو خوێندنەوە دەتوانێ یارمـەتیت بدا نەک تەنیاش لە لقێکی فرۆشیاری وەک کۆفرۆشی یان تاکفرۆشی یان بازرگانی یان دەزگێڕی واتە لە فرۆشیاری نەریتیدا. ئەگەر تۆ قایلکار یان وانەبێـژ یان بەڕێـوەبەر بی یانیش هـەوەڵ بدەی کەسـێک بۆ ئـەنجـامـدانی کـارێک هـان بدەی، ئەوا کـاری تۆش دەچێتـە خـانەی وشـەی "فـرۆشـیـاری"یەوە و ئەو ئـامـۆژگـارییـانەی لەم بەشـەی کـتـێبدا هـاتوون یارمـەتییت دەدەن کـارەکـەت بـەکـاردانییـەکی زۆرتـرەوە بەئەنجـام بگەیەنی.

## نیازی یارمەتیدەرانە

"ئۆپرا وینفـری" هـەمـوو ڕۆژێکی ژیانـی خـۆی بەپاڕانەوە بۆ هـەمـان شت: "خـزمـەتکردن بەخەڵکی تر" بەسەر بردووە. شتێکی سەرسـڕمێنە. ئەو داوای سەرمایەی زۆر و بەملیۆنەها جـەمـاوەر و تەنانەت ناوبانـگیـشـی نەکـردووە. جارێ هـەر لەوە گـەڕێ کـە ئەو زەنـگینتـرین ئافـرەتی ئەمـریکیی خـۆپێگەیەنـەر بووە. بەڵام هەروەک لە دیمـانەیەکی لـەگـەڵ " Redbook Magazine"دا هـاتووە ئۆپرا لە ناخی دڵییەوە ئاواتی خواستووە کەسێکی سوودبەخش بێ.

سـەرکـەوتنی ئۆپرا پشـتـئـەسـتـوور بەچەند هۆکـارێک بووە، بەڵام ڕەنگە ئەوەیان کـە باس کرا بـۆ خـەڵکـانی وەک من و تۆ گرینگترین هـۆکـار بێ، چونکـە ئێـمـە بەئارەزووی خـۆمـان

دەتوانین ئەم هۆکارە لە ئێستاوە پتەوتر بکەین.

گرینگە نیازی تۆ یارمەتیدانی خەڵک بێ. لە رووی کردارییەوە ئەم نیازە گرینگە چونکە زۆربەی خەڵک بۆ پەیبردن بەئیرەیی هەستیان تیژە. ئێمە لە دۆزینەوەی ئەو کەسەی کە بیەوێ کالاٌیەکمان پێ ساغ بکاتەوە وەک سەگی راو بۆژەنین.

هەروەها کاتێک کەسێک بەو چاوانەی هێمای دۆلاریان ($) تێدا دیارە، سەیرت دەکا و دڵساردی دات دەگرێ، ئاخۆ حەز ناکەی نیازێکی یاریدەدەرانەی راستەقینە کێشت بکا؟

هاوشێوەی تۆ، کارهێنانی تۆش هەست بەم شتانە دەکەن. کەواتە تەنانەت لە پێناوی خۆتدا گرینگە نیازت بەتەنگەوەهاتنی کارهێنانی فرۆشیارییەکەت بێ. خوێندنەوەی روو دەتوانێ هاوکاریی ئەوانەمان بکا کە نیازیان پاکە بەتایبەتیش لە کاتی هەڵچووندا. تەنانەت فێنکترین بەفر واتە ئەو جۆرەی کە بەهۆی سپییەتییەی هەناسەی مرۆڤ قەتیس دەکا، بەرگەی قەرەپەستان ناگرێ و شلۆقەیەک دەگورێت. بەهەمان شێوەش ویستە نیازچاکانەکانمان دەگۆرێن.

بەڵام خوێندنەوەی روو، سەرچاوەیەکی سەرسڕهێنە بۆ راهێنانی مرۆڤ. لە سەعات ٣ی پاشنیوەرۆی رۆژێکی هەینیدا بەراشکاوی ئەو کاتەی کە تۆ لە خەڵک وەڕەس بووی، بۆ خۆت سوود لە رامان لە لووتێک یان چەناگەیەک وەربگرە.

ئەو کاتەی لووتێک پێ دەنێتە ناو پێشانگایەکەت بۆ چەند ساتێک خۆت بەخوێندنەوەی ئەو لووتە سەرقاڵ بکە. دەربرینەکە پشتگوێ بخە «لەو کاتەی رۆژ یان هەفتەدا هەرچۆنێک بێ، نەتۆ و نەکریارەکەش لە دەربرین خوێندنەوە هیچ سوودێک وەرناگرن». چالاکانە بۆ بەهرەیەک یان دووان بگەرێ پاشان بۆت دەردەکەوێ کە بۆچی کریارەکەت کەسێکی تایبەتە. بەم شێوەیە تۆ لە خۆوە خۆت لە ناو فرۆشیارییەکی هاوتای دیمەنە بەفرێکی پڕ هەست دەدۆزییەوە. تۆ دەتوانی لە دیدگایەکی نوێوە سەیری ئەو کەسە بکەی.

بێگومان کەشوهەوای فرۆشیاریی ئەم سەردەمە نالەبارە. کریاران بێ ئەوەی شەرم بکەنەوە لە کریندا نرخەکەیان بەلاوە گرینگە. راشکاوانە ئەوان زۆربەی جار بەچاوێک کە هێمای دۆلاری ($) تێدا دیارە، سەیری ئێمە دەکەن، یان مەگەر لەوە دڵنیا بن کە ئێمە پێداویستییەکانی ئەوان بەهەرزانترین نرخ و لە هەمان کاتدا بەخێرایی رادەستیان دەکەین دەنا هەر ئاوریشمان لێ نادەنەوە.

ئەگەر مرۆڤ لەلایەن کریارەوە وەک کالاٌیەکە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێ وەک ئەوە وایە

کە وەک ئامێرێک بۆ سێکس سەیر بکرێت «هەمم، ئەگەر کرپارەکە زۆر بەدیش بێ ڕەنگە بەهەردوو شێوە هەڵسووکەوتت لەگەڵ بکا». کەواتە سوپاس بۆ خوا کە تۆ ویستی ئازادت هەیە و شارەزاییت لە خوێندنەوەی ڕوو وزەبەخشی ئەم ویستەتە. ئەو کاتەی تۆ بڕیار دەدەی کرپارەکەت وەک مرۆڤێک سەیر بکەی، ئەم بارە لە تۆوە بۆ ئەویش دەگوازرێتەوە. جەخت بکەوە لەسەر ئاخافتنی نێوان دوو کەس نەک دوو پارچە شت.

## دڵی خۆت خۆش بکە

تەنانەت ئەگەر نیازێکی پڕشکۆشت هەبێ و باشترین هەوڵیشی بۆ بدەی ئەوە لە خۆوە سەرکەوتنی بەدوادا نایەت. ئا لەو کاتەدا هەستێکی گاڵتەجاڕی دەتوانێ لە لە ڕووخانی ورە بتپارێزێ.

لە کۆتاییی وانەکانمدا داوا لە قوتابییان دەکرێ، فۆرمەکانی هەڵسەنگاندن پڕ بکەنەوە. زۆربەی جار قوتابییان سروشم بۆ دێنن. هەندێک جار پێشنیازی بەکەڵکم پێشکێش دەکەن. بەڵام ناوە ناوە تێبینییەکانیان دەبێتە هۆی ئەوەی بەبۆنەی دژواربوونی بارودۆخەکە، هەست بەبارگرانی بکەم. گرینگ نییە من بەدرێژاییی وانەکان چەند لاپەڕە زانیارییان پێشکێش بکەم، بەڵام شتێکی چاوەڕوانکراوەیە کە کۆمەڵێکیان لە چەنگ بەرنەکەوتنی نامیلکەکانەوە ببۆڵێنن. کۆمەڵێک قوتابی گلەییی لەوە دەکەن کە بەڕادەی پێویست لە بابەتەکە شارەزا نیم «بە ڕەچاوکردنی ئەوەی بابەتەکە لە داهێنانی خۆمە ئەمەیان تێبینییەکی سەیرە». هەندێک قوتابی تەنانەت لەوە پەست بوون کە وانەکە بەگوێرەی ئەو شوێن و ڕێکەوتەی کە لە ناو کەتەلۆگەکەدا هاتووە، نەوتراوتەوە «بەڕاستی؟ ئەی چۆن وا ڕێک کەوتووە هەر هەمووومان لێرە ئامادە بین؟».

لە جیهانێکدا کە مرۆڤ ناتوانێ دڵی هەموو لایەک ڕازی بکا، لانی کەم ئێمەی ڕووخوێنەوە بەردەوام دەتوانین خەڵاتی دڵنەواییکردن ببەینەوە. هەر شتێک ڕوو بدا ئێمە دەتوانین زانیاریی ڕوو خوێندنەوەمانی پێ دەوڵەمەندتر بکەین.

بەم جۆرە هەر کاتێک نیازی تۆ بۆ خزمەتکردن بەخەڵک هیچ قازانجێکی لێ نەکەوێتەوە دەتوانی سوود لەپلانی "باء" وەربگری: پێ بکەنە و تا دەتوانی فێر بە. هەندێک جار ئەو خەڵکانەی لە پیشەکانی خزمەتگوزاریدا کار دەکەن هەوڵێکی زۆر دەدەن بۆ ئەوەی خەڵکی تر بەپێکەنین بێنن. ئێمە لە بیرمان دەچێ لەگەڵ خۆمان بەبەزەیی بین. خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ لایەنێکی گاڵتەجاڕی بۆ هەڵسووڕاندنی ئیشوکارەکەت زیاد بکا.

من و هاوسەرم هەرگیز ئەو ئاهەنگەمان لە یاد ناچێ کە داوام لێ کرا تێیدا وەک رووخوێنەوە کار بکەم. "ئێلڤیرا"ی میواندار داوای لێ کردبووم یەک سەعات کار بکەم لەبەرئەوەی نرخەکەی پێ زۆر بوو لە توانای دانەبوو زیاتر لە یەک سەعات سوود لە خزمەتگوزارییەکەم وەربگرێ. کەسێکی زۆر قیرسچمە بوو بۆیە هاوسەرم منی بەئۆتۆمبێل گەیاندە شوێنەکە و بڕیاری دا لە ناو ئۆتۆمبێلدا چاوەڕوانم بێ. پاشان ئێمە دەبووایە ڕاستەوخۆ بچووباین بۆ ئاهەنگی لەدایکبوونی ئاوەڵێک. ئەو کاتەی بۆ خواحافیزی دەستم بۆ میچ ڕاوەشاند، چالاکانە خۆم گەیاندە ئەو شوێنەی کە تێیدا دەبووایە دەموچاوی پڕجۆشترین کۆمەڵێکی میوانان بخوێنمەوە. ئیلڤیرا نیگەران بوو و دەبووایە نیگەران بێ. چەناگە زۆر چەماوەکەی ئاماژەی بەوە دەکرد ئەو میواندارێکی زۆر بەخشندەیە و بۆ ئەو هیچ شتێک بەڕادەی پێویست بەشایانی میوانەکانی نین. لە هەمان کاتدا ئەو خاوەنی کونە لووتی شێوە سێگۆشەی زۆر بچووک بوو کە دەرخەری ئاریشەیەکی سەرەکییە لە پارە خەرجکردندا. میواندارە سەرلێشێواوەکەمان چ چارێکی هەبوو؟

بەئاشکرا میوانەکان دەیانویست من زیاتر بمێنمەوە و لەبری ئەوە ئیلڤیرا دەبووایە پارە بدا و هەرچەندە لە ماڵ و خێزانەکەیڕا دەوڵەمەندی دەخوێندرایەوە، بەڵام کونە لووتەکانی ئیلڤیرا هەژارییان لێ دەباری. ئەو کاتەی کە خۆم بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکرد پرسیاری ئەوەی کرد ئەگەر زیاتر بمێنمەوە چەندی تێ دەچێ. من کرێی سەعاتە کارێکی خۆمم پێی وت. لەبەرئەوەش کە هەستم بەبەهرەی لووتی کردبوو، جەختم لەوە کردەوە ئەگەر ئەو حەز بکا دەتوانم بەچارەکە سەعاتیش کار بکەم.

ئیلڤیرا وتی: "تەنیا یەک چارەکی تر".

بۆیە من لەوێ مامەوە و بۆ چارەکێکی تر بەردەوام بووم لە ڕوو خوێندنەوە. پاشان چارەکێکی تر و چارەکێکی تر و چارەکێکی تر ... تا ڕادەیەک هەستم کرد کە من شەهرەزادم و ئیلڤیراش هەزار و یەک شەوە. هەرخولەکێک پێ دەچوو دوا خولەک بێ بۆم.

ئەو کاتەی کارەکەم کۆتایی پێ هات بەنزیکەیی چوار سەعات کارم کردبوو. کە گەڕامەوە بۆ ناو ئۆتۆمبێل میچ ڕاکشابوو. قاچی خستبووە سەر داشبۆردکە و کورسییەکەی بۆ پشتەوە چەماندبووەوە.

بەڵێ، هاوسەرە سەرسڕماوە باش و شیرینەکەم لە کەروێشکە خەوێکدا بوو. من هەر پێیم نەوتبوو ئەوەندە زۆرم پێ دەچێ، لەبەرئەوەی تا کۆتاییەکەی مەزندەی ئەوەم نەدەکرد

چەند چارەکێکی تر زیاد دەبێ. ئێمە پێکەوە بەم ئاکامە نەویستەکییانە پێ کەنین. میچ بۆ ماوەی چوار سەعات بەندیی کونە لووتەکانی ئیلڤیرا بوو.

بەردەوام لە کاتی سەیرکردنی خەڵکدا دەبینی ئەوان بەگوێرەی ڕوویان هەڵسوکەوت دەکەن. ڕەنگە لە هۆڵی شانۆشدا نواندنێکی سەرنجڕاکێشتر لەو جۆرە ڕۆڵگێڕانە نەبینی. ئەو کاتەی تۆ هەست بکەی لە ناو ئیشوکارێکی سستدا بەند بووی لانی کەم دەتوانی چێژ لەو جۆرە شانۆیەی تایبەت بەڕووخوێنەوان وەربگری.

## کەسی دەسەڵاتگێڕ بدۆزەوە

زۆر لەسەر بیروبۆچوون ڕۆیشتین. ئێستا کاتی تایبەتەکان هاتووە و بۆ فرۆشیارێک هیچ شتێک پتر لە دەسەڵات تایبەتتر نییە.

ئەو کاتەی کڕیار زیاتر لە کەسێک بێ، پێویستە بزانی کێ بڕیاردەرە ئەگینا ماندووبوونەکەت هیچ ئەنجامێکی لێ ناکەوێتەوە. بەگوێرەی جۆری فرۆشیارییەکەت و ئەو ڕاهێنانەی وەرت گرتووە بەئەگەری زۆرەوە شارەزاییت لە زمانی جەستەدا پەیدا کردووە. تۆ فێری ئەوە کراوی چۆن ڕیزبەندیی پلەکانی کاری و سیاسەتەکانیش بخەمڵێنی، بۆیە دەتوانی کەسی سەرکردە دەستنیشان بکەی. ئێستا ئەگەر خاوەنی هەر جۆرە کارێکت بی بۆچی ڕامان لەو بەشانەی ڕوو کە هەڵگری هێزن ناخەیە ناو کارەکەت؟ ئەگەر تۆ لەگەڵ وتووێژکارانی شارەزا مامەڵە بکەی یان لەگەڵ ئەوانەدا کە لە شاردنەوەی هەستەکانیان ڕاهێنانیان پێ کراوە، ئەم جۆرە ڕامانە بەڕادەیەکی زۆر سوودبەخش دەبێ. بەهاوتابوونی هەموو مەرجەکانی تر ئەو کەسەی کە بڕیاری کۆتایی دەدا، زۆربەی ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی هەیە:

١- بەرجەستەییی کوڵم

ئەو کەسەی کوڵمی لە هەمووان زیاتر دەرپەڕیو بێ زۆربەی کات بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئاخۆ ئەوانی تر پاڵپشتیی دەکەن یان نا لە بڕیارداندا پێشدەستی دەکا.

٢- دەرپەڕینی لووت

لووتێک کە لە لاڕووەوە زیاترین دەرپۆقانی هەبێ هی کەسێکی ڕاهاتووە لە کارتێکردنێکی زۆر لەسەر خەڵکی تر.

٣- دەرپەڕینی چەناگە

ئەگەر بارودۆخەکە بپێتە بارودۆخێکی ڕکابەرانە وا چاوەڕوان دەکرێ کەسی خاوەن هێرشبەرانەترین چەناگە سەر بکەوێ و ئەگەری سەرکەوتنیشی زۆرە.

پرسیار: ئەی ئەگەر هەموو فاکتەرەکان هاوتا بن؟ ئەی ئەگەر بەرامبەر بەیەکترکردنی چەناگە و لووتەکانیان و ئەو ئەندامەکەی تر... ناوی چی بوو، گێژت بکات؟

وەڵام: بۆ ساناکردنی کارەکە کەسی خاوەن دەرپەڕیوترین چەناگە دەستنیشان بکە.

پرسیار: پاش ئەوەی دەستنیشانمان کرد ئینجا چی بکەین؟

وەڵام: هەر جارەی قسەیەکی گرینگ دەکەی یان ئەو کاتەی بەرەو کۆتاهێنانی فرۆشیارییەکەت دەچی، یەکەم جار سەیری ئەو کەسە بکە. هەروەها هەر کاتێک کەسێکی ناو گرووپەکە سکالایەک دژی وەڵامی تۆ بەرز بکاتەوە، پاش ئەوەی تۆ وەڵامی دەدەیەوە بەنیگایەکی دڵنیاکەرەوەی خێرا سەیری پلە بەرزترین کەسەکە بکە.

## دانانی یەکەمایەتییەکان "بەگوێرەی یەکەمایەتییەکانی ئەوان"

هەڵبەتە پێویستە تۆ هەستیار بی بەرامبەر بەوەی ئاخۆ کارهێنەکەت سەبارەت بەیەکەمایەتیی خۆی لەو کالایەی تۆ دەیفرۆشی، چ شتێکت پێ دەڵێ. لەگەڵ ئەوەش هەروەک دەزانی خەڵک بەردەوام تەواوی ڕاستییەکەت پێ ناڵێن. هەندێک جار بۆ خۆشیان نازانن چ شتێکیان بەلاوە گرینگە.

بەڵام هەندێک جار ڕوویان دەتوانێ ئەمەت بۆ ڕوون بکاتەوە. یەکێک لە هەرە بنەڕەتیترین بابەتەکان سەبارەت بەکڕیار، یەکەمایەتییەکانی ژیانیەتی کە لە ڕووبەرەکانی یەکەمایەتیدا خۆیان دەردەخەن. بۆ بەدەستهێنانی باشترین بەرەنجامەکان پێویستە هەستیاری بنوێنی، بەرامبەر بەو شتەی کڕیارەکەت زارەکییانە پێتی دەڵێ، بەڵام با ئەو شتەی بۆی دابین دەکەی بەگوێرەی ئەو زانیارییە بێ کە لە ڕوویەوە دەخوێندرێتەوە.

لە فرۆشیارییەکەت بەگوێرەی ڕووبەرەکانی یەکەمایەتیی بالادەستترین کەسە دەست بەکار بە. خوێندنەوەی ڕووبەرەکان زیاتر لە ٥ چرکە نابات «ئەگەر ئەم ڕووبەرانە بەو ڕادەیە ئاشکرا نەبوون کە لە سووکە نیگایەکدا بخوێنرێنەوە واتای ئەوەیە پێویست ناکا ڕەچاوی ئەم هێمایە بکرێ.»

١- ئەگەر ڕووبەری یەکەم گەورەترین ڕووبەر بوو

ئەم خەڵکانە شەیدای بیرۆکەکانن. کەواتە لەوە دڵنیا بە کە باکگراوندێکی تیۆریی تێر و تەژییان لەبارەی هەریەک لە تایبەتمەندییەکانی ئەو کاڵایەی کە دەیفرۆشی بۆ دابین بکەی. بۆ نموونە ئەگەر کاڵایەکەت پرۆگرامی کۆمپیوتەری بێ تەنیا باسی توانای پرۆگرامەکە مەکە. ئەوەش ڕوون بکەوە کە بۆچی پرۆگرامەکە بەم شێوەیە بەرنامەڕێژیی بۆ کراوە و ئامانج لە دانانی پرۆگرامەکە چی بووە و گرینگیی ئەم ئامانجانە چین؟

٢- ئەگەر ڕووبەری دووەم گەورەترین ڕووبەر بوو

پاڵنەری ئەم خەڵکانە فراوانخوازییە. جەخت بکەوە لەسەر دەسکەوتەکان. چەندی ئەنجامەکان کەسیتر بن، ئەوەندە باشترە. بۆ فرۆشتنی ئەو پرۆگرامە کۆمپیوتەرییە پرسیار بکە و بزانە کەسەکە پرۆگرامەکە بۆچی بەکار دەهێنێ و پێشانی بدە کەوا ئەو بەکام ڕێگە دەتوانێ بەماندووبوون و کاتێکی کەمتر بەرەنجامێکی زیاتر لەبەرهەمەکەت دەستەبەر بکا.

٣- ئەگەر ڕووبەری سێیەم گەورەترین ڕووبەر بوو

ئەم خەڵکە خاکییە لەگەڵ تۆدا هەست بەئاسوودیی ناکەن، مەگەر تۆ لە نومایشکردنەکەتدا ڕووڕاست بی. بۆ نوکتەکردن و دەمەتەقێ و قاوەخواردنەوە هەردەم دەرفەت بڕەخسێنە. لە ڕووی زانیارییەوە هەر ڕاستییەک کە بتوانێ برەو بەپێناسەی بەرهەمەکە بدا، باس بکە. بۆ نموونە ئەگەر جۆرێکی تایبەت لە پرۆگرامی کۆمپیوتەر لەو کاتەدا پرفرۆشترین جۆر بێ هەر دەبێ باسی بکەی.

پرسیار: ئەی ئەگەر کارهێنەکەت خاوەنی ڕووبەرێکی سێیەمی گەورە بوو، بەڵام گوێی گۆشەکراوەشی هەبوو؟ ئەی ئەم جۆرە خەڵکە تەنانەت ئەگەر کەسانێکی خاکیش بن، ناپێڕەوکار نین؟

وەڵام: دەم خۆش، وریا بە لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ کارهێنێکت کە خاوەنی ڕووبەری سێیەمە، زەرەی نییە ئەگەر چاوێک بەگۆشەی گوێیدا بخشێنی. ئەگەر کارهێنەکەی تۆ خاوەنی گوێی زۆر دەرپەڕیو بێ تاکە وشەیەکیش لەبارەی باوبوونی بەرهەمەکە مەدرکێنە. ئەگەر بەبیرت بێتەوە بۆ ئەم خەڵکانە جیابوون لە جەماوەر مایەی شانازییانە. تەنیا باسی تایبەتمەندییە بەسوودەکان بکە و هەروەها هەر ڕاستییەک کە سەلمێنەری کارایی تایبەتمەندییەکان بێ.

پرسیار: مەبەستت ئەوەیە مرۆڤ دەتوانێ پێشبینیی ئەوە بکا چ کاتێک بانگەوازکردن بۆ

واڕسکە "غەریزە"ی یەکرەنگی لەگەڵ کۆمەڵگەدا ئەنجامی پێچەوانەی لێ دەکەوێتەوە؟

وەڵام: زۆر جـار تـۆ دەتوانی پێـشـبـینیی ئەوە بکەی. تەنانـەت ئەگـەر کـڕیارەکـەت هەرزەکارێک بێ واتە لەو قۆناخەی ژیان دابێ کە کاریگەرییەکانی هاوڕێ لەسەر مرۆڤ لە پڕ هێـزترین ئاسـتی خـۆیدایە، ڕووی هەرزەکارەکە بخـوێنـەوە و ئەگەر ئەو خاوەنی گوێی گۆشەکراوە بوو یان ڕووبەری یەکەمی گەورەترین ڕووبەر بوو لافی ئەوە لێ مەدە کە: "ئەوە پڕفرۆشترین کاڵای ئێمەیە".

خەڵکێک کە گەورەترین ڕووبەری یەکەمایەتییەکانیان ڕووبەری یەکەم بێ، دەتوانن لەسەر ڕێبازێکی هۆشەکیانە برۆن کە ڕەنگە بەسووک سەیرکردنی خەڵکی تر هاوڕێی ئەم ڕێبازە بێ. ئەگەر تۆ بڵێی بەرهەمەکەت بەدڵی هەمووانە کارهێنە ڕێ تێچووەکەت ڕەنگە بەهۆی بیروباوەڕەوە لێتی نەکڕێ.

## خۆگونجاندن لە ڕووی بیرەوە

کـە بێـینە سـەر باسی بلیمـەتیش یەکێک لەو ڕێگەیانەی کـە تۆ بەهۆیەوە دەتوانی بلیمەتییەکەی خـۆت بسەلمێنی ئەوەیە کـە زیاتر لە جـۆرە لۆجیکێکت پێ پەسند بێ. تۆ هەروەک هەماهەنگیکارێکی فرۆشیاری ڕەنگە لەگەڵ خەڵکی ئەوتۆ مامەڵە بکەی کە بەتێکڕا بەشـێوەیەکی جیـاواز لە تـۆ بیـر دەکـەنەوە. ئەگـەر تۆ بتـوانی خـۆت لەگـەڵ شـێـوازی بیرکردنەوەی کەسێکی تر بگونجێنی بەم شێوەیە فرۆشیارییەکەت دەبووژێنییەوە.

ئەمە گرینگترین هۆکارە لەو بارەی کە کاڵاکەت تۆ خزمەتگوزارییەکان بێ. بۆ نموونە تۆ هەروەک دەڵاڵێکی خانووبەرە، یان پسپۆڕێکی دەروونی لە بوارێکی ڕکابەرانەدا کار دەکەی. تەنیـا ئەوە بەس نییـە کە هەسـتی کـارهێنێکی ڕێ تێچـوو بەهۆی ئاسـتی زانایی خـۆت بجـووڵێنی. ئەگەر تـۆ بتوانی زانیـارییەکـەت لەگـەڵ خـانەکـانی مـێشـکی کـارهێنەکـەتدا بگونجێنی، ئەمە شایەنی ڕێزلێنانێکی زیاترت دەکا.

ڕەنگە ئەو ئـامـۆژگـارییـەت بەرگـوێ کـەوتبێ کە دەڵێ مـرۆڤ بەلاسـاییکردنەوەی زمـانی جەسـتـەی خـەڵک، دەتوانێ بۆ خـۆی هاوڕێ بدۆزێتـەوە و هـەروەها کاریگەریـی لەسـەر خـەڵک هەبێ. ئەگـەر کـارهێنەکـەت قـاچێکی لـەسـەر قـاچی تر دابـنێ یان لەسـەر کـورسـییـەکـە بۆ پێشەوە بچەمێتەوە یان سەری خۆی بەلای ڕاستدا لار بکاتەوە، تۆش هەمان کار بکە. ئەمە کاریگەریی هەیە لەبەرئەوەی جەستە و مێشک پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. ئەگەر تۆ بەواتای وشـەوە خـۆت لە شـوێنی کـارهێنەکـەت دابنێی ئەوا بەشـێوەیەکی ڕەوانبێـژییـانە دووبارە

دەگەڕێیەوە سەر دۆخی جارانی خۆشت.

بەهەمان شێوەی ئەم ئامۆژگارییە ئەگەر تۆ لاسایی شێوازە هۆشەکییەکان بکەیەوە دەتوانی تەنانەت ئەنجامی باشتر وەدەست بهێنی. لووت و برۆ ئەو شتەی کە پێویستە بیزانی، بۆت دابین دەکەن. لە لووتەوە دەست پێ بکە. کارهێنەکەت چ لۆجیکێکی لە لا پەسندە؟

- چەندی لووتی کارهێنەکەت ڕێکتر بێ ئەوەندە زیاتر ڕێز لە پێشکێشکردنێکی سیستەماتیکی دەگرێ. بۆیە بەپێی لیستەیەکی پێداچوونەوە کار بکە یان وا پێشان بدە کە لەسەر لیستەیەک دەڕۆی.

- ئەگەر لووتەکە قیت بێ بەدڵنیاییەوە پێویستە لەجیاتی ئەوەی بەتەنیا باسی ڕاستییەکان بکەی، سەرنج بۆ هەستەکانیش ڕابکێشی.

- بۆ لووتی چەماوە لە باسەکەتدا تا ڕادەیەک جوانییەکە دڵڕفێن بکە. ئەوە دڵنیاترین "لۆجیک"ە بۆ زاڵبوون بەسەر هەستەکانی ئەم جۆرە کارهێنە.

پرسیار: بوەستە. تۆ ئامۆژگاریم دەکەی کە بڵێم: "ئەم ئامێرە تێکەڵکەرە خاوەنی دڵڕفێنترین ڕەنگی سپیی زەردباوە"؟ ڕەنگە من ماوەیەکی زۆر لە فرۆشتنی کەلوپەلی بچووکدا کارم کردبێ، بەڵام باوەڕ ناکەم جوانی لە فرۆشیاریدا خاڵێکی ئەوەندە گرینگ بێ.

وەڵام: ڕاست دەکەی. هەندێک جار تۆ لە بەرهەمەکەدا دڵڕفێنەرایەتییەکی هونەری نادۆزییەوە مەگەر بۆ خۆت ئەندازیار بی. بەڵام دەتوانی بەکورتی باس لەو شتانە بکەی کە لەگەڵ هەستی جوانناسیی کارهێنەکەتدا دەتبەستنەوە بۆ نموونە بابەتی وەک ڕەنگی گۆڕەوییەکانی. لە بیرت نەچێ کە پێویستە باس لەوە بکەی کە چۆن کاڵاکەت یارمەتیی کڕیارەکەت دەدا تا داهێنەرانەتر کار بکا.

## لەگەڵ برۆکانیان بدوێ

کاتێک بەگوێرەی لووت و لۆجیک خۆت لەگەڵ ئاراستەی بیروڕای کارهێنەکەتدا گونجاند، ئاوڕێک لە برۆ بدەوە. شێوەی برۆ دەتوانێ زانیاریت لەسەر چۆنیەتیی جێگیرکردنی ئاستی فرۆشیاری بۆ دابین بکا.

١- خەڵکی برۆ ڕێک لایەنگری بیروڕایەکانن

جەخت بکەوە لەسەر بیرۆکەکان. بیرۆکەکان ڕەنگە دەربارەی سوودە لۆجیکییەکان بن یان ڕەنگە لەبارەی هەستەکان بن. ڕەنگە لەبارەی جوانی و داهێنەرایەتیش بن. تایبەتمەندیی بیرۆکەکان هەر شتێک بێ، پێویستە بەخێراییەوە باسەکەت بکەی. ئەوەی سوودی نییە ئەوەیە کە تۆ لە یەک خاڵدا بچەقی و چاوەڕێی کاردانەوەیەکی بەجۆش بێ. کارهێنی برۆ ڕێک چێژ لەوە وەردەگرێ کە تۆ لە ناو ئەڵقەکاندا باز بدەی و هەرجارە باسی بیرۆکەیەکی بۆ بکەی.

٢- خەڵکی برۆ کەوانەیی گرینگی بەهەستەکان دەدەن

بۆچی وەسفی فرۆتەنییەکەت بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانەوە نارازێنییەوە؟ باس لەوە بکە کە چۆن فرۆتەنییەکەت بووەتە هۆی ئەوەی خەڵک هەستێکی باشتریان هەبێ «تۆ دەتوانی چیرۆک لەسەر هەر بابەتێک بگێڕییەوە بەمەرجێک چیرۆکەکان بەجۆش و بەتام بن و پێوەندییان بەهەستەکانی خەڵکەوە هەبێ.» بۆ زاڵبوون بەسەر کارهێنەکانتدا لایەنی عاتفیی خۆت بەکار بهێنە.

٣- خەڵکی برۆ هەشتی پێویستیان بەدەسەڵاتە

ئەگەر کارهێنێکت پێویستیی بەدەسەڵات بێ ئاخۆ چۆن دەتوانی ئەم پێویستییەی دابین بکەی؟ هەر زوو لەوە دڵنیا بە کە پرسیاری لێ بکەی: "کام لایەنی ئەم بەرهەمە «یان خزمەتگوزارییە» بەلاتەوە گرینگترە؟" ئەگەر دەرفەتێک بۆ کارهێنەکەت بڕەخسێنی تا بەم ئاسایە گفتوگۆیەک دەست پێ بکا، ڕەنگە ئەم کارە یارمەتیت بدا بۆ تێرکردنی پێویستیی ئەو کارهێنەت بۆ لەسەر دەسەڵات مانەوە و، هەروەها هەر کاتێک بگونجێ بەشێوەیەک پێڕەوی لەسەرکردایەتیی کارهێنەکەت بکە تاکو ئەو هەست بکا گفتوگۆیەکە لە ژێر ڕکێفی خۆی دایە.

پرسیار: ئاخۆ هەر کارهێنێک جا چ برۆ هەشتی بێ چ خاوەنی هەر جۆرە برۆیەکی تر نایەوێ دەسەڵاتی بەدەستەوە بێ؟

وەڵام: تووشی حەپەسان دەبی. ئەگەر لە کاتی ئاخافتندا باش هەستت ڕابگری دەبینی کەسێکی برۆ کەوانەیی تا ئەو ڕادەیەی تۆ بۆ خۆت بتەوێ درێژە بەگفتوگۆیەکە بدەی، دڵخۆشە بەئاخافتن لەگەڵ تۆدا. کەسێکی برۆ ڕێک بەباشی گوێ لە بیرۆکەکانت ڕادەگرێ بەتایبەتی ئەگەر تۆ بەڕوونییەوە دەریان ببڕێ. بەڵام کەسی خاوەن برۆی زۆر شتی لە دەسەڵات مانەوەی پێ گرینگترە لە هەر شتێکی تۆ دەیڵێی.

پرسیار: ئاخۆ هیچ کارهێنێک پێتی نەوتووە هەست دەکا تۆ کاتی لێ بەفیڕۆ دەدەی؟

وەڵام: زۆر کارهێن ئەو کاتەی کار لە کار دەترازێ واتە پاش ئەوەی گەرمەوگوڕییان نامێنێ ئەمەت پێ دەڵێن. بەتایبەتی ڕەچاوی کارهێنانی خاوەن دوو چاوی قووڵ بکە. ئەوان تاماوەیەکی زۆر درێژ پاش ئەوەی شوورەیەکی گەورەی چین یان دیوارێکی گەورەی گومانیان ڕۆناوە، بەناو ڕەوتەکانی نەزاکەتدا گوزەر دەکەن.

هەستی زگماکی بەردەوام دەتوانێ وریات بکاتەوە لە پاشەکشەکردنی نهێنیی کەسێک لە ئاخافتنی تۆ. بەڵام تۆ دەبێ گرینگییەکی تایبەت بدەی بەکەسێکی خاوەن دوو چاوی زۆر قووڵ. تا بکرێ زوو زوو پرسیار بکە: "ڕات چییە؟".

## کاتدانان

لە کۆمەڵگەی بەملیۆنان جار بەرنامەڕێژیکراوی ئەم سەردەمەدا، کات بابەتێکی بنەڕەتییە. نابێ تۆ پەلە لە کارهێنەکانت بکەی و هەروەها ناتەوێ ئەوان هەست بکەن کە تۆ کاتیان لێ بەفیڕۆ دەدەی. بۆ خۆشت ناتەوێ چەقەچەقکەرێک کاتت لێ بەفیڕۆ بدا. جێکەوتی گوێ دەتوانێ زانیاریی بەنرخت بۆ دابین بکا. بەتایبەتی وریای ئەو گوێیانە بە کە بەرز یان نزمن.

١- کارهێنانی گوێ نزم

ئەوان بەشێوازێکی بەئاگا و بەبیرکردنەوەوە بڕیار دەدەن. ئەگەر تۆ زۆر زوو داوای بڕیاردان لەسەر فرۆتەنییەکیان لێ بکەی، ڕایان دەچەنی. شتەکە هەروەک ئەوە وایە کە تۆ سەیری خۆشترین بەرنامەی تەلەڤزیۆنی خۆت بکەی و بێ ئەوەی هەستت پێی کردبێ نوقمی سووکە بێ هۆشییەک بووبی. ئەگەر کەسێک بڵێ "پخخ" تۆ ڕادەچەنی. یان تەنانەت لە ڕوانگەیەکی فرۆشیارییەوە تۆ دەبۆڵێنی. ئەگەر لە فرۆشیاریدا کار دەکەی، دەرفەت بدە بەو خەڵکەی خاوەن گوێی نزمن تا هەموو ئەو زانیارییەی کە پێویستییان پێیەتی گەڵاڵە بکەن. پێش ئەوەی پێیان بڵێی ماوەی سەیرکردن بەسەر چووە و کات کاتی بڕیاردانە، تا دەتوانی بێندرێژ بە.

٢- کارهێنانی گوێ بەرز

ئەوان خێرا بڕیار دەدەن. بەدووبارەکردنەوەی وتەیەک سووکایەتی بەبلیمەتییە بەلەزەکەیان مەکە.

پرسـیـار: ئەی ئەگەر پێویست بوو من کـۆمـەڵە خـاڵێکی فرۆشـیـاری باس بکەم. خـۆ تۆ مەبەستت ئەوە نییە یاساکان پێشێل بکەم، وایە؟

وەڵام: کێ، من؟ نەخێـر بەڵام لەگەڵ خـەڵکی گوێ بەرزدا تەکنیکەکە بریتییـە لە پێدانی پوخـتـەیەکی خـێـرا. ئـەوان یەکـجـار خـێـرا بڕیار دەدەن. بەپێـچـەوانەی ئـەم بارەشــەوە لە قێزبوونەوە بترازێ ئەوان هیچ شتێکی تریان دەستگیر نابێ.

## وریاییبوون لەمەڕ پارە

لەبەرئـەوەی شـێـوازی پارەخـەرجکردن لە لووتدا ئاشکرا دەبێ، دەتوانی بەبەسـتـنەوەی خشتەی کاتیت بەکونە لووتەکانی کارهێنەکەتەوە ئەنجامی باشتر وەدەست بێنێ.

– لە گرینگیدان بەکارهێنێکی خاوەن کونە لووتی خڕی گەورە، دەست و دڵکراوە بە. ئەم جۆرە کەسانە دەسبڵاوترین کەسانی سەر ڕووی زەوین.

– وەبەرهێنانەکەی خۆت لەسەر ئەو کارهێنانەی کە خـاوەن کونە لووتی سێگۆشـەیی یان کونە لووتی زۆر بچووکن، کەم بکەوە. ئەم خەڵکانە بەر لەوەی کالایەک بکڕن، پێویسـتـیـان بەهاندانێکی زۆر هەیە.

– ئەگەر کارهێنێک خـاوەنی کونە لووتی کلّپـەییـە جـەخت لـەسـەر لایەنە دڵکەرەوەکەی فرۆتەنییەکە بکەوە.

– ئەگـەر کارهێنەکـە خـاوەنی کـونە لووتی لاکێـشـەیی بێ، هـەوڵ بدە تا بکرێ کالایەکە بەدەسکەوتێکی شیاو بەرجەستە بکەی تەنانەت ئەگەر فرۆتەنییەکەت مەیموونێکی کەویکراو بێ.

پرسیار: ئەی سـەری لووت؟ ئەی نەمانوت کە سەرە لووتیش لە شێوازی پارەخەرجکردندا گرینگیی هەیە؟

وەڵام: با. ئەگەر تۆ کـەسێکی خاوەن سەرە لووتێکی تۆپەڵانیت دی تا دەتوانی بـەباشترین شـێـوە دڵنیـای بکەوە. بۆی شی بکەوە کـە چۆن فـرۆتـەنیـیـەکـەت یارمـەتیی دەدا تا پارە پاشـەکەوت بکا، هـەروەک چۆن فرۆشگایە نرخداشکێنەرەکەی گەڕەکەکەمـان پێت دەڵێ لە ڕەسـیـدەکـەتدا چەند پارەت بـۆ "مـاوتەوە" و بەم شـێـوەیـەش پێ دەچێ ئەو دۆلارانـەی کـە بەڕاستی خەرج کراون لە بەرچاوت بسڕێتەوە.

## هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕەخنەکان

کێیە حەز نەکا زیاتر پەسن بدرێ؟ گەڕان بەدوای ڕەخنە خۆشترین بەشی ناو کاری فرۆشیاری نییە جگە لەو بارەدا نەبێ کە بۆ خۆت چەناگەیەکی دەرپەڕیوت هەبێ یان خاوەنی هێمایەکی تری ڕکابەرایەتی بی.

فرۆشیاری ئیشوکارێکی سەختە. تەنانەت ئەگەر ڕقیشت لەوە بێتەوە کە خۆت بخەیە ناو مەترسیی نارەزایی دەربڕینەوە پێویستە گوێت لە ڕەخنەکانی کارهێنەکانت بێ. ڕوو خوێندنەوە دەتوانێ ئەم کارە ساناتر یان لانی کەم خۆشتر بکا. بەڕادەیەکی زۆر پێنج هێمای ڕوو دەرخەری هەڵسوکەوتی جیان کە پێوەندییان بەنارەزاییی دەربڕینەوە هەیە.

١- چاوی گۆشەداکەوتوو

ئەم چاوانە هی ئەو کەسانەن کە لە ناو گرفتەکاندا گەشە دەکەن. لەگەڵ خایاندنی کێشەکان ئەوان بەپرسینی پرسیاری وەک "ئاخۆ هیچ ڕەخنەیەکت نییە سەبارەت بەو شتەی ئێستا وتم؟" یان "بەڕای تۆ ئاخۆ هیچ حاڵەتێک هەیە کە ئەمە بێ سوود بێ؟" گەشە دەکەن. باوەڕ بکەی یان نا ئەم پرسیارانە وەک ئەوە وان کە داوا لە ڕاهێنەرێکی فرۆکەوانی بکەی چەند کردەوەیەکی سەرشێتانە ڕاڤە بکا. تۆ دەبێ کارهێنەکەت هان بدەی کە ئەو کارە بکا کە تێیدا کارامەیە. لە سەرووی هەموو شتێکیشەوە ئەو کاتەی کارهێنەکەت بەئازادی کێشەکان باس بکا پێویستە تۆ هەست نەکەی کە هەڕەشەت لێ دەکرێ. بەیەکەوە کار بکەن بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، یەک لە دوای یەک. بەم شێوەیە کارهێنەکەت وەک کەسێکی هاوتای خۆی ڕێز لە تۆ دەنێ.

٢- شێوە دەسەڵاتی ئاشتیخوازانە

ئەگەر فراونترین پانتاییی ڕووی کڕیاران ڕووبەری ژێر کوڵمیان بێ ئەو کەسانە ڕقیان لە مشتومڕە. ئەوان مەگەر لەبارێکدا نەبێ کە ڕێگەیان پێ بدەی ڕەخنە بگرن ئەگینا بەنەزاکەتەوە ڕەخنەکانی خۆیان حەشار دەدەن. هەر کە لە دەرگەکەشەوە دەرچوون ڕەخنە نەدرکاوەکانیان سەبارەت بەهەرقسەیەکی تۆ، هەڵدەرێژێن. هەڵبەتە تۆ نا بگرە ئەو هاوسەری کە تەمەنێکە دەناڵێنێ ئەم ڕەخنە گرانبەهایە دەبیستێ. لەبەرئەوە بەپێویستی دەزانم کە تۆ لەگەڵ کەسانی خاوەن ئەم هێمایە شێوازەکەت بگۆڕی. وا پێشان بدە تۆ کەسێکی کە حەزت لە گوێگرتن لە ڕەخنەیە.

ئەگەر بتوانی وا بنوێنە تۆ کەسێکی کە زۆر ڕێز لە خۆت دەگری و زۆر خووت بەوە گرتووە کە گوێبیستی هەڵڕژانی ڕەخنەکان بی و تا ڕادەیەک تۆ لە ناو ئەو بزمەدا دەژی. «کێشە نییە ئەگەر بێ تاقەتم بکەی» ئەمە وتەیەکی دڵنیاکەرەوەیە بۆ ئەم کەسانە. زۆربەیان گیانیان دەردەچێ بۆ ئەوەی دەرفەتێکیان پێ بدرێ داخی دڵیان لەلای کەسێک هەڵبڕێژن. ئەوان ڕەنگە تەنیا لەبەرئەوەی دڵیان دادەمرکێ شتێکت لێ بکڕن.

٣- لێوی زۆر تەنک

بەبیرت دێتەوە کە خەڵک لە ڕووی خۆئاشکراکردنەوە چەند جیاوازییان لەگەڵ یەکتر هەیە؟ باری ئاسودەیی خۆت فەرامۆش بکە. کەسێکی لێو تەنک حەز دەکا لەسەر شێوازێکی ئیشوکارییانە گفتوگۆ بکا. نەبادا ئەو هەڵەیە بکەی و دەست بەگفتوگۆیەکی تایبەت بەهەر شتێکی کەسی بکەی.

ناڕاستەخۆبوونیش بۆ تۆ زەرەری نییە. ئەگەر ئاستی تێگەیشتنت باش بێ، کەواتە پێویستە لەگەڵ هەندێک ڕەخنەی دیاریکراودا بەرخورد بکەی. بۆ نموونە با بڵێین کارهێنێکت تێبینییەکی داوە کە ئاماژەدەرە بەوەی ئەو جۆرە ئامێرە فاکسەی کە تۆ دەیفرۆشی زۆر پشتپێبەستراو نییە. ئەو کەسە پارەی تەواوی بەدەستەوە نییە تا دوا بەرهەمێکی مودیل بەرزتر بکڕێ و تۆش لەوە دەترسی نەوەک ئەو بەدەستی بەتاڵەوە لە فرۆشگاوە دەربچێ. ئەوسا تۆ چۆن دەتوانی لەگەڵ ناڕەزاییییەکی ئەوتۆ مامەڵە بکەی کە بەلای کڕیارەکەوە ئەوەندە کەسییە کە ئەو ناتوانێ بەئاسوودەیی لەلای تۆ بیدرکێنێ؟

تێبینییەکی ناڕاستەوخۆ، واتە باسکردنی بەسەرهاتی کەسێکی تر، ڕەنگە گرفتی کەسەکە بخاتە ڕوو. بۆ نموونە بڵێ: "هەفتەی ڕابردوو مامەڵکارێکی وەک تۆم هەبوو کە یەکەم جاری بوو، ئامێری فاکسی دەکڕی. ئەو لەوە دەترسا نەوەک لاپەڕەکان ئەوەندە لوول بخۆن کە کەڵکییان ببڕێت کەچی تاکە لاپەڕەیەکی فاکسیشی لە لا نەبوو. دوێنی ئەو لە فرۆشگا بوو. وتی ئەو ئامێرە فاکسەی لە منی کڕیبوو، ژیانی ڕزگار کردووە. ئەو پێمی وت: "گرینگ نییە کە کۆپییەکان لەسەر لاپەڕەی تەنکەوە ڕادەکێشرێن. ئەوەی گرینگە ئەوەیە کە هەرچۆنێک بێ من کۆپییەکانم چنگ دەکەوێ. تازە دەزانمەوە سەختە بڕوا بکەم کە من بەبێ ئامێرێکی فاکسی تایبەت خۆم ئیشوکارم کردووە".

٤- لێوی زۆر کورت

ئەم لێوانە هاوڕێن لەگەڵ پەرۆشبوون بۆ ڕاستگۆیی. ئەگەر تۆش ئەم پەرۆشییەت هەبێ

هەلی ئەوەی ئەم جۆرە کەسە شتومەکت لێ بکڕێ زیاترە. ئەگەر نا بەشێوەیەکی کاتی دەبێ هەر خەریکی سوێندخواردن بی. ئەو کاتەی تۆ لەگەڵ ئەو کارهێنەدا دەدوێی دڵنیای بکەوە کە ئەوە: "ڕاستییەکەیە، تەواوی ڕاستییەکە و لە ڕاستی بەدەر هیچ شتێکی تر نییە".

تکایە خۆت بپاریزە لەو دەربڕینە بێ بایەخانەی کە بەهۆیانەوە گومان لە ڕاستگۆییەکەت دەکرێ، واتە دەربڕینی وەک: "ئەگەر ڕاستییەکەت دەوێ..." یان " ڕاستترین بۆچوونی من ئەوەیە کە ...". خۆ تۆ حەز ناکەی لە ناو مامەڵەکەدا بۆ خۆت ببیە جێی ڕەخنە سەرەکییەکەی کارهێنەکەت .

٥- برۆی نزم

ئەگەر بەبیرت بێتەوە کەسانی خاوەن ئەم جۆرە هێمایەی برۆ، پێویستیان بەوەیە کە دەسبەجێ شتەکان دەرببڕن. لە کاتێکدا کە ئەوان بەنەزاکەتەوە لە ناو هزرەکانیاندا دەخولێنەوە، لەبەرئەوەی تۆ دەبۆڵێنی لە تۆ و لە فرۆشەکەشت سارد دەبنەوە. ڕەنگە مەیلی کارهێنەکەت بۆ پرسینی پرسیارێکی گوماناوی لە سەرەتا یان لە ناوەڕاستی ڕستەیەکدا سەر هەڵبدا. خێرا: هەر کە هەستت بەوە کرد دەسبەجێ قسەکەی خۆت ببڕە «تەنانەت ئەگەر لە ناوەڕاستی ڕستەکەشدا بووی» و بپرسە: "ئەی ڕای تۆ لەو بارەیەوە چییە؟".

پرسیار: ئاخۆ لەوە ناترسێی کە هەروەک کەسێکی پەشۆکاو بێیە بەرچاو؟ "تکایە من لە دوا ساتدا هەڵەیەکم کرد؟ ئۆه، زۆر دەترسێم ڕازیت نەکەم. بەڕاستی شایانی ژیانم؟

وەڵام: ئەگەر پێویستە گاڵتە بەم ستراتیجییەتە بکەی، قەی نا. بەڵام بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ برۆ نزمەکان ئەوە بەئامۆژگارییەکی باش دادەنێم. بەردەوام دەتوانی بەهۆی زمانی جەستەوە، پێشان بدەی کە پرسیارەکەت ڕەنگدانەوەیەکە بۆ بڕوابەخۆبوونت نەک ترس.

پرسیار: ئەی بەبۆچوونی تۆ دەقاودەق چۆن بزانین، ئەم برووسکە تیشکدەرەوانەی گوماناوییبوون کەی سەر هەڵدەدەن؟

وەڵام: هەر کە برۆی نزمت ناسییەوە ڕادیۆی هەستی زگماکیت بەکار بخە. چاو بگێرە بۆ هەر هەستێکی کورتخایەنی گومان کە بەڕووی کارهێنەکەتدا گوزەر بکا. هەر کە بزەیەکی بەتەوست لەسەر لێوی بینی، بپرسە: "کاردانەوەت بەرامبەر بەوە چییە؟" ئەگەر توانیت کاردانەوەیەکی ڕاستەخۆی ڕاستگۆ ببینی ئەوا تۆ لەسەر سکەی بۆ وەدەستهێنانی متمانەی کارهێنەکەت.

پرسیار: چۆن بتوانم بەدوای ئەم هەموو هێمایەدا بگەڕێم بێ ئەوەی سەر لە خۆم

بشێوێنم؟ دەزانی، من حاڵی حازر سەرم لە ڕێنوێنییەکانی فرۆشیاریی خۆشم دەرناچێ.

وەڵام: خۆشبەختانە پێویست ناکا تۆ بۆ سوودوەرگرتن لە شارەزاییەکانی خوێندنەوەی ڕوو، سەخت تێ بکۆشی. جارێک کە بەڕێکوپێکی ئەم کتێبەت بەش بەبەش خوێندەوە لەگەڵ بنەماکانی هێمایە جۆراوجۆرەکان و واتاکانیان ئاشنا دەبی.

کە ئەم بەشەی کتێبت تەواو کرد دەستبەجێ هەوڵ مەدە هەموو کارێک بکەی. ستراتیجییەتێکی هێمایەکی ڕوو هەڵبژێرە کە حەزی پێ بکەی هەروەک شتێک لە بابەتی کونە لووت خوێندنەوە، بۆ هەفتەیەک لەسەر ستراتیجییەتەکەی من بەردەوام بە. بۆ هەفتەی داهاتووی بچووە سەر دووەم ستراتیجییەت.

پاش ماوەیەک هەستمان لێ ڕادێ. پاشان شێوازە نەستەکییەکە زاڵ دەبێ. تۆ لە ماوەی گفتوگۆیەکی ئاساییدا ئەو کاتەی کە جووتە چاوێکی قووڵ یان دوو لێوی تەنک سەیرت دەکەن، لە ناختدا دەڵێی: "ئاها" و کتومت دەزانی دەبێ چی بکەی.

١٤

# ڕێز لەخۆنان

ئەگەر وا دابنێین کە تۆ لە سەرەتاوە تا ئەم بەشەی کتێبەکەت خوێندبێتەوە، نەک ئەوەی یەکسەر هاتبییە سەر ئەم بەشە «کە لە ڕاستیدا کارێکی ژیرانەیە» کەواتە لەوە تێ گەیشتووی کە ڕووی تۆ ڕەنگدانەوەیەکی ناخی تۆیە. هەر هێمایەکی سەر هەر ئەندامێکی ڕوو هەڵگری واتایەکی تایبەت بەناخی تۆیە. لە ڕاستیدا تۆ هەڵگری ئەو بەهرانەی کە لە خەڵکی تر جیات دەکەنەوە. بەڵام من ئەوەم دۆزیوەتەوە کە گرفتەکانی تایبەت بەڕێز لەخۆنان تەنانەت پاش ئەوەش کە دەبین بەڕووخوێنەوە، هێشتا یەخەی هەندێکمان بەر نادەن. ئێمە ڕەنگە لە چنگ ئەوە بناڵێنین کە تۆزقاڵێک جوانین یان زۆر پیر و ژاکاو دیارین. هەندێکمان ڕەنگە کێشەمان ئەوە بێ کە "کتومت" بەو خزمانەمان دەچین کە ڕقمان لێیانە کە ئەمەش هۆی دروستبوونی گومانی درێژخایەنە سەبارەت بەچەمکی دادپەروەری لە ڕوو یان لە ژیاندا.

ئاخۆ بەگوێرەی پشک و بەرکەوتی ڕوو لە ژیاندا، ڕەچاوی دادپەروەری کراوە؟ وەڵامەکە "بەڵێ"یەکی دەنگدەرەوەیە بەمەرجێک تۆ نهێنییەکانی خوێندنەوەی ڕوو بەدەروونناسی یان میتافیزیکسەوە گرێ بدەی، واتە کتومت هەروەک ئەو شتەی کە ئێمە بەنیازین لەم بەشەی کتێبدا تیشکی بخەینە سەر «ئەوانەی دوودڵن با ئاسوودە بن. ئێوە بەبێ پەسندکردنی تاکە شتێکی ناو ئەم بەشەی کتێبەکەش دەتوانن ببن بەڕووخوێنەوەیەکی پلە یەک. لایەنی میتافیزیکییەکە دەقاودەق بەخواردمەنییەکی بەجیا داواکراوە دابنێ».

## جوان یان ساکار

سەبارەت بەجوانی ڕاستییە ڕووتەکە، ئەوەیە کە جوانی تا ڕادەیەک هەڵخەڵەتێنەرە. جوانی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە سەرپشکییەکی ئاشکرات پێ دەبەخشێت بەتایبەتیش لە ماوەی

ساڵانی قوتابخانەی ئامادەییدا کە پێشبڕکێیەکانی پڕجەماوەرێتیی ساز دەدرێن، ئەو ساڵانەی کە ڕەنگە بۆ ئەوانەمان کە نەیانتوانیوە جەماوەرکێشی بکەن بەردەوام زیندوو دەمێننەوە. لە ڕوانگەی ڕووخوێنەوەیەکەوە هەر کەسێک دەتوانێ لەو شتەی کە لە ژیاندا گرینگە کەسێکی براوە بێ. جوانی هەڵگری کۆمەڵێک سەرپشکییە و ساکاریش بەخشەری پۆلێکی تریانە.

ئێمە ڕەچاوی هەردووکیان دەکەین. با لە جوانییەوە دەست پێ بکەین. ئاخۆ دەتزانی جوانی بەواتای وشە بەهەند وەردەگیرێ؟ باسکردنی ژمارەکان بۆ ئابووریناسێک بەجێ بێڵە. "دانییێل هامێریش" هاونووسەری کتێبی " Beauty and the Labor Market – جوانی و بازاڕی کار" گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە خەڵکی سەرنجڕاکێش لە هەر سەعاتیکدا نزیکەی ٥٪ زیاتر لە خەڵکی خاوەن ڕوویەکی مامناوەندی پارەیان دەست دەکەوێ و بەیەکسانیی هەموو مەرجەکانی تر ئەوان لە چاو خەڵکی بەڕاستی ناشیرین بەرێژەی لە ١٠٪ زیاتر پارە پەیدا دەکەن.

جوانی ڕەنگە ماوەی بەندبوونیش کەم بکاتەوە. دوو دەروونناسی دانیشتووی نیویۆرک کە سەر بەکۆلێجی "ئایوان"، تاقیکردنەوەیەکیان داڕشت بۆ زانینی ڕاستیی ئەم بیرۆکەیە. "وێلسی کایسۆن" و "ئەندری دی سانتیس" داوایان لە کەسانی بەشداربوو لە تاقیکردنەوەکە کرد کە خۆیان بەسوێندخوێنەرانی ناو کەیسێکی دزینی خەیاڵی دابنێن. بەگوێرەی ئاستی جوانی، حوکمەکان جیاواز دەرچوون. سوێندخوێنەرە ناڕاستەقینەکان پێیان باش بوو خەڵکی ڕووجوان بەگشتی بە٩-٧ ساڵ زیندان حوکم بدرێن بەبەراورد لەگەڵ ١٤-٧ ساڵ بۆ ئەو تاوانبارانەی کە کەمتر سەرنجڕاکێش بوون. ("ئار مۆرین" " Beauty and the Beast in the Courtroom – جوانی و تاوانباری لە ناو دادگەدا، واشنتۆن پۆست، ٣٠کانوونی دووەمی ١٩٩٧).

دەروونناسێکی تر بەناوی "کارڵ وینش"ی سەر بەزانکۆی کارۆلاینای ڕۆژهەڵات بەهۆی لێکۆڵینەوە چڕەکەیەوە جیاکارییەکی هاوشێوەی دۆزییەوە «سەرچاوەی پێشوو». "خەڵکی جوانتر لە دادگەدا باشتر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ". ئێمە دۆزیومانەوە کە ئەمە نەک تەنیا لە لێکۆڵینەوە تاوانییە ناڕاستەقینەکاندا ڕوو دەدا بگرە لە دادگەییکردنە شارستانییەکانیشدا بەم ڕەوتەیە".

هەروەک ئەوەی بڵێی ئەم ڕاستییە بەڕادەی پێویست دڵساردکەر نەبووبێ، بۆیە

لێکدانەوەی هۆی ئەم جۆرە مامەڵەکردنە تەنانەت ورەبەزاندێکی زیاتری بەدوادا دێ. وینش دۆزییەوە کە کەسانی سەرنجڕاکیش بە کەسانێکی "متمانەپێکراو و ڕاستگۆ و پشتپێبەستراو و درەوشاوە و گەرموگوڕ و دۆستانە" دێنە بەرچاو، لە کاتێکدا کە خەڵکی سەرنجڕانەکێش وەک کەسانێکی "تەمەڵ و بۆ دەستتناخۆش و متمانەپێنەکراو و ناڕاستگۆ" دیارن.

وینش دەڵێ خەڵک وا بیر دەکەنەوە کە "خوا جوانە". هەڵبەتە ئەمە جۆرە ڕامانێکە لە ڕوو نەک ڕوو خوێندنەوە.

لەبەرئەوەی زۆربەی ئێمەی ئەمریکی هێشتا لەوە ڕانەهاتووین قووڵتر سەیری ڕوو بکەین بۆیە شەیدای سەرنجڕاکێشین. بۆ نموونە ئێمە ساڵانە ١٨-٥ بلیۆن دۆلار لە مکیاژ خەرج دەکەین. ئاخۆ دەتزانی مکیاژەکان سەرەڕای گرانی دەتوانن مەترسیداریش بن؟ بەپێی وتەی "جاک ئەندرسۆن"ی گۆشەنووسێکی واشنتۆن پۆست تەنیا لە ساڵی ١٩٨٧دا ژوورەکانی فریاگوزاریی نەخۆشخانەکان ٤٧٠٠٠ نەخۆشی بریندابوو بەهۆی سابوون و پرچ لووسکەر و شێدەر و ماسکی ڕوو و بەرهەمەکانی تریان ڕاگەیاندووە. ڕەنگە تۆ هەرگیز ئارایشتکردنت بەکارێکی پڕ مەترسی دانەنابێ. کەچی کارەکە پڕمەترسییە «"جێی ئەندرسۆن"، "Beauty and the Beast of Makeup/Chemicals جوانی و مەترسیی میکیاژە کیمیاوییەکان"، واشنتۆن پۆست، ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨».

لەگەڵ ئەوەشدا ڕازاندنەوە هۆکاری سەرەکیی جوانی نییە. بەگشتی دان بەوە نراوە کە شێوە و ئەندازەکانی ئەندامە جەستەییەکان هۆکاری سەرەکیی جوانین. بەڵام گرینگیی ئەم ئەندامانە لە چی دایە؟ دەروونناسانی زانکۆی تێکساس و زانکۆی ئارکانس زانیارییەکی هەژێنەریان دەست کەوتووە. کاتێک کە ئێمە لە بەردەم پیاوێکی قۆز یان ئافرەتێکی شۆخدا واقمان وڕ دەمێنێ ئەو شتەی کە ئێمە بەڕاستی پێی سەرسامین ڕادەی ناوەندیبوونی ئەو کەسانەیە. یان بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکەی "جودیس لانگلۆیس" و "لۆری رۆگمان"، بەزمانێکی زانستییانەی شیاو، وەسفی واتای جوانی برێتییە لە خاوەندارییێتیی ئەو ئەندامانەی لە تێکڕا بیرکارییانەکەی هەموو ڕووەکانی ناو جەماوەرێکی دیاریکراودا نزیکە. ("بی باور" Average Attractions: Psychologists Break Down the Essence of Beauty – سەرنجڕاکێشییەکانی ناوەندێ: دەروونناسان کرۆکی جوانیی سروشتی، شرۆڤە دەکەن" ساینز نیوز، بەرگی ١٣٧، ژمارە ١٩، ١٤ی ئایاری ١٩٩٩، لاپەڕە ٢٩٨).

ئەو ئەنجامانەی لێکۆڵەران وەدەستیان هێنان، بەم جۆرە بوون: ئەوان بەسوودوەرگرتن لە وێنەی ڕووی ٩٦ پیاو و ٩٦ ئافرەتی قوتابیی کۆلێج بنەمای لێکۆڵینەوەکەیان دارشت. وێنەکان بەهۆی لێنزێکی ڤیدیۆیی کە بەکۆمپیوتەرێکەوە بەستراو بوو و هەر وێنەیەکی وەردەگێرایە سەر کۆمەڵە یەکەیەکی دیجیتاڵیی بچووکی هەڵگری نرخی ژمارەیی، سکان کران.

لە هەردوو کۆمەڵە نێر و مێیەکەدا ڕووەکان دابەش کرانە سەر ٣ کۆمەڵی ٣٢ ڕووی. لە هەر کۆمەڵێکدا کۆمپیوتەر هەڕەمەکیانە دوو ڕووی هەڵدەبژارد و بیرکارییانە تێکڕای نرخەکانیانی دەردەهێنا و پاشان ئەم ژمارانەی دەگۆڕی بۆ ڕوویەکی ئاوێتەبوو لە هەردوو کەسێک.

بەشێوازێکی لێکچوو ڕووە ئاوێتەکان لە نێوان هەر ٤ و ٦ و ٨ و ٣٢ پۆلێکی ناو هەر کۆمەڵێک ڕووی ئاوێتەدا دارێژران.

پاشان نۆرەی بەشی جوانییەکە هات. هەروەک لە Science News هاتووە ٦٥ قوتابی داوایان لێ کرا ببنە دادوەر و بڕیار لەسەر ئاستی جوانیی هەر کۆمەڵە وێنەیەکی ڕوو «ڕووەکانی بەجیا لەگەڵ ڕووە ئاوێتەکان واتە هەر هەموویان لە ناو یەک کۆمەڵدا» بدەن. کام ڕووەکان براوە بوون؟ ئەو ڕووانەی ئاستی سەرسڕمێنیی جوانیان پێوە دیار بوو، ڕووە ئاوێتەکانی کۆمەڵەکانی ١٦ی و هەروەها ٣٢ کەسی بوون. ئاستی جوانیی ڕووە ئاوێتەکانی کۆمەڵەکانی ٨ کەسی یان کۆمەڵەکانی بچووکتر، هێندەی هەمان ئاستی جوانیی ڕووە ڕاستەقینەکەی خودی کەسەکان لە قەڵەم درا بوو.

تۆ بەپلەی ڕووخوێنەر دەتوانی تێ بگەی کە واتای ناوەندیبوونی ڕوویەک چییە. بەگوێرەی ئەو هێمایانەی کە ئێمە لێمان کۆڵیونەتەوە ڕوویەکی جوان دەبێ خاوەنی ئەو چاوانە بێ کە مەودای نێوانیان ناوەندییە. پێویستە لووت درێژییەکی شیاوی هەبێ و پێویستە جێکەوتی گوێ ناوەندی بێ. پڕێتیی برۆ دەبێ یەکسان بێ و... هتد.

ئێستا واتای ئەو هێمایانە بخەوە یادت. بەهۆی هێمایە ناوەندییەکان کەسەکە توانای خۆگونجاندنی هەیە. هەر کاتێک تۆ هێمایەکی ناوەندیت هەبێ شێوازی کەسیت دەتوانێت دوو شێوە وەربگرێ. لە ڕووی بیروبۆچوونەوە ڕەنگە هەم ڕوانگەیەکی بەرفراون و هەم ڕوانگەیەکی تەسکت هەبێ. لە ڕووی کاتدانان بۆ پرۆژەکان لە ناخی تۆدا لە نێوان بڕیاردانێکی ورد و هێواش یان بڕیاردان بەخێراییەکی واقوڕمێن یەکەمایەتییەک هەبوونی

نییە. وردەکارییەکان گرفتێکت بۆ ناخوڵقێنن لەبەرئەوەی تۆ هەم لە دەستپێکردن و هەم لە کۆتاییهێنان بەپڕۆژەکان بەهەمان ڕادە هەست بەئاسوودەیی دەکەی. تۆ تەنیا کار دەکەی.

تێ گەیشتی؟ ئەگەر تۆ ڕوویەکی ناوەندیت هەبێ و «بەم هۆیەشەوە خاوەنی ڕوویەکی جوان بی» گەورەترین کاردانەوەی هاوڕێی هەر هێمایەکی ڕووت ڕەنگە بێنکورتی بێ بەرامبەر بەهەموو خەڵکی تر. بەڵام ڕەنگە تۆ هەروەها جگە لە توانای کێشکردنی خەڵک کاتێکی سەختت بۆ دۆزینەوەی هێمایە جیاکەرەوەکانت بەسەر بردبێ.

ڕندییەکی شێتکەر لە ڕووی هەستی و کۆمەڵایەتییەوە شتێکی ئاسان نییە. هەڵبەتە ئەم جوانییە لە خودی خۆیدا هاوتای کرێتییەکی واقورمێن بەهرەیەکە. لە هەردوو بارەکەدا خەڵک دەوەستن و زەق ڕادەمێنن و دواتر هەروەک بتێک سەیرت دەکەن. ئەوان ئاوات و ترس و ڕق و هەر شتێکی کەڵەکەبوو لە ناخیاندا لە تۆدا دەبیننەوە.

فێرخوازێکم کە ڕاهیبەیەکی خەڵکی سپرینگفیڵدی ئیلینۆس بوو، خووی بەوەوە گرتبوو کە جلە جیاکەرەوەکانی ڕاهیبەیی بکاتە بەری. ئەو پێی وتم چەند سەیرە مرۆڤ بەشەقامدا بڕوا و وەک "ڕاهیبە"یەک هەڵسوکەتی لەگەڵدا بکرێ.

"هەندێک خەڵک بەئامێزی کراوە تا ئەو پەڕی گەرموگوڕی بەرەو ڕووم دێن. ئەوانی تر واتە خەڵکانێک کە هەرگیز لە ژیانمدا نەمبینیون تووشم دێن و دەبۆڵێنن. هەندێکیان تەنانەت بەسەرمدا دەگوڕێنن. بەکورتی، شتێکی سەرنجڕاکێشە. هەرگیز ناتوانم پێشبینی بکەم کە خەڵک چ کاردانەوەیەکی دەبێ".

با دوور نەچین کە خوو بەجلێکەوە بگرین یان سوێند بخۆین، هەلی ئەوەمان بۆ ڕەخساوە کە بەشێوەیەکی کاتەکی وەک بت سەیر بکرێین. ئاخۆ هەرگیز ئێسکبەندت بەستووە؟ بەشەقە ڕۆیشتووی؟ یان کەوتوویە سەر ویلچێر؟ ئەی سکپڕی بۆ ماوەی نۆ مانگ، ئەی چاوێکی شینومۆر، ئەی پیاسەکردن بەسەگێکی ڕەسەنی گرانبەها، ئەی لەبەرکردنی جلی ڕەنگاوڕەنگ لە ناو ژوورێکی ئاخێنراو لە کەسانی جل سپی یان ڕەنگی پێچەوانەت تاقی کردووەتەوە؟

کاردانەوەکان بەڕێوەن. هەندێک خەڵک تۆیان خۆش دەوێ و ئەوانی تر ڕقیان لێت دەبێتەوە. هیچ کام لەم کاردانەوە بەتینانە بەشێوەیەکی کەسی هیچ پێوەندییەکیان بەخودی تۆوە نییە. ئەگەر ئەم ڕاستییەشت لە بیر بێ، ڕەنگە هەڵنەچی. لە هەمان کاتدا کاردانەوەکان بەچڕی و خێرایی و شێتانە گوزەر دەکەن و هەروەک ئەوە وایە کە تۆ وەک

تەختەیەکی مرۆیی یاریی دارتت لێ هاتبێ.

ئەمە ڕۆتینە بۆ جوانێکی وەک "تۆم کروز" یان "کیم باسینگر" یان هەر ڕوویەکی تابانی تر جا چ ناسراو بێ چ نەناسراو.

چەندی ڕووەکان ناوەندی نەبن، ئەوەندەش بەهرە جیاکەرەوەکان بەدەر دەکەون. بەپێچەوانەوە بەهرەی بەرچاوی جوانی برێتییە لە گونجانێکی باش لە هەموو شوێنێکدا و هەروەها فێربوونی ئەو وانەیەی ژیان کە پێوەندی بەبەرێوەبردنی ژیانێکەوە هەیە کە تێیدا مرۆڤ وەک تەختەی یاریی دارت هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرێ.

لە ناو ئەم کتێبەدا من نموونەم لەسەر سەدان ڕووی ناسراو هێناوەتەوە. نموونەکان ڕووی خەڵکی سەر بەپلەوپایە و سەردەمی جیاوازن. خەڵکانێکن کە بەهۆی دەستکەوتەکانیان نەک بەرکەوتی جوانییان گرینگن. بەدەر لە ژمارەیەکی کەم لە پێشکێشکاران ژمارەیەکی کەم خەڵکی ناودار توانیویانە ببن بە مۆدیلی وێنەگران. زۆرێکیان ڕەنگە بەساکار دابنرێن. ناوبانگی ئەوان لە ڕوویەکی جوانەوە هەڵناقوڵێ. و، چەندی پێویست بووبێ ئەو کەسانە بەسەر کۆسپی زیاتردا زاڵ بن ئەوەندەش لاسەنگی و ژاکاوی و وەرگەڕانێکی زیاتر بەئاراستەی هێمایە جەستەییە زۆرەکان لە ڕوویاندا دەردەکەوێ.

دوکتۆر "نارایان سینگ"، کە یەکێکە لە ڕووخوێنەوە سەرکردەکانی ئەمریکا جارێکیان لەگەڵم باسی کەسانی پلە بەرزی جیهان هەروەک "ئێبی لینکۆڵن" و "هێلێن کێلر"ی کرد. بەکورتی وتی: "ئەو کاتەی ئەو کەسانە ئەرکی خۆیان بەکۆتا دێن لە ڕوویانەوە وا دیارە لە ناو ئامێرێکی تێکدەری پرشەقوهۆڕەدا خولابنەوە".

پرسیار: مەبەستت ئەوەیە کە ئەو خەڵکەی بەڕواڵەت یەکجار جوانن لە ناخدا هاوسەنگییەکی زیاتریان هەیە؟

وەڵام: بەڵێ. ئەو کەسەی خاونی تایبەتمەندییە "ناوەندی"یەکانە جگە لەوەی کە دەتوانێ لە بنەڕەتەوە لەگەڵ ئەو خەڵکەدا کە بەچاوی بتێکەوە سەیری دەکەن، بگونجێ، بەگشتیش دەتوانێ شێوازی خۆی بگۆڕێ. زۆربەی جار ڕەنگە ئەو کەسە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە خۆی بگونجێ و هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خەڵک ڕێگەی پێ دەدا.

پرسیار: ئەی خەرمانە؟ زۆرێک لەو خەڵکانەی بە"جوان" دادەنرێن ئەو تایبەتمەندییە ستانداردانەیان نییە، بەڵام دەدرەوشێنەوە و ئەمەش خەڵک بۆ کاردانەوە دەورووژێنێ.

تەنانەت ئەگەر تۆ توانای ئەوەت نەبێت هۆشەکییانە خەرمانەکان ببینی، بەڵام ئەگەر هەستت کرد کەسێک شڵەژاوە یان بینیت حەب دەخوا کاردانەوەت بەرامبەری دەبێ. شتێک لە ناختدا دەورووژێ. ئاخۆ دەتەوێ نکۆڵی لەوە بکەی کە خەرمانە کاریگەریی هەیە، لەسەر هەڵسەنگاندنی جوانیی خەڵک؟

وەڵام: نەخێر. ئەوەی ڕاستی بێ، من هەموو ڕووخوێنەوەیەک هان دەدەم تواناکانی خۆی لە خەرمانەخوێندنەوەدا پەرە پێ بدا. «لە خەرمانەخوێندنەوەدا بەشێوەیەکی سروشتی هەستی بینینی بەرجەستە وەک ڕێگەیەکی سەرەکیی دەستەبەرکردنی زانیاری بەکار ناهێنرێ. زانیاریی زیاترت لە " Aura Reading through all Your Senses – خەرمانەخوێندنەوە بەهەموو هەستەکانتەوە"، دەست دەکەوێ». زۆربەی ئەو شتەی کە خۆی بەجوان یان بەناشیرین دەنوێنێ بەدەر لە تایبەتمەندییە جەستەییەکان، پێوەندی بەئاستی خەرمانەشەوە هەیە. خەرمانە شتێکی دڵڕفێنە و بەدڵنیاییەوە تۆ دەتوانی فێری خوێندنەوەی بی.

## دژایەتیی بەهرە

وا دابنێ پێش ئەوەی تۆ لە دایک بی، گرێبەستی لەدایکبوونت دادەڕێژی. کۆنفرانسێکی بچووک ساز دەدرێ و تێیدا ڕۆحی تۆ و فریشتەی پاسەوانت و هەر کەسێکی تر کە بۆ نەخشەڕێژیی ڕێککەوتنە ڕەسمییەکە یارمەتیت بدا، ئامادەن. با ئەو کەسە سێینت پیتێر بێ یان خوایەکانی میتۆلۆجیای یۆنانی واتە هەر کامیان کە بەبڕوای تۆ لە پرۆسەی بڕیاردانەکە ڕۆڵ دەبینێ. بۆ ئەم نموونەیە با ئەو کەسە بەسێینت پیتێر دابنێین.

تۆ و فریشتەکەت و سێینت پیتێر بەفڕین خۆتان دەگەیەننە کۆبوونەوەکە. سێینت پیێر دەڵێ: "با بەیەکێک لە پرسیارە هەرە گرینگەکان دەست پێ بکەین. بڕیاری تۆ لەسەر ئەم بابەتە کاریگەریی دەبێ لەسەر شێوەی ئەم ژیانە. پێت چۆنە بەهرەمەند بی؟".

تۆ دەڵێی: "پێم باشە. تکایە ئەگەر بکرێ حەز دەکەم یەکجار بەهرەمەند بم". ئاگەدار بە. ئەم پرسیارە بەهۆی دژایەتیی بەهرە پرسیارێکی هەڵخەڵەتێنەر بوو. بۆ زانینی کاریگەریی دژایەتیی بەهرە، پرسیارێکی ئاسانی لێ بکە: "چەند بەهرەم هەبێ؟".

ڕاستە. ئاخۆ چەند ڕۆح دەیانەوێ خاوەنی بەهرەی نائاساییی سەرەکی بن؟ تەنیا ژمارەیەکی بەبەراورد کەمیان دەوێرن بەڕاستی خۆیان بدەنە بەرمەترسیی نائاساییبوون.

بەڵێ بەشێوەیەکی گریمانەیی خاوەندارێتیی بەهرەیەکی جیاکەرەوە بۆ کارکردن و

شێوازێکی سەرکردە ئاسایی ناسایانە و شتی لەم جۆرە، پێ دەچێ دڵڕفێن بێ، بەڵام لە ڕووی کردارییەوە واتای ئەوەیە کە ژمارەیەکی کەم لە خەڵک لە تۆ تێ دەگەن و شێوازە کەسییەکانی ئەوان لە هی تۆ جیاواز دەبێ، بەڕادەیەک کە هەرچەندە ئەوان ڕەنگە زۆر بەتۆ سەرسام بن، بەڵام نەزانن کە تۆ چۆن هەڵسوکەوت دەکەی.

با درێژیی لووت کە پێوەندیی بەبەرنامەڕێژی و ستراتیجییەتی کارکردنەدا هەیە بەنموونە وەربگرین. چەندی درێژیی لووتت زیاتر بێ، ئەوەندەش دەسکەوتە ڕێ تێچووەکانت هەژێنەرتر دەبن. بەڵام بەهەمان ڕادەش بەرامبەر بەزۆربەی هەلەکانی کاری نائارامییەکی زیاتر دەنوێنی. تۆ لە ڕێکخستنی پرۆژەیەکی سەرەکی لە کاتێکی دیاریکراودا تەنیا لەبارێکدا نەبێ کە سەربەخۆییەکی تەواوت پێ درابێ دەنا هەر هەست بەخنکان دەکەی. هەر جۆرە هزرێکی گەشبینانەی ئەم دنیایە ناتوانێ لە هەستکردن بەبێ بەختی ڕزگارت بکا، تەنانەت لەو کارانەشدا کە ڕەنگە خەونی زۆربەی خەڵک بن.

ئاخۆ ئەم ڕاڕابوونە کە پێوەندی بەهێماکانی ڕووەوە هەیە مایەی سەرسڕمانە؟ بەگوێرەی ئامارەکان زۆرینەی هەرە زۆری ڕۆحەکان زۆربەی جار ناوەندییوون هەڵدەبژێرن. ڕەنگە شەش هێما لە نێوان هەموو هێماکانی ڕوو لە هێما زۆرەکان بن.

بۆ دڵنیابوون لە دروستیی ئەم وتەیە تاقیکردنەوەی خۆت ئەنجام بدە. هێمایەکی ڕوو هەڵبژێرە بەتایبەتی هێمایەکی پێوەست بەگوێ و برۆ و لووت «ئەو ئەندامانەی بەهرەکانی تایبەت بەشێوازی کاریان بەچڕی تێدا هێشووبەند کراوە». ڕووی ٥٠ تا ١٠٠ کەسی ناسیاوت بەجەختکردنەوە لەسەر ئەو تاکە هێمایە بخوێنەوە. بۆ نموونە ئەگەر تۆ درێژیی لووتت هەڵبژارد لەلای خۆت بنووسە چەند کەس خاوەن لووتێکی لە درێژیدا ناوەندین. چەند کەس لووتێکی تا ڕادەیەک کورت یان درێژیان هەیە؟ چەند کەس خاوەنی هێمایە زۆرەکانی هەرکام لەم دوو ئاراستانەن؟ کە بەرەنجامەکانت لەسەر هێلکارییەک ڕوون کردەوە، ئەوا کێرڤێکی زەنگوڵە ئاسات بۆ دەردەچێ کە ڕێژەی دابەشبوونەکەت بەدەر دەخا.

بەگوێرەی ئامارەکان زۆربەی خەڵک حەز دەکەن خاوەنی ژمارەیەکی کەم هێمای تا ڕادەیەک بەهێز بن. تەنیا ڕۆحە یەکجار بوێرەکانن کە هەڵبژاردنەکەیان ڕوویەکی پڕ لە بەهرە سەرەکییەکانیانە. «ئەو کەسانە ڕەنگە بەسەیر یان دەروشاوە – یان بەیەکەم سیفەت پاشان بەئەوی تریان– وەسف بکرێن، گرینگ نییە لە بنەڕەتدا چەند زۆر پەسن بدرێن، لەبەرئەوەی هەموو تاکێکی پڕ هێز پێویستییەکی زۆری بەهاندان هەیە».

جەماوەرکێشی هۆیەکە بۆ هەڵبژاردنی ڕوویەکی بەبەراورد ناوەندی. زۆربەی خەڵک هەمان شێوازە کەسییەکەی تۆیان دەبێ. لێکچوونێک لە نێوان هەست و بیری ئەوان و هی تۆدا دەبێت. ئەوان دەتوانن لە تۆ تێ بگەن.

جوانی خاڵی دووەمە. ئەگەر لە یادت بێ، جوانی واتای بەناوەندی هاتنەبەرچاوە، کەواتە ئەگەر تۆ هێمای ئەوتۆ هەڵبژێری کە بەهێز و نائاسایی بن، بەهرە دەروونییەکانی هاوڕێی ئەم هێمایانە، ڕەنگە بەردەوام وەک قەرەبوویەکی ڕەوا بۆ نەبوونی جوانی نەهێنە بەرچاو. بەڕادەیەکی زۆریش لە ساڵانی هەرزەکاریدا ڕەنگە ئاخ هەڵکێشی کە: "بۆچی من؟".

پرسیار: ڕەنگە مەبەستت من و ئەو لووتەم بێ کە لە ژیانمدا ڕقم لێی بووەتەوە. تۆ بەڕاستی وا بیر دەکەیەوە کە ئەوە بەهرەیەک بێ؟

وەڵام: بەڵێ. ئەو نرخەی کە تۆ لە بری ئەو هێمایە بەخشیوتە ڕوویەکە کە لەگەڵ ڕێزمدا بەشتێکی جوان نایەتە بەرچاو.

پێ ناچێ تۆ تەنیا تاکە هێمایەکی زۆر، واتە درێژیی لووتت هەبێ. لە زۆربەی ڕووە پڕ لە هێمایە زۆرەکان پێویستە گەورەترین بەهرەی ناو ڕوو لەلایەن هێمایە زۆرە پێوەندیدارەکانی ترەوە پاڵپشتیی لێ بکرێ ئەمەش لە پێناو یارمەتیدانی خەڵکە بۆ جێبەجێکردنی چارەنووسی هەڵبژێردراویان. لە باری تۆدا، لووتت جگە لەوەی زۆر درێژە زۆر چەماوە و تەسکە و هەروەها چەناگەشت زۆر دەرپەڕیو و زۆر کورتە.

واتای خاوەندارێتیی ئەم کۆمەڵە تایبەتەی هێمایە زۆرەکان چییە؟

لە ڕووی جەستەیییەوە، لووت و چەناگەکەت بۆ پێشبڕکێی شاجوانی ناتشێن.

لە ڕووی شێوازی کەسییەوە تۆ نائاسایانە خۆت بۆ کار تەرخان دەکەی و وەک کارکەر سەربەخۆ و داهێنەر دەبی. لە ڕووی ڕەوشتەوە خۆت بۆ ڕاستییەکان بەخت دەکەی و ئەو کاتەی کە بکەوییە ژێر پاڵەپەستۆ یەکجار ڕکابەرانەی.

تۆ لەمیانەی کۆنفرانسەکەدا بەسێینت پیتێر دەڵێی: "زۆر باشە. هەڵکردن لەگەڵ هەموو ئەو بەهرانە بۆم ئاسانە".

سێینت پیتێر بەئاخەوە دەڵێ: "ڕەنگە وا نەبێت، بەڵام باشە، تۆ دواتر لەوە تێ دەگەی".

هەر یەک لەم هێما زۆرانە هاوڕێیە لەگەڵ وانەیەکی ژیان کە بەهەمان ڕادە فێربوونی سەختە. لەم نموونەیەی ئێمەدا تۆ دەبێ بەرەنگاری ئەم ئاریشە بی کە دەربڕی ڕووە هەڵگەڕاوەکەی هێماکانتن، کاری ڕۆتینی بۆ تۆ دژوارە و یەکجار ڕقت لەوە دەبێتەوە کە لە

ژێر چاودێرییەکی ورد دابی و یەکجار هەستیار دەبی بەرامبەر بەرەخنە. بەدرێژاییی ژیانت خەڵک پێت دەڵێ: "دڵت خۆش بکە". و شتێکی تریشی بخە سەر: تەنیا لەو بارەدا نەبێ کە هەلی داهێنەرانە کارکردنت بۆ برەخسێنێ، ئەگینا تۆ تا ڕادەی مردن وەڕەس دەبی.

تۆ کە بەهۆی بیرکردنەوە لە توانا ڕێ تێچووەکانت تەواو گرت تێ بەربووە بەسێینت پێتێر دەڵێی: "بەدڵنیاییەوە دەمەوێ کارێکی بەرچاو ئەنجام بدەم. من بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم گرفتانە بەڕادەی پێویست بەهێزم".

گر! جەستەت پێ دەبەخشرێت و، ئێستا تۆ ناچاری لەگەڵ ناتەباییی بەهرەکانتدا هەڵ بکەی.

– چەندی بەهرەکەت بەهێزتر بێت ئەوەندەش هەلی دەسکەوتێکی ئەوتۆت دەبێ کە کەسی تر ناتوانێ دەستەبەری بکا و، ئەگەری زۆرە تۆ یەکجار لەوانی تر جیاواز بی.

پرسیار: ئەوە شتێکی مسۆگەرە. من هەرگیز ناگونجێم. بەڵام تۆ دەڵێی هۆیەکەی تەنیا سەرنجڕاکیشی نییە بگرە بەهرەش پێوەندیی پێوە هەیە؟

وەڵام: بەهۆی ڕووە یەکجار جیاوازە سەرنجڕاکێشەکەتەوە کەسایەتییەکەت بەو شێوەیە نابێ کە زۆربەی خەڵک پێشبینیی دەکەن: شێوازی کەسیی تۆ لەگەڵ باری ئاسوودەییی ئەواندا ناگونجێ. لە هەر بوارێکی ژیاندا کە تۆ بەهرەت پێ بەخشرابێ پێویستە تێ بکۆشی نەوەک خەڵک بەهەڵە لێت تێ بگەن و نەوەک بەتەنیا بمێنییەوە. بەڵام ئەم سەودایە لانی کەم بۆ ڕۆحی تۆ سوودی دەبێ. هیوادارم خوێندنەوەی ڕوو بتوانێ یارمەتیت بدا بۆ دووبارە لە چوارچێوەنانەوەی ئارایشەگەلی تایبەت بەجوانی.

پرسیار: کەواتە ئەوە بەرێکەوت نییە کە زۆرێک لە بەڕێوەبەرانی بازرگانی و بلیمەتەکانی کۆمپیوتەر یان پرۆفیسۆرەکانی کۆلێج، وەک کەسایەتیی ڕاستەقینە دێنە بەرچاو؟

وەڵام: وایە. بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەکی نوێ بۆ لە چوارچێوەنانەوەی مێژووی خۆت بگەڕێوە سەر ساڵنامەی قوتابخانەی ئامادەییت. سەیری ڕووی ئەو کەسانە بکە کە بەهۆی جەماوەرکێشی ناویان دەرکردووە و لەگەڵ ئەو کەسانەی کە یەکجار دەرسخوێن بوون بەراوردیان بکە. سەیری تایبەتمەندییە ناوەندییەکانی ئەو کەسانە بکە کە بەسەرنجڕاکێش لە قەڵەم دەدرێن و لەگەڵ تایبەتمەندییە پڕ هێزەکانی کەسانی پێچەوانە بەراوردیان بکە. هەر کەسە و خاوەنی شتێکە. لە ڕوودا دادپەروەری ڕەچاوکراوە.

پرسیار: بگەڕێمەوە سەر ساڵنامەکەم؟ من دەمەوێ لە ئاهەنگی داهاتووی

بەیەکگەیشتنەوەی دەرچووانی قوتابخانەی ئامادەییم بەشداری بکەم. ئاخۆ ئەوە پرۆژە لێکۆڵینەوەیەکی باش نییە؟

وەڵام: بێگومان. لەگەڵ پشتگوێخراو کۆمەڵایەتییەکەی جاران کە ئێستا کەسێکی ملیۆنێرە، بدوێ. بەهرە بەهێزەکانی ناو ڕووی ئەو هاوپۆلەت کە ڕەنگە ڕوویان لێی ناشیرین کردبێ، بوونە هۆی سەرکەوتنی لە پیشەدا و، کەسانی پڕ جەماوەری خاوەن هێماگەلی ناوەندی یان هاوتا ڕەنگە هێشتاش سەرنجڕاکێش و هێشتاش لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کاریگەر بن. بەڵام ئەگەر پرسیار لە دەسکەوتەکانیان بکەی، تێ دەگەی کە پیشەی زۆربەیان کەمتر لەسەر ڕەسەنایەتی و زیاتر لەسەر تایبەتمەندییە ناوەندییەکانی توانا کۆمەڵایەتییەکان وەستاوە. زۆربەی ئاوەڵەکانی تۆ لە قوتابخانەی ئامادەیی تێکەڵاون و بەزۆریش خاوەن هێمای ناوەندی و ژمارەیەکی کەم لە هێمایە زۆرەکانن.

## ڕێکەوتەکان

پێ ناچێ ئەو شتانەی کە بەڕێکەوت ناو دەبردرێن، جوانیی مرۆڤ یان ڕێز لەخۆنانی زیاتر بکەن. لەخوێندنەوەی ڕوودا چۆن دەڕوانینە ڕێکەوتەکان؟

بەزمانێکی سادە لە ڕوودا شتێک بەناوی ڕێکەوت هەبوونی نییە. بەزۆری ڕوو بێ ئەوەی کارەساتێکیش ڕوو بدا، وەک کاردانەوەیەک بۆ پێگەیشتنی دەروونی کەسێک دەگۆڕێ. گۆڕانە دەروونییەکان بەرەبەرە لە ڕواڵەتدا ئاشکرا دەبن. ڕێکەوتەکان ئەو کاتە ڕوو دەدەن کە ڕۆحی کەسێک ڕواڵەتی جەستەیی ڕوویەک ڕەت بکاتەوە. هەندێک جار دەروونی مرۆڤ داوای هێمایەکی جەستەیی دەکا کە نەتوانراوە لە ناو گۆماوی جینیدا وەدەست بهێنرێ یان بەتێپەڕینی کات بگۆڕدرێ. هەر بۆیەش ڕۆحەکە هەر جۆرە درامایەکی پێویست دەخولقێنێ تا ئەو هێمایە پێویستە وەدەر بکەوێ.

واین کە منداڵ بوو لووتی شکا. تا ئەو کاتەی ئێمە قسەمان لەگەڵ یەک کرد، ئەو ڕووداوەکەی بەبێ بەختی و بەشتێکی بێ واتا لە قەڵەم دەدا. بەڵام من پێوەندییەکم لە نێوان چەماوە بەرهەمهاتووەکەی لووتی و شێوازە کارییە یەکجار داهێنەرانەکەیدا دۆزییەوە. بەڕەچاوکردنی شوێنی چەماوەکە کە ڕێک لە ئێسقانی لووتیدا بوو من وای بۆ چووم تەکنیکە تایبەتییەکەی واین دۆزینەوەی ڕێگەی یەکجار داهێنەرانە بێ بۆ دەستپێکردنی پرۆژەکان. پێم وت: "ئەگەر نەتوانی هەر پرۆژەیەک بکەی بەپرۆژەیەکی نایاب گومانم لەوەدایە کە تەنانەت مەیلی کارکردنت بۆ بمێنێتەوە. پێویستە تۆ ئەمەت هەر لە سەرەتاوە

هەبێ. پاشان پاشماوەی پرۆژەکە لە خۆیەوە دێ".

واین دانی بەوە نا: "ڕاستە، خۆشییەکەی لەوەدایە کە هیچ کام لە خزمەکانی من لووتیان لە لاڕووەوە وەک هی من نییە. هەموو خزمەکانی سەر بەهەردوو لا لووتێکی ڕێکی جوانیان هەیە".

"ئاخۆ ئەوان لە کارکردن هەمان شێوازە داهێنەرانەکەی تۆیان هەیە؟".

"نەخێر".

بینیت! مەبەستەکە ئەوەیە.

بەشێوازێکی لێکچوو، هەندێک جار پێویستە ڕۆحێک ڕێکەوتی ئەوتۆ بخوڵقێنێ تا ئەو گۆڕانانەی کە بەهۆی نەشتەرگەریی جوانکارییەوە هێنراونەتە دی "هەڵبوەشێنێتەوە". هەرچەندە شتێکی دڵساردکەرەوەیە، بەڵام لانی کەم پڕ واتایە.

بیر لە چیرۆکی "کریستین" بکەوە. ئەو چەندەها ساڵ بەر لەوەی لەلای من وانە بخوێنێت، وای بیر دەکردەوە کە بووەتە قوربانیی ڕێکەوتێکی بێ بەزەیی. لە سییەکانی تەمەنیدا کریستین بۆ تەسککردنەوە و جوانکردنی لووتی خۆی نەشتەرگەرییەکی کرد. بەڵام ڕاستەوخۆ پاش ساڕێژبوونەوەی برینەکانی نەشتەرگەرییەکە "بەهۆی ڕووداوێک"ەوە بریندار دەبێت. لووتی دەشکێ و پان دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە سەر شێوازی بنەڕەتیی خۆی.

بەهۆی دەموچاوخوێندنەوە، کریستین لەوە تێ گەیشت کە هێمایە زۆر ناپەسندەکەی لووتی پێوەندیی هەیە بەیەکێک لە ئازیزترین خاڵەکانی هێزی خۆی لە شوێنی کارەکەیدا: بەهرەکەی بۆ کاری بەکۆمەڵ. کریستین دەیتوانی هەر لە سەرەتای پرۆژەیەکەوە لەگەڵ خەڵک کار بکا. لە ڕاستیدا بۆ کریستین خۆشیی کار لەوەدا بوو کە لە سەرەتاوە متمانە بەخەڵک بکا.

ئەم شێوازە کارییە سەربەخۆیە دەفەوتا، ئەگەر هاتبا و نەشتەرگەرییەکەی ئەو بەشێوازە ویستراوەکە سەرکەوتنی وەدەست هێنابا. لە ناو دەچوو، نەدەما. بەڵام ئێسکە لووتە تەسکە تازە هەڵکەنراوەکەی کریستین. لەگەڵ دەروونی کریستین نەدەگونجا. هەڵەیەکی زۆر گەورە ڕووی دەدا، ئەگەر ڕۆحی کریستین ناچار بووایە خۆی هەڵبقورتێنێ. بەدڵنیاییەوە ئەم لووتە نوێیە دەستکردە "خنجیلانەیە" زۆر ویستراوە و یەکجار بەنرخ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەرەچاوکردنی بارودۆخەکە قوربانیکردنی لووتە خەیاڵییەکەی کریستین لە قوربانیکردنی واقیعی ڕۆحیی ئەو گرینگتر بوو.

فێرخوازێکی ترم بەناوی "ئانتۆنی" باسی لە تووڕەیی خۆی بەرامبەر بەڕووشانی سەر بڕۆی کرد. ئەو پێی وابوو بەهۆی ئەم ڕووشانەوە ڕوویەکی جوانی لە دەست داوە. داوام لێی کرد ڕووشانەکە بەخشڵ دانابێ. کەس حەز ناکا کەموکوڕیی هەبێ. بەڵام هەر ڕووشان و ژاکاوییەک یان هەر گۆڕانێکی ڕوویەکی ڕوو لە گەشە، لە وێنەی مەدالیاکانی سەرسنگی سەربازێکن. باجێکە کە وانە ڕۆحییەکانی لەسەر نووسراوە. لەسەر ڕووی هەسارەی فێربوونیش چ شەڕەفێک لەوە گەورەتر؟

بۆ لێکدانەوەی ڕووشان، پێویستە تۆ زانیاریی بنەڕەتیت لەبارەی واتای ئەندامەکانی ڕوو هەبێ، پێویستە حەز بکەی زانیاریی سوودبەخش بدۆزییەوە و خۆت بکەی بەزوڵاڵترین کەناڵی ڕێ تێچوو، بۆ هەستی زگماکی. لەبەرئەوەی ئانتۆنی ڕقی لە ڕووشانەکەی دەبووەوە بەباشم زانی لێکدانەوەیەکی بۆ بدۆزمەوە.

ڕووشانەکەی ئانتۆنی کەوتبووە سەر بڕۆی لای ڕاستی و لە شوێنێک دابوو کە ئەگەر بڕۆی هەشتی بووایە، مووی بڕۆی لێ دەڕوا. گۆشەی بڕۆشی ڕێک بوو. ڕەنگی ڕووشانەکە سپی بوو کە ئاماژەدەرە بەفێربوونێکی بێگەرد «بەپێچەوانەوە ڕووشانە سوورەکان دەربڕی تووڕەیی کەڵەکەبووەن».

پێیم وت: «ئەم ڕووشانە ڕەنگدانەوەیەکە بۆ بەرەنگاربوونەوەت لە ژیانی کاریدا واتە بەرەنگاربوونەوەی پێوەست بەبیرۆکە نوێیەکانت کە ئەوانی تر پەسندیان ناکەن. بەبۆچوونی من، پێش ڕوودانی ئەو ڕێکەوتەی بووەتە هۆی دروستبوونی ئەم ڕووشانە تۆ بۆ بێندرێژبوونت لەگەڵ ئەو خەڵکانەی کە لەگەڵ تۆدا لە یەک ئاستدا نەبووبن هەوڵێکی زۆرت داوە. ڕەنگە سپییەکەی ڕووشانەکە ئاماژە بەو ڕاستییە دەکا کە هەرچەندە ماوەیەکی پڕ لە نائومێدین بەسەر بردووە، بەڵام لە ڕووی تێگەیشتن و پەسندکردنەوە توانیوتە سەرکەوتوو بی.»

پرسیم:" چ ڕێکەوتێک بووە هۆی دروستبوونی ئەم ڕووشانە؟".

ڕووی ئانتۆنی گەشایەوە. وتی: "پێوەندیی بەکۆمپیوتەرەوە هەبوو. کۆمپانیاکەی من کاری تێدا دەکەم سوود لە سیستەمێکی کۆن وەردەگرێ. هیچ کەس لەو شوێنەدا تێ نەدەگەیشت من بۆ دەمەوێ پرۆگرامی هاوچەرختر بەکار بهێنم. چەندها مانگ بەرەنگاری خەڵک بوومەوە و ئەوە شێتی دەکردم. لەو شەڕەدا دۆڕاندم. بەڵام لەسەر کارەکەی خۆم مامەوە و توانیم بێ گوێدان بەوەی کە ئاخۆ پرۆگرامەکە بەکار دەهێنن یان نا کارەکەم جێبەجێ بکەم.

هەر زوو پاش ئەم ڕووداوە کابینێتێکی فایل بەسەر سەرمدا بەربووەوە. تەقڵەم خوارد و ئەم ڕووشانە دروست بوو.

پرسیار: مەبەستت ئەوەیە کە ئێمە لە ڕێگەی نەخۆشخانەدا هەستین و دڵخۆشی بنوێنین؟ بەڕوو خوێندنەوە یان بێ خوێندنەوەی ڕوو کێ هەیە حەز لە ڕووشان بکا؟

وەڵام: لێکدانەوەکانی خوێندنەوەی ڕوو لەو کاتەدا کە ژانت هەیە لە ئازارت کەم ناکەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا پاشان تۆ دەرفەتێکت دەبێ، بۆ دووبارە بیرکردنەوە لە ڕووداوەکە لە ڕوانگەیەکی ڕۆحییەوە. ئاخۆ دەکرێ واتایەکی ئەرێنی لە ئارادا بووبێ؟ لێکدانەوە جۆرە دەسەڵاتێکت پێ دەبەخشێت کە ئەمەش بەپێچەوانەی بیروبۆچوونە باوەکەی ناو کولتوورمانە کە دەڵێ گرفتە سەرەکییەکانی ژیان لە ڕووداوە هەڕەمەکییەکاندا دەردەکەون و لەم ڕووداوانەدا مرۆڤ قوربانییەکی بێ دەسەڵاتە «بەبۆچوونی من زۆربەی ڕێکەوتەکان ئاستێکی ڕۆحیی پڕ واتایان هەیە. هەمووشیان نا، هەندێک ڕێکەوت لە ڕاستیدا هەڵەکانی جوانکارین. هەر بۆیەش ئەگەر مرۆڤ بیەوێ هاوسەنگیی خۆی بپارێزێ، پێویستە تا بۆی بکرێ لە ڕووداوەکە وانە وەربگرێ. ئەگەر بەتێگەیشتنی خۆی گەیشتە وەڵامێکی پڕ واتا، کەواتە بەهێزتر دەبێ. بەپێچەوانەوە پێویستە لەو شتەدا کە "جۆن بۆریسینکۆ" بە"تاوانی سەردەمی نوێ" ناوی دەبات، نەچەقێ. پێویستە بەباشترین شێوە، تیماری خۆی بکا و بەرەوپێش بچێ».

ڕوو خوێندنەوە ئەو هەلەت بۆ دەرەخسێنێ تا ئەو شتانەی کە ڕێگرن بۆ ڕێز لەخۆنانت، لێک بدەیەوە. ڕووشان جوانیت پێ نابەخشێ، بەڵام ڕوو «هەروەک چۆن تۆش لێی تێ گەیشتووی» تەنیا جوانی تێدا نییە. لەسەر هەسارەی فێربوون، پەروەردەبوون گرینگترە لە ڕوو.

پرسیار: بۆ ڕووشانی بچووکی وەک هی ئانتۆنی دەتوانم لەو خاڵەی پێشوو کە تۆ لەبارەی دادپەروەرانەبوونی ڕووەکانت وتت، تێ بگەم. بەڵام ئەی بۆ ڕێز لەخۆنانی ئەو کەسانەی لە زگماکەوە کەموکورتییان هەیە؟ ئەی قوربانییانی سووتان یان خەڵکانی تر کە ڕێکەوتی کارەساتباریان بەسەر هاتووە؟ چۆن خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ لەگەڵ کارەساتی ئەوەندە قووڵ، مامەڵە بکا؟

وەڵام: با سەرەتا لەو ئازارە سەختانەی کە لە شێوانی ڕوودا خۆیان دەنوێنن، تێ بگەین. تۆ بەپلەی ڕووخوێنەوە دەزانی چۆن بۆ شتێکی سەرووی جوانیی ستاندارد بگەڕێی و ئەم

ڕاستییە یارمەتیت دەدا بۆ بانگهێشکردنی ورەیەکی زۆر پێویست. لە یادت نەچێ کە تۆ شــارەزای لەوەی چۆن هەناســەیەکی قــووڵ وەربگری و دانە بەدانە ســەیری هێـــمــایە جیاوازەکان بکەی. ئەمــەش ڕێگەت پێ دەدا تا بەدیدێکی زولاڵەوە بەدوای ئەو بەهرانەدا بگەڕێی کە لە ئەندامە بریندارەکانی کەسێکدا بەدەر دەکەون.

بێگومـان کەسـێکی بێ بەش لە هـێزی خوێندنەوەی ڕوو لە ترسـان هەڵدەلەرزێ و ڕووی وەردەگـێـڕێ. تۆش چ ڕووخـوێنەوە بی چ نا، ڕەنگە هەڵبلەرزی. بەڵام پاشــان تۆ دەتوانی هەناسەیەکی قووڵ وەربگری و پڕکێشی ئەوە بکەی کە سەیری ڕوو و ئەو بەهرانە بکەی کە نەسڕاونەتەوە. یارمەتیی ئەو کەسە پەککەوتە یان شێواوە بدە کە هەست بەهەبوونی خۆی بکا. ئەو ورەیە بدە بەخــۆت کــە ســەیری ڕووی بکەی. بەدوای ئەو بەهرانەدا بگەڕێ کــە نەسڕاونەتەوە.

پرسیار: هەر کەسێک کە بەئەزموونێکی سەختی لەم شێوازەدا ڕەت بووبێ ناتوانێ باوەڕ بەوتەکەی تۆ سەبارەت بەدادپەروەرانەبوونی ڕوو بکا. مەگەر مرۆڤ لەخۆڕازی یان دڵڕەق بێ دەنا کەس ناتوانێ قسەیەکی لەم جۆرە بکا.

وەڵام: تێگەیشـتنی درێژخایەنم لە دادپـەروەری، دەوەسـتێـتـە سـەر بروام بـەئەڤـەژین کـە ئەمـەش شتێکی بژاردەییە بۆ خوێندنەوەی ڕوو، بەڵام ڕێگەیەکە بۆ لێکدانەوەی ئەوەی کە چۆن ڕووەکان سەرەڕای ڕواڵەتە جیاوازەکانیان دەتوانن دادپەروەرانە بن.

دووبارە ژیانەوە واتای ئەوەیە کە ئێمە زۆر ژیانمان هەیە نەک تەنیا یەک ژیان. لە ماوەی ئەم ژیانـانەدا هەر کارێک بکەین ئەم کـارە دێتـەوە ڕێمـان. کـەواتـە بەڵێ، هەرچەندە ئەوە سەختە، بەڵام دەتوانێ شتێکی دادپەروەرانە بێ کە کەسێک ناچاربێ ژیانێکی جەستەیی شێواو بەسەر بەرێ. ڕەنگە ئەو کەسە سەردەمانێک یەکجار لەخۆبایی بووبێ، یان بووبێتە هۆی ناشــیــرینبــوونی کــەســێک. یان ڕەنگە ڕۆحی ئەو کــەســە خــۆی بۆ ژیانێکی سوودبەخشانەی قارەمان ئاسا تەرخان کردبێ کە تێیدا بیەوێ پێشان بدا کە چۆن سەرەڕای هەبوونی ئاریشەیەکی زەق ئاشکرا، دەکرێ بەئازایەتیی ژیان ببردرێتە سەر.

هۆیەکانی کرێتی و شێوان و کێماسییەکانی تر زۆر قووڵن، بەڵام بنەمایەکی هاوبەشیان برێتییە لەو ئاریشەیە کە ڕوویەکی کرێت بۆ هەموانی بەدەر دەخا. ئاخۆ تۆ ڕازیی بەوەی کە ناخی کەسەکە ببینی نەک تەنیا ڕووی؟ لەم بارانەدا تێگەیشتنی ڕۆحی شتێکی زێدەکی نییە، بگرە پێویستییەکە.

## بەساڵاچوون

دووبارە دادپەروەرانەبوون، پێ دەچێ تا ئەو کاتەی بیرمان لە ئاڵتەرناتیڤەکەی بەساڵاچوون نەکردبێتەوە، بەشتێکی تا ڕادەیەک ناخۆشی دابنێین.

پرسیار: تۆ باس لە مردن دەکەی؟

وەڵام: نەخێر من باس لە" The Portrait of Dorian Gray – نیگارەکەی دۆریان گرێی" دەکەم.

لە ڕاستیدا قسەکەت تەواوە. مردن ئۆڵتەرنێتێڤێکی پڕسامە. بەڵام ڕۆمانەکەی "ئۆسکار وایڵد" کە باس لە دۆریان گرێی دەکا گریمانەیەکی زۆر دڵرفێنی هەیە. لەبەرئەوەش دەبێ کتێبەکە لەلایەن هەموو ئەو کەسانەوە کە ڕوو خوێندنەوەیان بەجیددی وەرگرتووە، بخوێندرێتەوە.

وەک زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە بەریتانیای سەردەمی ڤیکتۆریادا دەژیان ئۆسکار وایڵدیش زانیاریی لەسەر خوێندنەوەی ڕوو هەبوو. تەکنیکی ڕۆمانەکە لەسەر ئەو گریمانەیە بەندە کە بۆ جارێکیش بێ ڕوویەک بۆ ڕەنگدانەوەی ناخی مرۆڤ گۆڕانی بەسەر نایەت.

بەهۆی ئامادەکارییەکی زیرەکانەی ئەهریمەن ئاسا بەرەنجامەکانی ناخە چەپەڵ و کردەوە بەڕواڵەتەکانی دۆریان گرێی، لە ڕوویدا ڕەنگیان نەدابووەوە. لەبری ئەوە ئەم بەرەنجامانە گواسترابوونەوە بۆ سەر نیگارێکی شاراوە. بەڵام لە کۆتاییدا پیاوەکە سزای خۆی وەردەگرێ.

گرێی بێگەرد و بێ تاوان دەهاتە بەرچاو. سەرەڕای زاتە پۆخڵەکەی، هەر کەسێک کە تووشی گرێی هاتبا، بەهۆی بەڕواڵەت پاک و بێگەردبوونییەوە تووشی سەرسڕمان دەبوو. یەکێک لە یاساکانی ئەم هەسارەیە بمانەوێ و نەمانەوێ، یاسای کار و کاردانەوەیە. لە تەمەنی منداڵیدا بەرەنجامەکانی کردەوەکانمان دەبنە هۆی ئەوەی بۆ تەنبێبوون بەتەنیا بەجێمان بهێڵنەوە. لە تەمەنی هەراشیشدا گیرۆدەی ئەو ڕووانە دەبین کە بۆ خۆمان دروستیان دەکەین.

" Wrinkles Are God's Makeup ، ژاکاوی خەملی خواوەندییە" لە چرچولۆچەکان و هەندێک ڕێگەی وردی پڕ واتا کە بەهۆیانەوە ڕوو بەتێپەڕینی کات دەگۆڕێ، دەکۆڵێتەوە. تا ئەو کاتەی ئەم کتێبەت نەخوێندبێتەوە، گرینگترین چەمک کە پێویستە لێی تێ بگەی ئەوەیە

که کلێشـەکانی تایبەت بەبەساڵاچوون هەڵەن. بەشێوەیەکی بەربڵاو خەڵک لەوە دەترسن کە هەر ئەندامێکی ڕوویان بەهۆی قەڵەوی شۆڕ ببێتەوە جگە لەو ئەندامانە نەبێ کە بەهۆی چەورییەوە دەردەپۆقێن. لە هەمان کاتدا لەوە تۆقاون نەوەک ئەندامە بەڕواڵەت گەشەکانی ڕوویان بۆ هەمیشە چرچولۆچییان لەسەر بنەخشێ. ئەگەر چارەنووس نەبێتە هۆی خوڵقانی چرچولۆچەکان تیشکە سەروووەنەوشەیییەکان دەیانخوڵقێنن.

گوێ بگرە، من ئامۆژگاریت دەکەم، بەردەوام کرێمی دژەخۆر بەکار بهێنی، بەڵام لە کاریگەرییەکەی زۆر دڵنیا مەبە، هەرچۆرە گۆڕانێکی ڕوو مسۆگەرە. با ڕووی دایکت هەرچۆنێک بێ لە چارەنووسی تۆدا نەنووسراوە، کە چرچولۆچ لەسەر شوێنێکی دیاریکراوی جەستەتدا گەشە بکا. لەگەڵ تێپەڕبوونی هەر ساڵێک ڕووت هەر زیاتر دەبێتە هی خۆت و، هەر شتێک ڕوو بدا، هۆکارێکی لە پشتەوەیە. ئەو کاتەش کە تۆ لە هۆیەکان تێ بگەی، بەڵگەی زیاتر «نەک کەمتر»ت بۆ ڕێز لەخۆنان دەست دەکەوێ.

## لێکچوونە خێزانییەکان

ئەگەر بۆت بکرێ با سنگت بەرامبەر بەکەسایەتی و ڕووی ئەندامانی خێزانەکەت فراوان بێ. ڕەنگە تۆش هەندێک لایەنی هاوبەشت لەگەڵیاندا هەبێ.

بەڵام لە ڕووی بەرکەوتی ڕوو، بڕیارە وردەکانت سەبارەت بەشێوازی کەسی دەتوانن مەودایەکی سەرسڕمێن لە نێوان تۆ و خێزانی ڕەچەڵەکت بخوڵقێنن. ئاخۆ لە وانەکانی مێژووی قوتابخانەی ئامادەییدا، هەرگیز باسی زێ The Hasburg Nose – لووتی هاسبورگەکان و The Hasburg Chin – چەناگەی هاسبورگەکانت خوێندووەتەوە؟ ئەوانە ئەو دوو هێمایانەی ڕوو بوون کە لە ناو بنەماڵەی شانشینی ئەڵمانیدا باو بوون، بنەماڵەیەک کە بۆ ماوەیەکی زۆر زیاتر لەوەی ڕەوا بێ، دەسەڵاتیان بەسەر نەرویج و ئیسپانیادا گێڕا.

ئاخۆ زاڵبوونی ئەم هێمایانە تەنیا پێوەندیی بەوەچەخستنەوە هەبووە، هەروەک چۆن مامۆستای مێژووم بەردەوام بەم شێوەیە گاڵتەی پێ دەکرد؟ ڕەنگە هۆی لێکچوونی ئەم خەڵکە یەکجار ناشیرینانە لەم هێمایانەدا بگەڕێتەوە بۆ هەبوونی لێکچوونێکی دەروونی بەلەخۆگرتنی سیفەتی بەرهەڵستییەکی سەرسەختانە دژی گۆڕان. ئەگەر بنەماڵەی مرۆڤ بۆ ماوەی چەندین سەدە دەسەڵاتی ئەورووپای بەدەستەوە بووبێ ڕەنگە بەلای ئەو مرۆڤەوە گەشەکردنی کەسی ئەوەندە پێویست نەبووبێ، بەتایبەتیش ئەگەر جەماوەرەکە بڕوایان

بەمافی خواپێداوانەی پاشایانەوە هەبووبێ. ئەگەر بێینە سەر ڕووەکانی ئەمڕۆ بەگشتی و هی تۆش بەتایبەتی بەڵێ، تۆ دەتوانی لە ناو ڕووی ئەندامانی خێزانی خۆتدا، بەدوای ڕەسەنایەتیدا بگەڕێی. یان بەلێکۆڵینەوەیەکی ورد لە ڕوویاندا بەدوای شەرم و هێماکانی نەخۆشیدا بگەڕی. تۆ لە ڕێی بینینەوە دەتوانی ئاستی پێگەیشتنی کەسێک هەڵبسەنگێنی.

بۆچی خزمەکانیشت یان لانی کەم وێنەکانیان ڕیز ناکەی و بەوردییەکی زیاتر لەوەی جارانت سەیریان ناکەی. بڕوانە، بەڕاستی بڕوانە، ئاخۆ کام هێمای کوڵم تایبەتە بەخزمەکانی باوکت و کام یەک لە هێماکان ناسان. لە ڕووی وێنەکانەوە بزانە کە چۆن ئەندامانی بنەماڵە بەتێپەڕینی کات گۆڕاون. جا وێنەکان ڕەش و سپی بن یانیش ڕەنگی تۆ بەهۆی سەیرکردنیان ڕێزێکی نوێت بەرامبەر بەشێوازەکانی بەتەمەنداچوونی خۆشەویستەکانت لە لا دروست دەبێ. تۆ بەپلەی ڕووخوێنەوە ئەو سەرپشکییە دڵکەرەوەیەت هەیە کە هەروەها دەشتوانی ڕۆڵی کەسێکی خاوەن بۆچوونێکی دژەجەماوەری بگێری. بەزۆری مەبەستی ئاشکرای خەڵک لە سەیرکردن لە ڕووی ئەندامەکانی خێزانەکانیان بۆ دۆزینەوەی لێکچوونەکانە. ڕەنگە داپیرە بەقنەقن بڵێ: "ئێرنێستینی بچووک، لووتی ویندڵ و لێوی فرێدریکای پێوەیە"، هەروەک ئەوەی بڵێی ئەو وەسفە کتومت وابێ. هۆی وەسفکردنی کەسێک بەگوێرەی لێکچوونەکانی لەگەڵ خەڵکی تر دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک یان زیاتر لەم بیرۆکانە:

– جینەکان بەرپرسن لە شێوەی ڕووی مرۆڤ.

– جینەکان بڕیار لەسەر ژیانی مرۆڤ دەدەن.

– ئەگەری ئەوە هەیە کە تۆ "کتومت" لە ئەندامێکی تری خێزانەکەت بکەی.

– تەنانەت ئەمەشیان کە: چارەنووسی مرۆڤ بەهۆی باب و باپیرانییەوە لە هەموو ئاراستەیەکی گرینگی ژیاندا نەگۆڕە. بۆ نموونە هاتفیلدەکان چارەنووسیان جۆرێکە و هی مەککۆیسەکانیش بەجۆرێکی تر.

باوەڕم بەو شتە نییە. ئەگەر تۆش لایەنگرێکی ویستی ئازاد بی، کەواتە خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ یاریدەت بدا تا بیرۆکەکەت بسەلمێنی. دەستبەکار بە. ٥ لایەن بدۆزەوە کە بەهۆیانەوە ڕووی دایکە پەنجا ساڵانەکەت خۆی بەڕوویەکی بێ هاوتا دەنوێنێ و لە هی هیچ کام لە منداڵەکان و خوشک و دایک و باوکی ناکا. سێ لایەنیش لە لووتی ئێرنێستین دیاری بکە کە هیچ پێوەندییان بەباپیرە وێندڵەوە نەبێ. هەموو زانیارییەکان لەلای خێزانت کە گوێت بۆ شل دەکەن، ئاشکرا بکە.

پرسیار: با شتەکە ئاواش بێ، بەڵام ئاخۆ ناتوانرێ شێوازەکانی لێکچوون بدۆزرێنەوە؟

وەڵام: بەدڵنیاییەوە و، خۆشییەکە لەوەدایە کە مرۆڤ بەدوای ئەو شێوازانەدا بڕوا و لێکیان بداتەوە بەتایبەتیش ئەگەر باوبوون لەگەڵ ڕەسەنایەتی هاوسەنگ بکرێن. ئەگەر مەبەستی تۆ جینۆلۆجی بێ، مێژوویەک لەسەر بنەماڵەکە بنووسە کە لەگەڵ مێژووی ئەو وانانەی ژیاندا کە بەردەوام لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر گواسترابنەوە یەکانگیر بێ.

پرسیار: ئەی ئەگەر کەسێکی وەک من پێی وابێ تاکە ڕێگەی نەمریی مرۆڤ منداڵەکانین؟ ئاخۆ بیرکردنەوە لەوەی کە ئەو کەسانەی لە خوێنی مرۆڤن و بەو ڕادەی کە ئەو مرۆڤە پێشبینیی کردووە لە خۆی ناچن هەرەشە لە مرۆڤ ناکا؟

وەڵام: ئەگەر تۆ بەدوای ڕێگەی ئەوتۆدا دەگەڕێی کە منداڵەکانت لە تۆ بچن چ میراتێک لەوە باشترە کە ئەزموونی ژیانی خۆتیان پێ ببەخشی؟ چیرۆکیان بۆ بگێڕەوە و چیرۆکەکان بەو وێنانەی کە شێوەی گۆڕانت پێشان دەدەن دەوڵەمەند بکە. بۆیان باس لە ئازارەکانت و هەلومەرجی پێگەیشتنت بکە. وانەکانی ئەوان ڕەنگە لە هی تۆ جیاواز بن، هەروەک چۆن هێماکانی ڕوویان ڕەنگە لە هی تۆ جیاواز بن. لەگەڵ ئەوەشدا بیرەوەریی ئەو شتانەی کە تۆ لە بارەی مێژووی دەروونیتەوە باست لێوە کردوون، دەتوانێ بەردەوام سرووش بۆ ئەوان و بۆ منداڵەکانیان بێنێ.

## جوانی، کێ پێویستی پێیەتی؟

ئەی ئەگەر تۆ لە ئاراستەی پێچەوانەی نەوەسازیدا بی و لە بنەڕەتدا زیاتر گرینگی بەدروستکردنی خێزان بدەی نەک بەدڵنیابوون لەوەی کە ئاخۆ خێزانەکەت یادت زیندوو ڕادەگرن یان نا؟ ئەی ئەگەر تۆ بەڕاشکاوی نائومێدانە بەدوای هاوژینێکدا بگەڕێی؟ پێویستە خوێندنەوەی ڕوو ڕێگەی ئەوتۆی هەبێ تا یارمەتیت بدا وەک کەسێکی سەڵت ڕێز لەخۆنانت بنیات بنێی.

زانیت ڕێگەکان چین. لە ڕاستیدا دوو ڕێگە هەن. یەکێکیان پێوەندیی بەخۆتەوە هەیە. ئەوەی تریان پێوەندیی هەیە بەبابەتی هاوژوانێتی و چۆنیەتیی پێناسەکەت بۆ ئەم بابەتە.

سەرەتا با لە تۆوە دەست پێ بکەین. بۆ کەسێکی سەڵتی ئەم ڕۆژگارە خوێندنەوەی ڕوو وەک دەفتەری تۆماری ژوانەکان شتێکی پێویستە. بۆ ئاریشەی پاڵەپەستۆی کۆمەڵایەتییەکان، تۆ پێویستیت بەشتێکی زیاتر لە ڕێز لەخۆنانێکی ئاسایی هەیە. ئەو پروپاگەندانەی لەم سەردەمەدا سەبارەت بەسەنجراکێشی ڕووبەڕووی سەڵتەکان دەبنەوە،

زۆر تێکشکێنەرترن لە هەر کاتێکی تر لە مێژوودا. ئێمە بەو ڕیکلامانەی میدیا و ئەو وتانەی بۆ مکیاژ هانمان دەدەن و هەروەها بە بەرهەمەکانی گەشەپێدەری موو و نەشتەرگەریی جوانکارییەوە دەوره دراوین و تێک دەشکێین. ئاریشتگەرانی پرچ و نینۆک گیانیان دەردەچێ تا ئێمە زیاتر بۆ هاوسەرایەتی بشێێن. هەر با باس لەو دیزاینەر و فرۆشیارانە نەکەین کە تامەزرۆی ئەوەن لە ناو یانەیەکی تەندروستی یان ڕجیمگرتندا بمانچەپێنن.

زۆرێک لەم جوانیخولقێنەرانەی کە پێویستە پاداشت بکرێن، هەستێکی باشت بەرامبەر بەخۆت بۆ دەخولقێنن، بەڵام هەندێک جار کرۆکی کارەکانیان لە ڕاستیدا دەبێتە هۆی ئەوەی لە ناختدا هەستێکی خراپتر دروست ببێ. ئەو جۆرە جوانییە مێشکت کون دەکا.

بۆ نموونە ئێوەی خانمان، ئاخۆ هەرگیز پیشەگەرێکی ژێنەوەر بۆتانی ڕوون کردووەتەوە کە چۆن بارێک بدەن بەچاوەکانتان کە لە یەک نزیکتر یان دوورتر بەدەر بکەون؟ ئەی پڕترکردن یان تەنکترکردنی لێوەکانتان؟ ئەی مادام لە بنەڕەتدا ڕووتان چ کەموکورییەکی هەبووە؟

پیاوانی ڕێزدار، ساڵانە ژمارەیەکی زۆرتر لە ئێوە نەشتەرگەری پێست لووسکردنەوە و جوانکاری لووت دەکەن. تکایە.

سەڵتەکان ئاخۆ ئێوە لە سەرووی هەموو پاڵەپەستۆکانی تردا، خۆتان ناچار نەکردووە کە لە یانەیەکی تەندروستیدا ڕاهێنانی سەخت ئەنجام بدەن، یان سەبارەت بەپارەی ئەو ئەندامەتییەی کە هەرگیز سوودتان لێی وەرنەگرتووە هەستتان بەتاوان نەکردووە؟ ئەی پاڵەپەستۆ لەو لایەنەوە کە هاوژانەکەی ناو ئامێزت بۆ ئەوەی ببێ بەسەنەمی شانوشەوکەت پێویستە ڕوویەکی گونجاوی هەبێ؟

پێوەرەکانی کۆمەڵگە بۆ سەرنجڕاکێشبوونی تۆ و هاوژوانەکانت یارییەکی پلەوپایەداری لێ دەکەوێتەوە و بۆ ئەوە دانراوە کە خەڵکێکی پڕ بەهای کەمی تێدا براوە بێت. چەند جار تۆ کەسانی سەڵتی ترت بەپشتبەستن بەپێوەرەکانی جوانی کە خۆشت هەر لە بنەڕەتدا خاوەنیان نی، بە"دۆڕاو" لە قەڵەم داوە؟ ئاخۆ فیلم و وێنەکان بوونە هۆی ئەوەی کە تۆ بڕوا بەسیناریۆیەک بکەی کە هەمووی لەسەر ئەو بخولێتەوە تۆ "کەسەکە" بدۆزییەوە «ئەو کەسەی بڕیارە تەواوی خاڵەکانی جوانیی هەبن» و پاش ئەم ڕووداوە پاشماوەی ژیانت هەروەک چیرۆکی پەرییان بەرەو پێش بچێ؟

بۆ هەر پیاو یان ئافرەتێک کە لە بنەڕەتەوە پێی وابێ ڕوو و جەستەی هاوژوانێک هێمایەکی گرینگی شان و شەوکەتە ڕۆمانسێکی واقیعی وەک فانتازیایەکە. تۆ ئێستا ڕووخوێنەوەی کەواتە ئەمە بەبیرۆکەیەک دابنێ کە لە کولتوورێکەوە بۆ کولتوورێکی تر دەگۆڕێ. ئەو هێمانەی هەڵسوکەوت کە دەبنە هۆی ئەوەی ڕۆمانسێکی فانتازی بەهای ژیانی خۆی بزانێ، ڕەنگە تەنیا لە ڕوودا دەرنەکەون.

ڕاستە. ئەو زانیارییە سەبارەت بەڕوویەکی ویستراو لە ناو مێشکت چەقێنراوە ڕەنگە هاوڕێی تایبەتمەندیی ئەوتۆ بێ کە لە بەرژەوەندیی بەختەوەربوونتدا نەبێ. کەواتە ئەگەر تۆ هەستت بەوە کردبێ کە کەسێکی دوڕاوی ڕەنگە ئێستا کاتی ئەوە هاتبێ یارییەکی پلەوپایەدار بناسییەوە کە تێیدا ناتوانی سەرکەوتوو بی. خۆت ئامادە بکە.

– هێڵ بەژێر ئەو هێمایانەی هەڵسوکەتدا بکێشە کە حەزیان پێ دەکەی. گرینگ نییە ئەگەر ئەم هێمایانە هیچ پێوەندییەکیان بەو هێمایانەی ڕووەوە نەبێ کە بەپێی بەرنامە داڕێژراوەکەی ناو مێشکت پێویستە داوایان بکەی.

– لەسەر کارتێکی پێرستی سێ لەو هێمایانەی ڕوو ڕیز بکە کە هاوڕێن لەگەڵ ئەو سیفاتە دەروونییانەی کە تۆ حەز دەکەی لە ناو هاوژوانەکەتدا بن: هێمای وەک سەرە لووتێکی تۆپەڵانی، پێڵووی تەنک، ڕووبەرێکی گەورەی یەکەمایەتیی سێیەم، چەناگەیەکی گەورەی پان، گوێی زل یان هەر شتێک کە لە ڕووی دەروونییەوە بتگەشێنێتەوە.

– ئەم کارتە لەگەڵ خۆت بگێڕە. لە ناو بەرک یان جزدانتدا هەڵی بگرە. با ئەو کارتە هێمایەک بێ بۆ بیروبۆچوونێکی نوێ: کێ پێویستیی بەو شتەیە کە بەجوانی ناو دەبردرێ؟

تاکە پێوەرێکیش نییە بۆ ئەو ڕووەی کە خۆی بەڕووە تەواوەکە دەنوێنێ. بەڵام ئەوە بۆ تۆ شتێکی یەکجار گرینگە کە هاوژینەکەت گوێت لێ ڕابگرێ. هیچ واتایەکی نییە تۆ ئەو هاوژوانانەت پێ پەسندتر بن کە خاوەنی گوێی بچووکی خنجیلانە و شتی لەم جۆرەن. بەبڕوای زۆرێک لە گەنجان پێویستە ئافرەتێکی شۆخ بەو جۆرە بێ کە "تۆم وۆڵف"ی نووسەر بە"کەسێکی تەقەلاکەر بۆ بێ کەموکورتییەکی نزیکەیی" ناوی دەبات. ئەی ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێ نرخی ئافرەت پێچەوانە دەگۆڕێ لەگەڵ قەبارەی لووتی و ڕاستەوانە دەگۆڕێ لەگەڵ قەبارەی سینگی؟

ژیانی واقیعی زۆر وردەکاریی تێدایە. بۆ ڕێز لە خۆنانی هاوژوانەکەت و «هی خۆشت کە ئەمەش بۆ بەرژەوەندی خۆتە» کۆمەڵە ستاندارێکی تایبەت بەڕووخوێنەوان دابنێ. تەنیا سەیری ڕوو مەکە. لێی ورد بەوە.

## ١٥

## چۆن خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ لە پیشەکەتدا یارمەتیت بدا

کارەکە ئاسانە. تۆ شارەزاییت لە ڕاستییەکان و تایبەتمەندییەکان و لەو شێوازە تەواو نوێییەی سەیرکردنی خەڵک پەیدا کردووە. بێگومان ئەوەش سوودی بۆ پیشەکەت دەبێ. بۆ نموونە دەستپێکەران بڕوا بەخۆبوونیان زیاتر دەبێ. ئەگەر تۆش وەک فێرخوازێکی نموونەییم بی ئێستاکە هەروەک چڵە تەماتەیەکی تازە ئاوردراو لە ڕۆژێکی گەرمی مانگی ئابدا لە ناو ڕێز لەخۆناندا خەریکە دەخوسێییەوە.

گرینگ نییە بۆ دابینکردنی بژێویی خۆت چ جۆرە زانیارییەکت وەرگرتبێ، لەبەرئەوەی ئێستا تۆ خاوەنی کرۆکی ئەو زانیارییەی کە لە پێوەندیی ڕووت بەشێوازی کەسیتەوە دەکۆڵێتەوە. بۆچی نابێ مرۆڤ هەم بەهۆی ڕووی سروشتیی خۆی و هەم بەهۆی بەهرەکانییەوە هەستێکی باشتری بەرامبەر بەخۆی هەبێ؟ ڕێز لە خۆنان ناوێکە بۆ ئەم شانازییە ڕەواییەی تۆ هەستی پێ دەکەی. تەنانەت ئەگەر خوێندنەوەی ڕوو بەدەر لەم جۆرە گوڕوتینە دەروونییە سوودێکی تری لە ژیانتدا نەبێ، هێشتاش هەر بەشتێکی بەسوود هەژمار دەکرێ. بەڵام سوودەکانی زانینی زانیاری لە بارەی خوێندنەوەی ڕووەوە ڕەنگە زیاتر لەوە بن کە مرۆڤ بەشێوەیەکی کاتی هەستێکی باشتری لە لا دروست بێ، سوودی وەک پارە پەیداکردنی زیاتر. ئێمە باسمان لەوە کرد چۆن خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ برەو بەپیشەی فرۆشیاری بدا. لە سەرووی ئەمەشەوە ئاوڕدانەوەیەک لە بواری پێشکەوتووی ڕوو، خوێندنەوەی پسپۆڕانە شتێکی سەرنجڕاکێشە. لەم بوارەدا تۆ دەتوانی لە نێوان ئەو ١٠ پسپۆڕییەی ئێمە لەم بەشەدا دەیانخەینە ڕوو یەکێک یان چەند دانەیەکیان هەڵبژێری. ڕەنگە ڕێنوێنیکارت لە قۆناخی خوێندنی ئامادەییتدا بەتۆی نەوتبێ پارە لە ڕێی ڕوو خوێندنەوەوە وەدەست دێ، بەڵام بزانە کە ئەوە شتێکی ڕاستە.

لەگەڵ ئەوەشدا پێش ئەوە من دەمەوێ لەوە دڵنیا ببمەوە کە تۆ شارەزاییت لەو تەکنیکە هەیە کە خوێندنەوەی ڕوو دەگۆڕێ بۆ چەکێکی تەنانەت بەهێزتر تا بەهۆیەوە لە ناو کارەکەتدا بڕوابەخۆبوونت زیاتر بکا. ئەگەر ئێستا خەریکی هەر کارێک بی یان ئەگەر دانەمەزراو بی و یانیش بەنیازی دامەزران بی، ئەم تەکنیکە هەر بەکەڵکت دێ.

## ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خاڵەکانی هێزی خۆت

ئەگەر بتوانی پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان بەهرەکانت و ڕووتدا بدۆزییەوە ڕەنگە بڕوابەخۆبوونت زیاتر بێ. بەشێوەیەکی بەشەکیش ئەم کارە دەوەستێتە سەر ئەو شارەزاییانەی کە لە ناختدا تووشی سەرسڕمانت و دەکەن. ئاخۆ لەوەتەی خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە چەند جار دەنگێک لە ناو ناختدا وتوویەتی: واو!

تۆ لە ناو دڵتدا وتووتە: "بەڕاستی من لەوەدا باشم!" جا چ ئەم شتە کارکردنی بەکۆمەڵ بێ، یان کاری بەجیا بووبێ، یان دەستپێکردنی پرۆژەی نوێ و بەنیوەچڵی بەجێهێشتنیان بووبێ، کۆمەڵێک لەو بەهرە هەرە مەزنانەی لە ڕووی تۆدا دەرکەوتوون دەبنە هۆی ئەوەی لە ناختدا بریسکەیەکی ناسینەوە تیشک بداتەوە. ئەو ساتانە "ساتەکانی کۆداک"ی ڕۆحین. ڕەنگە تۆ پاشان لە بیرت بچێتەوە چ شتێک بووەتە هۆی وتنی ئەم ئاها!یە. بەڵام پێم وایە کە ڕۆحی تۆ وێنەکانی واقیعی ڕاستەقینەی تۆی کۆ کردوونەتەوە. خاوەنی ئەم ئەلبومە پڕ وێنەیە خۆتی و هەمیشە لە لات دەمێنێتەوە. تەکنیکێکی دیاریکراو کە پێوەندیی بەڕوو خوێندنەوەوە هەیە، یارمەتیت دەدا بۆ ئەوەی هێزەکانی دەروونیی خۆت لەم ئەلبومەوە ڕابکێشییە دەرەوە. تەکنیکەکە پێی دەوترێ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خاڵەکانی هێزی خۆت. ئەگەر تۆ بتوانی لە کاتێکدا کە پێویستییەکی زۆرت بەبڕوابەخۆبوون هەیە سوود لەم تەکنیکە وەربگری ئەوە خاڵێکی ئەرێنییە. ئەگەر ڕەچاوی ئەو ڕاستییە بکەی کە لە کاتی نەهامەتیدا بەدەگمەن ئاراستەی کارەکان بەرەو باشبوونەوە دەڕوا، جگە لە حەزکردن لەم تەکنیکە هیچ چارەیەکی ترت نییە. تەکنیکەکە بەم شێوەیەیە:

١- بۆ هەستکردن بەگۆڕانکاری، لە دەربڕینەکەی خۆت ورد بەوە

لە ناو نەینۆکدا لە ڕووی خۆت ورد بەوە. تیشک بخە سەر دەربڕینەکە. ئەو کاتانەی تووشی خەمۆکی دەبی، دەربڕینەکەت باشترین کەرەسەی پێویست بۆ ئەم بەشەی تەکنیکەکە دابین دەکا. «نزیکەی ٣٠چرکە» لەو دەربڕینە قووڵ بەوە. ئاخۆ بێزارکەرە؟ دڵشکێنەرە؟ ڕوویەک دەتوانێ هەزاران وردەکاری لە چەرمەسەرییەکانی مرۆڤ پێشان بدا.

ئەم جارە چیت بەسەر هاتووە؟ بڕوانە. پاشان لەگەڵ ڕووت بدوێ: "هەر بەلامەوە گرینگ نییە لەبەرئەوەی ئەمە رووی ڕاستەقینەی منە".

٢- ئەندامێک هەڵبژێرە تا لێیەوە دەست پێ بکەی

هەڵبەتە رووی ڕاستەقینەی تۆ برێتییە لە ئەندامەکانی رووی سروشتیت. بچووە سەر هەر بەشێکی ڕوو کە زیاتر سەرنجت ڕادەکێشێ. ئەگەر باری دەروونیت شڵەژاو بێ ڕەنگە نەویستراوترین بەشی رووت سەرنجت ڕابکێشێ. ڕەنگە ئەم بەشە زیپکەیەک بێ یان چرچولۆچێک بێت یان هەر شتێکی سەر ڕووت بێ کە بەهەر شێوەیەک گەورە یان بچووک یان نائاسایی بێ. ئاوڕ لە نزیکترین هێمای سەرسڕمێنی ناو ڕووت بدەوە. یان ئەگەر هەست دەکەی یەکجار بوێری هەر لەگەڵ هێمایە نەویستراوەکە بەردەوام بە.

٣- بەدەست و دڵ کراوەییەوە پەسنی بەشە هەڵبژێردراوەکە بدە

بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئاخۆ ئەو بەشەی ڕوو کە سەرنجتی ڕاکێشاوە بەشێکی پەسند یان نەویستراو بێ زۆر پەسنی بدە. بەڵێ، تۆ دەتوانی ئەم کارە بکەی.

بۆ نموونە ئەو کاتەی هەستم بریندار دەکرێ کیسەکانی ژێر چاوم سەرنجم ڕادەکێشن. کیسە و چرچولۆچەکان بەگوێرەی شوێنەکانیان لە ناو ڕوو هەڵگری واتای تایبەتن. لێکدانەوەی واتەکانیان بەشێکە لە کتێبی " Wrinkles Are God's Makeup – ژاکاوی خەملی خواوەندییە" "نیگەران مەبە. ئەم کتێبە پاشکۆییە باس لە هەموو ئەو شێوازانە دەکا کە ڕوو بەهۆیانەوە بەتێپەڕبوونی کات دەگۆڕێ و چرچولۆچ لە ناو ئەم کۆمەڵە شێوازانەدا بەشێوەیەکی سەرسڕهێن پشکێکی زۆر کەمی بەرکەوتووە". هەروەک دواتر لە چرچولۆچەکاندا دەیخوێنییەوە واتای کیسە پفەڵبووەکانی ژێر چاو برێتییە لە بەسەختی هەوڵدان بۆ ڕوانینێکی قووڵتر. "سوپاس بۆ خوا کە من ئەوەندە پەرۆشم بۆ بینینی قووڵترین واقیعی ژیان و چەند بەختەوەرم کە ئەم سیفەتە تەنانەت لە ڕوویشمدا ڕەنگی داوەتەوە." ئەمە تێبینییەکی گونجاوە کە پێویستە دانی پێدا بنرێ. لەو سەرلەبەیانییانەی کە کیسەکان یەکجار گەورە دیارن پەسنەکەی خۆم زیاتر دەگونجێنم. "پێویستە من ئەمڕۆ تەنانەت زیاتر لە جارانیش واقیع ببینم. ئاخۆ ئەوە تایبەتمەندییەکی بەنرخ نییە."

٤- بەردەوام بە

پاش ئەوەی تۆ پەسنی ئەندامە "نەویستراو"ەکەت دا مەچەقێ. دەستبەجێ ئاراستەی

سەرنجت ڕووەو یەکێک لەو بەشانەی ڕوو بکە کە بەردەوام خۆشت ویستووە. ئەگەر نەتزانی کامیان هەڵبژێری ئەوەیان هەڵبژێرە کە یەکجار جیاکەرەوەیە.

٥- لە دڵەوە پەسنی بەشە هەڵبژێردراوەکە لە بدە

واتای ئەو بەشە جیاکەرەوەی ڕوو لێک بدەوە. واتاکەی بەهاوارکردن بەگوێی جیهاندا بچرپێنە «بەڵام ئەگەر لە ناو خەڵکدا بی وا باشترە بەمەندییەوە سەرسەنگینانە بیدرکێنی».

نموونەیەکی تر لەبارەی خۆم: جیاکراوەترین هێمای ڕووی من ددانەکانی پێشەوەمن. لەجیاتی ئەوەی کۆتاییی ددانەکانی من هەروەک کۆتاییی زۆربەی ئەو ددانانەی بینیوتن ڕێک بن، یەکجار چەماوەن. لە بەشەکانی پێشتری ئەم کتێبەدا بەپێویستم نەزانی ئاماژە بەواتای کۆتاییــە چەماوەکەی ددانەکانی پێشەوە بدەم لەبەرئەوەی ئەم هێمایە زۆر دەگمەنە. بەڵام ددانی چەماوە پێوەندیی هەیە بەوەرگرتنی وانەکانی ژیان لە ڕێی دڵەوە. کە ئەمەش بەپێچەوانەی چییە؟ زۆربەی خەڵک بەگوێرەی کۆتاییــە ڕێکەکانی ددانەکانی پێشەوەیان، وانە سەرەکییەکانی ژیانیان لە ڕێی مێشکەوە فێر دەبن. بەڵام ئێرەیی بەئەوانەمان مەبە کە کۆتاییی ددانەکانیان چەماوەیە. ئێمە زیاتر لە ئێوە پێویستیمان بەدەسرە هەیە. ئەمەش تێبینییەکی وزەبەخشە کە دەتوانم سەبارەت بەخۆم و ددانم بیدەم. "لە هەموو ژیاندا پێویستە من لە ڕێی دڵەوە وانە وەربگرم. سوپاس بۆ خوا لەبەرئەوەی ئەمەش هەلی بۆم ڕەخساندووە تا بتوانم سیستەمی ڕوو خوێندنەوەم پەرە پێ بدەم".

٦- بەپرسیارکردن زیاتر قووڵ بەوە

لە خۆت بپرسە "لەو هەموو بەهرانەی لە ڕووی مندا کۆبوونەوە ئاخۆ لە کاتی ئێستادا کامیان زیاتر لە هەموویان پێویستە بۆم؟". هەناسەیەکی قووڵ یان دووان وەربگرە تا ناو سینگت پاک بکەیەوە. ڕەنگە بشتوانی مێشکتی پێ ساف بکەیەوە.

٧- گوێ بگرە

وەڵامێک لە ناو مێشکتدا خۆی قووت دەکاتەوە. کاتێک ئەمە ڕووی دا، سەرنج بدە. چاوەڕێی وەڵامێکی "ڕەها" مەکە. لەسەر ئەو وەڵامی سرووشی بۆت هێناوە کار بکە.

بۆ نموونە بڵێ من بەنیازم لەگەڵ کاربەدەستێکی کۆمپانیای Fortune 500 سەبارەت بەکردنەوەی خولەکانی ڕاهێنان گفتوگۆ بکەم. هەرچەندە وا بزانم پرۆسەکە لە کەشێکی دۆستانەدا بەڕێوە دەچێ، بەڵام نەختێک هەست بەشڵەژان دەکەم. ئەو وشەیەی کە دەربڕی پێویستییە سەرەکییەکەی منە بۆ کاتی ئێستا بریتییە لە"هێز".

٨- لە ناو ڕوودا پێویستییەکەت بدۆزەوە

بزانە کام لە هێمایەکانی ڕووت زیاتر لە هەمووان لەگەڵ پێویستییەکەی تۆدا دەگونجێن، لەبەرئەوەی پێویست نەبووە تا ئەم بەشەی کتێب زانیارییەکان لەبەر بکەی، ڕەنگە لێرەدا پێویستیت بەیارمەتی هەبێ. بەردەوام بە لە گەڕان بەدوای هێمایەکان و تا ئەو کاتەی نەتدۆزیبنەوە واز لەم کارە مەهێنە.

٩- دان بەبەهرەکەت بنێ

ئەو هێمایەی پێوەندیی بەپێداویستییەکەت هەیە لەسەر ڕووت بدۆزەوە. لەسەری دەست بەکار بە. گفتوگۆ وزەبەخشەکە دەست پێ بکە. بۆ نموونە بڵێ: "برۆ زۆر کەوانییەکانی من ئاماژە بەشێوازی بیرکردنەوەیەکی بەرێوبەر ئاسا دەدەن. لە کاتی بەشداریکردن لەم کۆبوونەوەیەدا لەجیاتی ئەوەی داهاتە زۆرەکەی کاربەدەستان و نووسینگە خەیاڵییەکانیان تووشی دڵەڕاوکێ بکات، سەیری شێوەی برۆیان دەکەم. بڕوا ناکەم شێوەی گۆشەی برۆی هیچ کامیان لە هی من جوانتر بێ. بۆیە جێی سەرسڕمان نییە، من لەچاو ئەوان سەربەش بم. لە کۆبوونەوەی ئەمڕۆدا دەسکەوتی باشم چنگ دەکەوێ".

١٠- لە ناو واقیعدا لەنگەر بخە

بۆ پاشماوەی ڕۆژەکە بەرنامەڕێژی بکە. لە ناو نەینۆکدا سەیری بەشە هەڵبژێردراوەکەی ڕوو بکە. بەدەستی ڕاستت بەنەرمی نەوازشی بکە. وتە وزەبەخشەکانت بدرکێنە. پاشان ئەم کردارانە دووبارە بکەوە. واتە سەیر بکە و بیلاوێنە و دانی پێدا بنێ، بەڵام لە دووەم جاردا دەستی چەپت بەکار بهێنە.

ئێستا تۆ ئامادەییت هەیە. لەو ڕۆژەدا هەر کاتێک پێویستیت بەپاڵپشتی هەبوو دەست بەسەر ئەو بەشەی ڕوودا بخشێنە.

پرسیار: ئەی ئەگەر ئەو دەربڕینەی لە ناو نەینۆکدا دەیبینی تەنانەت بووە هۆی زیاتربوونی خەمۆکێ؟ بۆ نموونە ئەم نیگایەی ناو چاوم کە هەندێک جار بەنیگای گوجیلەیەکی تێ هەڵدراو دەچێ، خەمۆکێم زیاتر دەکا؟

وەڵام: ئەگەر پێویستی کرد سەعاتەکەت بەکار بهێنە بۆ ئەوەی لە بیرت نەچێ زیاتر لە٣٠ چرکە لە دەربڕینە سەرەتاییەکەت قووڵ نەبییەوە «پێ دەچێ ٣ چرکەش بۆ تۆ زۆر بێ» و یەکسەر بچۆ سەر هەنگاوی سێیەم.

پرسـیـار: هێـشـتـاش تێ نەگـەیشـتـووم چ شـتـێکی ئەم تەکنیکەکـەی تۆ کـە بە"ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خاڵەکانی هێزی خۆت" ناوی دەبەی، لە گفتوگۆیەکی وزەبەخشی ئاسایی زیاترە؟

وەڵام: گرینگترین جیاوازییەکەی لەوەدایە کە تۆ بەهۆی گفتوگۆیە وزەبەخشەکەی تایبەت بەبەشێکی ڕووت لەنگەرەکەت دەهاوێژی. لەنگەرهاوێشتن زاراوەیەکە کە لە سایکۆلۆجیادا بەکار دێ. من بۆ یەکەم جار لە چوارچێوەی بەرنامەڕێژیی زمانەوانیی دەماری « بە LNP کورت کراوەتەوە» ئاشنای ئەم زاراوەیە بووم. بیـر لە پاپۆڕێک بکەوە کـە لـەنگەر دەهاوێژێ تاوەکو خۆی لە شوێنێکی ویستراودا جێگیر بکا. سەرنجی تۆش هەروەک پاپۆڕێک دەشێ بەهەر ئاراسـتـەیەکدا بڵاو بێـتـەوە. تۆ لە ڕێی لەنگەرهاوێشـتنەوە دەتوانی ئاراسـتـەی سەرنجت جـێگیر بکەی. کـەواتە شـوێنێکی بەرفـراوان بدۆزەوە تا لەنگەرەکـەت بهاوێژی و کاتێک لە ئەنجامی ئەمانەدا میشکت بەکار هێنا، چێژ لە بارەکە وەربگرە.

ئاخۆ چ شـوێنێک بۆ لەنگەرهـاوێشتن هەڵدەبژێری؟ ژمـارەیەک سیسـتـەم لە بەردەستن بۆ وەرگرتنی زانیاری لەبارەی ئەو خاڵانەی هێز کە لە ژیاندا مرۆڤ دەتوانێ لەسەریان خۆی جـێگیـر بکا _ ئەمـانەش بریتین لـە سـیـسـتـەمـی تایپکردنی Myers-Briggs و هەروەها گرافۆئەنالیسیس و Ennegram و فەلەکناسیی قووڵ "کە جیایە لەو کەلووانەی بەکورتی لە ناو ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەکرێنەوە و زیاتر لەوەی زانیارییەکی ڕاستەقینە پێشکێش بکەن بۆ پێکەنین دەنووسرێن". هەر یەک لەم سیستەمانە بەوردی بخوێنەوە تا زانیاریی بەسوودت دەست بکەوێت. لـە زۆر باردا ئەو زانیارییـانەی وەریان دەگری، زۆر لەو زانیارییـانە دەچن کە لە نهێنییەکانی ڕوو خوێندنەوەدا دۆزیوتنەوە.

لەگـەڵ ئەوەشـدا خـوێندنـەوەی ڕوو بەهۆی لـەنگەرهـاوێشـتنـەوە سـوودێکی بێ هـاوتا دەگەیەنێ لەبەرئەوەی بەهۆی ئەم لەنگەرهاوێشتنەوە تۆ دەتوانی پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نیوان سیفاتە باشەکانی خۆت و بەشێکی ڕووتدا بدۆزییەوە. تۆ دەتوانی ڕاستەوخۆ لە ناو نەینۆکدا ئەم بەشـە بنەڕەتیـیەی ڕووت ببـینی و دەسـتی لێ بدەی و لەگـەڵی بدوێی. کـاتی بەکارهێنانی تەکنیکی لەنگەرهاوێشتنەوە تۆ دەتوانی هەرسێک لەم کارانە هـاوکات ئەنجام بدەی کە ئەمەش کارەکەت سێ ئەوەندە کاریگەرتر دەکا.

ئێستا کە تۆ شارەزای ئەوە بووی کە چۆن لە ناو ئەو سیفـەتانـەی کە بۆ سـەرکەوتنت پێویستن لەنگەر بهاوێژی کاتی ئەوە هاتووە کۆمەڵێک شێوازی کارەکیی خوێندنەوەی ڕوو وەربگری کـە ڕەنگە بەهۆیانەوە ژیانت پێـشـڤـەچوونێک بەخـۆیەوە ببـینێ یان تەنانەت لە

دۆزینەوەی هەلی کارێکی کاتەکی یارمەتیت بدەن. ئێمە ١٠جۆر پسپۆڕیی جیاواز باس دەکەین و بەپوختــە زانیــارییــەک لەبارەی چۆنیــەتیی دۆزینەوەی کــارێک و ڕاهاتن لە خوێندنەوەی ڕوو لەسەر ئاستێکی پسپۆڕانە، کۆتاییی بەزانیارییەکان دێنین.

## هەلی کاری بۆ ڕوو خوێنەران

- ڕاوێژکاری بواری فرە جۆریی مرۆیی
- ڕاوێژکاری سامانە مرۆییەکان
- چارەسەرکەری ناکۆکی
- خوێنەوەی جینەکان
- بەزمگێڕ
- خوێنەوەی توانا شاراوەکانی مرۆڤ لە ژیاندا
- خوێنەوەی پیشکەوتنەکانی ژیان
- خوێنەوەی تەبایی
- ڕاوێژکاری نەشتەرگەریی جوانکاری
- شرۆڤەکاری کۆمەڵایەتی

## ڕاهێنەری فرەجۆریی مرۆیی

چاودێرانی هەڵبژاردن پێت دەڵێن کە کەس هەست بەوە ناکات "لە نێوان مرۆڤەکاندا جیاکاری بکا". ئەمە بەردەوام گرفتی کەسی بەرامبەرە.

بەڵام ئەمرۆ تەنگژەکانی ڕەگەزی لە ئەمریکادا گرفتی هەموو تاکەکانە. تۆ وەک ڕووخوێنەوە دەتوانی لە چارەسەرکردنی گرفتەکە بەشداری بی. بەو کۆمپانیا ناوەخۆییانەی کە لە بواری فرەجۆریەتیی مرۆیی چالاکن، ڕابگەیەنە کە تۆش بەهۆی کارەکەتەوە دەتوانی بەشدار بی لەو خزمەتگوزارییانەی ئەوان پێشکێشیان دەکەن.

ڕاهێنانی خەڵک لە فرەجۆریەتیی مرۆیی بەواتای ڕاهێنانی خەڵکە لەوەی کە لە جیاتی ئەوەی کەسی بەرامبەریان وەک کلێشەیەک ببینن وەک مرۆڤێک سەیری بکەن. لەم کارەدا چی تر ڕێگە بەخەڵک نادەی لەلای خۆیانەوە گریمانە دابنێن بگرە تۆ پێوەندیی دۆستانەیان لە نێواندا دەخوڵقێنی. لە ڕاستیشدا بۆ دەستپێکردنی ئەم جۆرە ڕاهێنانە چ شوێنێک

باشترە لەو شوێنەی کە خەڵک بەواتای وشەوە یەکتری دەبینن؟ خەڵک فێری ئەوە بکە کە ئاستی تێگەیشتنی خۆیان لە ڕەنگ و کلێشەسازییەوە بەرزتر بکەنەوە. بەرپەرچی خەڵکەکە بدەوە. "ئێوە وا بیر دەکەنەوە هەروەک مرۆڤ سەیری یەکتری دەکەن، وا نییە؟ بەڵام نازانم ئاخۆ ئێوە هەستتان بەفرەجۆریەتیی مرۆیی کردووە یان نا. ئەگەر هەستتان پێی نەکردبێ ئەوا هەر کلێشەکان دەبیننەوە". با بزانین ئەوە ڕاستە؟ هەر ئێستا کەسێک دەستنیشان بکە. کەسێکی بەدەر لەم گرووپە کە باش شارەزاییت لێی نەبێ. لەمیانەی ١٠ خولەکدا هەرشتێک لەبارەی ڕووی ئەو کەسە بەخەیاڵتدا بێ، بینووسە. لەگەڵ یەکتر قسە مەکەن. ڕاستەخۆ لە ڕووی کەسەکە ورد بەوە. ئینجا تێبینییەکانت لەبارەی ڕوویەوە بنووسە. هەر تێبینییەک وەک نهێنییەک دەپارێزرێ.

پێشبینیی ئەوە دەکەم، تۆ بتوانی تەنیا لیستە زانیارییەکی بچووک و ساکار دابڕێژی. هۆی ئەم پێشبینییەشەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە زۆرجار کە داوام لە خەڵکی ئاسایی کردووە ئەم جۆرە زانیارییانە بنووسنەوە لیستێکی ئاوایان ڕادەست کردوومە. ئەگەر مرۆڤ نەزانێ چۆن بەشێوەیەکی سیستەماتیکی زانیاری لە ڕووە هەڵکرێنێ، ئەوا جگە لە دەربڕین هیچ شتێکی تر ناخوێنێتەوە و پاشان خەملاندنێکی گشتی و ئۆمێدبەخش پێشکێش دەکا. "پێ دەچێ کچێکی باش بێت. بزەیەکی دڵکێشی هەیە".

ئێستا تۆ دەتوانی وەک پیشەیەکی ڕاستەقینە سوود لە خوێندنەوەی ڕوو وەربگری و زانیاریی قووڵ و پروردەکاری بپاڵێوی.

ڕاهێنانەکەت بەباسکردنی ئەو بەشانەی ڕوو کە هەڵگری واتایەکی عاتیفیی بەبەراورد کەمترن، واتە ئەندامی وەک برۆ یان ڕووبەرەکانی یەکەمایەتی دەست پێ بکە.

بەر لەوەی باسی بابەتی گرینگی دژایەتی بکەی، کارێکی ئەوتۆ بکە کە گرووپەکەت پێ بکەنێ. ئەو کاتەی کە باس لە لووت دەکەی تەئکید لەوە بکەوە کە ئەو لووتەی باسی دەکەی تەنیا لووتی کەسانی ڕەش پیست یان لووتی فیلیپینییەکان یان لووتی کەسانی پلە بەرزی کۆمەڵگە نییە. پێشانیان بدە کە چۆن خەڵکێکی بەڕواڵەت سەر بەدوو گرووپی جیاواز کتومت خاوەنی هەمان هێمایەکانن، لە کاتێکدا ئەو کەسانەی وەک ئامۆزای یەکترین هێمای یەکجار جیاوازیان هەیە.

لەگەڵ باسکردنی هەرجۆرێکی ڕوودا، ئەندامانی گرووپەکەت لەسەر هەمان ڕێباز ڕێنوێنی بکە. ڕووی ڕاستەقینە ببینە، باس لە ڕووی خۆت و ڕووی ئەوانی تر بکە و خۆت فێری ئەوە بکە کە لێکدانەوەکانت بەگوێرەی شیوازی کەسی بن.

بەڵێ، بەشێوەیەکی نمونەیە لە ڕاهێنانی فرەجۆریەتیی مرۆییدا، جەختەکە زیاتر لەسەر جیاوازییەکانی زەمینە و کولتوورە. بەڵام لە ڕوو خوێندنەوەدا وردەکاریی لەم جۆرە وەک بەرهەمێکی لاوەکیی لێکدانەوەکانن. ئەو کاتەش کە ئەم وردەکارییانە دەرکەوتن باسیان لێوە بکە. بۆ نموونە بەدڵنیاییەوە کارکەرانی فرەجۆری کارگەیەک بەگوێرەی کولتووریان بیربۆچوونی جیاوازیان هەیە، لەبارەی چاوبڕینە ناو چاوی یەکتر. کێ فێری ئەوە کراوە کە خۆی لە ئەنجامدانی ئەم کارە بپارێزێ؟ کێ بەپێچەوانەی ئەمەوە ڕاهاتووە؟

بەڵام هەروەک ئاگەدارکردنەوەیەک، ئەوە بزانە کە پسپۆڕانی بواری ڕاهێنان لە فرەجۆریەتیی مرۆیی پێویستە کارامە بن. کارامە لە بەڕێوەبردنی گرووپ و هەروەها پێویستیشە هەستیار و بوێر بن و بەڕادەی پێراگەیەنەرانەوە کاریگەرییەکی زۆریان هەبێ. لەگەڵ پسپۆڕێکی بواری ناوبراو تیمێک پێک بهێنن. لەجیاتی ئەوەی هەوڵ بدەی ڕاستەوخۆ بچییە ناو بواری ڕاهێنان لە فرەجۆریەتیی مرۆیی و شێوە زۆر کۆنباوترەکەی ڕاهێنانی ئەم کەسە لە خۆتەوە بەتەواوی بگۆڕی، پێویستە شتێکی نوێی بۆ بخەیە سەر. هەروەها خۆت فێری ئەو شێوازانە بکە کە سارێژبوونەوەی عاتیفی ئاسان دەکەن. هەرکەسێک لە ئەمریکادا گەورە بووبێ، بێ بەش نەبووە لەو کلێشەسازییە نەرێنییانەی کە کە لە نەستی مرۆڤدا دەچەسپن. بۆیە پرۆسەی سارێژبوونەوەکە دەتوانێ ئەو هەستە دڵتەزێنەرانەیە بروێنێ کە ڕەنگە بەهۆی پیشەی ڕاهێنەرایەتییەوە ناچاری ڕووبەڕوویان ببییەوە. کارەکە بەتەنیا دەست پێ مەکە. بەڵام تەنیا لەبەرئەوەی ڕەنگە ڕاهێنانی خەڵک لە فرەجۆریەتیی مرۆیی بەشێوەیەکی پڕ ئازار، کارێکی جیدی بێ خوێندنەوەی ڕوو هەلێکت بۆ گاڵتەجاڕی بۆ دەرەخسێنێ. ئەگەر بەپیشەی ڕاهێنەری فرەجۆریەتیی مرۆیی کار بکەی، ئەوا جیاوازییەکی گەورە دەخوڵقێنی. لە کاتێکدا کە خەڵک فێری ناسینەوە و لێکدانەوەی واتای ئەندامەکانی ڕوو دەکەی، ئاخۆ چ شتێکی تریشیان فێر دەکەی؟ پەیامە شاراوە و جوانەکەی تۆ ڕەنگە ئەوە بێ:

"مرۆڤەکە ببینە. لەگەڵ مرۆڤەکە بدوێ".

بەشێوەیەکی نموونەیەی مەبەست لەو ڕاهێنانەی لەم سەردەمەدا سەبارەت بەفرەجۆریەتیی مرۆیی پێشکێش دەکرێ بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی خەڵکە بەرامبەر بەشێوەی ژیان و هۆکاری وەک نایەکسانیی کۆمەڵایەتی و گرفتی ئابووری و ترسی ڕەگداکوتاو و چاوەڕوانییەکانی خێزان و زمان و جیاوازییەکانی تری کولتووری. لەگەڵ ئەوشدا ئەگەری ئەوەش هەیە کە بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاریی خەڵک سەبارەت

بەشێوازی کەسی ڕەنگە بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤ یارمەتییەکی تەنانەت زیاتریشی هەبێ. لەگەڵ گرووپەکەتدا باس لەوە بکە کە ئاخۆ چ کەسێک پێویستیی بەخۆئاشکراکردنەوە هەیە بەپێچەوانەی ئەو کەسەی کە متمانەی بەم کردەوەیە نییە. ناکۆکییە بەردەوامییەکانی نێوان خەڵکی خاوەن گوێی گۆشەتیژ و ئەوانی تری خاوەن هێمای پێچەوانە دیاری بکە. باس لە جیاوازیی خەڵکی خاوەن شێوە جیاوازەکانی کوڵم بکە و هەروەها ئەو خەڵکانەی بەگوێرەی پێرەوەکان هەڵسوکەوت دەکەن بەپێچەوانەی ئەوانەی ئەم کارە دەیانخنکێنێ.

هەروەها باس لە بەهای هەریەک لە شێوازەکان بکە. پێویستە هەر هەموومان بێندرێژ بین و ئەم خەسڵەتەمان لە بەردەم ئەو کەسانەی شێوەی کارکردنیان جیاوازە بنوێنین. ئەمرۆ کۆمپانیاکان ئاگەدارن لەوەی هێزەکارییە فرەجۆرەکەی مرۆڤ کە ڕووەو زیادبوونە پێویستی بەتێگەیشتنێکی قووڵتر لە مرۆڤ هەیە. هەروەها بۆ ڕاهێنان بۆ ئەم مەبەستە پارە تەرخان دەکرێ. ئەگەر تۆ توانای ئەوەت هەبێ کۆرسێکی ڕاهێنان لەسەر فرەجۆریەتیی مرۆیی بکەیەوە و وانەی تێدا بڵێیەوە ئەمە دەبێتە یەکێک لە پرسوودترین شێوازەکانی بەکارهێنانی زانیاریی ڕوو خوێندنەوە.

## ڕاوێژکاری سامانە مرۆییەکان

هونەری بەڕێوەبردنی سەرچاوەکانی مرۆیی، بەڕادەیەکی زۆر بۆ زاڵبوون بەسەر ترس سوودی لێوە وەردەگیرێ. ستافی ناوەخۆیی دەزگایەک لەوە دەترسێ نەوەک هەڵەیەک بکا. ئەوانەی داواکاری پێشکێش دەکەن لە هەبوونی جیاکاری دەترسن. ئەو کاتەی مەترسییەکان لەوپەڕی زۆری دابن هەروەک ئەو بارەی لە کاتی دامەزراندندا ڕوو دەدا، ڕەنگە مێشکی مرۆڤ زیاتر بگووشرێت. هەر بۆیەش ڕەنگە تا لە خەفەتان مۆر هەڵدەگەڕێی، باس لەوە بکەی کە چۆن ڕەنگ لە ڕوو خوێندنەوەدا ڕۆڵ نابینێ و هێشتاش بۆ خۆت گومانت لە ڕاستیی ئەم وتەیە هەبێ. بەشێوەیەکی مەجازی خوێندنەوەی ڕوو کتومت بەپێچەوانەی ترسەکانی مرۆڤە. مەبەستمان ڕوو خوێندنەوەیە نەک ڕەگەزخوێندنەوە. بەڵام کەسێکی پەرۆش کە داوای دامەزران دەکا، ڕەنگە نەتوانێ باوەڕ بەم ڕاستییە بکا.

دژایەتییەکی یەکجار لە خشتەبەرە. وردبین بە. خولێکی ڕاهێنان بۆ ستافی سەرچاوە مرۆییەکان بکەوە. ئەگەر نا هەروەک ڕاوێژکارێکی نافەرمی کار بکە.

بەپلەی ڕاوێژکارییەوە تۆ دەتوانی یان لەگەڵ چاوپێکەوتنکارەکانتدا دابنیشی، یان بەجیا

وێنەکەیان شرۆڤە بکەی و پاشان بەرەنجامەکان بەو کاربەدەستانە ڕابگەیەنی کە تۆیان بەم کارە ڕاسپاردووە. شارەزایانی دەستنووس بەم ئاسایە کار دەکەن. ڕووخوێنەوانیش دەتوانن هەمان کار بکەن. ئەگەر لەلایەن کۆمپانیایەکەوە بەوە ڕاسپێردرای کە لە دەستنیشانکردنی باشترین پاڵێوراو بۆ کارێکی دیاریکراودا یارمەتیی کۆمپانیایەکە بدەی تۆ دەتوانی بەم ئاراستەیەدا کار بکەی:

١- چاوەڕوانییەکان ڕوون بکەوە

بەنووسراو و دەقاودەق چۆنیەتیی خزمەتگوزارییەکەت و تێچووەکەی دیاری بکە. ئاخۆ تێچووەکە بەگوێرەی ژمارەی ئەو کەسانەیە کە ڕوویان دەخوێنییەوە یان بەپێی ژمارەی سەعاتەکانە؟ ئاخۆ ئەو پرسیارانەی دواتر دەکرێن پارەیان تێ دەچێ یان لەگەڵ نرخە چەسپێنراوەکەی گرێبەستەکە هەژمار دەکرێن؟ بەهۆی ئەم نووسراوەوە تۆ نەک تەنیا دەتوانی پسپۆرییەکەت ڕوون بکەیەوە، بگرە ڕێگەش بەوە نادەی هیچ خراپ لێک حاڵیبوونێک بێتە ئاراوە. تۆ تەنیا پێویستیت بەڕێککەوتننامەکە هەیە. داوا لە کارهێنەکەت بکە لە هەر شوێنێک بەپێویستی زانی، گۆڕانکاری لە ڕێککەوتننامەکەدا بکا و وێنەیەکی لێ هەڵگرێتەوە و بۆتی بگەڕێنێتەوە تا لە ناو فایلی خۆتدا هەڵی بگری.

لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیش ڕەنگە تۆ هەروەها بتەوێ پەرە بەجۆرە ڕۆتینێکی کاری بدەی، بۆ وەسفکردنی پاڵێوراوانی کارێک.

٢- بزانە دامەزرێنەرەکە چ جۆرە زانیارییەکی مەبەستە

کام لایەنەکانی شێوازی کەسی زیاتر لەلایەنەکانی تر پێوەندییان بەکارەکەوە هەیە؟ بۆ دارشتنی لیستێک لەگەڵ ستافی پێوەندییە مرۆییەکان قسە بکە. پاشان یەکەمایەتییەکان دیار بکە.

٣- بگەڕێ

بزانە چ شتێک زیاتر لە هەمووان بۆ سەرپەرشتیارە ڕاستەوخۆکەی ئەوە کارەی تۆ پێی ڕاسپێردراوی گرینگە؟ بزانە کام سیفاتانە گرینگن «هەم ڕەسمی و هەم نارەسمی». ئەم هۆکارانە بۆ سەر لیستەی لایەنەکانی گرینگی شێوازی کەسی زیاد بکە. بۆ نموونە ئەگەر سەرکارەکەت لە ڕووی خوو و ڕەوشتەوە کەسێکی سەختگیر بوو چی ڕوو دەدا؟ هەرچەندە بەشێوەیەکی تەکنیکی ئەو ناتوانێ کارمەندێک کە لە ڕووی هەڵسوکەوتەوە بەئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت بکا لە کار لابدا، بەڵام بەدڵنیاییەوە حەز دەکا لە سەرەتاوە ئەم

کارمەندە دانەمەزرێنێ. لەم بارەدا پێویستە تۆ بەڕادەیەکی زۆر شەیدای ئەو داواکارانە بی، کە گوێی لای ڕاستیان گۆشەی تیژە.

٤- مەرجەکانی کارەکە وەربگێڕە سەر زانیاریی ڕوو

لیستێکی تایبەت بەمەرجەکان دابڕێژە. بۆ نموونە ڕەنگە ڕۆتینی کاریی کارێکی بەڕێوەبەرانە پێویستی بەتەرکیزێکی ورد هەبێ. کەواتە کەسێک کە خاوەنی لووتێکی لە درێژیدا ناوەندی یان کورتە یان کەسێک کە مەودای نێوان هەردوو چاوی ناوەندی یان کەمە، وەیان برۆیەکانی سەراوبن یان هاوتان سەرنجت ڕادەکێشێ.

٥- ڕووی داواکارەکان بخوێنەوە

بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی لە ڕووی داواکارەکانەوە وەریان دەگری بزانە ئاخۆ هەر کامیان لە چ ڕوویەکەوە دەتوانێ بۆ کارەکە سوودێکی زیاتری هەبێ.

٦-زانیارییەکە هەڵبسەنگێنە.

ئەو زانیارییەی لە ڕووەوە دەستت کەوتووە، لەگەڵ لیستی مەرجەکانی پێویست بۆ کارەکە بەراورد بکە.

٧- جیاوازی و لێکچوونەکان بدۆزەوە

ستافی سەرچاوەکانی مرۆیی دەتوانن لە ڕێگەی شێوازە کۆنباوەکان، واتە بەگوێرەی شارەزایی و پێشینەی کاری و نامەکانی پاڵپشتی کاندیدەکانی خۆیان بپاڵێون. ئاخۆ چۆن دەروانرێتە زانیارییەکانی تۆ؟ ئاخۆ تۆ هیچ شتێکت دۆزیوەتەوە کە جێی شکوگومان بێ؟ ڕاستییەکی تاڵی کێشەی سەرچاوە مرۆییەکان لەم سەردەمەدا ئەوەیە کە بەگوێرەی یاسا و هۆکارەکانی تر پاڵپشتیکەرانی داواکارێک ڕەنگە زانیاریی بنەڕەتی سەبارەت بەکەسایەتیی داواکار بەدەستەوە نەدەن. خوێندنەوەی ڕوو دەتوانێ یارمەتیت بدا بۆ ئەوەی ئەو پرسیارانەی ئاراستە بکەی کە واقیعەکەت بۆ ئاشکرا دەکەن.

٨- پرسیار

ئاخۆ بیرت بۆ هیچ پرسیارێک دەچێ کە ڕەنگە بۆ چاوپێکەوتنێکی تر بەسوود بێ؟ ئەگەر وابوو پرسیارەکە بنووسە و ڕوونی بکەوە کە ئاخۆ ئەو پرسیارە بۆ لێکدانەوی چ شتێک دانراوە.

ئەو گفتوگۆ بەپێزەی لە ژووری چاوپێکەوتندا بەڕێوە دەچێ، هەروەک نامەکانی پاڵپشتی مەرج نییە ئەو زانیارییانە ئاشکرا بکەن کە بەڕێوەبەرانی دامەزرێنەر پێویستیان پێیانە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی زۆر جار کۆمپانیایەک کاتێکی زۆری خۆی بۆ کەسێک تەرخان بکا و ڕاهێنانێکی چڕوپڕی پێ بکا، کەچی پاش شەش مانگ کارکەرەکە ناچار دەکا دەست لە کار بکشێنێتەوە. تۆ ناتوانی پێشبینیی مەرگ و نەخۆشی و شتی لەم بابەتانە بکەی. بەڵام وەک ڕووخوێنەوە بەدڵنیاییەوە دەتوانی پێشبینیی ئەوە بکەی کە ئاخۆ چ کەسێک لە کاری ڕۆتینیدا بەهرەمەندە «بگەڕێوە سەر بەشی زانیاریی تایبەت بەدرێژیی لووت» و چ کەسێک لە ڕاستیدا چێژ لە قووڵبوونەوە لە ناو ئەنجامدانی وردەکارییەکان وەردەگرێ «دەزانم بیرت بۆی چووە – بگەڕێوە سەر بەشی زانیاریی تایبەت بەشێوەی برۆ».

دڵنیابوونەوە لە ڕاستگۆیی داواکاریش «کە خاڵێکی گرینگە بۆ هەموو دامەزرێنەران» پێویستی بەکارامەیی هەیە، بەڵام بێگومان کارێکی کردەنییە. پێویستە بەرچاوترین هێمایەکانی ڕووی کەسێک بدۆزییەوە، پاشان پرسیاری پێوەندیدار بەو هێمایانە دابڕێژی. بۆ نموونە لە کاتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ ئافرەتێکی خاوەن چەناگەی زۆر چەماوە، پێویستە پرسیاری لێ بکەی: "ئەگەر پێویست بوو لە کارەکەتدا بڕیارێکی گرینگ بدەی، ئاخۆ تا چەند گرینگی بەپێگەی دەسەڵاتی خۆت دەدەی؟"

ئەگەر وەڵامەکەی ئەمە بوو: "کێ؟ من؟ بۆ من دەسەڵات گرینگ نییە". پێویستە وریا بی. یان ئەوەتا ئەو ئافرەتە زانیارییەکی درۆ و نەگونجاو لەگەڵ چەناگەکەی خۆت پێشکێش دەکا یان یەکجار بێ ئاگایە لە هێزە ڕاستەقینەکانی خۆی. لە هەردوو باردا ئەو کەسە جێی متمانە نییە. بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەو ئافرەتە بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: "ئامانجەکانی کۆمپانیاکە بەئامانجەکانی خۆم دادەنێم و بۆ وەدیهێنانی ویستەکەم هەر کارێکی پێویست ئەنجام دەدەم" بەو کەسە سەرسام بە.

### ٩- ڕاپۆرتێک ئامادە بکە

تێبینییەکانت کورت بکەوە. هاوشێوەی ڕۆژنامەنووسێک سەرەتا گرینگترین زانیارییەکان پێشکێش بەخوێنەرانت بکە، پاشان وردەکارییەکانی تایبەت بەخاڵەکانی هێز و لاوازیی پاڵێوراوەکە ڕوون بکەوە. وردەکاریی زۆر بۆ کەسانی بڕیاردەر دابین بکە.

## چارەسەرکەری ناکۆکی

بێ شک دەتوانی لە خوێندنەوەی ڕوو بۆ کاروباری دادیش سوود وەربگری. بەڵام من خۆم زیاتر حەزم لەوەیە کە لەگەڵ دانووستانکەران و ئەو کەسانە کار بکەم کە لە بواری چارەسەرکردنی ناکۆکیدا ئیش دەکەن. ئاخۆ چۆن دەکرێ، بێ پەنابردنە بەر بگرە و بەردەی یاسایی کە هەم تێچووەکەی زۆرە و هەم ئاکامەکەی دابڕانی خەڵکە لە یەکتر ناکۆکییەکانیان یەکلا بکرێنەوە؟ ڕاوێژکاریی تەلاق بوارێکی گونجاوی تایبەتە کە تێیدا خوێندنەوەی ڕوو، دەبێتە پیشەیەکی پسپۆڕانەی بەنرخ.

ئەگەر بۆ خۆت بەپلەی ڕاوێژکاری لەم بوارەدا کار بکەی، ئەوا خوێندنەوەی ڕوو پەرە بەشارەزاییەکانت دەدا. ئەگەر ڕاوێژکاریش نەبی، پێویستە لەگەڵ ڕاوێژکارێک ئیش بکەی. بەم شێوەیە دەتوانی خۆت لە بەکارهێنانی زانیاریی خوێندنەوەی ڕوو و هەروەها بێندرێژی و خۆڕاگری و ئاستێکی بەرزی بوێری ڕابێنی.

کاتێک گرفتە ڕاستەقینەکان پێویستییان بەچارەسەرکردن دەبێ شیکردنەوەی گرفتەکان بەهۆی دەستنیشانکردنی خاڵەکانی جیاوازییەوە ئاسانتر دەبێ. تۆ دەتوانی بەهۆی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی خەڵک، بەرامبەر بەشێوازی کەسی بەردەوامی بەراڤەکەت بدەی.

– پێشانیان بدە، چۆن ئەو بۆچوونانەی بەڕواڵەت جیاوازن، پێوەندییان بەشێوازی کەسیی پێچەوانەی یەکتری هەیە. ئەم شێوازانە بەتێگەیشتن و بەبێ ڕەخنەگرتن ڕاڤە بکە.

– هەر کاتێک پێویست بوو کورتە باسێک لەبارەی چۆنیەتیی گونجاندنی ڕوانگە جیاوازەکان لەگەڵ یەکتر پێشکێش بکە.

– کارهێنەکانت لەوە ئاگەدار بکەوە، چی تر بەگوێرەی خووە کۆنەکانیان تەنیا بەدوای لێکچوونەکانیان لەگەڵ یەکتریدا نەگەڕێن.

– با نەینۆکێکت لە بەردەست بێ، بۆ ئەوەی کارهێنەکانت بتوانن جیاوازییە سەرەکییەکان خۆیان لە ڕووی مەودای نێوان هەردوو چاو و ڕووبەرەکانی یەکەمایەتی و بەشەکانی گوێ و ئەندامەکانی تریان ببینن.

بەکورتی، تۆ دەتوانی لە ڕێگەی ئاشکراکردنی ئەو شێوازە کەسییانەی لە ڕابردوودا بوونە هۆی خراپ لێکحاڵیبوون، پەرە بەلێک تێگەیشتن بدەی. با نیازێکی باشت هەبێ تا ئاکامی کارەکەت بگاتە ئەوپەڕی خۆی. ڕووخوێنەوە بۆی هەیە ببێتە کەسێکی ئاشتیدەر.

## خوێنەوەی جینەکان

جینۆلۆجیستەکان ڕەنگە کۆنەخواز بن بۆیە بێ شک پێویستە لە سەرەتاوە پێیان بوترێ خوێندنەوەی ڕوو بەشێوەیەکی پسپۆڕانە هەزاران ساڵە پێڕەو دەکرێ. بۆ ماوەی ١٥خولەکیش ڕووی کەسێک وەک نموونە و بەبێ بەرامبەر بخوێنەوە. کارهێنە رێ تێچووەکانت تووشی سەرسڕمان دێن. زانایانی جینۆلۆجی وێنە کۆ دەکەنەوە و تۆ دەتوانی کارێک بکەی کە ئەم وێنانە بەشێوازێکی نوێ ڕۆحیان بێتە بەر و، خوێندنەوەی جینەکانیش هەلێکی دڵکێشت بۆ دەرەخسێنێ بۆ ئەوەی شێوازە فرەجۆرەکانی وەچەخستنەوە بدۆزییەوە. لە خوێندنەوەی جینەکاندا ئەرکی تۆ ئەوەیە کە گرینگیی ئەم شیوازانە بەخەڵک ڕابگەیەنی. با جەختەکەت لەسەر زۆرەکان بێ. ئاخۆ لە خێزانێکدا کێ بەکێ دەچێ و خاڵی لێکچوونەکە چییە؟

ئەگەر وێنەکان بەڕادەی پێویست ڕوون و ئاشکرا بن، ئەوا دەتوانی ئەو گریمانە شی بکەیەوە کە دەڵێ خەڵک هەموویان "کتومت" لە یەکتری دەچن. ڕەنگە ئەو سێ پیاوەی گوایە "لووتێکی هاوتای یەکتر"یان هەیە لە ڕاستیدا تەنیا دوو یان سێ هێمای لووتیان بەیەک بچێ، بەڵام زۆر جیاوازیی بەرچاویشیان لە لووتدا هەبێ.

ئاخۆ تۆ چۆن دەتوانی ئەم کارە دەست پێ بکەی؟

– بۆ ڕاهێنانی خۆت، چاوێک بەژینامەیەکی وەک شاکارەکەی "دۆریس کیرنس گودوین" بەناوی "The Fitzgeralds and the Kennedys " بخشێنە. چاوێلکەیەکی وردبینی باش بکرە، بۆ ئەوەی وێنە بچووکەکانی ناو کتێبەکە بەجوانی ببینی. خۆت لە دۆزینەوەی شێوازەکان ڕابێنە.

– کارتێکی کاری بۆ خۆت دروست بکە و بڵاوی بکەوە.

– بۆ ئەوەی پاڵپشتی وەدەست بێنی بەبێ بەرامبەر ڕووی چەند کەسێک بخوێنەوە.

– پێشوەختەکی کاتێک بۆ ژوان لەگەڵ یانەکانی جینۆلۆجان و ڕێکخراوەکانی کاربەدەستان دیاری بکە، بۆ ئەوەی سمیناریان بۆ بدەی. ئەگەر هەر جارەو لایەنێکت ڕازی کرد، ئەوا ڕێگە هەموار دەبێ بۆ دارشتنی بناخەیەک بۆ وەرگرتنی کارهێن.

سەرنجراکێشیی کارەکەی تۆ بۆ کارهێنەکانت، دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ. خزمەکانی هەر کەسێک سەر بەدوو کۆمەڵەن: ئەوانەی زۆر ناسراون و ئەوانەی زانیارییەکی کەم لەبارەیانەوە زانراوە. ئەو کاتەی تۆ ڕووی کەسێکی سەر بەکۆمەڵە ناسراوەکە دەخوێنییەوە

و دەتوانی سیفاتی تایبەتی وەک سیفاتی ناو ئەم وەسفە: "لە شەویلگەکانی خاڵە "دان"ەوە دیارە کە ئەو کەسێکی یەکجار بەوەفا بووە. لە هەمان کاتیشدا کەسێکی تا بڵێی کەللەڕەق بووە" دەستنیشان بکەی، واو! کارهێنەکانت دەستبەجێ ڕاستیی قسەکەت پشتڕاست دەکەنەوە. پاشان بەخوێندنەوەی ڕووی ئەو خزمانەی کەمتر ناسراون بەردەوامی بەڕاڤەکەت بدە. ئەمە تەنانەت زیاتریش سەرنجیان ڕادەکێشێ.

جینۆلۆجی بەشێوەیەکی بەشەکی ڕوونکردنەوەیەکی کورت سەبارەت بەچۆنیەتیی بەرگەگرتنی ئەو نەهامەتییانەی کە بەسەر خێزانێکداهاتووە دابین دەکا. ئەو کاتەی کارهێنێکت چیرۆکێکی ئاریشەیەکی خۆی دەگێڕێتەوە بۆی ڕوون بکەوە کە بەهرەکانی ناو ڕووی، بوونە هۆی زاڵبوونی بەسەر ئەم ئاریشەیە.

ڕوو خوێندنەوە دەتوانێ زۆر سوودبەخش بێ بۆ ئەو کەسانەی کە شانازی بەبنەماڵەی ڕەچەڵەکی خۆیان دەکەن. باب و باپیرانی هەر کەسێک بێ ڕەچاوکردنی باری ئابوورییان بەسامانێکی ڕۆحیی هاوتای سامانی مادیی زەبەن لە دایک بوون. ئاخۆ ئەم باب و باپیرانەمان چۆن سوودیان لەم بەهرانەی خۆیان وەرگرتووە؟

## بەزەمگێڕی

تا ئێستا دەرکت بەوە کردووە کە خوێندنەوەی ڕوو، شتێکی دڵکەرەوەیە. هەر کاتێک لە خوێندنەوەی ڕوو شارەزا بووی ئەوا ئەم شارەزاییە دەبێتە شێوازێکی ژیانت. هەروەها وا پێ دەچێ کە خوێندنەوەی ڕوو، شێوازێکی باشیش بێ بۆ وەدەستهێنانی پارە. ڕەنگە بازاڕی بەزەمگێڕانی ئاهەنگەکان لە هەموو بازاڕەکانی دی گەرمتر بێ، لەبەرئەوەی تۆ دەتوانی لەم ڕێگەیەوە لە بەرامبەر هەر شەوێک ڕوو خوێندنەوەی شەریفانەدا، ٥٠٠ دۆلار یان زیاتر وەدەست بێنی و لە هەمان کاتیشدا لەمیانەی ئەم سەودایەدا بۆ خۆشت چێژ وەربگری.

– بۆ ئامادەکردنی خۆت بۆ ئەم کارە لە توانای خۆت بۆ ڕوو خوێندنەوەیەکی ورد و لە توانات بۆ دیتنی هێماکان و شیکردنەوەی واتاکانیان دڵنیا بەوە. ئەگەر تۆ لە کاتی چوونت بۆ ئاهەنگێک ئەم کتێبە (سەرچاوە)یەت بەدەستەوە بێت بۆ ئەوەی لە خوێندنەوەی ڕوو پەنای بۆ بەری ڕەنگە خەڵکەکە سەبارەت بەپیشەکەی خۆت تووشی دوودڵی بکەی.

– ئەو کاتەش کە بەو ڕادەیە پرۆژەت کردبێ کە متمانەت بەخۆت هێنا بێ لە ناو ئەو کتێبەی ناوی کۆمپانیاکانی خزمەتگوزاریی ناوەخۆیی تێدا ڕیز کراوە، بەدوای ناوی ئەو

کۆمپانیایانە بگەڕێ، کە لە بواری سەرگەرمی یان ئاهەنگگێڕاندا کار دەکەن.

– بۆ سازدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەرانی ئەم کۆمپانیایانە ژوانیان لەگەل دابنێ. کارەکەی خۆت بۆیان ڕوون بکەوە.

– هەر جارەی کە بانگهێشتنی ئاهەنگێک کرای دەتوانی بۆ شوێن و ماوە و بابەتەکانی تر، ڕاوبۆچوونی خۆت بدەی. هاوشێوەی هونەرمەندێک تۆ دەتوانی بەئارەزووی خۆت کارێک پەسند یاخۆ ڕەت بکەیەوە.

شتێکی سەرسوڕهێنە کە تۆ بۆ سەلماندنی بەهرەکەت ناچار نی لەبەرامبەر دامەزرێنەریکدا گۆرانی بڵێی یان بەشداری لە تیپێکی شانۆیی بکەی. ڕێکخەرانی بۆنەکان بەردەوام پێویستیان بەو پێشکێشکارانە هەیە، کە دەتوانن میوانەکان و بۆنەکەش بگەشێننەوە و پرۆگرامی تایبەت بەهاوسەران یان چالاکیی تایبەت بەئاهەنگ پێشکێش بکەن. ئەی بۆچی تۆش خۆت بەیەکێک لەم کەسانە دانانێی؟

هەندێک جار خەڵک بەتێکڕا تۆ بەپێشگۆ دادەنێن. بەڵام کاری تۆ پێوەندییی بەپیشگۆییەوە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانی بەڕوونی بڵێی: "من باسی ئەو بەهرانەت بۆ دەکەم کە دەتوانی لە کار و لە پێوەندییەکانتدا تا ماوەی شەش مانگی تر جەختیان لەسەر بکەیەوە". هەرچەندە ڕوو گۆڕانی بەسەردا دێ، بەڵام بەدەگمەن لە ماوەیەکی کەمتر لە شەش مانگ دەرفەتی گۆڕانی هەیە.

ئاخۆ کارکردن لە ناو ئاهەنگێک، کاتێک کە تۆ ڕەنگە ناچار بی لەگەڵ هەر میوانێکدا بۆ ماوەی شەش خولەک بدوێی ماندووت ناکا؟ بێ شک ماندوو دەبی پاڵەپەستۆیەکی زۆرت دەخرێتە سەر. ڕیزی سەرەگەران هەر درێژ و درێژتر دەبێتەوە. ئەو کەسانەی دەنگی هۆیهایان لێوە دێ ڕەنگە خۆیان بەگاڵتەجاڕ دابنێن. بەڵام تەنانەت ئەو کەسە سەرخۆشانەی ناوە ناوە لە میوانداریییەکان تووشیان دەبم نابنە کۆسپی سەر ڕێگەی کارکردنم. بەباسکردنی ڕووی خەڵک و لە کاتێکدا کە بەم باسە یارمەتییان دەدەی بەڕێگەی تەواو نوێوە سەیری خۆیان بکەن، بۆ خۆت تەواو چێژ وەردەگری.

هەندێک جار میواندارەکان یەکجار پەشۆکاو دەبن و ماوەی کارکردنەکەت چەندین سەعات درێژ دەکەنەوە. من بۆ ماوەی ٦ سەعات یان ٩ یان تا ١١ سەعاتیش بەبێ پچڕان کارم کردووە و هەروەک گوڵەبەرۆژیەک بەگەشی «بەڵام لەگوڵەبەرۆژە پرۆزەتر» لە شوێنی ئاهەنگەکە دەرچووم. هاوکاریکردنی خەڵک، بۆ بەرزکردنەوی ئاستی هۆشیارییان سەبارەت بەڕوو وزە بەمرۆڤ دەبەخشێ.

ئەگــەر بەبەزمگێــڕان لە ئاهەنگێکدا ڕاســپــێــردرای تکایە ڕێز لە ناو جــوانەکــەی پسـپـۆڕییەکـەی ئێمـە بگرە. پێش ئەوەی جلە سـەیرەکانت لەبەربکەی بشـۆ. خواردنەوەی سەرخۆشکەر مـەخۆوە. بەر لەوەی خاوەن شکۆیەکانی ناو ئاهەنگەکە بدەی بەر باری قسە، پرس بەمیواندارەکە بکە. لە سـەرووی هەموو شتێکیشەوە مەهێڵە هەستی سووکایەتیکردن بەو مـیوانانەی ناوە ناوە چاوت پێـیـان دەکەوێ و حـەزیان پێ ناکـەی، بەسـەرتدا زاڵ بێ. بەبیـرمـدا نایە مـاوەی ١٥سـاڵی ڕابردوو لە کـاتی خـوێندنەوەی ڕووی مـیوانـەکـان تاکـە کـارهێنێکی خـۆشم ڕەنجـاندبێ هـەرچەندە ژمـارەیەکـیـان بەهۆی کـاریگەریی ئەرێنیی شیکردنەوەکانم دەستیـان بەگریان کردووە. خـوێندنەوەی ڕوو هـەمیـشـە سـەرپشکییەکت پێ دەبەخشـێ. بەزەمگێڕان لە نـاو بۆنەکاندا پارەیەکی یەکجار زۆری پێوە دێ. بەمسـۆگەری ئەو کاتە زیاتر چێژ لە ئاهەنگەکە وەردەگری ئەگەر بەگوێرەی ماوەکە پاداشت بکرێیەوە.

## خوێنەوەی توانا شاراوەکانی مرۆڤ لە ژیاندا

بەدوای دیارییـەکی نائاسایی بۆ بۆنەی لەدایکبوون یان سـاڵوەگەڕێکدا دەگـەڕێی؟ ئەی بۆ دیارییەکی ١٠٠ دۆلاری پێشکێش ناکەی کە بۆ تۆ هیچی تێ ناچێ؟ بۆ ماوەی یەک سەعات بەقووڵی ڕووی کەسێک بخوێنەوە.

خـوێندنەوەی تواناکـانی ژیان دەتوانێ لە ڕێگەی دەرخسـتنی هێـما سـەرەکییـەکانی ناو ڕووی کـەسێکەوە ئاسـتی کەسـەکە بەرز بکاتەوە. لە خـوارەوەدا ڕێبـازێکی هەنگاو بەهەنگاو بۆ خــوێندنەوەی ڕووی هاوڕێ و خــزمــەکــان و تەنانەت ئەو کــارهێنانەش کــە لەبری ئەم کارەتـەوە پاداشتت دەکەن، هاتووە. بەڵێ، با ئەو کەسـەی سوودمـەند دەبێ، بەکارهێنـەکەی تـۆ ناوی ببــەین. ئـەمــەش یاریدەت دەدا تـا ڕابێی و بـڕوابەخــۆبـوون و شــارەزاییت بـۆ دەستپێکردنی پیشەکەت زیاد بکا.

١- سەکۆیەک ئامادە بکە

شوێنێکی ئەوتـۆ بدۆزەوە کە کەس کـاری تۆ و کارهێنەکەت نەپچـڕێنێ. تکایە پێویسـتە بۆ مـاوەی یەک سـەعـات تەلەڤـزیۆن لە شـوێنەکـەدا دانەگـیرسێ و کـەسـیش تەلەفـۆن نەکـا. بەتایبـەتیش ئەگـەر بەخـۆڕایـی ڕووی کەسـێکت خـوێندەوە، ئەوا دەبێ خـۆت بۆ ئەم کـارە تەرخـان بکەی. شـتـێکی ئاسـاییـیـە کـەسێک کـە تازە باسی ڕوو خـوێندنەوەی بیـسـتـبێ، گـومـاناوی بێ. بەڵام بۆ ئەوەی بڕوابەخـۆبوونت سـست نەبێـتـەوە مـافـی خـۆتـە داوا لە کارهێنەکە بکەی کە ئەگەر گومانیشی هەبێ بەچاوی ڕێزەوە سەیری پیشەکەی تۆ بکا.

باشترە بەیەکەوە لە دەوری مێزێک دابنیشن. نەینۆکێک لە شوێنێکی بەردەست دابنێ و ڕوونی بکەوە کە ڕەنگە زانیاریی ئەوتۆ لەبارەی ڕووی کارهێنەکەت ئاشکرا بکەی کە ئەو هەرگیز پێشتر هەستی پێ نەکردبێ. با دەفتەرچە و قەڵەمێکیشت لە لا بێ، بۆ نووسینی تێبینییەکان. باشتریشە ریکۆردەرێک و کاسێتێکی بەتاڵیشت پێ بێ.

٢- نیازی خۆت دەرببڕە

بەر لەوەی دەست بەخوێندنەوە بکەی، بەشێوەیکی ڕەسمی نیازی خۆت دەرببڕە، بەپێچەوانەوە خووە ناهۆشەکییەکانت زاڵ دەبن.

ئاخۆ پاڵنەرە پڕبەهاکەی ئەم ڕوو خوێندنەوەیە چییە؟ مەبەست لێی ئەوەیە " یەکجار زیرەکبوونی تۆ" ئاشکرا بکا؟ بۆ ئەوەیە پێشان بدەی هەرگیز نادۆڕینی؟ قسەی لابەلا! ئەمە نەستی تۆیە، ئەمە بەویستی خۆت نییە. بەڵام هەر کاتێک پێشوەختەکییانە نیازی خۆت دەرنەبڕی ئەوا ئەم هزرە پووچانە لە دواوەوەی میشکت جێگیر دەبن. ویژدانی نیمچە ئاگای تۆ لانی کەم هەروەک دیفۆڵت سێتینگی سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەت کە شتێکی پێشبینی کراوە بەسەرتدا زاڵ دەبێ.

خووە کۆنەکانمان ڕێگەی بەرەو پێشڤەچوونمان لێ تەسک دەکەنەوە. بەپێچەوانەوە کارێک کە بەویستی ئازادەوە ئەنجام بدرێ، ڕەنگە ئاراستەی مێشکت بەرەوە خاڵێکی بەسوود و نوێ ڕێنوێنی بکا، خاڵێکی وەک:

" هیوادارم لەم دانیشتنەدا کە مەبەست لێی ڕوو خوێندنەوەیە، ژیریی خۆمان ببێتە ڕێنوێنیکارمان. ئامانجی من ئەوەیە هاوکاریت بکەم بۆ ئەوەی باشتر لە خۆت تێ بگەی و لە ژیاندا بەباشترین شێوە سوود لە بەهرەکانی خۆت وەربگری."

تێبینێ: ئەگەر بەڕاستی هەست بەجۆش و خرۆش دەکەی دەتوانی نیازەکەت بەدەنگێکی بەرز دەرببڕی نەک بەبێدەنگی. ئەی هاوار! ئەو کاتە هەست بەوە دەکەی کەشوهەوای ناو ژوورەکە سیحراوی بووە.

٣- بەشێکی ڕوو هەڵبژێرە و شرۆڤەی بکە

لە برۆیەکانی کارهێنەکەت دەست پێ بکە، پاشان هەر ئەندامێک بەجیا بخوێنەوە. یەکەم جار جۆرێک هەڵبژێرە و پاشان هێمایەکەی سەر بەم جۆرە شی بکەوە. بۆ هەر لێکدانەوەیەک سەرەتا لایەنە جەستەییەکە شی بکەوە، بۆ نموونە واتەی برۆی تاجدار ڕوون بکەوە. دڵنیا بە، لەوەی کارهێنەکەت ئەم هێمایەی خۆی بناسێتەوە.

پاشـان واتای هێـمـایەکـە شی بکەوە. بۆ ڕاست و دروسـتـیی شـرۆڤـەکـەت پرسـیـار لە کـارهـینکەت بکە. ئاخـۆ لـە شـێـوازی ڕاڤـەکـردنـەکـەت چ ڕێکخـسـتنێک پێـڕەو دەکـەی؟ شێوازێکی تایبەت بەخۆت دابڕێژە و یان هـەمـان ڕێکخـستنی ئەم کتێبە بەکار بێنە واتە ڕیزبەندی ڕاڤـەکـەت با بـەم شـێـوەیە بێت: برۆ، گـوێ، چاو، لووت، کـولْم، دەم، شـەویلگە، چەناگە، ڕووبەرکانی یەکەمایەتی.

٤- جەخت لەسەر زۆرەکان بکەوە

لە کاتـی لێکدانەوەکـانتـدا، ئەوەت لە یاد نەچێ کـە زۆر= زۆر. هێمـایە زۆرەکـان بەواتای سیـفـاتی بەهێـزن. هێمـایە ناوەندییـەکـان هاوڕێن لەگەڵ ئـەو سیـفـەتە دەروونیـیـانەی کـە هێزێکی کەمتریان هەیە.

٥- لە کارەکەتدا ڕەچاوی هەستی کارهێنەکان بکە

هەندێک جـار بەربەرچدانەوەکـانی کـارهـێنەکـانت وەک ئەوەی زللـەیەکـیـان لە ڕوومـەتت ڕاکـێـشـابێ، ڕات دەتەڵەکـێـنن. بەڵام لەوانەیە کـۆمـەڵێک خـاڵی هێـز هاوڕێی ئەم بەرپەرچدانەوانە بن و تۆ ئەمەت لە یاد نەمابێ. ئەگەر نا هەر پێویستیت بەو زللەیە هەیە تا بەئاگا بێیەوە. لەگەڵ کارهێنەکەت بەبەزەیی بە.

بۆ نموونە ڕەنگە لە ئەندازەکانی لێـودا هەستت بەوە کردبێ لێوی کارهێنەکـەت ئاماژە بەدەمشڕی دەکا. بۆیە ڕەنگە دڵەڕاوکێ بتگرێ و بڵێی:

"ئەندازەکـانـی لێـوی تۆ ئامـاژە بـەوە دەکـەن تۆ زۆر بابەتی پێـوەندیدار بەخـۆت ئاشکرا دەکەی، بۆیە هـەر تووشی چەرمەسەری دەبی. هەی شێت، ئاگات لە دەمت بێ".

نەخێر. پێدانی تێبینییەکی دۆستانەتر و یاریدەدرانـەتر ئەوەیە کە سـەرەتا باسـی ئەوەی بۆ بکەی کە ئەو لـە دوان دەربارەی هەسـتـەکان بەهرەمـەندە و پاشـان باسـی ئاریشـەی ڕێ تێچووی بۆ بکەی. هیچ کام لەو کەسانەی ڕوویان دەخـوێنییەوە گەمژە نین. تەنیا پێویستە بەنەرمی تێبینییەکانت بدەی.

٦- متمانەت بەبەرنامەڕێژییەکەت هەبێ

ئەی ئەگەر لە بیرت چوو، شتێک باس بکەی و پاش تەواوبوونی ڕوو خـوێندنەوەکە هاتەوە یادت؟ با بڵـێـین لە بیـرت چووە باسـی هێـمـایەکی گـرینگی گـوێ بکەی و هاتوویە سـەر باسکردنی چاوەکانی کارهێنەکەت. کاتێک بۆ یەکەم جار لە ژیانی پیشەییمدا تووشی ئەم

بارە بووم شەرم دای گرتم. وەک ئەوە وا بوو کەتنێکم کردبێ و هەستم بەوە دەکرد کە هەر ڕووخوێنەوەیەکی ڕاهاتوو کە لەو کاتەدا سەیری کردبم لە ژێرەوە تیزی پێ کردووم.

ئەم لێژنە ڕەخنەگرە فەرامۆش بکە. هەموو شتێک لە دەستی خۆت دایە. با ڕیزبەندی تێبینیدانەکانیشت تێک بچێ، گرینگ ئەوەیە زانیارییەکان لەگەڵ یەک بگونجێن. تەنانەت ڕەنگە هۆیەکی ڕێبەدیکەر هەبووبێ، بۆ ئەوەی ڕێگەی بۆ لە بیرچوونەوەی هێمایەکی دیاریکراو هەموار کردبێ. تۆ نیازی خۆت دەربڕیوە بۆیە متمانەت بەخۆت هەبێ کە ئەم نیازەت دێتە دی.

یاسای خوێندنەوەی ڕوو ئەوەیە کە هەر کاتێک تێبینیی شتێک کرا پێویستە هەر ئەو کاتەش تێبینییەکە دەرببڕدرێ. گرینگ نییە، ڕیزبەندەکە چۆن بێ. لە ڕاستیدا تۆ کە بووی بەڕووخوێنەوەیەکی شارەزا لە هەمان کاتدا ڕەنگە تێبینیی سیفاتی پێوەندیدار بەیەکتریش بکەی. ڕەنگە پێت باشتر بێ، بەیەک جاری واز لە ڕێکخستنەکەی خۆت بێنی و ڕێگە بەڕووی خودی کەسەکە بدەی، ڕیزبەندی زانیارییەکانت بۆ دیاری بکا.

بۆ نموونە ڕەنگە سەرەتا بیر بکەیەوە: "چ پێوەندییەک لە نێوان نەرمە گوێیە پفدارە گەورەکانی "سالی" و جووتە چاوە لێک نزیکبووەکانیدا هەیە؟ دۆزیمەوە! بەهرەی سالی لە تێبینیکردنێکی هاوسەنگ هاوڕێیە لەگەڵ مەیلەکەی بۆ ژیانی فیزیکی. ئەگەر سالی لە یاریی کورسی کورسیدا بەشداری بکا "بەهۆی نەرمە گوێیەکانییەوە" دەتوانێ بزانێ هەر کام لە کورسییەکان لە کوێ دانراون و هەروەها ڕەنگە ئەو تاکە یاریکەر بێ بۆ یەکسانکردنی مەودای نێوان کورسییەکان بەشداری لە یارییەکە بکا. بەهۆی جووتە چاوە لێک نزیکبووەکەیەوە، هەست بەهەر بستە خواروخێچییەکی مەوداکە دەکا.

کاردانەوە ڕێ تێچووەکانی سالی ئەوەن کە ئەو بەئاشکرا ڕەخنەگرە و کەسێکە بەشێوەیەکی ترسناک گرینگی بەدەقاودەقێتی دەدا. بەڵێ، ئەو خاوەنی ئەو شتەیە هەوێنی ترسی خەڵکە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لە یارییەکی وەکو کورسی کورسی وەیان پڕۆژەی زۆر سوودمەنددا دەتوانێ ببێ بەقارەمان.

٧- ڕووبەڕووی مەتەڵەکان ببەوە

دژایەتییەکانی ناو ڕوو گێژی کردووی؟ زۆر باشە، واتای ئەوەیە تۆ لە سەر لێواری ئەوەی نقومی زانیاریی قووڵتر ببی. دوو هێمای پێچەوانە یان زیاتر بکە بەمەتەڵ و وەڵامێکی بۆ بدۆزەوە. کارهێنەکەی تۆ تەمەنێکی لەگەڵ ئەم دژایەتییە بردووەتە سەر. هەڵێکی چەند

سەرسڕهێنە ئەگەر بتوانی ئەم دژایەتییەی بۆ ڕوون بکەیەوە.

هەناسەیەکی قووڵ بدە. لە ئاریشەکە قووڵ بەوە و بەبێندرێژییەوە مەتەڵەکە شی بکەوە. دژایەتییەکان یەکێک لە پڕ واتاترین بەشەکانی خوێندنەوەی ڕوو پێک دێنن.

بەگوێرەی زانیارییەکانی هەر بەشێکی ڕوو، سەرەداوێکت دەست دەکەوێ. بۆ نموونە ڕەنگە ئەوەی خوارەوە شیکردنەوەیەکی گونجاو بێ بۆ دژایەتییەکەی ناو ڕووی "زاک" کە چەناگەی ڕێک و برۆی چەماوەی هەیە:

"بەگوێرەی شێوەی برۆت تۆ لە پێوەندییەکانت لەگەڵ خەڵک و لە بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکاندا کەسێکی سۆزیار و هەستیاری. بەپێچەوانەوە چەناگە ڕێکەکەی تۆ ئاماژە بەوە دەکا لە کاتی بڕیارداندا، تۆ زیاتر شێوازێکی تاکڕەوانە و شیکاری پێڕەو دەکەی".

٨- نموونەی بەرجەستە بەکار بهێنە

ئەگەر زاک وتی: "ها؟" نموونەیەکی تایبەتی بۆ دێنمەوە. پێی دەڵێم: "گریمان دەتەوێ دەنگ بدەی. لەگەڵ هاوسەرەکەتدا چووی بۆ بنکەی دەنگدان و وەک جاری جاران لەبەرئەوەی بەهەستیارییەوە گوێت لە گرفتەکانی ئەو گرتووە، دڵیت خۆش کردووە. پاشان تۆ دەچیە پشت پەردەی ژووری دەنگدان و بەگوێرەی پرەنسیپەکانی خۆت دەنگ دەدەی."

لە کاتی دەنگدان بەپێچەوانەی ئەو کاتەی لەگەڵ هاوسەرەکەتدای، یەک تۆزقاڵ بەلاتەوە گرینگ نییە ئاخۆ ئەو شتەی دەنگی بۆ دەدەی چ کاریگەرییەکی هەستەکیی بەسەر خەڵکەوە دەبێ. ئەوەی گرینگە ئەوەیە تۆ بۆ ئەو شتەی پێت ڕاستە دەنگ دەدەی. ڕەنگە بۆ خۆشت سەرت سڕمابێ لەوەی لە هەندێک باردا تۆ بەرامبەر بەخەڵک ئەوەندە هەستیاری و لە هەندێک باری تردا ئەوەندە بێ هەستی دەنوێنی. ئەمە پێوەندیی بەدژایەتیی نێوان چەناگە و برۆتەوە هەیە.

٩- خۆت مەکە بەخوا، وەک هاوڕێیەک هەڵسوکەوت بکە

ڕەنگە لە سەرەتای پیشەی ڕووخوێندنەوەییدا تۆ دڵەڕاوکێ بتگرێ و بڵێی: "ئەی خوایە، من دەتوانم بەهۆی ڕوو خوێندنەوەوە بیری خەڵک بخوێنمەوە." و ڕەنگە قسەی لەم جۆرەت لە بەرامبەر کارهێنەکانت لە دەم دەربچێ: "ئەمە ڕاستییەکەیە. ئەمە چارەنووسی تۆیە".

باشترە دووبارە بیر بکەیەوە.

ئەگەر هەموو جۆرە تێگەیشتنەکان ڕاست و دروست بوونایە، ئەی بۆچی هەستێکی هاوشێوەی هەستت بەرامبەر بەناپەسندترین پێشکێشکاری بەرنامەیەکی گفتگۆیی، بەسەردا زاڵ دەبێ؟ تۆ بەوەرگرتنی «پەنا بۆ خوا» دەوری خوا ڕقی خەڵک دەوروژێنێ.

کەواتە لەگەڵ هەموو کارهێنەکانت بەبەزەیی بە و لە شیکردنەوەکەتدا وەک مرۆڤ هەڵسوکەوت بکە نەک خوا. تەنانەت ئەگەر هەرگیز جارێکی تر کارهێنەکەت نەبینییەوە کارەکەت بەشێوەیەک ئەنجام بدە، هەروەک ئەوەی بۆ هاوڕێیەکی خۆت ئەنجامت دابێ و بەشێوەیەک بەکۆتای بێنە کە ئاماژە بدا بەوەی تۆ وەک هاوڕێیەکی ئەو حەزت کردووە خزمەتێکی بکەی. لە کۆتاییدا خودی کارهێنەکەتە کە بڕیار دەدا، ئاخۆ چ شتێک لە بەرژەوەندی ئەو دایە نەک تۆ.

## خوێنەوەی پێشکەوتنەکانی ژیان

ئاخۆ هاوڕێیەکت هەیە کە ئەمساڵ تەمەنی بگاتە ٤٠ یان ٥٠ ساڵ؟ ئاخۆ هیچ دیارییەکت هەیە پێشکێشی بکەی؟ خوێندنەوەی پێشکەوتنەکانی ژیان بۆ کەسێک کە پێ دەخاتە ناو دەیەیەکی نوێی ژیانی خۆی یان گۆڕانکارییەکی سەرەکیی وەک تەڵاق یان خانەنشینبوونی لە ژیانیدا ڕوو دەدا، گونجاترین دیارییە. تۆ دەتوانی لە ڕیگەی خوێندنەوەی بەخۆڕایی بەمەبەستی ڕاهێنانی خۆت بەڕادەیەک پەرە بەشارەزایی و متمانەبەخۆبوونی خۆت بدەی کە بتوانی دواتر لەبری ئەم خزمەتگوزارییەت داوای پاداشت بکەی. بەتایبەتیش لەگەڵ بەتەمەنداچوونی دایک و باوکان، بازاڕی ئەم خوێندنەوەیە گەرمتر دەبێ.

لە هەمان کاتدا با لێرە دیارییەکی ڕۆژی لەدایکبوون پێشکێش بە"بێس"ی هاوڕێت بکەین. کاتێک بۆ خوێندنەوەی ڕووی بێس کاتەکە دیاری دەکەی، داوای لێ بکە با لەگەڵ خۆی وێنەکانی لە تەمەنی منداڵی بەدواوەی بێنێ. ئەم وێنانە لە دەوروبەری خۆت بڵاو بکەوە و بەگوێرەی تەمەن ڕێکیان بخە و دەست بەکار بە.

ئامانجی تۆ لە خوێندنەوەی پێشکەوتنەکانی ژیان ئەوەیە، کەسەکە لە ڕەوابوونی گۆڕانەکان تێ بگات. لە وێنەی یەکەمەوە تا دوا وێنە بەدوای ئەو هێمایانە بگەڕێ کە ئاماژە دەدەن بەگۆڕانێکی فیزیکیی بەرچاو، لە هەر شوێنێکی ڕوودا واتە لە مەودای نێوان چەناگەوە بۆ هێڵی ڕوانی موو. هەر جارەی کە تێبینیی جیاوازییەکەت کرد واتاکەی لێک بدەوە. لەو وێنەیەی لە کەمترین تەمەنەوە گیراوە دەست پێ بکە و لەگەڵ وێنەکانی دوای خۆی بەراوردی بکە.

خـوێندنەوەی پـێـشکـەوتنەکـانی ژیان، تـەنانەت دەرفــەتی ئەوەت پـێ دەدا کـە ســەبارەت بەڕوانگەی کـەسـەکە لە تەمـەنی پێش ١٨ سـاڵیش تێبینی تێبینی بدەی. ئەم تێبینیدانە ئـاسایییە لەبەرئەوەی کارهێنـەکەت چی تر ئەو گەنجـە هەڵەشەیە نییـە. بەشێوەیەکی گشتی کەمـترین تەمەن بۆ ئەم جۆرە خوێندنەوەیە ٣٥ ساڵە. چەندی کارهێنەکەت بەتەمنتر بێ، باشترە.

زۆربەی جار خـەڵک وا بیر دەکاتەوە کە پیربوون بەواتای لە دەسـتدانی سـەرنجڕاکێشیی تەمـەنی گەنجـێتییە. خـوێندنەوەکـەی تۆ و باسکردنی ئەو ژیرییـەی کە لـەو گەشـتـەی ڕۆحـدا وەدەست هـاتووە، دیدێکی تەواو جیاوازیان پـێ دەبەخشـێ.

## خوێنەوەی تەبایی

جارێکی تر کە کەسێک مارە دەکرێ یان کاتێک ئاهەنگێک دەگاتەوە ساڵوەگەڕی خۆی تۆ دەتوانی بەڕۆمـانسیـترین جۆری خوێندنەوەکـان دیارییـەکی گـونجـاو پێشکێش بکەی. لە ئەنجـامـدا تۆ ئـامـادەیـیی پەیدا دەکـەی، بۆ ئەوەی خـوێندنەوەی تەبایی لـەسـەر ئـاسـتـێکی پسـپـۆڕانەش پێشکێش بکەی. پاشـان بـەتایبـەتیش ئـەگـەر تۆ لەو کـۆمـەڵانەدا کە تایبـەتن بەکـەسـانی سـەڵت، خـۆت ناسـاندبێ ژمـارەیەکی زەبەن کـارهێنی پاداشـتکەر داوای ڕوو خوێندنـەوەت لێ دەکەن. بەبێ بەرامـبەر لێدوانێک بدە و کـارتی تایبەت بەخـۆت بڵاو بکەوە و خۆت بۆ ژواندانان بۆ چاوپێکەوتنەکان ئامادە بکە.

گـرینگ نییـە لەبری هـەر سـەعاتێک بەچەند پاداشت دەکرێیەوە، بەڵام خـوێندنەوەی ڕووی هـاوسـەران سـەوداگەرییـەکە. هۆیەکەشـی تەنیـا لەبەرئەوە نییـە کە لەم سـەودایەدا یەک کەس لە بەرامـبەر دوو کـەسـە. ئەو کـاتەی تۆ هـاوسـەران لـە جیـاوازی و لێکچـوونەکـانیان ئاگـەدار دەکەیەوە، دەتوانی لە دەمەقاڵێ و تەنانەت دڵڕەنجان لە یەکتریش ڕزگاریان بکەی.

لە سـەرەتاوە ئەوە ڕوون بکەوە کە: "مـەبەست لەم خوێندنەوەیە ئەو نییە کە پێتـان بوترێت ئاخۆ ئێوە پێکەوە دەگونجێن یان نا. مـەبەست لێی ئەوەیە کە چۆن ئێوە دەتوانن جیاوازی و لێکچوونەکانتان لە بەرژەوەندیی خۆتان بەکار بهێنن".

هـەڵەی ئـێمـە لە پێـوەندییـەکـانماندا ئەوەیە، کە چاوەڕێین هـەمـوو خـەڵک "کـتـومت وەک خـۆمـان" بێ. تۆ بەخـوێندنەوەی تەبایی ئەوە ڕوون دەکـەیـەوە کە بەچ شـێـوازێک ڕەنگە دوو هـاوسـەر جـیـاوازیی ڕیشـەیییـان لە نێواندا هـەبێ. چـەندی هـاوسـەرەکـان بەخـتـەوەرتر بن، ئەوەندەش زیاتـر لە کـاتی ناسـینەوەی ئەو شـتـانەی کـە تۆ پێـشـانیـان دەدەی، لە دڵەوە پـێ دەکەنن.

ئەم ڕێبازە پێڕەوە بکە:

– با کارهێنەکانت دانیشن و نەینۆکێک و ڕیکۆردەرێکیان بەدەستەوە بێ.

– بۆ ماوەی یەک سەعات هەر جارەو جۆرێک وەربگرە و جیاوازی و لێکچوونەکانی نێوان هەردوو کەسەکە بەگوێرەی ئەو جۆرە دەستنیشان بکە.

– پەسنی لێکچوونەکانیان بدە، لەبەرئەوەی یارمەتیدەرە بۆ پێکەوەهەڵکردنی کەسەکان «دڵنیا بە لەوەی باست لە هەموو ئەو بارانەت کردبێ کە ڕەنگە ئەم هاوسەرانە بەدەست بێنکورتی بەرامبەر بەخەڵکی تر بناڵێن».

– پەسنی ئەوەش بدە کە چۆن جیاوازییەکانیان یارمەتییان دەدا لە یەکتری فێر بن.

– لە سەرووی هەموو شتێکیشەوە بزانە هەریەکەیان چ کاردانەوەیەکی دەبێ. لە کاتی گونجاودا بەبیریان بێنەوە کە پێویستە ڕێز لە یەکتری بگرن و لە جیاوازییەکانی یەکتر فێر بن.

بەبیرمە جارێک ڕووی دوو هاوسەری تازە پێگگەیشتووم لە ڕووی تەباییەوە خوێندەوە، ئەو هاوسەرانە بە"هاوارد" و "کێیسی" ناو دەبەم. لە زۆر لایەنەوە شێوازە کەسییەکانیان جیاوازیی هەبوو. ئەمەش شتێکی نائاسایی نییە. ئەوەی نائاسایی بوو کاردانەوەی هاوارد بوو. لە هەر شوێنێک کە جیاوازییەکم دەستنیشان کردبا ئەو بەلەخۆباییبوونەوە دەیوت: "دەبینی کێیسی؟ پێویستە تۆ لەم ڕووەوە شێوازت زیاتر وەک هی من لێ بکەی. شێوازەکەی من ڕۆحانیترە".

شەش مانگی نەبرد کە کێیسی لەهاوارد جیا بووەوە. ئەوە بەڕێکەوت بووە؟ بەداخەوە نا.

جارێکی تر لە ئاهەنگێکدا ڕووی ئاننا و ڤیکتۆرم خوێندەوە. هەرجارەو کە هێمایەکی ڕووی ئاننام شی دەکردەوە بەگاڵتەوە بزەی دەکرد و لە ناو نەینۆک ڕادەما و پێ دەچوو جگە لە سەرسامبوون بەمکیاژەکەی خۆی هیچ شتێکی تری ناو نەینۆک سەرنجی ڕانەکێشێ. دوای ئەمەش ڕووی دەکردە ڤیکتۆر و دەیوت:

"ئەیەڕۆ! من نازانم. گیانەکەم من بەو شێوەیەم؟".

ئەگەر ئافرەتێک دەسەڵات بگێڕێ، خۆ شتێکی خراپ نییە. بەڵام ئەگەر تەباییەکی کەم هاوڕێی ئەم دەسەڵاتگێڕییە بێ، کارەساتێک بەڕێوەیە. هیوادارم ئافرەتانی وەک ئاننا داوای خوێندنەوەی تەبایی بکەن و لێدوانەکان بەریکۆردەر تۆمار بکەن و ڕۆژانە گوێ لەم لێکدانەوانە ڕابگرنەوە. ئەو کاتەی ئاننا بڕیار بدا زیاتر لە بەهای جوانییەکەی لە بەهای

خۆی تێ بگات، ئا لەو کاتەدا ژیانی بەردەوام بەئاراستەی بووژانەوەوە درێژە دەکێشێ.

بیرۆکەیەکی خراپ نییە، ئەگەر ئەو کەسانەی بەنیازی هاوسەرگیرین پێش ئەنجامدانی ئەم کارە، داوا لە خوێنەوەیەکی تەبایی بکەن، ڕوویان بخوێنێتەوە. بەتایبەتیش ئەم شێوازە ڕوو خوێندنەوەم بۆ ئەو کەپلانە پێ باشە کە لە ڕێی ئینتەرنێتەوە لەگەڵ یەکتر ئاشنا دەبن. هەرچەندە ناوەڕۆکی وتەکانی تۆ بەم جووتە دڵدارە ئاماژە بەنەشارەزاییەکانیان لە ڕووی پێوەندی بەستنەوە نادا، بەڵام دڵدارێکی ژیر بەوردی تێبینیی ئەوە دەکا تا بزانێ لە ماوەی خوێندنەوەکەدا کەپڵەکەی چ کاردانەوەیەکی دەبێ.

هەروەها ئەگەر کەپڵێک دەناسی کە بەڕاستی حەز دەکەن ماوەی پێش خێزان پێکهێنان، درێژ بکەنەوە، کارێکی ژیرانەیە کە بیانـنێرییە لای یەکێک لە هاوڕێیە ڕووخوێنەوەکانت تا هەروەک دیارییەکی زەماوەندگێڕانیان ڕوویان بخوێنیتەوە. ئەو زانیارییەی کە دەستیان دەکەوێ، ڕەنگە ڕێخۆشکەر بێ بۆ ئەوەی دووبارە بیر لە پێکهێنانی ئەو خێزانە بکەنەوە کە بەئاشکرا لەسەر لێواری لەناوچوونە.

کەسانی ڕۆمانسی با بەدڵنیاییـیەوە ئاسوودە بن، لەبەرئەوەی زۆربەی ئەو خەڵکەی خوێندنەوەی تەباییـیان بۆ کراوە ڕێزگرتنی هاوبەشیان زیاد بووە نەک کەم. ڕەنگە تۆ ئەوەندە بەختەوەر بی کە داوات لێ بکرێ لە ئاهەنگی ساڵڤەگەڕی زەماوەندی جووتە هاوسەرێکدا ڕوو بخوێنییەوە، لەگەڵ خۆت پاکەتێکی پڕ لە دەسرە بەرە.

## ڕاوێژکاری نەشتەرگەریی جوانکاری

چاوەڕوانی ئەوە مەبە نەشتەرگەرانی جوانکاری پرست پێ بکەن، بەڵام کە خزمەتگوزارییەکەی تۆ ناوبانگی دەرکرد، ئەو کاتە ڕەنگە کڕیارانی جوانکاری و ژمارەیەکی زۆریشیان بێن و پرست پێ بکەن. بازاڕی نەشتەرگەری لەم سەردەمەدا گەرمە نەک لەبەر ژمارەی زۆری کڕیارانی جوانکاری، بگرە بەهۆی ئەو پارە چەورەی کە لە گۆڕینی ڕوویەکدا خەرج دەکرێ. تۆ بەپلەی ڕووخوێنەوە، دەتوانی ڕوانگەیەکی ڕاستەقینەی تر پێشانی ئەم کەسانە بدەی. لەبەرئەوەی نرخی هەر سەعات لە خزمەتگوزارییەکەی تۆ یەکجار کەمترە لە نرخی پیشنیازکراو بۆ نەشتەرگەرییەکە و ڕەنگە ئەم خزمەتگوزارییە بیروبۆچوونی زۆر گرینگ بخاتە ڕوو، بۆیە نابێ بەخزمەتگوزارییەکی پڕتێچوو دابنرێ. بۆ خوێندنەوەکەت ئەم هەنگاوانە پێڕەو بکە:

– لە کارهێنەکەت بپرسە بەنیازی چ گۆڕانکارییەکە.

– لەسەر هەمان ئەو هەنگاوانە بڕۆ کە بۆ خوێندنەوەی توانا شاراوەکانی ژیان گیراونەتە بەر، بەڵام دڵنیا بە لەوەی ئەو ئەندامەی کارهێنەکەت بەنیازە بیگۆڕێ دوا جار باس بکەی.

– لە کۆتاییدا ڕاوێژکارییی نەشتەرگەری جوانکاری دەست پێ دەکا و تۆ باس لە پێوەندییەکەی ئەو بەشە پرکیشەیەی ڕوو بەدەروونی کەسەکە دەکەی. ئاخۆ ئەو هێمایەی ڕوو پێوەندیی بە چ وانەیەکی ژیانەوە هەیە؟ بۆ نموونە ئەگەر بڕیار بێ نەشتەرگەرییەکە درێژیی لووت بگۆڕێ هەموو ئەو بەشانەی ناو ڕووی کەسەکە کە پێوەندییان بەبەرنامەڕێژی و داهێنەرایەتییەوە هەیە باس بکە. ئاخۆ ئەم نەشتەرگەرییە دەبێتە هۆی لەناوچوونی کام هاوسەنگیی سروشتی؟ ئاخۆ لە چ ڕوویەکەوەش ئەم نەشتەرگەرییە ڕەنگە سوودی پێ بگەیەنێ؟ ئاخۆ کارهێنەکەت ڕووبەڕووی کام گرفتە شاراوەکان دەبێتەوە؟

با سوودەکانی نەشتەرگەریی جوانکاری زۆریش بن، بەڵام ئەم نەشتەرگەرییە هەر شتێکی پیرۆز نییە و کتومت ناڕەوایە. بەڵام خوێندنەوەی ڕوو شتێکی پیرۆزە و ئامانج لێی ئەوەیە لە جەستە و مێشک و ڕۆحی کارهێنەکەت تێ بگەی و ڕێز لەو تایبەتمەندییە بگری کە ئەو کەسەی لە خەڵکی تر جیا کردووەتەوە.

کاری ئێمە لە سەرووی باسکردنی پلەوپایەی کۆمەڵایەتیمانە، واتە لە سەرووی ئەو ئاستەیە، کە تێیدا بەشێوەیەکی ئاسایی هەڵسەنگاندنی مرۆڤ بەگوێرەی پلەو پایە و کلێشەکانەوە، بەهەڵسەنگاندنێکی گونجاو هەژمار دەکرێ. ئەو کارهێنەی پێوەندیت پێوە دەکا هەست بەوە دەکا، لە ناخی خۆیدا بەهرەی بێ هاوتای ئەوتۆی هەن کە داوای ئەوە دەکەن بەکار بهێنرێن. خوێندنەوەی ڕوو یارمەتیدەرە بۆ ئاشکرابوونی ئەم بەهرانە.

ڕوو خوێندنەوەکەت یارمەتیی کارهێنەکەت دەدا، بۆ ئەوەی بەقووڵی بیر لە گرینگترین بەرژەوەندی خۆی بکاتەوە و لەوەش تێ بگا کە ڕووی مرۆڤ لێکچوونێکی ئەوتۆی لەگەڵ قوڕی یاریی قوڕقوڕانێی منداڵاندا نییە. هەر گۆڕانکارییەک لە ناو ڕوودا، ڕوو بدا بەرەنجامەکانی لە دەروونی مرۆڤدا ڕەنگ دەداتەوە. بەهۆی پێوەندییە دووقۆڵییەکەی نێوان ڕووی مرۆڤ و دەروونی خودی مرۆڤ، کاریگەریی ئەم گۆڕانکارییانە زۆر زیاترە لە بەتەنیا گۆڕینی ئاستی جوانی. بۆ نموونە جوانکارییەکی لووت گۆڕانکارییەک لە بەهرەکانی کاری دەخوڵقێنێ و گۆڕینی چەناگە کاریگەریی لەسەر شێوازەکانی بەرەنگاربوونەوە هەیە و لووسکردنەوەی پێست، کەمتر خەڵک دەگۆڕێ و تەنیا دەبێتە هۆی سڕینەوەی ساڵانی ژیری.

خـەڵکی ژێر، لەمـە تێ دەگـات. هەر نەشـتـەرگـەرییـەکی ڕوو بەمـەبەسـتـی هێنانـەدیی گـۆڕانکارییـەک تەنیـا "جـوانکاری"ی بەدوادا نایەت. کـاتی وەرگـرتنی زانیـاریـی تەواو لەم بارەیەوە، پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکەیە.

ئەرکی تۆ ئـەوە نییـە لەجیـاتی کارهێنەکەتەوە بڕیار بدەی. پێویسـتـە تەنیـا پرسـیـاری گرینگی لێ بکەی. هەندیک جار کـارهێنەکانم بەخـۆشحـاڵییـەوە لەلام دەردەچن و زۆر زیاتر لە جـاران قـەناعـەتیـان بـەوە دێ کە ئەنجـامـدانی نەشـتـەرگـەرییـەکە کـارێکی باشـە. ئەوانی تریش کە بڕیار دەدەن نـەشـتـەرگـەرییـەکە نەکەن، بەهەمـان ڕادە خـۆشحـاڵ دەبن. ئەمـەش تەنیـا لەبەرئەوە نییـە کە پارەیان بۆ دەگـەڕێتـەوە. بگرە ئەوان بەڕێگەیەکی قووڵ و کـەسـیـدا فێری ئەوە بوون کە چۆن ڕێز لە خۆیان بنێن.

## شرۆڤەکاری کۆمەڵایەتی

ئاخۆ زاراوەی "شرۆڤەکاری کۆمەڵایەتی" بیرت بەئاراستەی مامە "بەدی"ی سەرخۆشت و خاتـوو "بێنتا"ی بێزارکەر و لۆمـەکاری گـەڕەک ڕادەکێشێت؟ قـووڵتر بیـر بکەوە. بۆ زۆربەی پسپۆڕییە ڕاوێژکارییەکان پێویستە ڕاوێژکار، شارەزاییەکانی شرۆڤەکارێکی کۆمەڵایەتیی دەسـتـبـالای هەبن. نموونـەش بۆ ئەم بـوارانە بریتین لـە: سـیـاسـەتوانی، دوورنواڕی، ڕێکخستنی بانگەشـەی تایبەت بەڕیکلام و پێوەندییە کۆمەڵایەتییـەکان، پێشکێشکاری «یان دەرهێنەری»ی بەرنامـەی گفتوگۆئامێزی ڕادیۆیی، ڕۆژنامـەگەری، پسپۆڕیی کۆمـەڵناسی، نووسینی پرۆژەی لێکۆڵینەوە لەلایەن قوتابییانی بەشی کۆمـەڵناسی. مەبەستم ئەوە نییە کە ئەگـەر تۆ تەنیـا شـارەزاییت لە خـوێندنـەوەی ڕوو هەبێ، ئەوا بـۆ ئەم پیـشـە دڵکێشـانە بەکەسـێکی شیـاو هەژمـار دەکرێی. بەڵام لە هەریەک لـەم پێشـانەدا سـەرکـەوتووتر دەبی، ئەگەر بێو شارەزاییەکی وردت لەسەر خوێندنەوەی ڕوو هەبێ.

بیـر لە کـولتـووری هونەری بکەوە کـە بـەزۆر هۆی جـیـاوازەوە بـۆ کـەسـانی سـەر بەو پسپـۆڕییـانەی لە سـەرەوە ئامـاژەیان پێ دراوە، شـتێکی گـرینگە. کولتـوور و مـیـدیاکـانی ئەمـریکی لێـوانلێـون لە کـەسـانی سـەرناس، جـا چ ئەم کـەسـانە هونەرمـەند بن یاخـۆ سیـاسـەتوان بـن یانیش ئەو کـەسانە بن کـە تەنیـا بەهـەوڵی خـۆیان توانیـویانە ناوبـانگێک دەربکەن. تۆ ناتـوانی کـولتـووری هونەری فـەرامـۆش بکەی. «شـتێکی سـەیرە کە تۆ بەپلەی ڕووخـوێنەوە بتـەوێ واز لە کـولتـووری هونەری بهێنی. تەنانەت بیـرکـردنـەوە لە کـارێکی لەم جۆرە شتێکی سەیرە».

ڕوو خوێندنەوە، ڕێگەیەکی تەواو نوێ بۆ شیکردنەوەی ڕووی کەسانی سەرناست بۆ ئاوەڵە دەکا. لە ناو ڕووی ناودارێک کە لە لات خۆشەویستە بەدوای بەهرە ڕاستەقینەکان و بەرپەرچدانەوەکان بگەڕێ. ئەم شێوازەی گەڕان دڵکەرەوەیە لەبەرئەوەی ئەم ناودارانە ڕۆژنامەنووسی ئەوتۆیان بەکرێ گرتووە تا جەماوەریان بۆ کێش بکەن و هەڵبەتە تۆ لە واقیعی ئەم جەماوەرکێشییە تێ دەگەی. بۆ نموونە ئاخۆ هەرگیز لەو کاتەی کە لە ناو سەرەی سوپەرمارکێتێکدا لە چاوەڕوانی دای لە خۆتەوە چاوت بەکۆواری تیراژبەرزی وەک TV Guide یان Redbook یان People نەکەوتووە؟ بەرگی ئەم کۆوارانە بەوێنەی ڕووی ناوداران و سەردێری دڵکێش ڕازاونەتەوە. ئەو کاتەی تۆ سەردێرەکە لەگەڵ ئەو شتەی کە ڕووەکە پێتی دەڵێ، بەراورد دەکەی، زۆربەی جار دژایەتییەکی تەواو دەدۆزییەوە.

زۆرجار چاوت بەوتارێک لەبارەی ناودارێک دەکەوێ کە بەم دوایانە تامی "بەختەوەری" یان "سەرکەوتن"ی چێشتووە. لە وێنەی ئەم ناودارانەوە دیارە کە پێوانی چەمانەوەی ژێرپێڵوویان بەردەوام کەمە. بابەتێکی جەماوەرکێشی تر وێنەی "سەرنجڕاکێشترین پیاوانی ئێستا"ن کە لەسەر بەرگی کۆوارەکان بڵاو دەبنەوە و وا دیارە ئەمە سەرپشکییەکی گوزەرا بێ لەبەرئەوەی بەزۆری لە کۆوارە جۆراوجۆرەکان هەرجارەو بابەت لەسەر یەکێک لەم کەسانە دەنووسرێ. سەیری ڕووی ئەو کەسانە بکە و هەموو هێمایە جەستەییە بەهێزەکانیان دەستنیشان بکە.

لە ئەمریکا لەگەڵ هاتنی هەزارەی نوێدا، کەسی سەرنجڕاکێش، ئەو کەسەیە کە سەرلێوێکی زۆر بەرچاوی هەبێ و «ئەگەر تەمەنی لە ٣٠ ساڵ سەرتر بێ» پێویستە لانی کەم چاڵێکی لە ناو ڕوو هەبێ. ڕەنگە خاوەنی گرێی شانازی و گوێی گۆشە تیژیش بێت و چەمانەوەی ژێر پێڵووی «لەسەر پێوەرێکی ١ تا ١٠ پلەیەی» لانی زۆر ٢ پلە بێ. ئەگەر سمێڵیشی هەبێ ڕەنگە ئەم سمێڵەی لەجیاتی شاردنەوەی لێوی سەرەوەی، ڕێگە بەدەرکەوتنی لێوارەکانی لێوی بدا. ئەی بەڕای تۆ ئاخۆ ئەو مۆدیلکار و ئەستێرە سینەماییانەی کە شەیدای گۆڕانکارین چۆن باسی ئێمە دەکەن؟ تۆی شرۆڤەکاری کۆمەڵایەتی، بیر لەوە بکەوە. پاشان ئەو ڕێگەیانە بدۆزەوە کە هەم بتوانی سوودێک بەخەڵک بگەیەنی و هەم چێژ وەربگری.

– لە زۆربەی بانگەشە بازرگانییەکاندا، مۆدیلکاری ئەوتۆ بەکرێ دەگیرێن. کە ڕوویان کتوپڕ پێچەوانەی ئەو پەیامەیە کە بەگەیاندنی ڕاسپێردراون. ئەگەر داوات لێ بکەن، بۆیان ڕوون بکەیەوە کام مۆدیلکار ڕیکلامەکە بەهێزتر دەکا نەک بەپێچەوانەوە ئەوا تێچووی ئەم

لێکۆڵینەوەیان بەخەسار ناچێ. ئەگەر تۆش حەز بکەی ئەم برە پاداشتە بدرێ بەتۆ ئەوا ڕاپۆرتێک سەبارەت بەو مۆدیلکارانە بنووسە کە لە ڕیکلامەکانی کۆمپانیاکەدا بەشدارییان کردووە. بەمەبەستی ئاگەدارکردنەوەی گەورەترین ئاژانسەکانی ڕیکلامی ناو شارەکەی خۆت لە خزمەتگوزارییەکەت دەرفەتێک بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ کاربەدەستانی بالای ئەم ئاژانسانە بدۆزەوە، پاشان بەناوی ڕاوێژکار بناخەی خزمەتگوزارییەکەت دابرێژە.

– بۆ زیاترکردنی زانیاریی مامەڵەکارەکەت لەمەڕ خۆی شارەزاییی خۆت لە بواری شرۆڤەکاریی کۆمەڵایەتیدا بخە گەڕ. لە وتارێکدا پوختەی خوێندنەوەی ڕووی کۆمەڵێک ناودار باس بکە. پاشان ئەمە لە ڕۆژنامەیەکی ناوخۆیی بلاو بکەوە. لە کۆتاییدا، خزمەتگوزارییەکانی تریشت باس بکە «واتە هەرجۆرە پسپۆڕییەکی تر کە لەم بەشەی کتێبەکەدا باس کراون». هەرچەندە بەشێوەیەکی ئاسایی ڕۆژنامە ژمارە تەلەفۆنی تۆ بلاو ناکاتەوە، بەلام دەکرێ بەم شێوەیە ئاماژەت پێ بدرێ "ڕووخوێنەوەیەکی ڕاوێژکاری دانیشتووی ستێرالینگی ڤێرجینیا" یان هەر شوێنێکی تر.

– ئاخۆ هیچ ژوورێکی چاتی ئینتەرنێت هەیە کە بەدڵت بێ؟ بەم ڕێگەیەش باس لە سەرنجڕاکێشیی شرۆڤەکاریی کۆمەلایەتی بکە. پاشان بناخەی خزمەتگوزارییەکەی خۆت دابرێژە.

– یان پێوەندی بەپرۆفیسۆرەکانی کۆلێجە ناوخۆیییەکانەوە بکە، واتە ئەوانەی کە کۆرسی تایبەت بەفیلم یان لایەنەکانی تری کولتووری هونەری دەڵێنەوە. بەناوی میوانێکی وتاردەر خزمەتگوزارییەکەت پێشکێشیان بکە. وتارێکی پڕکێش و هزروروژێنەر پێشکێش بکە. پاشان باس لە خزمەتگوزارییەکەی خۆت بکە و کارتی کاریی خۆت بلاو بکەوە.

– لە کۆتاییشدا با ئاماژە بەبەکارهێنانێکی پسپۆڕانە، بەلام گرینگی شرۆڤەکاریی کۆمەلایەتی بدەین، ئەویش برێتییە لە کاری خێرخوازی. ئەگەر تۆ لەو قوتابخانە یان ڕێکخراوە سوودوەرنەگرانەی ئامانجیان کێشکردنی بەخشەرە سەرەکییەکانە، کار بکەی، بۆ خۆت دەزانی پێویستە ئەم بەخشەرە ڕێ تێچووانە هان بدەی و ئامانجەکەت بەباشترین شێوە دەرببڕی. ناسینەوەی نیگەرانییە تایبەتییەکانی بەخشەرەکان لە ڕێگەی خوێندنەوەی ڕوو، دەتوانێ یارمەتیت بدا کاریگەرترین تێبینییە کۆمەلایەتییەکان بۆ وەسفکردنی ئامانج یان کاری دەزگایەکەت پێشکێش بکەی. لە ڕێگەی خوێندنەوەی ڕووی بەخشەرەکانەوە دەتوانی بزانی چ شتێک تەلیسمیان دەکا و، پێویستە هەوڵەکانت بەئاراستەی دۆزینەوەیەی

ئەم زانیارییە بن. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوی کە ئەو بەروبووکارانەی ناچارن لەگەڵ هەموو خێرخوازەکان، بەمنگەمنگەوە بدوێن لەسەر وەدەستهێنانی تۆ ڕکابەرایەتی بکەن.

تێ گەیشتی؟ ئەگەر مرۆڤ شرۆڤەکارێکی کۆمەڵایەتی بێ، لە کۆمەڵێک سەرپشکیی کارەکی سوودمەند دەبێ. ئەگەر ئەم پسپۆرییە بۆ پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەکار بێ، ڕێگەخۆشکەر دەبێ بۆ وەدەستهێنانی کارێکی ئەوتۆ کە لەبری مرۆڤ پاداشت بکرێتەوە. هەڵبەتە گرینگە تۆ خۆت لە وتن یان بڵاوکردنەوەی ئەو قسانەی بۆنی سووکایەتیکردن بەخەڵکیان لێ دێ، دوور بخەی. با قسەکانت لە چوارچێوەی یاسا زێڕینەکەی خوێندنەوەی ڕوو دەرنەچن، واتە تەنیا باسی بەهرەکان و ئاریشە ڕێ تێچووەکان بکە.

هەروەها تەنیا لەو بارەدا نەبێ کە مەبەست لە شرۆڤەکە تەنیا پێکەنین بێ، ئەگینا پێویستە مەبەستت لە خوێندنەوەیەکە بازرگانی بێ. لە ژێر هەر بارودۆخێکیشدا تەنانەت ئەگەر دڵەڕاوکێش بتگرێ، خزمەتگوزارییەکەت بەخۆڕایی پێشکێش مەکە. هەندێک جار بۆ پێشاندانی توانات ناچاری بەبێ بەرامبەر نموونەیەک بخوێنییەوە، بەڵام با بەردەوام کارتی کاریت لە بەردەستدا بێ و بەکارهێنە ڕێ تێچووەکانت پێشان بدە، چۆن پێوەندیت پێوە بکەن.

## چوونە ناو ئیشوکار

دەستپێکردنی بازرگانیی بچووک، بەتایبەتیش ئەگەر ئەم بازرگانییە بەشێوەی بەشەکاتی بێ شتێکی سانایە. مەهێڵە پێشبینییەکانت سەبارەت بەداهێنانی ئیشوکارێک بەهەمان شێوە کە لە سەرەتادا منی بەدڵەڕاوکێ خست، تۆش تووشی دڵەڕاوکێ بکا.

بەر لە هەموو شتێک ڕەنگە پێویست بێ زانیارییەکانی پێوەست بەچۆنیەتیی دەست بەکاربوون لە ڕێگەی چاوپێکەوتن لەگەڵ ژمێریارێکدا بدۆزییەوە کە ئەمیش لەلای خۆیەوە بناخەی تۆماری حیسابەکانت بۆ دادەڕێژێ. هەروەها بەگوێرەی هەلومەرجی خۆت، گونجاوترین سیستەمی کاری کە تێیدا ڕوون کرابێتەوە کام تێچووەکان باج دەیانگرێتەوە، دەستنیشان بکە. پاشان بەهەمان خێرایی وتنی: "واو! ئەمەش لە ئیشوکاری خۆم!" دەکەوییە سەر سکە. ئەگەریش بۆ خۆت کارەکانت بەڕێوە ببەی، ئەوا پێویستە کارهێنەکان بەوردی بەدوای ناوونیشانەکەتدا بگەڕێن و لەم بارەدا تەنانەت پێویستیت بەکردنەوەی ژمارە حیسابێکی بانکیی نوێ نابێ.

تۆ بەپلەی ڕاوێژکار، پابەندی بەوەی IRS – سەنتەری ناخۆیی بۆ داهات، لە داهاتی

خۆت ئاگەدار بکەیەوە و هەروەها بەشە باجی خۆت ڕادەست بکەی. هەروەها پێویستە بۆ ئیشوکارەکەت مۆڵەتی کارکردن لە شوێنی نیشتەجێبوونت وەربگری. وەرگرتنی ئەم مۆڵەتەش بەهەمان ڕادەی وەرگرتنی مۆڵەتی بەخێوکردنی سەگێک یان مۆڵەتی لێخوڕین ئاسانە. کەواتە لە ترسی ڕۆتینە یاساییەکان ڕووی خۆت گرژ مەکە. بزانە پێویستە چی بکەی و وا مەزانە بازرگانییەکی زۆر گەورەتر لەوەی بتوانی بەڕێوەی بەری، چاوەڕێت دەکا. بۆیە "زوو دەست بەکار بە".

– دەتوانی یارمەتییەکی زۆر لە "U.S. Small Business Administration (SBA)" – بەڕێوەبەرایەتیی وردە بازرگانی ئەمریکا "کورت کراوەتەوە بۆ "ئێس بی ئەی" وەربگری. ئەگەر هێڵی ئینتەرنێتت هەبێ یان بتوانی سوود لە ئینتەرنێتی نزیکترین کتێبخانەی گشتی وەربگری، ئەوا چاوێک بەماڵپەڕی SBA's Online Women's Business Center – سەنتەری ئەلیکترۆنیی (ئێس بی ئەی)، تایبەت بەئیشوکاری ئافرەتان لەسەر ئەم ناوونیشانە http//: www. onlinewbc. org بخشێنە. ماڵپەڕێکی بەخۆڕایی و پڕ کاریگەرە و ئەگەر پێویستیت بەیارمەتی هەبوو، ئەوا لەسەر هێڵ دەتوانی پرس بکەی. ئەم خزمەتگوزارییە بەشەو و بەڕۆژ لە هەر شوێنێکی ئەمریکاوە سوودی لێ وەردەگیرێ. هەڵبەتە ئینتەرنێت خۆ نازانێت ڕەگەزی تۆ چییە بۆیە ئەم ماڵپەڕە بۆ پرسکردن دەرفەتێکی یەکسان بۆ هەمووان دەرەخسێنێ.

سەرچاوەکانی تریش بریتین لە ماڵپەڕی The Office of Women's Business Own-ership – لەسەر ئەم ناوونیشانە www. sab. gov/womeninbusiness و، هەروەها بەشی ناوخۆییی (ئێس بی ئەی) ڕەنگە، تەنانەت هەلی ئەوەت بۆ برەخسێنێ کە لەسەر هێڵی ئینتەرنێت بەبێ بەرامبەر پرس بەڕێنوێنیکەرێکی خۆبەخش بکەی. بۆچی ئەم سەرچاوە سەرسوڕمێنانە بەخۆڕایی بەردەست کراون؟ هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بازرگانیی بچووک برەو بەئابووریی ئەمریکا دەدا. هەر بۆیەش هاندانی خەڵکێکی وەک تۆ لە پێناو وەدەستهێنانی پارەی زۆرتر وەبەرهێنانێکی باشە. تەنیا بیر لەوە بکەوە کە سەرکەوتنی تۆ لە بەرژەوەندیی ئەمریکا دایە، بۆیە سەرکەوتنی خۆت بەئەرکێکی نیشتمانی بزانە.

ئەمانە گرینگترین ئەو تێبینییانەن کە بۆ وەپێشخستنی پیشەی ڕووخوێنەوەیی و سەرکەوتن لێی، پێویستیت پێیانە:

– یەکێک لەو پسپۆڕییانە هەڵبژێرە کە بەڕادەیەکی زۆر سەرنجی ڕاکێشاوی. دەتوانی

هەر کام لە پسپۆڕییەکانی ناو ئەم بەشەی کتێب، هەڵبژێری یان بۆ خۆت یەکێکی نوێ دابهێنی.

– بیر لە کڕیارەکانی خزمەتگوزارییەکەت بکەوە. بزانە ئەوان چ کەسانێکن و ئاخۆ چۆن دەتوانی پێیان بگەی.

– بزانە دەقاودەق کام خزمەتگوزاری پێشکێش دەکەی و تێچووەکەی چەندە. زۆربەی جار وا باشترە کە چەند نرخێکی جیاواز دەستنیشان بکەی. هەندێک خەڵک حەزیان لە مامەڵەکردنە. چ ئەمە بەلاتەوە سەیر بێ چ ئاسایی ژمارەیەک لە کڕیارەکان بەردەوام بەدوای گرانترین نرخدا دەگەڕێن. بۆیە باشترە هەلی هەڵبژاردنیان بۆ بڕەخسێنی.

– با کارتێکی چاپکراوەت هەبێ. لە سەرتادا ئەو شتەی کە پێویستتە تەنیا کارتی کارییە. ئەم کارتە سەرچاوەیەکی خێرای وەدەستهێنانی متمانەیە کە بەهەموو خەڵکی دنیا دەڵێ بەڵێ، لە ڕاستیدا تۆ خاوەن پیشەیەکی.

– هەر جارەو کارهێنێک پێوەندیی پێوە کردی، پێشانی بدە، تۆ بە چ شێوازێک دەتوانی گرفتەکانی خەڵک چارەسەر بکەی و دڵیان بگەشێنییەوە. بەنەزاکەتەوە لە نیگەرانییەکانیان بکۆڵەوە. ناوبانگی ڕاست و دروستی و یارمەتییە بێ خەوشەکەت لەسەر بناخەیەکی پتەو بنیات بنێ. پاشان بارینی پارە بەچاوی خۆت ببینە.

## ڕوو خوێندنەوە لەسەر ئاستێکی پیشەوەرانە

ئاخۆ مرۆڤ بەچ شێوازێک تائەو ڕادەیە شارەزای خوێندنەوەی ڕوو دەبێ کە بتوانێ وەک پیشە سوودی لێ وەربگرێ؟ ئەگەر بتەوێ بەناوی پیشە لە پسپۆڕیی وەک بەزمگێڕانی ناو ئاهەنگ، ڕوو خوێندنەوەی بەجیا بۆ خەڵک، ڕاهێنانی خەڵک لە خوێندنەوەی ڕوو و هەروەها ڕاوێژکاریدا کار بکەی، پێویستە بزانی هەر هەموویان پێویستییان بەئاستێکی بەرزی کارامەیی هەیە.

ئەگەر بەتەنیا پشت بەخۆت ببەستی، ئەوا ئەم ویستەت دێتە دی لەگەڵ ئەوەشدا گرینگیی ڕۆڵی ڕاهێنەران لە یاد مەکە. بەشداریکردن لە وانەیەکی ئاسایی دوو سەعاتیدا، ڕەنگە کارایییەکی ئەوتۆت پێ ببەخشێ، کە هێندەی شەش مانگ یان زیاتریش لەبەتەنیا پشت بەستن بەخۆوە وەدەست دێ. هەروەها وانەوەرگرتن لەسەر دەستی شارەزاییەکی خوێندنەوەی ڕوو ڕەنگە سرووشت بۆ بێنێ.

بەمەبەستی بەهاناوەچوونی خەڵک، بۆ پێشکێشکردنی ڕاهێنانێکی سیستەمیانە لە سیستەمی نهێنییەکانی ڕوو خوێندنەوەمدا کۆرسێکم کردووەتەوە کە تێیدا ڕاهێنانەکان بەنامەگۆڕینەوە بەڕێوە دەچن.

ئەم سیستەمە زنجیرە پرۆژەیەک بۆ برەودان بەشارەزایی و بڕوا بەخۆبوونی تۆ لەخۆ دەگرێ و لەم کۆرسەدا، چاودێری دەکرێی تابتوانی هەمان شارەزاییەکانی ڕووخوێنەوەیەک وەدەست بهێنێ. هەڵبژاردنەکان یارمەتیت دەدەن لە یەکێک لە پسپۆڕییەکاندا پەرە بەشارەزاییەکانت بدەی و هەروەها هەلی ئەوەت بۆ دەرەخسێن تا لێکۆڵینەوەیەکی ڕەسەن لە بوارە هەڵبژێردراوەکەدا ئەنجام بدەی.

بۆ زانیاریی زیاتر سەردانی ماڵپەڕەکەم بەناوونیشانی www.Rose-Rosetree.com بکە.

هەروەها لەم ماڵپەڕەدا ڕێ و شوێنی ڕادەستکردنی ئەنجامی ڕوو خوێندنەوەکانم بەرێگەی پۆستە یان بەپۆستی ئەلیکترۆنی ڕوون کراوەتەوە. هەروەها هەلێکی تر بۆ وەرگرتنی زانیاریی تایبەت بەڕوو خوێندنەوە داواکردنی وانەی تایبەتە کە تێیدا بەئارەزووی خۆت فێری خوێندنەوەی ڕوو دەبی. یاخۆ دەتوانی بۆ خۆت لەگەڵ خەڵکی تر کە وانەی تایبەت بەخوێندنی بەردەوام وەردەگرن، بۆ نموونە کەسانی وەک پسپۆڕانی دەروونی، مامۆستایان یان پسپۆڕانی تەندروستی لە یەک پۆل وانە وەربگری. هەر پرسیارێکت لەبارەی هەر زانیارییەکی ناو ماڵپەرەکە لە مێشک گەڵاڵە بوو، بەپۆستی ئەلیکترۆنی بۆمی بنێرە.

لەگەڵ ئەوەشدا بۆ بەدواداچوونی وەڵامەکان پێویستیت بەشارەزاییەکی زۆر لە ئینتەرنێت نییە. هەروەها هەر کاتێک ویستت دەتوانی نامەم بۆ بنێری. ئەگەر مەبەستت لە ناردنی نامە، وەرگرتنی زانیاری لەبارەی وانەکان و خوێندنەوەکان و کۆرسی ڕاهێنان بەنامەگۆڕینەوە بێ، تکایە با پوولێک و ناوونیشانی خۆت لەسەر پاکەتی نامەکە دیار بێ. ئەمە ناوونیشانی پۆستیی منە:

Rose Rosetree

P. O. Box 1605

Sterling، VA 20167-1605

هەروەها ئەگەر لە بڕینی پلەکانی بوون بەڕووخوێنەوەی پسپۆڕانەدا سەرکەوتوو بووی، لە نامەیەک بۆ هەمان ئەم ناوونیشانە باسی چیرۆکی سەرکەوتنی خۆتم بۆ بنووسە.

لە کۆتاییدا هیوادارم بیر لە وەرگرتنی ڕاهێنان لەلای من بکەیەوە، بۆ ئەوەی بتوانم لە ڕێگەی خەرمانەخوێندنەوە و هاوسۆزی، دەرگەی تێگەشتنێکی بەرفراوانترت بۆ ئاوەڵە بکەم. خەرمانەخوێندنەوە و هاوسۆزی، سەرنجڕاکێشییەکەی خوێندنەوەی ڕوو تەنانەت زیاتریش دەکەن. پێم باشە بەخوێندنەوەی کتێبەکانی من بەناوەکانی "Aura Reading through All Your Senses – خەرمانەخوێندنەوە بەهەموو هەستەکانتەوە" و هەروەها "Empowered by Empathy – کەسی بەهێز بوو بەهاوسۆزی" دەست بەکار بی. پاشان لە وانەکان بەشداری بکەی یان وانەی تایبەت وەربگری. ئەم وانانەش یان لەلای خۆم وەردەگری یان لەلای شارەزایانی ترەوە.

ژمارەیەکتان ڕەنگە لە ڕابردوودا هەوڵی ئەوەتان دابێ خەرمانە بخوێننەوە، بەڵام سەرکەوتنێکی بچووکتان تۆمار کردبێ. ڕەنگە هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زۆربەی ڕاهێنەرەکان لە ڕێبازەکانی خەرمانەخوێندنەوەیاندا جەخت لەسەر یەک بەهرە دەکەنەوە کە ئەویش بینایی دەروونییە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی خەڵک لە جەستە و مێشک و ڕۆحیاندا لەم بەهرەیە بێ بەشن. ڕێبازەکەی من لە هی ئەوان جیاوازە. زیاتر لە ١٠٠ تەکنیک یاریدەت دەدا، بۆ ئەوەی لە بەهرەکانت تێ بگەی و گەشە بەبەهێزترین بەهرەکانت بدەی و، نیگەرانیش مەبە لەبەرئەوەی تۆ خاوەنی بەهرەی بیناییەکی ئیلاهیی. سیستەمەکەی من کە لە ١٥ ساڵی ڕابردوودا بەکارم هێناوە بەدڵنیاییەوە پەرە بەشارەزاییەکانت دەدا. هەر کاتێک تۆ دەستت بەخەرمانەخوێندنەوە کرد یان بووی بەخەرمانەخوێنەوەیەکی پسپۆڕ، ئەو کاتە ڕاستیی ئەم قسەیەی منت بۆ سوور دەبێتەوە.

هەریەکەمان بەشێوەیەکی بێ هاوتا، خزمەت بەمرۆڤایەتی دەکەین. خزمەتکردنی خەڵک لە ڕێگەی خوێندنەوەی ڕوو، ڕەنگە بەشێک لە ئەرکی تۆ بێ. یان ڕەنگە گرینگیی خوێندنەوەی ڕوو لە دۆزینەوەی زانیاریی نوێ سەبارەت بەڕووی خۆت دابێ، لەبەرئەوەی خوێندنەوەی ڕوو، سرووشت بۆ دێنێ تا سوودێکی زیاتر لە بەهرەکانی خۆت وەربگری. ئەمەش بەکەم مەزانە. تۆ خاوەنی هەر پیشەیەک بی تەنیا ئەو کاتەی کە باشترین سوود لە بەهرەکانت وەربگری، دەتوانی زیاتر یارمەتیی خەڵک بدەی و ئەوانیش تەنیا ئەو کاتە دەتوانن زیاترین تواناکانی خۆیان بخەنە گەڕ ئەگەر تۆ هۆشەکییانە ئەم توانانەیان بۆ بخەیە ڕوو.

لە کاتی ئەنجامدانی ئەم کارەدا خاڵە ڕاستەقینەکانی هێزی خۆت بەکار بهێنە تا هێزی لە خۆتێگەیشتن لە ئامادەبوونی تۆدا خۆی بەرجەستە بکا. تۆ وەک نموونەیەکی هێزی لە

خـۆتێگەیشتن دەتوانـی هەسـتـی لە خـۆتێگەیشـتـنێکی قـووڵتـر لە ناخـی خـەڵکی تردا بورووژێنـی. هەر بۆیەش ڕەنگە بەبوێرییـەکی هـاوشـێـوەی چاونەترسـیـی "سـوارچاکـێکی جیدی"، بەرەو پێش بچی. پێش کەوە و جیهانمان بۆ ڕووناک بکەوە. ڕوو پشتوپەنات بێ.

## ڕاپۆرتی بێ بەرامبەر لەبارەی زمانی جەستە لە پێوەندییەکاندا

تۆ بڵـێی بتـوانی ڕۆژێک کتـێبـێک لەسـەر لێکدانەوەی واتای زمـانی جـەسـتـە بنووسی؟ هەرچەندە ئـەمـڕۆ زۆر شـارەزا لەم بوارەدا هەن، بەڵام ڕۆز ڕۆزتری لـە نامیلکەکەی خـۆیدا بەناوی "زمانی جەستە لە پێوەندییەکاندا: ٧٥ بابەتی بچووک بەڵام پڕ واتە" و بەگاڵتەوگەپە هەمیشـەییە ناوبەناوەکەی خۆی، کۆمەڵێک بیروبۆچوونی نوێ دەخاتە ڕوو.

پێوەندیی نازارەکییانە، بوارێکە کـە شـارەزایان بەئاشکرا گرینگیی پێ دەدەن. یەکێک لەم شـارەزایانە ڕۆز ڕۆزتریی پرۆفیسۆری کۆلێجە کە بەدەستـپێکێکی پێکەنیناویی ئەم بابەتە دەورووژێنێ. پـاشـــان بەلێکدانـەوەی واتای ژمـــارەیـەکی زەبەنی ئـیـــشـــارەت و ژێست بەلەخۆگرتنی "جەمسەری موگناتیسی" و خۆچەماندنەوە و گرژبوونەوە بەردەوام دەبێ.

دەزگای Women's Intuition Worldwideیش ئەم نامیلکەیەی بەنرخـی ٥٠, ٤$ لەگەڵ - ٢٠ سـەنتی باجی فرۆشتن بۆ دانیشـتوانی ڤـیرجینیا بەردەست کردووە. بەڵام پێویسـتـە لەبری هەر داواکـارییـەکی بەکۆمـەڵیش ٣ $ی زیادە بدرێ. ئـەم نامیلکە سـپـایرۆڵدارە ٣٨ لاپەڕەییە، دیارییەکی بەرچاوە. بەتایبەتیش دیارییەکی گونجاوە بۆ ئەو کەسانەی وا بیر دەکەنەوە، خـوێندنەوەی ڕوو زانسـتـێکی یەکجار سـەردەمیـیانەیە. بەم کتێبە بچکۆلانەیە دڵیان خۆش بکە.

یان ئەگەر حەز بکەی ئەم نامیلکەیە لە ئینتەرنێت و بەبێ بەرامبەر وەربگری ئەم دوایەت ئاراستەی ئەم ناوونیشانە بکە: .Rosetree@Starpower.net

## سەرچاوەی پەراوێزی

هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر کتێب لەبارەی خوێندنەوەی ڕووو بڵاو بوونەوە، بەڵام ئەم ناوونیشـانانەی خـوارەوە، بەسوودترین ئەو کتێبانەن کە من دۆزیمبنەوە و بەگوێرەی یەکەمـایەتییـان لەلای من ڕیز کراون:


What's in a Face لە نووسینی Narayan Singh Khalsa

Loving the Neighbour لە نووسینی Narayan Singh Khalsa

Secrets of the Face لە نووسینی Lailan Young

How to Read the Language of the Face لە نووسینی Mitchell.E.M

Face Reading for Fun and Profit لە نووسینی Boye De Mente

Faces لە نووسینی Hilarton

Characterology لە نووسینی Carl Wanger

The Naked Face لە نووسینی Lialan Young

Picture of Dorian Gray لە نووسینی Oscar Wilde

Bodymind لە نووسینی Ken Dychwald

Helping Yourself with Full Reflexology لە نووسینی Mildred Carter

Ayurveda:The Sceince of Self-Healing لە نووسینی Vasant Lad

Heal Your Body لە نووسینی Louise Hay.L

Telling Lies لە نووسینی Paul Eckman

# پێڕست